# سەردەم

گۆڤـارێکی تایبەتــە بــە وەرگـێڕان و کـەلتووری بیـانی
دەزگــای چـاپ و پەخشــی ســەردەم دەریدەکــات

ژمـارە ( ٢ ) نیسـانی ١٩٩٩ – سـاڵی یەکـەم





ناونیشان:

سلێمانی – فولکەی یەکگرتن

دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

تەلەفون : ٢٩٨٣٩

بۆ پەیوەندی کردن لەدەرەوەی وڵاتەوە:

نوسینگەی ساحێبقران

Tel : 00873 761 477 268 - 00873 682 040 391

Fax : 00873 761 477 269 - 00873 682 040 392

# سەردەم

ژمارە (٣) نیسانی ١٩٩٩ ساڵی یەکەم

# فیکرو فەلسەفە



- ڕۆحی جیهان بەسەر باڵەکانی ڕۆکێتێکەوەیە

(ڕەخنەی ئادۆرنۆ لەپێشکەوتن)

- زانین و دەسەڵات



- هێربرت مارکۆزو قوتابخانەی فرانکفۆرت

# ڕۆحی جیهان بەسەر باڵەکانی ڕۆکێتێکەوەیە

# ڕەخنەی ئادۆرنۆ لە پێشکەوتن


■ مایکل لۆوی – ئێلێنی ڤاریکاس

● و: ئازاد سدیق محەمەد


ئایدیۆلۆژیای پێشکەوتن، (لە شێوە مۆدێرنەکەیدا)، لە قۆناغی ڕۆشنگەریدا لەدایك بوو و لەچەمکی هیگڵدا بۆ مێژوو گوزارشتی فەلسەفی خۆی بینییەوە. لە ئایدیۆلۆژیای پێشکەوتن دا هەموو شتێك، کە ڕوودەدات، هەنگاوێکی ڕەوتی مرۆڤایەتییە بەرەو ئازادی: کاتێك هیگڵ ناپلۆینی بینی بە سواری ئەسپێکەوە بەرەو شاری زێدی خۆی دڕوات بە تەواوی قەناعەتی کرد کە بەچاوی خۆی بینی ((ڕۆحی جیهان سوار شتی ئەسپێك بووە)).

بیری تیۆدۆر ئادۆرنۆ بەرامبەر پێشکەوتنگەرییەکی لەو جۆرە کەمترین ئاستی گەشتبینی تێدایە. بە بڕوای ئادۆرنۆ سەرەڕای ئەو پێشکەوتنە بەرچاوەی عەقڵ هیچ ئەگەرێك لە ئارادا نەبوو بۆ شعرناس کردن. لە گەرمەی جەنگی دووەمی جیهانیدا ئادۆرنۆ لە پەرەگرافێکی (مینیمیا مۆرالیا)دا بە گاڵتەجارییەوە لاسایی هیگڵی کردۆتەوە، ئادۆرنۆ وتی: هەروەها منیش ڕۆحێکی جیهانم بینی، بەڵام سوار پشتی ئەسپێك نەکرابوو، بەڵکو بەسەر باڵەکانی ڕۆکێتێکەوە بوو. مێژووی سەدەی بیستەم زەبرێکی کاریگەر بوو بە ئاڕاستەی ڕەت کردنەوەی فەلسەفەی هیگڵدا.

ئادۆرنۆ جگە لەو وانەیەی ساڵی (١٩٦٢) وتییەوە هەرگیز لێکۆڵینەوەیەکی سیستماتیك یان وردی بۆچوونەکانی سەبارەت بە پێشکەوتن پێشکەش نەکردوە. کەچی سەرباری ئەوەش ڕەخنەگرتن لە دیدو ئایدیایی لایەنگرانی پێشکەوتنگەری لە سەراپای بەرهەمەکانیدا ڕەنگی داوەتەوە. ڕەخنەگرتن لە دیدو ئایدیای



ئەوانەی برِوایان بە پێشکەوتن هەیە، توخمێکی سەرەکی تێروانینی مێژوویی ئادۆرنۆ و فاکتەرێکی یەکجار گرنگی پەرەسەندن و گەشە کردنی دیدوئایدیاکانی ئادۆرنۆ بوو سەبارەت بە هونەرو ئەدەبو کەلتوور.

بێگومان دەمێک بوو رەخنەگرتن لە پێشکەوتن بوو بووە بیرۆکەیەکی ناسراوی کەلتورو فەلسەفەی ئەوروپای ناوەڕاست. لای ئادۆرنۆ لەم بوارەدا (رەخنەگرتن لە پێشکەوتن) کەلەپوورێکی قەبەو گەورەی دیالەکتیکی دژ بە مۆدێرنیتی بورژوازی پێک دەهێنن، کە لە هەندێک جاردا شێوەیەکی ناشایستەی وەرگرتووە {هەموو ئەمانە دەبن بە میراتێک کە}بەشێک لەو رێرەوە رۆمانتیکییە بەربڵاوە پێک دەهێنێت کە لە مێژووی کەلتووری سەدەی هەژدەهەمی ئەڵمانی و ئەوروپاوە سەرچاوەی گرتووەو تا ئەم ساتەوەختە بەردەوام بووە. پێویستە بەو شێوەیە لە رۆمانتسیزم نەگەین کە تەنها بزووتنەوەیەکی ئەدەبی یە بەڵکو دەبێت بەوشێوەیە تێی بگەین کە بۆچوونێکی جیهانی یە لەسەر بناغەی رەخنەگرتن لە کۆمەڵگەی سەرمایەداری، پیشەسازی مۆدێرن، دارێژراوەو پشت دەبەستێت بە بەها کۆمەڵایەتی و کەلتووری یەکانی پێش قۆناغی سەرمایەداری. دیارترین دوو بوار کە ئادۆرنۆ رەخنەی لێ گرتوون؟ بریتیتن لە قۆناغی رۆمانستیزمی کلاسیکی لە سەرەتای سەدەی نۆزدەداو ئەوەی لەکۆتایی سەدەی نۆزدەدا بە قۆناغی رۆمانتیکی نوێ ناودەبراو بەشێوەیەکی تایبەت لەنێوەندە ئەدەبی یەکاندا کاریگەریبوو و دەنگی دایەوە. ئەم دوو قۆناغە بۆ بۆچوونی ئادۆرنۆ سەبارەت بە پێشکەوتن گرنگی بنچینەیی یان هەیە هەرچەندە ئادۆرنۆ، سەرلەنوێ، بەجۆرێکی دیارو بەرچاو راڤەیان دەکاتەوەو لەچوارچێوەی فەلسەفەیەک دا دەیانخاتەوە کار کە لەدوا راڤەکردن و لێکدانەوەدا پابەند دەبێت بە نەریتی رۆشنگەری یەوە.

بەو شێوەیە ئادۆرنۆ دان دەنێت بە شەرعیەتی ئەو رەخنەیەی رێبازی رۆمانتیکی لە مۆدرێنیتی و رۆشنگەری گرتووە: رۆشنگەری ئەوەندەی پەیوەندی بە ئامرازخوازی و بنیاتنانی ئامرازەکانەوە هەیە ئەوا بەو ئەندازەیە تێکدەرو رووخێنەرە کە دوژمنە رۆمانتیکەکانی ئاماژەی پێدەکەن رۆمانتسیزم لە کۆنەپەرستانەترین سیماو شێوەیدا، بۆ نموونە لە سیمای کاسۆلیکی کۆنەپەرست دا، بەشێوەیەکی دادپەروەرانە رەخنە لە لیبرالیزمی رۆشنگەری دەگرێت لە کاتێک دا کە لیبرالیزمی رۆشنگەری وا پیشان دراوە لە رێگەی خستنە گەڕی پرۆسەکانی ئابووری بازارەوە ئازادی دەگۆرێت بۆ پێچەوانەکەی. لە هەندێک رووەوە ئادۆرنۆ بەهۆی دوژمنایەتی کردنی بەهاکانی سوودمەندی و یەقین گەری کۆمەڵگەیەکی مۆدێرن کە بە بازاڕو تەکنەلۆژیا کۆنترۆڵ کرابێت بەتەواوی نزیک بووەوە لە بە شدارکردنی نوخبەی کەلتووریی ماندارینەکانی ئەکادیمیای ئەڵمانی لەکۆتایی

سەدەی نۆزدەهەم دا. ئەمە حەقیقەتی هەڵویستی ئادۆرنۆ هەیە هەرچەندە رادیکاڵانە هەڵویستی جۆراوجۆری وەرگرت لە تێڕوانینە کۆمەڵایەتی‌یە مارکسیەکانی‌داو لە پابەندبوونی‌دا بە مۆدێرنیزمی ستاتیکایی‌و لە رەت کردنەوەی هەر گێڕانەوەیەکی ئیمتیازاتە ئەرستۆکراتی‌یەکانی رابردوو.

لەوانەیە ئەم هەڵویستە وادەرکەوێت کە ناکۆکە لەگەڵ تێگەیشتنی مارکسیانەدا بۆ پێشکەوتن. بەڵام {وەرگرتنی} ئەم هەڵویستە پابەندە بەوەی چۆن مارکس دەخوێنینەوە: دەقەکان هەڵگری خوێندنەوەی جیاوازن. بە بڕوای ئادۆرنۆ دەتوانرێ بەوشێوەیە لە رەخنەی مارکس لە پرۆگرامی گۆش تێبگەین کە ئەو بۆچوونەی {سەرەوە} رەد دەکاتەوە {واتە ئەو بۆچوونەی کە پێی وایە ئادۆرنۆ ناکۆکە لەگەڵ تێزە مارکسیەکاندا}:

ئەگەرچی رێبازی کارکردن وەك تەنها سەرچاوەی خۆشگوزەرانی کۆمەڵایەتی بەزەروورەت رێی خۆش کرد بۆ خۆش گوزەرانی‌یەکی بێکۆتایی: بەڵام لەلایەکی دیەوە مارکس دانی ناوە بە ئەگەری گەڕانەوە بۆ بەربەریەت. خوێندنەوەیەکی لەو جۆرە - کە گوڵبژێرکردنە بەڵام بە زەروورەت هەڵە نی‌یە - رێگە دەدات بە ئادۆرنۆ ئاڵۆزی‌و تەنگژەکانی لە نێوان پابەندبوونی قووڵ‌و دڵسۆزانەی بە پرۆژە مارکسی‌یەکەوە بۆ رزگارکردنی کۆمەڵایەتی‌و هاوسۆزی لەگەڵ رەخنەی کەلتوری لە پێشکەوتن، کەم بکاتەوە. ڤاڵتەر بنیامین ی هاورێی ئادۆرنۆ لەم چەند دێڕەدا مارکسی راڤەکردبوو، گومانیشی تێدانیە لەم بوارەدا نووسینەکانی بنیامین گرنگترین‌و بەردەست ترین سەرچاوەی ئایدیاکانی ئادۆرنۆ بوون. ئادۆرنۆ خوێندنەوەیەکی نووسینەکانی دوو نووسەری سەدەی بیستەم پێشکەش دەکات‌و ئەوانیش (ئاڵدۆس هاکسلی‌و ئوسواڵد شپینگەر) ن و ئەم

خوێندنەوەش بەکار دەهێنێت بۆ روون کردنەوەی بەهاو سنوورەکانی رەخنەیەکی بەو شێوەیە کۆنەپەرستانە کە لە پێشکەوتن دەگیرێت‌و پشتی بە بەهاکانی رابردوو بەستووە.

{لە هەردوو کتێبی مینیما مۆرالیاو دیالێکتیکی رۆشنگەری‌دا هاکسلی لەگەڵ یاسپەرز و ئۆرتیگائی گاسێت دا بەو شێوەیە وێناکراوە کە راڤەکەرێکی نموونەیی ئەو رەخنە کۆنەپەرستانەیە کە لە شارستانێتی گیراوەو {ئەو رەخنەیەش} لەسەر بناغەی نۆستالیژیا دارێژراوەو بە ناوی بەرگری کردن لە کەلتوور ئەنجام دراوە}.

ئادۆرنۆ ئەم راڤە کردنەوەی لە وتارێك دا پەرەپێداوە کە ساڵی ١٩٤٢ (سەرلەنوێ -کتێبی لەنێو بڵاوکراوەکاندا- بڵاوکرایەوە) و تیایدا ناوەرۆکی کتێبەکەی هاکسلی ((جیهانی نوێی ئازا)) هەڵدەسەنگێنێت. بە بۆچوونی ئادۆرنۆ رۆمانەکە گوزارشت کردنێکە لەو ترسەی کە بڕیارەکان هەستی پێدەکەن کاتێك رووبەڕووی نائارامی جیهانی دەبنەوە دەرەنجامی میکانیزمی درندەی ئاڵوگۆڕی بازاڕەو بە هیچ شێوەیەك بەرەنگاری ناکرێت. ئادۆرنۆ لەبەرخاتری راستگۆیی هاکسلی‌یە کە هیچ سازشێك لەبەرامبەر ئەو بیرۆکە منداڵانەیەدا ناکات کە پێی وایە زیادەڕەوی لە گرنگی دان بە شارستانێتی تەکنیکی بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیکی‌و لە رێگەی پێشکەوتنێکەوە ئەنجام دەدرێت کە بەرەنگاری لێناکرێت.. سەبارەت بە دۆخی ئێستای شارستانێتی‌یەکە کۆمەڵێك دەرەنجام دەخاتە روو کە راستەوخۆ شان بە شانی هێڵەکانی تەکنەلۆژیای خودی شارستانێتی‌یە تەکنیکی‌یەکە بە جۆرێك سروشتی درندانەی شارستانێتی‌یە تەکنیکی‌یەکە دەخاتە روو کە بەڵگەی ناوێت. سەرەڕای ئەوەش کتێبەکەی ئەوپەڕی شکستە. لایەنێکی کۆنەپەرستانەی هەیە: هاکسلی ناتوانێت لەو بەڵێنە تێبگات کە بۆ بەدیهێنانی

شارستانێتی بە مرۆڤ دراوە چونکە درك بەوە ناکات کە بە مادە کردن هەرچەندە لاوازوناتەواوبێت ئاراستەی پۆزەتیڤانەشی هەیە. هاکسلی لە پیورتیانیزمەکەیدا سەرکەوتوو نابێت لە جیاوازی کردن لەنێوان ئازادی سێکسیو کەمکردنەوەی بایەخی {ئەو ئازادیەدا}. هاکسلی خیانەت دەکات لە ئولفەتی خۆی لەگەڵ کۆن پارێزی رۆمانتیك دا کاتێك دێت مرۆڤ رووبەرووی ئامێرو مرۆڤایەتیش رووبەرووی تەکنەلۆژیا دەکاتەوەو بەهەڵە دەروانێتە ئەو سنوربەندی‌یانەی لەلایەن پەیوەندی‌یەکانی بەرهەم هێنانەوە سەپێنراون کە دەستەواژەی (شکۆمەندکردنی ئامێری بەرهەم هێن لەپێناوی قازانجدا باشترین گوزارشت لەخەسڵەتی مرۆڤو هێزە بەرهەم هێنەکان دەکات.

کتێبەکە ئەو تاك ویستی‌یەی کە توانای رەنگدانەوەی نی‌یەو ئەخلاقیاتی دوایین رۆژی نیهلیستیو رۆمانتسیزم ئاشکرا دەکات.. دەبێت رەخنەی لێ بگیرێت چونکە نەیتوانیوە تێرامان لە پراکتیك کردنێك بەرهەم بهێنێت کە دەیتوانی ئەو بەردەوامی‌یە بەدناوە بتەقێنێتەوە کە لە جیهانی ئەمرۆوە تا (جیهانی نوێی ئازا)ی خایاندووە کە خودی کتێبەکە وێنای دەکات.

بێگومان ئەم حوکمە بۆخۆی حوکمێکی قورسو تەواو ناشایستەیە کە دەوڵەمەندی‌و هێزی رۆمانەکە پشت گوێ‌دەخات. لە راستیدا وا دەردەکەوێت پێشەکی‌یەکانی رەخنەکە زیاتر ئائادۆرنۆی‌یانە بێت: بڵێی ئادۆرنۆ بیکێیت یان کافکای بەوە تاوانبار کردبێت کە نەیانتوانیوە ئایدیاکانیان موتوربە بکەن بە پیادەکردنێکی گۆڕاو؟ ئەم وتارە زۆر سەیرە ژمارەیەك پەرەگرافی ئەوتۆی لەخۆ گرتووە کە هێرشێکی توندتر لە هێرشەکانی لۆکاش بۆ سەر نیهلیزمی نووسینە مۆدێرنەکان بە بیردەهێنێتەوە نەك ستاتیکای ئەدەبی کە ئێمە دەیبەستینەوە بە فەیلەسووفی دیالێکتیکی نێگەتیڤەوە.. {واتە ئادۆرنۆ}.

شتێکی نیمچەحەتمی بوو دەبوایە ئادۆرنۆ بە هاوسۆزی‌یەکی کەمتر لەو هاوسۆزی‌یەی پیشانی‌داوە بۆ شپینگلەر مامەڵە بکات لەگەڵ هاکسلی‌دا. ئوسواڵد شپینگلەر پرۆسایی‌یەکی سۆشیالیستو (دواتر سۆشیالیستێکی نیشتمانی) بوو سەرەجام بوو بە خاوەن ئایدیایەکی {کۆنخواز}. شپینگلەر بێ‌هیچ سکالاکردنێك لەگەڵ چینی فەرمانڕەوادا هاوسۆز بوو و فەلسەفەکەشی شەرعیەتی سیستمی باوی ئەوساتەی دەنووسی‌یەوە. وەك کۆمت سوود مەندی ئاوێتەی میتافیزیك کردو ملی بۆ ئامۆرفاتی کەچ کردوبڕیاری دا بە ئاراستەی تەوژمەکەوە لە بکات. سەرەڕای ئەوەش شپینگلەر یەکێکە لە تیرۆداڕێژەرانی کۆنەپەرستی توندڕەو کە رەخنەکانی لە لیبرالیزم لە زۆر رووەوە سەلماندیان لە رەخنەی لایەنگرانی پێشکەوتن بالاترن چونکە هەرگیز رەخنەگرانی لایەنگرانی پێشکەوتنگەری ئەگەری گەڕانەوەیان بۆ بەربەریەت بە جددی وەرنەگرت.

ئادۆرنۆ پێی وایە لە بیرکردنی نووسەری‌کتێبی (تێکچوونی ژیانی رۆژئاوا) ((پاشەکشەوی خۆرئاوا))، پاش مردنی، شتێکە پاشاوی نی‌یە. شپینگلەر بە زەحمەت رکەبەرێکی دۆزیەوە کەهاوتای خۆی بێتو لە بیرکردنیشی دەرەنجامی خۆدزینەوە بوو. ئەگەرچی ئەو محازەرە رەخنەیەیە بخوێنینەوە کە تا ساڵی (١٩٢٢) ی ئەو نووسراوە دەبینین چۆن عەقڵی ئەڵمانی بەتەواوی هەرەسی هێنا کاتێك رووبەروو بووەوە لەگەڵ نەیارێك دا کەوا دەردەکەوت هەموو هێزی مێژووی راستەقینەی خۆی بە میرات وەرگرتووە. شپینگلەر هێندە ورد بوو کە لەسەر دەمی هەیمەنەی گەردوونی‌دا هەست بکات بە ئیزدیواجیەتی رۆشنگەری. هەموو دەست نیشان کردنەکانی وەك یەك دروستن: رەوشی کاروبارەکان لە ئەدەبو رۆژنامەنووسی‌داو لە هونەرەکانی جەنگو ئابووری‌دا بە تەواوی یەك

دەگرنــەوە لەگــەڵ دەســت نیشــانکردنەکانی شــپینگلەردا. ئەوانــەی بەرهەڵستی شــپینگلەر دەکەن زۆر بە زەحمەت دەتوانن وەك ئەو بە متمانــەوە بۆچوونـــەکانیان گەڵاڵــە بکـــەن‌و بڵاویکەنــەوە کــە ئــەو هــەیبوو بــە دروســتی کەلتورەکەی: تەنها وەڵام بـۆ شـپینگلەر لەلایـەن ئەوانەوە رادەگەیەنرێت کە مێژوو فرێیان دەداتە کــەنارەوەو دەیانســرێتەوە و لــە نــارەزایی نائومێدانەیاندا ئەو تەنــها ئومێدە هەیە کە دوا حوکم حوکمی قەدەرو دەسەڵات نابێت.

لەوانەیـــە ئـــەم زیادەڕۆییکردنـــە لـــە هەڵســـەنگاندنی شـــپینگلەردا هەڵوەســـتەمان پێبکات هەروەك چۆن لەوانەیە ئەو کەمکردنـەوە لە بایـەخی هاکسلی هەڵوەستەمان پـێ بکـات، بـەڵام هێشتا ئـەو دوو هەڵســەنگاندنە لەیـەکدی جیـاوازە بۆمـان ر وون دەکاتـەوە ئـادۆرنۆ تـا چ ئاستێك ئامادە بـوو ئـەو رەخنەیـە بـە جـددی وەربگرێت کە رێبازی رۆمانتیکی لە ئایدیۆلۆژیـای یەقین گەری پێشکەوتنی گرتووە. بـەڵام ئـادۆرنۆ بەشـێوەیەکی سـەراپاگیر سـەرەتا ئـەنتی رۆشـنگەرییەکانی ئـەو رەخنـە گرتنـە لـەپاڵ لایەنگیری پاشەکشە کـارو محافزکارەکـانی رەت دەکاتەوە. لە پەرەگرافێکی مینیما مۆرالیادا بە تەواوی شێوازی مامەڵەکردن و تێڕوانینی ئادۆرنۆ بۆ ئـەم رێبـازەی ئێسـتای بـیر ئاشـکرا دەکرێـت: یەکێك لەو ئەرکانەی رووبەڕووی هزر دەبێتەوە کە یەکێکە لە گرنگترین ئەرکەکان، ئەوەیە سـەرجەم ئـەوە مشـتومڕە کۆنەپەرسـتانەیەی لـە دژی شارسـتانێتی خۆرئـاوا خولقێـنراون بهێنێتــە خزمەتی رۆشنگەری‌و پێشکەوتن.

دەکـرێ سـەراپای فەلسـەفەی مێـژوو لای ئادۆرنۆ، بەتایبەتیش تێڕامانەکانی لە پێشکەوتن، بەو شێوەیە تێبگەین کە هەوڵێکە بۆ تێگەیشتن‌و درك پێکردنـی ئـەم پرۆگرامـە کەهـەرخۆی لەوانەکـەی سـاڵی ١٩٦٢ دا سـەبارەت بـە ((پێشـکەوتن)) بـەم شـێوەیەی لای خـوارەوە رایدەگەیەنێتەوە:

پێویستە تیۆری پێشکەوتن دان بنێت بـەو لایەنانـەی کـە پـەیوەندییان بـە زەمکردنـی پێشـکەوتنەوە هەیـە وەك رەگـەزێکی دژ بـەو میسۆلۆژیایانەی [چونکە] رەنگە بەبارەکەی تـردا [ئـەو لایەنانـەی زەمکـردن] ملـی بـۆ کـەچ بکـەن [واتە بۆ تیۆری پێشکەوتن].

شێوازێکی لـەو جـۆرە تـێڕوانینێك بەرامبـەر رابـردوو پـەیڕەو دەکـات کـە تـەواو جیـاوازە لـە شـێوازی ئــەو رۆمانتیکانــەی هــەوڵ دەدەن شکۆمەندییەکانی رابـردوو بگێڕنــەوە. بـەبڕوای ئادۆرنۆ مەبەست پاراستنی رابـردوو نییـە بـەڵکو مەبەست ئەوەیە لە هیواکانی رابردوو تـێ بگـەیت و درکیان پـێ بکـەیت. ئەمـەش ئـەوە دەگەیـەنێت هەرشتێکی جیهانی کۆنی پێش بۆرژوا تەنها لـەو حاڵەتەدا بەنرخ‌و بەهادارە کـە لەوانەیـە میکرۆبـی بڵاوبوونەوەی نوێ ئیحتیوا بکات.

## شڵەژانێکی بەردەوام

ئەوەی سەیرەو جـێی سەرسوڕمانە ئەوەیـە ئادۆرنۆ لە رەچاوکردنی ئەو رەخنانەی رۆمـانتیك لـە پێشـکەوتنی‌گرتووە سـەرنجی خـۆی تـەرخان کـردووە بـۆ ئەوانـەی بـە زمـانێکی کۆنەپەرست‌و محافزکارانــەو ئــەنتی شۆڕشــگێڕانە دواون. وا دەردەکەوێت ئادۆرنۆ بێ ئاگـابووبێت لـەوەی کە لــە هــەمان قۆنـاغی کـەلتووریدا رۆمانتیســـزم بۆخـۆی بـە زمـانێکی شـۆڕگێڕانە دواوە: دەنگــی رۆسـۆ، بلـەیك، ئێرنست بلـۆخ‌و ڤالتــەر بنیـامین دیـارترینی دەنگـەکانی بـوون. کـاتێك ئــەوە دەهێنینەوە بەرچاوی خۆمان کە لە پەرەسەندنی چەمکی ئادۆرنۆدا بۆ پێشکەوتن بەرهـەمی والتـەر بنیامین خاڵێك بووە سەرەڕای جیـاوازی نێوانیـان هەمیشـە ئـادۆرنۆ بـۆی گەڕاوەتـەوە ئیدی پشت گوێخسـتنی ئــەو نەریتــە شۆڕشــگێڕییەی رۆمانتسـیزم لــە هــەموو شـتێك زیـاتر مایــەی سەرسوڕمانە.

کتێبی ((چەند تێزێك سەبارەت بە فەلسەفەی مێژوو)) ی ساڵی ١٩٤٠ ی ڤالتەر بنیامین بەشێوەیەکی تایبەتی کاری لە ئەدۆرنۆ کردووە. تێزی نۆهەم گرنگی تایبەتی هەبوو، تیایدا بنیامین فریشتەی مێژوو دەنوێنێت و گەردەلوولێك بەرەو داهاتوو پاڵی پێوەدەنێت کە لە فردەوس دەری دەکات - گەردەلوولێك کە وێرانەیەك لەدوای خۆیەوە بەجێ دەهێڵێ و ئەم گەردەلوولە ناوی پێشکەوتنە. ئەم وێناکردنە مەجازییە بەشێوەیەکی تر لە پەرەگرافێکی ((دیالێکتێکی رۆشنگەری)) دا دووبارە کراوەتەوە: ئەو فریشتەیەی بە شمشێری ئاگرینەوە مرۆڤی لە فردەوس دەرکردو خستیە سەر رێگای پێشکەوتنی تەکنیکی هەر خۆی سمبولی ئەو پێشکەوتنەیە.

ئادۆرنۆ لە وانەکەی ساڵی ١٩٦٢ی دا ئاماژەدەکات بۆ تێزەکانی ڤالتەر بنیامین و ستایشیان دەکات سەبارەت بەو رەخنە کاریگەرانەی لە تێزی پێشکەوتن و لەو کەسانەی گرتووە کە لە رووی سیاسییەوە زۆر بەخێرایی بە پێشکەوتنخواز پۆلێن کراون. ئادۆرنۆ لە رەت کردنەوەی ئەو بۆچوونەدا کە پێی وایە دەکرێ پێشکەوتنی زانیاری و تەکنەلۆژیا لەگەڵ پێشکەوتنی مرۆڤایەتیدا پێناسە بکرێت خۆی لە ریزی ڤالتەر بنیامین دا حساب دەکات و ولانی ئەو دەگرێت و بە هەمان شێوەی بنیامین، ئادۆرنۆش قەناعەتی کردووەو قایلە بەوەی پێشکەوتنی راستەقینە ساتەوەختێکی رووخێنەر لە خۆ دەگرێت تەنانەت ئەگەر فۆرمێکی عەلمانیش بەخۆوە بگرێت. بەڵام ئادۆرنۆ وەك باوەڕێکی مێژوویی ئایین هەر تێکەڵکردنێکی ئەو دوو ساتەوەختە رەت دەکاتەوە: هەروەك سەینن ئۆگەستین زۆر پێشتر درکی پێکردووەو پێناسەی کردووە تێکدان شان بە شان لەگەڵ مێژوودا دەڕوات و نابێت تێکەڵی بکرێت.

بە بەراوردکردن لەگەڵ بنیامین دا، ئادۆرنۆ تێڕوانینێکی جیاوازی هەبوو بۆ پێشکەوتن بەڵام جیاوازییەك کە بە زەحمەت هەستی پێدەکرێت و تێڕوانینەکەی ئادۆرنۆ لە ساتەوەختێك دا گەڵاڵە کراوە کەلایەنی پۆزەتیڤی پێشکەوتنی رەچاوکردووە. بەهەرحاڵ بۆچوونەکانی ئادۆرنۆ ئاڵۆزییەکی بەردەوامی بەخۆگرتووە. لە راستیدا هەڵوێستی شێلگیرانەشی بەرامبەر رەتکردنەوەی چارەسەری ئەو ئاڵۆزییە توخمێکی بنچینەیی سەراپا شێوازەکەیەتی کە بەردەوام بە متمانە نەکردنی بە بە چەمك کردنێکی ئەبستراکت، چەمکێکی سەپاراگیر بۆ پێشکەوتن رەت دەکاتەوە. ئادۆرنۆ لەبەر ئەوە پێشکەوتن ناخاتە نێو سەنتەری بیرکردنەوەیەوە چونکە بەتەواوی پابەندە بەو تابۆ دیالێکتیکییەوە کە لەسەر چەمکە پیرۆزەکان دانراوە [شێوازێك لەکارکردن] کە رۆحی رەخنەلەخۆگرتنی رۆشنگەری لەخۆیدا پوخت دەکاتەوە، ئەو رۆحەی کە ئادۆرنۆ سەرەڕای هەموو شتێك هەرپێوەی پابەند بووە.

دەتوانین لەم گۆشە نیگاوە سەیری نووسینەکانی ئادۆرنۆ بکەین و ئەو راستیە ببینین کە ئەوەندەی بەخەسڵەتی دیالێکتیکێکی راستەقینەدا دەناسرێنەوە ئەوەندە پێیانەوە دیارنییە لە نێوان حوکمی پۆزەتیڤ و نێگەتیڤ دا ئەمسەرو ئەوسەر بکەن و نووسینەکانیشی لە کەلەپووری دیالێکتیکی رۆشنگەریدا بەشداری دەکەن و گەورەشی دەکەن. ئەم دیالێکتیکە لە نووسینەکانی سەرەتای سالانی (سی) ئادۆرنۆدا بەکارهێنراوە، بەتایبەتی لە چوارچێوەی ئەو تەحەفوزاتانەی ئادۆرنۆ لە دووتوێی ((حەقانیەتی فەلسەفی)) سەبارەت بە ئەقڵانیەتی خۆرئاوایی گوزارشتی دەکات: لەوانەیە لە بازنەکانی ناوەوەی قوتابخانەی فرانکفۆرت دا پاش بنیامین، ئادۆرنۆ بەهێزترین گومانی بەرمبەر دینامیکی پێشکەوتنگەری ئەقڵ پیشان دابێت. لەدیالێکتیکی رۆشنگەری دا بەتەواوی گوزارشت

لەم بەدبینی‌یە دەکرێت و لەوێدا پێشکەوتن وەك بەرجەستەکردنی هەیمەنەی ڕێبازو لایەنگرانی پێشکەوتنگەری دەردەکەوێت. ئەم ئیشە دەرەنجامی هاریکاری ئادۆرنۆیە لەگەڵ هۆرکهایمەردا کە لە نووسینەکانی دواتری‌دا وەك ((کۆتایی ئەقڵ)) ئەم تێڕوانینە بەدبینی (مێژوویی – فەلسەفی) یە بە تەواوی بەرجەستە دەبێت.

هەرچۆنێك بێت هۆرکهایمەر کەمتر ڕاستەوخۆ بایەخی دەدا بە ناواخنە ئەپستمۆلۆژیەکانی ڕەخنەی ڕۆشنگەری لەکاتێك دا لای ئادۆرنۆ لە سالآنی چلەکان بەدواوە بەردەوام ڕەنگیان داوەتەوە.

بایەخ پێدانی لەم جۆرە، کە ڕووبەڕووی فەلسەفەو ئەو ئەرکە دەبێتەوە کە دواجار، لەسەر مەتەڵی خۆی **Aporia** دەبێت، ئەو چوارچێوەی کارکردنە دەستەبەردەکات کە تیایدا ئایدیای دیالیکتیکێکی پێشکەوتن پەرەی پێ‌دەدرێت.

کتومت وەك چۆن دیالیکتیکەکانی ڕۆشنگەری دیدێکی بەرایی دادەنێن لە یەك کاتدا ناوەخۆیی‌یەو ڕەخنەش دەگرێت لە ڕۆشنگەری بەهەمان شێوە دیالێکتیکەکانی پێشکەوتن تێڕوانینێك پەیڕەو دەکەن کە ڕەخنە لە ئایدیای پێشکەوتن دەگرێت بێ ئەوەی ئەو ئایدیایە لەودیوی ئاسۆگەی بە چەمك کردنەوە ون بکات.

ئادۆرنۆ دێت و بە پەیڕەوکردنی ئەم هێڵانە ڕەخنەکانی بنیامین لە پێشکەوتنی سۆشیالیست دیموکراتەکان شی‌دەکاتەوەو پەیڕەویشی دەکات. بەو پێ‌یە پێشکەوتن ((بنیامین دەڵێت)) پێشکەوتنی مرۆڤایەتی بوو ((نەك پێشکەوتنی تواناکانی‌و زانیاری بێت)). ئادۆرنۆ بەشێوەیەك ئەم پەرەگرافە دەخوێنێتەوە وەك ئەوەی ئاڕاستەی چەمکێکی دیاری‌کراوی پێشکەوتنی بکات نەك هەوڵ بدات پێشکەوتن لە تیۆری ڕەخنەیی ون بکات. تیۆری ڕەخنەیی ناتوانێت بەبێ ئایدیای پێشکەوتن کە ئەو ئومێدە دەدات شتەکان باشتر دەبن‌و ڕۆژێك دێت مرۆڤ دەتوانێت ئازادانەتر هەناسە بدات، کارێکی ئەوتۆبکات. بەبێ پێشکەوتن چاکە لە ئارادانیەو هیچ شوێنەوارێکی چاکە دیارنی‌یە. لەوەش زیاتر پێشکەوتن لە تێکۆشاندا یە لە دژی سەرکەوتنی یەکجارەکی ئەوپەڕی خراپەو هەمیشە لە جەنگدایە لە دژی مەترسی گەڕانەوەو هەوڵیش دەدات خۆبپارێزێت لەوەی بەکارەساتی تەواو ناودەبرێت.

**بە ماددەکردن لەبیرکردنە**

دەست نیشان کردنی دیالێکتیکەکانی ڕۆشنگەری‌و دیالێکتیەکەکانی پێشکەوتن هەڵوێستێکی ئەخلاقی‌یە کە پێوەرەکەی نە ئاستی پێشکەوتنی تێگەیشتنی مرۆڤایەتی‌یەو نەتوانای قبووڵ کردنی ئەو پێشکەوتنەیە بەڵکو ئەو ئاستەیە کە تیایدا ئەو بەڵێنی قبووڵ کردنە بەدی هێنراوە.

نکووڵی‌کردن لە جیابوونەوەی پێشکەوتن لە زانین و [جیابوونەوەی] تێگەیشتن لە پێشکەوتنی مرۆڤایەتی تیشك دەخاتە سەر جووت کاراکتەری داینامیکێك کە هەمیشە توانای خۆی لەیەك کاتدا بۆ ئازادی‌و واقعی سەرکوت کردن پەرەپێ داوە. هەموو پێشکەوتنێك کە لەلایەن شارستانێتی‌یەوە ئەنجامدراوە پێکەوە لەگەڵ هەیمەنەدا کە خەسڵەتی نەهێشتنی ئەو پێشکەوتنەیە نوێ‌کراوەتەوە.

جووت کاراکتەری پێشکەوتن لە بەرایی پەرەسەندنی تەکنەلۆژیایی و زانستی‌یەوە بەرچاو دەبێت. لە هەر کەشو هەوایەك دا بێت– لە سایەی پێشکەشکردنی ئامێردا، یان پەرەسەندنی گەیاندنەکانی میدیادا بێت یان باشترکردنی دابەشکردنی کاردابێت هەمیشە ئەو ئەگەرە هەیە پێشکەوتن بگۆڕێت بە گەڕانەوە (بۆ دواوە) ئادۆرنۆ لە مینیما مۆرالیادا مشتومڕی ئەوە

دەکات هەرکاتێك مەڵۆی ئەو ئامرازە تەکنیکیانە وەربگرین کە لە ئێستادا لەبەردەستماندان ئەوا ئەم کەڵەکە بوونەی ئەگەرەکانی گەڕانەوە لەنێو ئەگەری پێشکەوتندا بەتەواوی دەردەکەوێت. ئەگەر نموونەی بەرهەم هێنانەوەی میکانیکی رەچاو بکەین بۆمان روون دەبێتەوە کە پێشکەوتن لە پرۆسەکانی بەرهەم هێنان دا لەسەر حسابی ((بەرهەم هێنان بەگوێرەی پێداویستی)) روودەدات. لە راستیدا پرۆسە نوێیەکان دێن و بالادەستی خۆیان دەسەپێنن و پێداویستیش خۆی لەگەڵیاندا دەگونجێنێت. هێشتا لەوەش خراپتر هێندەی پەیوەندی بەشتە ماددی و کەلتوورییەکانەوە هەبێت پێشکەوتن بەوشێوەیە حساب نەکراوە کە تا چ ئاستێك تەکنیکە بەرهەم هێنەکان پێداویستی مرۆڤایەتی دابین دەکەن بەڵکو وەك کرۆك لەناوخودی پرۆسەی بەرهەم هێن دا، بەچاوپۆشین لەوەی چی بەرهەم دەهێنێتەوە، حسابی بۆ کراوە.

پێشکەوتنی تەکنیکی بە مۆدێرنیزەکردنی رۆحی حساب کردنێکی ئەقڵییانە دەست نیشان دەکرێت. سەرەنجام کۆمەڵگە مۆدێرنەکان شتێکی تایبەتی کۆمەڵگاکانی پێش قۆناغی مۆدێرنیتی یان دۆڕاند: پاشەکشەو داماڵین روویان دا. لەژێر کاریگەری پێشکەوتنی تەکنیکیدا ئاماژەکانی مرۆڤ هەموو خەسڵەتێکی سڵەمینەوەو وشیاری و پوختەیی یان دۆڕاندو ئەزموون بەدەست هێنان پاشەکشەی کردو وشکی کردو بەهەرەش لەناوچوو. بەدەستەواژەیەکی تر پێشکەوتن ئەوە دەگەیەنێت کە ((مرۆڤایەتی رەهەندە مرۆڤایەتییەکەی کەلتووری دۆڕاند)).

ئەدەبی مەزنی مۆدێرنیزم – بەرهەمی نووسەرانی وەك بیکێت و کافکا – شایەتی دەستەوسانی دارمانی خودێتی مرۆڤایەتی لە ژیانی مۆدێرن دا لەخۆ دەگرێت. ئەوە بۆیە ئادۆرنۆ ستایشی ئەوانە دەکات کە لە قۆناغی پێش سەرمایەداریدا ماون و دەکرێ تا ئێستا لە ئەورووپای سەدەی بیستەم دا بدۆزرێنەوە کە بە پێچەوانەی باکووری ئەمریکاوە سەراپاگیر مۆدێرنیزە نەکراوو. بۆنموونە لە ئەڵمانیا چەندین دامەزراوی هونەری و کەلتووری وەك ئەکادیمیاو شانۆکان و مۆزەخانەکان هێشتا لە چنگی میکانیزمی بازاڕ بەدوورن: ئەم دامەزراوانە کەلەپووری رەوای سەردەمی رەهایین و خراونەتە ژێر دەسەڵاتی سیاسییەکانەوە کە سەربەخۆیی خۆیان لە چنگی ئەو هێزانە پاراستووە کە بازاڕیان بەشێوازی پاوانخوازی شازادەو خاوەن موڵکەکانی قۆناغی فیوداڵی پاوان کردووە. لە ئەمریکا بەپێچەوانەوە دژایەتییەکانی ناوخودی پێشکەوتن لەهەموو ئەو رەفتارەنامرۆڤانەیاندا ئاشکرایە کە بە چاو دەبینرێ. لەوێ کەمایەسییەکی تەواو لەلاف لێدان بەو توخمە ناموشەرەفەوە هەیە کە ئەقڵی فیوداڵی پێی وایە لە پەیوەندی ئاڵوگۆڕ کردن و لایەنی دیموکراتی هاندەری قازانج دایەو بۆخۆی بەشداری کاریگەرانە دەکات لە پاراستنی ئەنتی دیموکراسی و ناعەدالەتی ئابووری و پاشەکشەکردنی مرۆڤ دا. هیچ کەسێك ناتوانێت بیر لەوە بکاتەوە ئەو شتانە هەن کە ناکرێ لەچوارچێوەی بەهای ئاڵوگۆڕکردنیان دا گوزارشت بکرێن.

کت‌ومت چۆن پێویستە ئەقڵ کورت بهێنێت لە دەستەبەرکردن و بەدیهێنانی پەیوەندی خۆیدا ئەگەر بەر بەقبول کردنی ئامانجەکانی گیرا بە هەمان شێوە پێشکەوتنی تەکنەلۆژی کە ئامرازی ئەقڵە بۆ گوزارشت کردن دەگۆڕێت بۆ بالادەستی بڕوای لایەنگرانی پێشکەوتن لە هەرکاتێکدا پەیوەندی بەو ئامانجانەوە نەما کە بڕیابووە خزمەتیان بکات. لەم بوارەدا ئەوە پەرەسەندنی زانست یان تەکنەلۆژیا نییە کە رێگە دەدات بە ئامێرێك ببێت بە ئامرازی هەیمەنەکردن بەڵکو

ئەوە پەیڕەوکردنی خودی ئامێرەکانە بۆ ئامانجی دەسەڵات کە ڕۆڵی ئەوە دەبینێت ڕێگە بە گۆڕان بدەن. قۆرخ کردنی وشیاری دەستەجەمعی لەلایەن ئەوەوەی کە ئادۆرنۆ بە پیشەسازی کەلتوور ناوی بردووە لەپاڵ بەکارهێنانی پێشکەوتووترین تەکنەلۆژیا لەلایەن بەربەریەتی فاشیستەوە دوو لایەنی گرنگو زەرووری ئەم هەڵگەڕانەوەی پێشکەوتنی زانستی پێك دەهێنن.

هەرچۆنێك بێت جووت کاراکتەری پێشکەوتن بە تەنها مەسەلەی پێشێل کردنی زانست نییە، مەسەلەیەکی سەرەکی تر بریتییە لە ئامادەگی لەنێو ڕەگو ریشەی هەمان ئەو پرۆژەیەی زانستدا کە دەیەوێت مرف لە خەسڵەتە ئینسانییەکان دابماڵێت.

ئادۆرنۆ و هۆرکهایمەر لە گێڕانەوەی دۆزینەوەی دیالێکتیکی ڕۆشنگەریدا بۆ سەر سەرهەڵدانی ئەقڵی خۆرئاوا هێلکاری ڕەوتێکیان بەرامبەر هەیمەنەی پێشکەتنگەری کێشاوە کە ئەوان وا یانبینی تەواو وابەستەیە بە دان پیانانی دوو لایەنی دامەزرێنەری پرۆژەی زانستییەوە:
کورتکردنەوەی جیاوازی چۆنایەتی بۆناسنامەی چەندایەتیو ((کە لەو دەستەواژەیەدا دەسەڵات دەگەیشتە لوتکە: زانست پێوانەیە)) هەوڵ دان بۆ سەپاندنی دەسەڵات بەسەر سروشت دا بەئامێرمۆنۆپۆلکردنی سروشتی سەرسەختانە ڕێگەی خۆش کرد بۆ تێڕوانینێکی ئامێرگەرییانەی مرۆڤ هەروەك چۆن گۆڕانی جیهان بۆ تەنها ئامانج ڕێگەی خۆ شکرد بۆ بەماددەکردنی پەیوەندییەکانی مرۆڤ کوێربوونی مرۆڤ لە ئاست ئازارو ئەشکەنجەکانی سروشتی کۆیلەکراودا کە ئەو کۆیلە کردنەی سروشت بۆخۆی مەرجێکی پێویستی پێشکەوتنی زانستییە، و بەڵام وەك بڵێی سروشتی ستەملێکراوو چەوسێنراوە تۆڵەی خۆی دەکاتەوە [ئەوا ئەمانە]، ڕێگەی خۆش کرد بۆ کوێربوونو نابینابوونی مرۆڤ لە ئاست ئازارو ئەشکەنجەی برائیسانەکانیدا. ئەم راڤەکردنە هاوچەرخانەیە هەرچەندە ئادۆرنۆ و هۆرکهایمەر هێندەی بیریان لەو شێوازە دەکردەوە کە تیایدا مرۆڤ بەجۆرێکی کارەساتبار نالاندوویەتی بەهۆی زەلیل بوونیەوە نەك هەر لەبن دەستیسروشت دا کە دەسەڵاتیان بەسەردا سەپاند بەڵکو لەناوخۆشیاندا کە پەیوەست بوون بە سروشتەوە هێندە بیریان لە پرسی ژینگە نەکردۆتەوەوە.

پێشکەوتن بە لەت کردنی خورافەکانی ڕێکخەری ڕۆحی گەردوون (ئەمنیمیزم) دەستی پێکرد، کە بەوپێیە واتە بە پێی ئەمنیمیزم شتەکان ڕۆحێکیان هەبووە، و بە گەیشتنی بۆ ژێر دەسەڵاتی جادوویەکی بەهێزتر کۆتایی هات – خورافەیەك کە تیایدا ڕۆحی مرۆڤ گۆڕدرا بۆ شت. مۆرفی مۆدێرن کە یەکێتی دێرینی خۆی لەگەڵ جیهانی سروشتیدا لەبیرچوو بە سیحر لێکراوی مایەوە: ئادۆرنۆ و هۆرکهایمەر لەوباوەڕەدان بوون هەمیشە بەماددەکردن لەبیرکردنو لەبیرچوونەوە دەگرێتەوە.

ئادۆرنۆ لە ڕەچاوکردنی پێشکەوتن دا هەمیشە بیرۆکەی گەڕانەوە بۆ سروشت دووبارە دەکاتەوە، هەندێك جار وەك ڕەنگدانەوەی تۆڵەی سروشتی ستەم لێکراو و هەندێك جاریش وەك پێداگرتن لەسەر پێویستی ئاشت بوونەوە. لە جوولێت یان ڕۆشنگەریو ئەخلاق [کە فەسڵێکی دیالێکتیکی ڕۆشنگەرییە] بیرۆکەی گەڕانەوە بۆ سروشت بەو شێوەیە نەخراوەتە ڕوو کە گەڕانەوە بێت بۆ ڕەوشتێکی بەر لە شارستانێتی یان هێمایەکی لەو شێوەیەی بۆ بکات بەڵکو گەڕانەوە بۆ قۆناغێکی خودی شارستانی رادەگەیەنێت.

((جوولییێت (بەزاراوەی فەلسەفی) نە لیبیدۆیەکی ئازادو نە لیبیدۆیەکی سەرکوت کراو بەرجەستە دەکات بەڵکو خۆشی (سعادة) ڕووناکبیر لە گەڕانەوەدا بەرجەستە دەکات،

خۆشی‌یەك كە خۆشی هێرش كردنە بۆ سەر شارستانی بە چەكەكانی خودی شارستانی.

هۆركهایمەر لە كتێبی ((گیرانی ئەقڵ)) دا بەشێوەیەكی جیاواز گوزارشتی لەوە كردووە ئەو لە كتێبەكەیدا فاشیزمی وەك هەستێكی شەیتانی هاوزەمانی ئەقڵو سروشت وێناكردووە، تەواو پێچەوانەی ئاشت بوونەوەی ئەو دوو جۆگەلەیەیە كە هەمیشە فەلسەفە خەونی پێوە بینیوە.

دەكرێ چارەنووسی ژنان لە ژیاری مۆدێرن دا باشترین نموونە بێت بۆ داماڵینی مرۆڤ لە خەسڵەتە ئینسانیەكان كە بە بۆچوونی ئادۆرنۆ داماڵینی مرۆڤ لە خەسڵەتە ئینسانی‌یەكان مەرجی سێ‌یەمی پێشكەوتنە پاش دوو مەرجە پێش وەختەكەی كە بریتین لە: رەتكردنەوەی جیاوازی چۆنایەتی‌و هەوڵدان بۆ سەپاندنی دەسەڵات بەسەر سروشت دا. ژنان كە هەڵگری كۆمەڵێك هێمای ئەوتۆن لەلایەن سروشتەوە سەپێنراون‌و ناكرێ بسرێنرێنەوە جیاوازی‌یەكی ئەوتۆی دروست كردووە ناكرێ بەرەنگاری بكرێت‌و ئیدی ژنان دەبن بە ئامانجی هەڵبژاردەی ویستی سەپاندنی دەسەڵات.

ژن وەك نوێنەری سروشت لەو شارستانێتی‌یەدا كە شكۆمەندیەكەی لە سەركوت كردنی ژنان دایە، دەبێت بەهەوێنی پۆلێن كردنێكی وەهمی كە هەرگیز كۆتایی نایەت‌و لە هەمان كاتیش دا دەبێتە هەوێنی تووش بوون‌و گیرۆدەبوونێك كەهەرگیز كۆتایی نایەت.

تا ئێستا ژن بەرچاوترین هێمایە بۆ هەردەم مەحاڵی سەربەخۆبوونی مرۆڤ لە سروشت‌و ئیدی ژن رقێكی بێ‌سنوری ئەوتۆ بەسەرخۆی‌دا دەهێنێت كە قووڵی ئەو رقە زیاتر لە توندو تیژی سادی دا نەك لەخۆ دەرخستنی خێرخوایانەی باوكسالاری بۆرژوادا دەردەكەوێت. مل پێ كەچ كردنی ژنان رەمزێكە بۆ چارەنووسی مرۆڤی مۆدێرن لە كۆمەڵگەیەك دا كە رق‌و بەماددەكردن حوكمی دەكەن. ژن كە رێگەی نادرێت، وەك چۆن پیاوان لە تاك ویستی خۆیان دابڕاون، بگاتە تاك ویستی خۆی تەنها نموونەیەكی توخمەكەی خۆیەتی‌و بە گۆشەگیری یان دابڕانیان لە یەكتری ناسنامە بەیەكتری دەبەخشن. هەروەك چۆن لەگەڵ گەلانی راستەقینەی دەوڵەتە كۆلۆنیالكراوەكان یان لەگەڵ جوولەكە لەنێو ئاری‌یەكان دا روودەدەدات بەوشێوەیە بێ دیفاعی ژنان ناونیشانی یاسایی چەوساندنەوەو سەركوت كردنیانە. لەبەرئەوەیە كە ژنان وەك كەمینە سەیردەكرێن تەنانەت لەو شوێنانەش دا كە زۆرینەی راستەقینەی دانیشتوان پێك دەهێنن. ئەم بێ دەسەڵاتی‌یە پێكەوە لەگەڵ دوورخستنەوە یان جیاكردنەوەی ژنان لە هەر پیادەكردنێكی دەسەڵات داخرانی ژنان بەرووی سروشت دا دەسەلمێننن. بەهەرحاڵ داخران بەرووی سروشت دا وەك سروشتی ژنان بۆ خۆی بەرهەمی سەركوت كردن‌و چەوساندنەوەیە. ئەوەی لۆژیكی باوكسالاری‌و بۆرژوا دروستی دەكەن لە سروشت دا ((لە پەڵەی رەشی شیواندنێكی كۆمەڵایەتی)) بەولاوە هیچی تر نی‌یە: دوور لە خۆبەستنەوە بە ((غەریزە)) ەوە مێ‌بینەیی بریتی‌یە ((لەو شتەی هەموو ژنێك بەهێزی ماسوولكەیی زۆر لەخۆی بكات ببێ)) بە دەستەواژەیەكی تر ((ژن وەك بوونێكی سروشتی ئیدیعاكراو بەرهەمێكی مێژووە كە هەرخۆی ژن مەسخ دەكات)).

ئەمە هەڵسەنگاندنێكی تەواو بەدبینانەیە. پێشكەوتن بە دوور لەوەی وەك توخمێكی روخێنەرو تێكدەر تر لە توخمەكانی سروشت دابنرێت ئێمەی هێناوەتە بەردەم هەرەشەی دواتێكدان‌و رووخاندن. هیچ مێژوویەكی گەردوونی نی‌یە كە لە هەمەجیەتەوە دەستی پێ‌بكات‌و رێگە بۆ شارستانێتی ئینسانی خۆش بكات.

ئادۆرنۆ لە (دیالێكتیكە نێگەتیڤەكان)دا بەناخۆشی‌یەوە ئەوەی تێبینی كردووە، بەڵام زۆر

پێدەچێت مێژوویەکی گەردوونی هەبێت کە لە مەنجەنیقەوە دەست پێبکاتو ڕێگە بۆ بۆمبی ئەتۆمی خۆش بکات. ئەم هەڵسەنگاندنە بەدبینانەیە پێشینەی خواستی نائومێدی ئەدۆرنۆیە بۆ ئاشت بوونەوە لەگەڵ سروشت دا خواستێك کە لەسەر بناغەی تێڕوانینێکی نۆستالیژانە بۆ ڕابردوویەکی دووردارێژراوە کە تیایدا مرۆڤ بە هەماهەنگی لەگەڵ سروشت دا ژیاوە. ئەگەر لایەنی لاسایکردنەوەی هونەری ڕەهەندێکی یۆتۆپی هەبێت ئەوا لەبەرئەوەیە کە لاسایکردنەوە یادگارێکی ئەو هارمۆنییە دۆڕاوە دەپارێزێتو ئەو ئەگەرەش بەرجەستە دەکات کە ڕۆژێك ئەو هەماهانگییە دەگێڕدرێتەوە. لاپەڕەکانی دیالێکتیکی ڕۆشنگەری پڕن لە یادەوەری یان یادەوەری خۆشی سەرەتایی کە زۆر دەمێکە دۆڕێنراون، ئەو یادەوەرییانە یادەوەری قۆناغێکی پێش مێژوون کە نە دیسپلینو نە دەسەڵاتی دەزانی. بە هەرحاڵ وەك مارتن جای بەشێوەیەکی دروست تێبینی کردووە ئادۆرنۆ (بەو تۆنە نۆشالۆژیانەیەوە) داوا ناکات ئاشت بوونەوەیەکی تەواو لەگەڵ سروشت بەدی بهێنرێت و شوناسێکی گشتی بۆ سورشت بگەڕێتەوە. ناسنامەیەکی لەو جۆرە ئەگەر لە توانادا بێت بگێڕدرێتەوە ئەوا پەسەندو ئارەزوو ناکرێت: مەبەست ئەوە نییە مرۆڤ بکەینە ئامانجێك بۆ سروشت بەڵکو مەبەست ئەوەیە هێندەی لە توانادا بێت یادەوەری یەکێتی بنچینەیی لەگەڵ سروشت دا بپارێزین وەك چارەسەرێکی پەسەندکراو لە دژی جادووی شوومی بەماددەکردن. نابێت ئەوەندەی خودی سروشت بەرهەڵستی دەسەڵات دەکات هێندەش یادەوەریی سروشت بەهەڵستی بکات.

ئادۆرنۆ پێ لەسەر ئەوە دادەگرێت کە پێویستە سوود لە خراپەکانی پێشکەوتن وەربگیرێت لەچوارچێوەی سوود وەرگرتن لە هێزەکانی خودی پێشکەوتن بەڵام پێویستە ئەم سوود وەرگرتنە هەرگیز بە گێڕانەوەی ڕەوشەکەی پێشووو نەبێت. ئادۆرنۆ لە ڕەت کردنەوەی ڕاڤەکردنی وێناکانی گەڕانەوە بۆ ڕابردوو خەمی پاراستنی بەڵێنو توانای قبوڵکردنی پێشکەوتنیەتی، بایەخ بەوە دەدات یادەوەری ئەو ناعەدالەتیانەی پێشوو بە زیندوو بهێڵێتەوە کە پێشکەوتن وەك بەرامبەرێکیان خۆی هەڵکۆڵیوە. بەڵێنی ئەوە هەبوو کە جیهانێکی باشتر دێت کە تیایدا چیتر برسێتی وجودی نابێت هەروەها بەڵێنی ئەوەش هەبوو کە پێشکەوتن توخمێکی سۆشیالیستی تێدا دەبێت بەلای هەموو کەسێکەوە ئەوەی دەگەیاندە کردەوە کۆمەڵایەتیەکان بەڕووی هەموو کەسێك دا کراوە دەبن، تەنانەت لۆژیکی چەندایەتی لەنێوچوارچێوەی خۆی بەڵێنی ئەو ئایدیاڵەی هەڵگرتبوو کە ئاڵوگۆڕو ناسنامەی بیرکردنەوەو حەماسەتی هاوشانیان بۆ هەڵسەنگاندنی بەراوردکارانە ئایدیاڵێکی ئازادو دادپەروەرانە دەبێت تەنانەت ئەگەر ئەو ئایدیاڵە لە ڕاستیدا وەك بیانوویەك خزمەتی بەناعەدالەتی کردبێت. لە ڕاستیدا هەڵسەنگاندنی بەراوردکاری هێندەی هەڵسەنگاندنی چەندایەتی بگرێتەوە بۆئەوە بەکارهێنرا جیاوازی چەندایەتی لە سێتی دەست نیشان کردنە پێوەرییەکان دا کەم بکاتەوە لەکاتێکدا هەر شتێك ملی کەچ نەکردووە بۆ ئاسایی کردنەوەی چەندایەتی ڕاستەوخۆ دووخراوەتەوە بۆ ناو ڕەوشی ئەوانی تر و ئیدی بەراورد ناکرێ، بەڵام هەرچۆنێك بێت هیچ بناغەیەك نییە کە بیکەینە پێوانەی وەك یەك بوونی شەرعیو یەکسانی ئەو توانایەی هەموو مرۆڤەکان. ئەوە پڕەنسیپی ناسنامەیە شەرعیەت دەدات بە بەراورد کردن لە نێوان مەوقعی کۆمەڵایەتی دەسەڵاتداران و ئەوانەی دەسەڵاتداران دەیانچەوسێننەوە ئیدی ڕێگە دەدات بەوەی دواییان بڵێن: هەروەها ئێمەش... و لە مەدا ئەو پڕەنسیپە پەیوەندی نهێنی بە

مـەیلی دژە دەسـەڵاتدارێتی ئەقڵـەوە ئاشـکرا دەکات کە وەك ئادۆرنۆ و هۆرکهایمەر تێبینییـان کرد خزمـەتگوزاری هـێزی دەسـەڵاتە تائـەوەی خزمـەتگوزاری ئایدیۆلۆژیاکـانی سـەردەمە دێرینـەکان بێـت. لـە راسـتیدا ئـەم گـوڕزەی سـرەوێنرایە شـەرعیەتی دەسـەڵات تـاك پێشکەوتنێك پێك دەهێنێـت کـە لەوانەیـە لـە مێژوودا بەدی هێنرابێت، چونکە وزەی بەخشی بە هەموو راپەڕینێك لەدژی ناعەدالەتیو سەرکوت کردن. بـەبۆچوونی ئـادۆرنۆ دەسـتبەرداربوونی بەراوردکرن لەسەر بنچینەکانی رێزێکی ئیدیعاکراو بۆ ئەو توخمەی چەندایەتی کە ناکرێ ریشـەکێش بکـرێ پاسـاوێك دەبێـت بـۆ گەڕانـەوە بـۆ ناعەدالەتییە کۆنەکان. هەموو هۆیەك لە ئارادایـە بۆئەوەی لە کاتی ئێستای خۆمان دا بایەخ بدەین بـەو وریاکردنەوەیـە لـەکاتێك دا مـافی جیـاوازی دەبێـت بـە هـاواری کۆکـراوەی نایەکسـانیو رەگەزپەرستیو ترس لە بێگانە.

### دژە پێشکەوتن وەك نائومێد دەبێت

هێنـدەی پـەیوەندی بـە مێـژووەوە هـەبێت دیـالێکتیکی پێشکەوتن بـە شـێوەیەکی فراوانـتر نێگەتیڤانـە هەڵدەسـەنگێرنێت. لەبەرئـەوەی مێـژووی راسـتەقینە بەرهـەمی ئەشـکەنجەی راستەقینەیەو ناکرێ بە مەبەستی گونجان لەگـەڵ زیـادبوونی ئامرازەکـانی رەتکردنـەوەیدا کـەم بکرێتـەوە لەبەرئـەوەی درك کـردن بـە خەسڵەتەکانی چـەمکی پێشـکەوتن تەنـها وەك توانایەك و وەك بەڵێنێك مایەوە. لێرەوە ئـادۆرنۆ دەگاتـە ئـەو دەرەنجامـەی کـە پێویسـتە هـەر فەلسـەفەیەکی پۆزەتیڤی مێژوو رەت بکەینـەوە کە کۆتـایی گـەرێو یاسا پێشتر دامـەزراوەکانو پشت بەستن بەکاتییەتی پـەیڕەو دەکات. بـەڵام بە دڵنیاییەوە ئەگەر مێژوو بەو شێوەیە سەیری نەکرێت کە پێشکەوتنێکە بەرەو ئازادیو رزگـاری ئـەوا ناشـتوانرێت بـەو شـێوەیە سـەیر بکـرێو ببینرێ کە شۆڕبوونەوەیەکی پلە بە پلەیە بـەرەو دۆزەخ. ئەم تێڕوانینەش ئەگەری پارچە پارچە کردن لـەخۆ دەگرێتو دەشکێتەوە نـاو کۆرسـی پێشـووترو بـە رووی چـەمکێکی تـەواو جیـاوازدا دەکرێتـەوە. بـۆ فەیلەسـووفێکی قوتابخانـەی فرانکفۆرت پـاش داشوو هێرۆشـیما هەرەشـەی ناواخنی بۆچوونێکی لـەو جۆرە تـەواو بـەرچاو و بینراو بوو. بەڵام تواناو دەفرەت هەبوون بـۆ ئـەو سـاتەوەختانەی لەلایـەن ڤاڵتـەر بنیـامین ی برادەری ئادۆرنۆ وە شکۆدارکرا. لـە تێڕوانینێکی لـەو جـۆرەدا بـۆ مێـژوو، رابـردوو لـە هەرسـاتێك دابێـت دەتوانێـت دەرەتـانێك بۆخـۆی بدۆزێتـەوە یان ئـەوەتا وەك دووبارە بوونەوەیـەکی دیمـەنی ئـەو دەسـەڵاتەی کـە بـە شـێوەیەکی نـەمری دووپـات دەکرێتـەوەو هـەرگیز دەسـتبەرداری راوەدوونانی مـرۆڤ نـەبووە یـان وەك سـەرلەنوێ کۆکردنـەوەی هیـواو شـڵەژاوەکانی گۆڕانێکـی رادیکاڵ دووبـارە دەبێتـەوە. ئـادۆرنۆ هەرچـەندە بەدبین بووبێـت بەرامبـەر بـە پێشـکەوتن (بـەڵام) دروستکردنی چەمکێکی پیرۆزی ئۆنتۆلۆژیانەی بۆ دارمـان (انحطـاط)، رەت کردۆتـەوە. شـێوازە دیالێکتیکییەکـەی ئـادۆرنۆ، وەك ئاشکرایە، بـە تەنها لەسەر بنچینەی رەخنەگرتن لە رۆشـنگەری دانەمـەزراوە بـەڵکو لەسـەر نـاواخنی ئەپستمۆلۆژیو سیاسی رەخنەکـەش دامـەزراوە. ئـەو شێوازە لـە ساڵانی سییەکان دا راگەیـەنرا ئەوکاتـەی ئـادۆرنۆ پـێی لەسـەر ئـەوەداگرت کـە ((راڤـەکردنی هـەر حەقیقـەتێکی وەرگـیراو وابەرستەیە بـە هەڵوەشاندنەوەشـییەوە تـا ئـەو ئاستەی پیادەکردنی گۆڕانێکی راستەقینە دەبێتە شتێکی بێهیـوا ئیـدی وەك تەنـها سـەرچاوە زۆر زۆر پێویستە کە روو بکەینە تێکۆشانی فیکری لە دژی واقعی جێگیر)) ئەمانە ئەو نیگەرانییانەن کە

رەخنەو توندەکانی لە فەلسەفە پێشکەوتن گەرییەکانو مێژوو دەست نیشان دەکات.

لەبەرئەوەی هەردوو رەوتەکە هەڕەشەی ئەوە دەکەن شەرعیەت بدەن بە سیستمی جێگیر (مەوجود) بە کەنارکردنی ئەو ئەگەرە یۆتۆپیاییە بۆ هەتا هەتایە کە لەو وشیارییەدایەو پێی وایە لەوانەیە شتەکان بگۆڕێن. پێشکەوتنگەری هەموو ئەو شتانەی بە سروشتی کرد کە مرۆڤ دروستی کردوون. هەموو شتێك دەبێتە حەقیقەتێکی پۆزەتیڤو خۆی دەسەپێنێت بەسەر وشیاری مرۆڤایەتیدا وەك حاڵەتێکی خۆسەلماندن یان شتێکە کە بەرەنگاری کردنی لە تواناوادا نییە تا ئەوناستەی وشیاری شۆڕگێڕی هەست بە شەرمەزاری دەکات لە خۆییو لە یۆتۆپیانیزکەیو دەگۆڕێت بە متمانەیەکی ئەوتۆو بەرچاوی ردوتەکانی مێژوو کە بەئاسانی وەردەگیرێت. دژە پێشکەوتن نائومێدی مێژوویی دەگۆڕێت بە رێسایەك کە پێویستە ئێمە رێزی لێبگرین: تا ئەم ساتەی ئێستا هیچ پێشکەوتنێك بەدی نەهێنراوەو لەبەرئەوە هەرگیز هیچ پێشکەوتنێك بەدی ناهێنرێت. لە هەردووکیاندا هەمان رەوتی پۆزەتیڤانە بەدی دەکەین کە پێی وایە هەر شتێك مرۆڤ نەیبووە بەفەرمانێکی ئۆنتۆلۆژیانە لێی یاساغ کراوە. ئادۆرنۆ کە متمانەی هەبوو بەمیتۆدە پەرشو بڵاوەکەیو دڵسۆزیش بوو بۆی لەهیچ شوێنێکی نووسینەکانیدا رەخنەیەکی سیستماتیك پێشکەش ناکات.

هەروەها تیۆرێکی مێژوویشمان پێشکەش ناکات کەلەوانەیە بناغەی ئەوجۆرە رەخنەیە پێك بهێنێت. بە پێچەوانەوە، ئادۆرنۆ خۆی دەنوێنێت بە زنجیرەیەك هەوڵی بەدوایەکتریداهاتوو بۆ دیاری کردنی هێڵەکانی دەوڵەمەنترین و تارماییترین گرفتی دیالێکتیکی چەمکی پێشکەوتن. ئادۆرنۆ کە دەچێتە ئەودیوی ئەفسانەکانی بۆرژواو ئۆستالژیای کۆنەپەرستانەوە زاڵ دەبێت بەسەر گەشبینی تاك ئاڕاستەیی مارکسیزمی پۆزەتیڤانەو پاساوە سەرسوڕهێنەکانی لیبرالیزم دا دژایەتییەکانیو دژەکانی پێشکەوتن ریزدەکاتو تیشك دەخاتە سەر ئەو ترسو بەڵێنانەی کە هەڵیگرتووە. بیری ئادۆرنۆ کە گرژی ناوخۆ، هەژاندبووی هەرگیز ئارام نەبوو بۆئەوەی پشوو بداتو هیچ ئەنجامگیرییەکیشی نەدۆزییەوە کە قایلی بکات، ئەم سەمفۆنیا بێکۆتاییە، سەرەڕای هەموو شتێك، کەوتۆتە ژێر دەستی تۆنێکی بەدبینو کەئیبەوە، ئادۆرنۆ ئەوە رەت دەکاتەوە مل بۆ گۆرانییە خۆشەکانی پێشکەوتنو مۆدێرنیتی کەچ بکات.

تێڕوانینەکانی ئادۆرنۆ گوزارشتی لە ئەزموونی مێژوویی نەوەی خۆی دەکرد. بۆئەوەی روونتر بدوێین ئەوان لە ئەزموونی جوولەکەیەکی ئەورووپای ناوەڕاستەوە دەستیان پێکرد کە خرایە بەردەم دوولایەنی زۆر خراپی ((بە دڵنیاییەوە وە زۆر جاوازی)) فاشیزمو شێوازی ژیانی ئەمریکای سەدەی بیستەمەوە. تێبینی بەدبینانە بەڵام بەجۆرێك کە لێی تێدەگەین لە نووسینەکانی ساڵانی (١٩٤٤-١٩٤٨) ی دا بەدی دەکرێت، دیالێکتیکی رۆشنگەریو مینیمامۆرالیا، کە لە کاتی جەنگی دووەمی جیهانو دوورخراوەییدا بۆ ئەمریکا نووسیونی.

بەهەرحاڵ نووسینەکانی وەك گشتی شێوازێکی جەدەلی بەردەوام، تێکۆشانێکی بەردەوامو نائومێد لە بەدەست هێنانی ئومێد بە داهاتوویەك کە لە زنجیرە توانای جادوو یەکانگیری ((پێشکەوتن)) و ((گەڕانەوە)) ئازاد کرابێت.

پەراوێزەکان:

- پێشکەوتنگەری لەجیاتی پێشکەوتنخوازی بەکار هێنراوە چونکە وشەی پێشکەوتنخوازیو پێشکەوتنخواز لەفەرهەنگی ئێمەدا زیاتر رەهەندێکی سیاسی هەیە.
- دەستەواژەو وشەی نێو کەوانە گەورەکان زیادەی وەرگێڕن بۆ مەبەستی زیاتر روون کردنەوەو گەیاندنی واتا ناوەڕۆکی رستەکان.
- Aporia چەقی شاردراوەیە کە لەلایەن زیوسی خوداوەندەوە بەکار هێنراوە.

* مارتن رایل ئەم بابەتەی گۆڕیوە بۆ ئینگلیزی سەرچاوە: گۆڤاری(:Radical Philosophy) ژمارە (٧٠) - ١٩٩٥.

# زانینو دەسەڵات


▪بابەك ئەحمەدی

●و: ڕێبین هەردی


(دانتێ لە کوێوە ڕەگەزەکانی دۆزەخی خۆی دۆزیەوە؟ جگە لەم دنیا واقعیەوە کە تیایدا دەژین!!)

ئارتور شۆپنهاور

بابەتی ئەم فەسڵە پەیوەندی مۆدێرنیتیو دەسەڵاتە. ناونیشانی ((دەسەڵات)) بیری ناوی فەیلەسوفێکمان دەخاتەوە کە بەڕاستی تەمەنێك لە دژی جەنگا. فەیلەسوفێك کە چاوی ئێمەی بۆ کاریگەری دەسەڵات لەسەرجەم ئاستەکانی ژیانی کۆمەڵایەتیو فکریدا، کردەوە. میشل فۆکۆ بەردەوام بیری لە دەسەڵات ئەکردەوەو تەنانەت لە دوا بەرهەمەکانیدا (کە بە بڕوای زۆر کەس گرفتە سەرەکیەکانی جیاوازە لە ناوەڕۆکی بەرهەمەکانی پێشووی) هەمووی هەڵیکی قۆزتەوە بۆ ئەوەی بگەڕێتەوە بۆ مەسەلەی دەسەڵات، ئەگەر چی جارێك نووسیی کە خاڵی سەرەکی بەرهەمەکانی ئەزموونە نەك دەسەڵات، بەڵام دەبێ (ئەو ڕاستیە) بگوترێت کە ئەمڕۆ ناتوانین لە دەرەوەی تێڕوانینەکانی فۆکۆ باس لە دەسەڵات بەشێوەیەکی فەلسەفی بکەین.

تێڕوانینی فۆکۆ بۆ ڕۆژگاری نوێش بەهەمان ناوەڕۆکەوە، بەستراوەتەوە. ئەو (کە دیارە) بەینی لەگەڵ عەقڵباوەریو دوانەی پێکەوە بەستراوی (زانین/ دەسەڵات) دا نەبوو، بەدوای ئەوەدا دەگەڕا ئاشکرای بکات کە بەکارهێنانی دەسەڵات لە ڕۆژگارەی تازەدا بەتایبەتی لە کۆمەڵگای هاوچەرخدا، بێ پەردەترو نائەخلاقیترە لە (بەکارهێنانیدەسەڵات) لە کۆمەڵگا کلاسیکیو کۆنەکاندا.

ئەمە خاڵێکە کە هەموو قوتابیەکی زانکۆی ئارەزومەندی فەلسەفەی ئەمڕۆ، لەبارەی تێڕوانینی فۆکۆوە بۆ مۆدێرنیتی، دەیزانێت. بەڵام فۆکۆ لەو دوا بەرهەمانەدا کە لەبارەی رۆژگاری نوێوە نوسی بێ ئەوەی دەست لە رەخنەکانی پێشووی هەڵبگرێت، لایەنێکی دی هێنایە پێشی کە زۆر لە رەخنەگران و نەیارانی چاویان لێداخستووە. ئەم لایەنە کە تەنانەت هەندێ لە لایەنگرانی فۆکۆش ئاشنای نین، (بریتیە لە) دەستەبەربوونی بواری واقعیی و سەرەکی رزگاری لە سەردەمی مۆدێرندا.. واتە ئامادە بوونی ((هەلومەرجێکی دی)).

## فۆکۆو مۆدێرنیتی

باسکردنی تیورەی رەخنەگرانە لە دو فەسڵی رابردوودا .. واتە لێکۆڵینەوەی ئادرنۆو هورکهایمەر لە خۆوێرانکردنی رۆشنگەری و بەرگری




مەرجداری هابرماس لە پرۆژەی ناتەواوی مۆدێرنیتی، ئێمەی بۆ نەریتی هیگڵ لە باسکردنی مۆدێرنیتیدا راکێشا. بیریارانی قوتابخانەی فرانکفۆرت و هابرماس وەک گرنگترین پاشماوەکانی نەریتی تیۆرەی رەخنەگرانە، سەربە فەلسەفەی هیگڵن.. نەک بەو مانایەی رەخنە (لە هیگڵ) ناگرن ((لە راستیدا کتێبی

(دیالەکتیکی نێگەتیڤ) ی ئادرنۆ، یەکێکە لە رادیکالترین ئەو رەخنانەی لە سیستمی هیگلّ گیراوە)). بەڵکو بەو مانایەی هیگلّ ئاسۆی فکری ئەو بیریارانەی دیاریکردووە. ئەم فەیلەسوفانە سەرقاڵی هەمان ئەو گرفتو کێشە تیوریو فکریانەن کە هیگلّ هێنابویە ئاراوەو هیگلّ پێوەی سەرقالّ بوو. ئەوان بەتایبەتی لە رێی بەرهەمە رەخنەییەکانی مارکسەوە، سەروکاریان لەگەلّ لۆژیكو دیالەکتیکی هیگڵدایە. لەم فەسڵەدا رویەڕوی فکرێك دەبینەوە کە راستەوخۆ لە پەیوەندی هیگڵی لە فەلسەفەدا، دابڕاوە. بەو مانایەی رێگەی نەداوە ئەو سیستەمو ئەو تێگەیشتنە بۆ هەمەکی (کلی) و دیالەکتیكو بەتایبەتی ئەو راڤەکردنە تایبەتە بۆ مێژوو و پەرەسەندنو ئازادی، ئاسۆی باسکردنو عەقڵانیەتی فەلسەفی دەستنیشان بکەن. میشیل فۆکۆ هەر لەهەمان سەرەتای کاری نوسینەوە هەوڵیداوە لە رێگەیەکی جیاواز لە دیدی باڵادەستی سەردەمەکەیەوە بەرەوپێش بچێت.

لە کاتێکدافکری فەلسەفی پاش جەنگ لە فەرانسادا، بەهۆی تەفسیری ((ژان هیپۆلیت)) ەوە بۆ ((فیۆمولوژیای رۆح)) [1] ی هیگلّ لەژێر کاریگەری سیستمو دیالەکتیکی هیگڵیدا بوو... تەنانەت پێشەنگی بونگەریش واتە ژان پول سارتەر بەرەو روی ئەو گرفتو کێشانە بۆوە کە بەرهەمەکانی هیگلّ دەیهێنایە ئاراوەو ... بەهۆی تەفسیری مارکسیانەی ئەلکسەندەر کۆژیفەوە بۆ هیگلّ (هاوکات لەگەلّ تەوژمی سیاسی باڵادەستی مارکسیانە لەنێوان رۆشنبیرانی فەرەنسادا) .. (بەهۆی هەموو ئەمانەوەو) لەکاتێکدا وا دەهاتە پێش چاو کە هیچ رێگەی دەرباز بوونێك لە هێرشی سەرکەوتوانەی فەیلەسوفی ئەڵمانی نیە، میشل فۆکۆ بەپێی دەربڕینی خۆی یەکێك لە ((سەنگەرەکانی بەرگری)) دروستکرد. دیارە لەم رێگەیەشدا ئەوەندە بێهاوڕێو هاوکار نەبوو. لەلایەکەوە پشت ئەستوور بوو لە کارە ئەنسرۆپۆلۆژیەکانی لیڤی شتراوسو وانەو نوسینەکان ژاك لاکان لە بواری دەرونشیکاریداو کتێبو وانەو وتارەکانی رۆلان بارت لەبواری گوتاری ئەدەبیدا (کە دواجار فۆکۆیان لەگەلّ ئەو سێ کەسەدا لە قوتابخانەیەکدا ریزکردو ناویاننا



بونیادگەری) و لەلایەکی دیشەوە سودی لە هاوڕێیەتی ((جیل دولۆز)) وەرگرت .. بیریارێکی مەزن کە هەوڵیدەدا بەهۆی تەفسیرێکی تازەوە بۆ ((برگسۆن)) دەرگایەکی جیاواز لەدەرگای هیگڵی لە فکری فەلسەفیدا بکاتەوە.

فۆکۆ لە بەرامبەر هیگڵگەریدا [واتە لە بەرامبەر] ئەندێشەی باڵادەستی سەردەمەکەیدا، رویکردە نەریتێکی فکری فەلسەفی تر. لە هەنگاوی یەکەمدا [رویکردە] جینالۆجیای فردریك نیتچە (کە نکوڵی لە کارتێکردنی بەسەر نوسینو تێڕوانینەکانیەوە ناکرێت) و لە هەنگاوی دوایدا رویکردە ئەنتۆلۆژیای هایدگەر. فۆکۆ خۆی دانی بەوەدا ناوە کە بەرهەمەکانی جگە لە درێژەدانێکی ناچارانە بە کارەکانی ئەو فەیلەسوفە مەزنە شتێکی دی نیەو ئاماژەی بۆ ((کێوێك یاداشت کرد کە لەبەرهەمەکانی هایدگەری وەرگرتووە)) [2] .

لەزۆربەی بەشەکانی بەرهەمەکانی فۆکۆدا (بەدیاریکراوی تا کاتی نوسینی دووهەمین بەرگی _ مێژووی سیکسوالیتی_ واتە نزیک ساڵی ١٩٨٠) تێگەیشتنی بۆ رۆژگاری مۆدێرن و ئەو رەخنە توندەی ئاراستەی کۆمەڵگای تازەی دەکرد، بیری ئەندێشە بەهێزەکانی نیتچەو هایدگەرمان دەخاتەوە. ئەم کارتێکردنە تەنها لە هەڵبژاردنی وشەکان و زاراوەکاندا دەرناکەوێت، بەڵکو لە ناوەرۆکی بیرۆکەکانیشدا خۆی دەردەخات. لە دارشتن و شێوازی دەربڕینی تایبەتی فۆکۆدا (کە بێگومان یەکێکە لە جوانترین و کامڵترین نموونەکانی نوسین لە زمانی فەرەنسی ئەمڕۆدا) نیشانەکانی جەسارەت و گاڵتەجاڕی و بریندارکردنەکانی نیتچە بەهەمان ئەندازەی دەسەڵاتی قوڵ و نهێنی ئامێزو لە هەمانکاتدا: تاڵی هایدگەر، بە ئاشکرا دیارە، بەڵام فۆکۆ لەدواساڵەکانی ژیانیدا، لە رێگەیەکی دیەوە بیری لە رۆژگاری نوێ کردەوە. ئەو بێپەروا لەوەی بە کۆمەڵێ دەرئەنجام بگات کە چەند لایەنێکی کارەکانی رابردووی وێراندەکات، بەشێوازی تایبەتی خۆی رویکردە ئایدیالیزمی ئەڵمانی (بەڵام) ئەمجارەش نەك لە رێگەی هیگڵەوە بەڵکو بەرێی فەیلەسوفێکدا رۆیشت کە جارێك بە ((بیریاری مۆدێرنیتی)) لە قەڵەمیدا: [واتە] ئەمانوێل کانت. ئەگەرچی دوا نوسینەکانی فۆکۆ لەبارەی رۆشنگەری و مۆدێرنیتی و تێڕوانینەکانی کانتەوە لە هەندێ لایەنەوە لەو گرفت و خاڵ و کێشانەی بەرهەمەکانی پێشووی دەیهێنایە ئاراوە جیاواز بوو (کە گرنگترینیان بە دەوری بیرۆکەی ((هەلومەرجێکی دیدا)) دەسوڕانەوە)، بەڵام دواجار [ئەو تێڕوانینانە] پەیوەستن بە ناوەرۆکی سەرەکی فکری سەرجەم ژیانیەوە.

فۆکۆ کاتێك باسی رۆژگاری نوێ یان مۆدێرنیتی دەکرد، مەبەستی سەردەمێکی مێژووی دیاریکراو نەبوو. هەندێ جار وەك رۆسۆ هەموو ئەوشتانەی بە مۆدێرنیتی دادەنان کە لەبەردەم سەدەکانی ناوەڕاستدا رادەوەستان و هەندێك جاریش وشەی مۆدێرنیتی بۆ گۆڕانێکی تایبەت و دیاریکراوی مێژووی بەکار دەهێنا کە کۆتای سەدەی هەژدەی بە سەرەتای سەدەی نۆزدەو گرێ دەداو بەم مانایەش گرنگترین رووداوی مێژووی (بریتیبوو لە) شۆڕی فەرەنسی. فۆکۆ لە کۆتایی ژیانیدا دەریخست کە لە بنەڕەتدا راست نیە لە سەردەمە مێژوویەکاندا بۆ مۆدێرنیتی بگەڕێین، بەڵکو دەبێ مۆدێرنیتی بەر لەهەرشتێك بەئاراستە وەرگرتنێکی بزانین، ئاراستە وەرگرتنێك کە هەمیشە مومکین بووەو هەیە بەڵام لە دوو سەدەی دوایدا بووە بە روداوێکی باڵادەستی کۆمەڵایەتی و فکری... ئاراستە وەرگرتنێك بەرەو زەمەنی هەنوکەو بەرەو قبولکردنی بەرپرسیاری و بەرەو ئەمڕۆی بوون و نوێبوونەوە. ئەم تێڕوانینە ئەگەرچی لە بەرهەمەکانی سەرەتای فۆکۆدا بە راشکاوی و وردی نەهاتووە، بەڵام لەهەریەك لەبەرهەمەکانیدا چەکەرەی ئەم تێڕوانینە خۆی حەشارداوە.. بەتایبەتی لەو شوێنەدا کە هەوڵدەدات بیسەلمێنێ کە ناتوانین بەردەوامی مێژووی لە هەلومەرجە جیاوازەکاندا بدۆزینەوەو دەبێ هەر هەلومەرجێك بە جیا لێیان بکۆڵرێتەوەو شوناس بکرێ و بناسرێنەوە... چونکە هەر یەکێکیان دەرئەنجامی دابڕانی تەواوە لە مێژوو.. دابڕێنێك کە فۆکۆ بە یارمەتی دەربڕینێکی گاستۆن باشلار ناوی ((دابڕانی ئەبستمولۆژی)) لێنا [٣].

تێڕوانینی فۆکۆ بۆ مێژوو و ئەو راستیەش کەبەردەوام خۆی (نەك بە گاڵتە بەڵکو بە جدی) بە مێژوونووس دادەنا، لەسەر بنەمای ئەم پێشنیارە راوەستاوە. ئێمە ناتوانین ئەمڕۆ لێرەدا.. واتە لە هەلومەرجێکی مێژوویدا کەتیایدا دەژین بە وردی ئەوە روونبکەینەوە هەلومەرجی رابردوو لە تێڕوانین (یان ئاسۆی مانایی) هاورۆژگارەکانیەوە چۆن بووە؟ پرسیاری

سەرەکی فۆکۆ ئەوەیە: ئایا بیرکردنەوە لە رۆژگاری رابردوو بەشێوەی رابردوان شیمانەیە (مومکینە)؟ و لە دەرئەنجامدا وەڵام دەداتەوە ئێمە بە راستی ناتوانین لە جیاوازییەکان تێبگەین.. واتە جیاوازی ئاسۆکان بناسین. کەوا بوو لەباسکردنی نوێگەرییەکان و مۆدێرنیتیدا تەنها یەك شت دەتوانین بکەین: هەموو چەمکێکی بنەڕەتی کە ئایدولۆژیای مۆدێرنیتی دەیهێنێتە ئاراوە وەك گرێیان گرفتێکی فەلسەفی و زهنی و شایەنی بیرلێکردنەوە، تەماشا بکەین. بەم شێوەیە دەتوانین رەگی ئەو چەمکە بدۆزینەوە. بەڵام ئەم جینالوجیایە (رەگ ناسی) وەك نیتچە دەریخستووە بەمانای باوی وشەکە ((مێژوویی)) نیە.. واتە پشتی بە مێژووگەری نەبەستووە.. بەڵکو سەرنجێکی وردبینانەیە لە پەیوەندیە سەرەکیەکانی ئەو چەمکە. ئەم سەرنجەش روبکاتە هەر پانتاییك بەردەوام خاڵێك دەهێنێتە پێشێ [ئەویش ئەوەیە] لە هەر هەلومەرجێکدا پەیوەندیەك هەیە لەنێوان زانین و دەسەڵاتدا.. پەیوەندیەك کە فۆکۆ بە ((پەیوەندی سەرەکی و بناغەیی)) زانیووە.

کاردانەوەی توندی فۆکۆ لە بەرامبەر ((هەر شێوەیەکی دەسەڵات)) و سەرکوتکردن و زۆر کردندا، بەتایبەتی لەو جێگەیەدا کە بەهۆی زانینی مۆدێرنەوە رەوایەتی پێدەبەخشرێ [واتە] ئەوەی هەندێجار بۆ نرخاندن و هەندێك جار بۆ سوکایەتیکردن ناویاننـاوە ((ئەنارشیزمی فۆکۆی)) بەرلەوەی رەنگدانەوەی خەسڵەتی دەروونی و ژیانی تایبەتی خۆی بێت، دەرئەنجامی راستەوخۆی خوێندنەوەی بەرهەمەکانی نیتچەو هایدگەرە. فۆکۆ لەوانەوە فێر بوو کە لە پشت هەر بانگەشەیەکی زانستیەوە، بەدوای خۆشاردنەوەی پەیوەندیەکدا بگەڕێت و کاتێکیش بە وردی سەرنجیدا ئەو پەیوەندیەی لە ((پەیوەندی دەسەڵات/ زانین)) دا دۆزیەوە. دیارە فۆکۆ دەسەڵاتی تەنها لە شکڵی سیاسیدا نەهێنایە پێشێ بەڵکو بیری لە پەیوەندیەکی مرۆڤانە دەکردەوە کە لە خێزان و کۆمەڵگای مەدەنی و بواری گشتیەوە سەرهەڵدەدەن و دواجار لە پەیوەندیە سیاسیەکاندا شکڵێکی ئاشکراو بێ پەردە وەردەگرن. [بەڵام] بەرلەوەی بمانەوێت هەڵوێستێکی دژ یان تەبا لەگەڵ رەخنەکانی فۆکۆدا بۆ مۆدێرنیتی وەربگرین، دەبێ بیرۆکەی ئاراستەوەرگرتنی مۆدێرن (رویکرد مدیرن) لەبەرهەمەکانیدا بدۆزینەوە.. واتە روبکەینە جینالوجیا. دووەم کتێبی فۆکۆ ناوی ((مێژووی شێتی)) بوو کە بەشێوەیەك لە شێوەکانی بە بەرهەمی یەکەمی دەژمێرێت چونکە لەکتێبەکەی پێشویدا واتە نەخۆشی دەرونی و کەسێتی (١٩٥٤ کە لە چاپی دووەمدا بە _ نەخۆشی دەرونی و دەروونناسی _ ناونرا) [٤] پاشماوەیەکی ئەوتۆی ئەو خاڵە سەرەکی و تێڕوانینانەی فۆکۆ نابینین کە لە بەرهەمەکانی دوایی ژیانیدا _ واتە لە سەردەمی سەرەکیکاری فکری خۆیدا _ سەرقاڵی بوو. بەهەرحاڵ فۆکۆ لە ((مێژووی شیتی)) دا ئەم خاڵەی هێنایە ئاراوە: ئاراستە وەرگرتنی مۆدێرن ((ئەوی دی)) (الاخر) قبوڵناکات یەکەمین ((حاڵەتی ئەوی دی))یش کە بەهۆی دەرکردن، قەبوڵ نەکردن و دواجار سەرکوتکردنیەوە، فۆرمەلەی یاسای قەبوڵنەکردنی ئەویدی دەکات، دەبێتە بەهێزترین شێوەی دەرکەوتنی ئەوی‌دی.. واتە شێوەیەکی دیکەی دەرکەوتنی و کارکردنی عەقڵ (واتە شێتی). مۆدێرنیتی بەهۆی دەرکردنی (طرد) شێتەوە رێگەی خۆشکردن بۆ ئەوەی هیچ شێوەیەکی دەرکەوتنی ئەوی دی لە دەرەوەی دەسەڵاتیدا گەشە نەکات.

## شێتی و بەندینخانە

عەقڵباوەڕی مۆدرنێتی لەسەر بنەمای چەمکێکی زۆر رون و راشکاوی عەقڵ راوەستاوە. بڕواهێنان بەهێزی دروستکەری عەقڵ و بەوەی

دەتوانرێت جیهان بەهۆی عەقڵەوە بناسرێت‌و بگۆڕدرێت [لە بنەڕەتدا] باوەڕهێنانە بە هێزی عاقڵ .. [واتە] کەسێك کەتوانای شوناسکردن‌و دروستکردنی هەیەو خۆشی دەناسێت. لە جێگەی هێزی ئەو خودایەی کە [بە هاتنی] مۆدێرنیتی نکوڵی لێکرا، ئەو هێزی مرۆییە هاتە ئاراوە کە [بریتی‌بوو لە] بڕواهێنان بە توانست‌و داهێنانی زەینیەتی مرۆڤ .. واتە بەکورتی [بریتی‌بوو لە] پەرەستنی خود (سوژە). هەنوکە هەموو ئەو هێزانەی کە خودا خاوەنی بوو بە مرۆڤ دەبەخشرا.. بەڵام نیتچە گووتبوی مرۆڤ بە کوشتنی خودا، تواناکانی خۆشی لەدەستداوە. [چونکە] نکولیکردن لەخوا [لەهەمانکاتدا] نکولیکردنە لە هێزەکانی خوداش‌و ئەم هێزانەش بۆ مرۆڤ ناگوێزرێنەوە. مرۆڤ هەمان مرۆڤی بێ دەسەڵاتی جاران دەبێت. مۆدێرنیتی دوو شتی پێکەوە بەرەو پێش برد: باوەڕهێنان بە خود (سوژە) و بڕوا بوون بە عەقڵ. ئەمانەش هەردووکیان بێتوانایی خۆیان ئاشکرا کردووە: نەمەزنی مرۆڤ مایەوەو نە ئەو مۆجیزانەی (معجزة) دەدرانە پاڵ عەقڵ.

بەمشێوەیە فۆکۆ کەبەرەو نکولیکردن لە ((خود باوەڕی)) دەڕۆیشت، کەوتە دژایەتی عەقڵ باوەڕی مودێرنیتیشەوە. عەقڵ‌و عاقڵی ڕاستەوخۆ بە ئایدیالۆژیای مۆدێرنیتی (بە گشتیترین ماناکانی ئەم وشانە) لە قەڵەمدا کە دەستکەوتی کۆمەڵگای مۆدێرنە. لە ڕۆژگاری پێش مۆدێرندا نە عاقڵ ئەو پایەو دەسەڵاتەی هەبوو کە ئەمڕۆ لە سەردەمی مۆدێرندا هەیەتی‌و نە مرۆڤیش بە گشتی بە شتێك دەزانرا. مرۆڤی عاقڵ‌و مرۆڤ بەمانای گشتی، زادەی ڕۆژگاری تازەن.. [واتە] چەمکی تازەن کە زووش لەناودەچن .. ئەگەر وەهمێکیش هێشتا لە بارەیانەوە مابێت ئەوا بەزووی لەناو دەچێت.[٥]

مێژووی شێتی کتێبێکی زۆر گەورەیە. دکتۆرانامەی میشل فۆکۆیە کە بەشی سەرەکی لە مەنفا خۆویستو هەڵبژێراوەکەی نوسەر لە سوید، نوسراوە[٦]. یەکجار دەزگای بڵاوکردنەوەی ((پلۆن)) دەقی تەواوی نوسینەکەی لە ساڵی (١٩٦١) دا بە ناونیشانی (شێتی‌و بێ‌عەقڵی: مێژووی شێتی لە سەردەمی کلاسیکیدا) چاپکردو هەمان دەق لەلایەن دەزگای بڵاوکردنەوەی (گالیمار)ەوە بە ناونیشانی بەناوبانگی ((مێژووی شێتی لە سەردەمی کلاسیکیدا)) لە ساڵی ١٩٧٢ دا بڵاو کرایەوەو چاپی دووهەمیشی بەهەندێك جیاوازی کەمەوە لە ساڵی (١٩٧٨) دا چاپکردەوەو هەر ئەم دەقەش سەرچاوەی چاپە تازەکانی کتێبەکەیە. کورتکردنەوەی کتێبەکە بەناونیشانی (مێژووی شێتی)[٧]ەوە لە ساڵی (١٩٦٤) دا بۆ گیرفان چاپکرا کە سەرچاوەی سەرەکی وەرگێڕانە ئینگلیزیەکەیەتی بە ناوی ((شێتی‌وشارستانێتی)). دەقی سەرەکی کتێبەکە (٦٠٠) لاپەڕەیە کە هێشتا بۆ زمانی ئینگلیزی وەرنەگێڕراوە. یەکەمجار هەندێك بیریار لە ساڵی ١٩٥٥ دا توانیان مێژووی شێتی بخوێننەوە. دەقی تایپکراوی کتێبەکە لە ژمارەیەکی سنوردراودا کۆپی کرابوو... ئەمەش کەمێك پێش بڵاوبوونەوەی کتێبەکەی ((لیڤی شتراوس)) (بەناوی) ((گەرمیانیە خەمناکان))ەوە.

هەردوو کتێبەکە بریتین لە دابڕانێکی تەواو لە تێگەیشتنی کلاسیکی بۆ ((خودی (سوژە) فەلسەفی)). لیڤی شتراوس دەریدەخست کە کۆمەڵگا سەرەتاییەکان لەناوەڕۆکدا وەك کۆمەڵگا مۆدێرنەکانن. خوێندنەوەی هەریەك لەم کۆمەڵگایانە دەتوانێ لێکۆڵینەوەی نموونەیەك بێت کە یارمەتیمان دەدات ئەوی تریان (و کارکردنی زەینی مرۆڤ) بناسین. بە وردبوونەوە لە هەریەکێك لەو کۆمەڵگایانە دەتوانین لەوە تێبگەین کە ئەو مانایەی بۆ عەقڵ‌و کارکردن‌و کاریگەری عەقڵانی زەین، دروستمانکردووەو لە سەردەمی مۆدێرندا ئەوەندە بە گرنگ‌و بەنرخ

دادەنرێت، [ئەو مانایە] دەتوانێت بگۆڕێت. بە نکوڵیکرن لە ((پەرستنی عەقڵ)) ڕێگا بۆ خوێندنەوەی سنورداریەکانی (عەقڵ) دەکرێتەوە. ئەمەکارێکە کە فەلسەفەی مۆدێرن (بەتایبەتی لە کانتەوە) دەستی پێکرد. بەڵام هەرگیز نەیتوانی لە کۆت و بەندی زەینیەی تراندستالی (متعالی) و خۆدێتی (سوژە)، دەربازی بێت. لەلایەکی دیەوە لیڤی شتراوس دەریدەخست کە ((نموونەی پیرۆزی مۆدێرنیتی)) بە پێچەوانە بڕوای ئەو کەسانەی باوەڕیان پێهێناوە، نمونەیەکی مەزن و دوا نموونەی کارکردن و کاریگەری زیهنی مرۆڤ نیە. ئەمە گرنگترین دەستکەوتی سیاسی کتێبەکەی ئەم مامۆستای ئەنسرۆپۆلۆجیایە بوو.. کتێبێك کە خۆی سەفەرنامەیەکەو شیکردنەوەی دیدارە لەگەڵ ئەو خێڵانەدا کەبەناو ((خێڵی سەرەتاییان)) پێدەڵێن.. و [لە هەمانکاتیشدا کتێبەکە] بە شاکارێکی ئەدەبی دەژمێرێت. کاری فۆکۆ لە زۆر رووەوە لە باسەکەی لیڤی شتراوس دەچێت. شێتی (کە بە _ دژی عەقڵ _ بەناوبانگە) بۆ گۆڕینی ئەو مانایەی ئێمە بۆ عەقڵ و ((هۆشمەندو عاقڵی)) دروستمانکردووە، لە بواری گشتی کارایی عەقڵ و هێزی تێگەیشتنی مرۆڤدا، دادەنرێت. فۆکۆ دەریخست عەقڵباوەڕی و باوەڕهێنان بە بەکارهێنانی عەقڵی مرۆڤ.. بە گشتی باوەڕهێنان بە خود، وەك دەمامك وان بەسەر سیمای دەسەڵاتەوە.

بنەمای رەخنەکەی فۆکۆ لەسەر لێکۆڵینەوەی چەمکی خودی تراندستالی (زهن المتعالی) و فەلسەفەی تراندستالی، دامەزراوە. فۆکۆیش دەیەوێت بزانێت سنوری فکرو بەکارهێنانی عەقڵ، لە کوێدایە، عەقڵ کەمۆدێرنیتی بە پیرۆزی دەزانێت لە کوێدا ئیدی کار ناکات یان بەشێوەیەکی وا تازە کاردەکات کە بە ناچار چەمکی کۆنی عەقڵانیەت دەخاتە ژێر پرسیارەوە. لێرەدا نهێنی کاریگەری نیتچە لەسەر فۆکۆ دەردەکەوێت. نوسین لە بارەی بێعەقڵیەوە، دەرخستنی مێژووی فەرامۆشکراوی عەقڵە. [وەك چۆن] دۆزینەوەی سەرچاوەی پەیوەندی عەقڵە بە دەسەڵاتەوە.

لە سەدەکانی ناوەڕاستدا هێشتا عەقڵ و بێعەقڵی بە پێکەوە گرێدراو دەژمێران. شێتەکان ئەگەرچی سوکایەتی و گاڵتەیان پێدەکرا، بەڵام لە ژیانی کۆمەڵایەتی دوور نەخرابوونەوەو هیچ کەسێکیش فڕێی نەدەدانە دەرەوەی کۆمەڵگا. دەزگایەك لە گۆڕێ نەبوو کە کۆیان بکاتەوەو دیلیان بکات و هێڵێکی جیاکەرەوە لەنێوان ژیانی عەقڵانی و شێتیدا دروستبکات. تەنانەت لە سەرەتای رێنیسانسدا واتە لە سەردەمی سەرهەڵدانی هیومانیزم و عەقڵباوەڕی مۆدێرنیتیدا، هێشتا عەقڵ و بێعەقڵی بە بەیەکەوە بەستراو دادەنران. هێشتا گەورەترین بیریارانی هیومانیزم ستایشی بێعەقڵیان دەکرد. ئاراسموس کتێبی لە بارەیەوە دەنوسی و لە شانۆگەریەکانیشدا بێ عەقڵان بە نموونەی پاکی دەژمێرران. سەدەکانی ناوەڕاست کە بە بڕوای میخائیل باختین پێکەنینی وەك ئامرازێکی رەخنەگرانە دژی پلەوپایە دینی و دەسەڵاتە زەمینیەکان بەکار دەهێنا [(٨)]، سوکایەتی بە بێعەقڵی نەدەکردو لە سەرەتاکانی پرۆژەی رێنیسانسیشدا ستایشی ئەم ((رووە شادو ئازادەی ژیان)) دەکرا کە ((رابلێ) لایەنگری بوو. لە سەدەکانی ناوەڕاستدا ((شێوەکانی تری عەقڵ)) نەك هەر ئازاد بوون بەڵکو بە رێنماکەری حەقیقەتیش دەزانران. چەمکی ((عاقڵیی شێتەکان)) لە کلتوری ئێمەدا ئاشنایە*[١]. ((سۆفیو عارفان)) یش لە بازنەی سنورداری عەقڵ دەچوونە دەرێو دنیایەکی تازەیان تاقیدەکردەوە. لە هەموو ئەمانەش گرنگتر

---

[١] لە کلتوری کوردیدا لە جیی ئەو چەمکە پەندێکی بەناوبانگمان هەیە کە دەڵێت ((قسە یا لە شێت یا لە منداڵ.

(سۆفیو عارفەکان) دەیانتوانی بە نکولیکردن لەبنەما گەندەڵەکانی عەقڵی بەڵگە خواز (عقل استدلالی) و عەقڵانیەتی رەسمی، بنەمای بەکارهێنانی ژیری بەتەنها، سست بکەن. لە سەدەکانی ناوەڕاستدا ئەوە ((گول)) ەکان بوون کە لەکۆمەڵگاو شارەکان دەردەکران. هۆی دەرکردنی ((گولەکانیش)) بریتی بوو لە ((ترس لە نەخۆشیو مردن)). بەڵام شێتەکان لە پاڵ ئەوانی دیدا دەژیان. شێتەکان لە سەدەکانی (١٥، ١٦) هێواش هێواشو هاوکات لەگەڵ ستایشکردنی عەقڵی مرۆڤدا، لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا کرانە دەرێ. بەڵام هێشتا لەناوەڕاستی سەدەی (١٧)دا فەیلەسوفێکی وەك (باسکاڵ) هەبوو کە رایگەیەنێت ((مرۆڤەکان ئەوەندە شێتن کە خۆی شێتیە گەر شێتەکان قبوڵنەکەین[٩].)) فۆکۆ چەندانجار ئەم قسەیەی باسکاڵی کە لە (پارچەی ٤١٤) ی ئەندێشەکاندا هاتووە، لەبەرهەمەکانیدا دوپات کردۆتەوە). بەڵام تەوژمی کۆمەڵایەتی سەرکەوتوو لە پاش رێنیسانسەوە بریتی نەبوو لە قبوڵکردنی شێوەیەکی تری بەکارهێنانی عەقڵ، بەڵکو بریتی بوو لە دەرکردنی شێتەکان. عەقڵباوەڕی مۆدێرنیتی خەریکی دروستکردنی کۆمەڵێ دەزگا بوو بۆ ئەوەی شێتەکانی تیا زیندانی بکات. شێتی لە بواری گوتاری ئەدەبیو ((رەسمیشدا)) لە پانتایی عەقڵ چووە دەرێو ئیدی بە شێوەیەکی دیو تەنانەت قبوڵکراوی دەربڕینی حەقیقەت نەدەزانراو بە شکڵێکی تری بەکارهێنانی لۆژیك لە دژی ستەمو دەسەڵات دا نەدەنرا. شێتی گۆڕا بۆ خوازەیەکی (ئیستعارە) سوكو دزێو.. [و بوو بە] وشەیەکی نێگەتیف. عەقڵو شێتی بە هەمان شێوەی چاکەو خراپە سەیر کرا. دنیای شێتی بە جیهانی بێمانایی لە قەڵەمدرا. عەقڵی پراکتیکی (عملی) و دنیایی کە سوودخوازو تەندروستخواز بوو، بە هیچ شێوەیەك سازشی لەگەڵ شێتیدا نەدەکردو سوکایەتی بەو بێنیازیو بێپەرواییو (لە هەموو ئەمانەش گرنگتر) بەو نارەزاییە توفاناویە، دەکرد. بەهۆی یاسای (٢٧ نیسانی ١٦٥٦)ەوەکە شای فەرەنسا ئیمزای کرد، خەستەخانەیەکی گشتی دروستکرا. بە وتەی فۆکۆ ((شاری رەوشت)) یان دروستکرد.. جێگایەك کەشێتیەکانیان تیایدا وەك نوێنەری شێوەیەکی ترسناکی خراپە کۆکردەوەو [لە ناویدا] زیندانیان کرد[١٠]. هەر ئەم دنیا داخراوو سنوردراوەی بێعەقڵان بەهۆی گوتاری یاساییو ئەدەبی بورژوازیەوە سەقامگیر کرا. پولبەندکردنی مرۆڤەکان لەسەر بناغەی بەکارهێنانی قبوڵکراوی عەقڵ، ژیانی کۆمەڵایەتی لە دەسەڵاتی ئەخلاقی دینیەوە بەرەو پانتایی ئەخلاقی مۆدێرن برد. دەزگا چالاکەکانی سەرکوتکردنی ژیانی مۆدێرن دروستبوون. فۆکۆ دەریخستووە کە لە هەموو ئەم دەزگایانەدا شێوەیەك لە دورخستنەوەو زیندانی کردن خۆی حەشارداوە.

شێتەکان وەك خێڵێکی زیندانیکراو و گۆشەگیریان لێهات کە هەم لە دیدی یاسایو ئەخلاقیەوەو هەم لە دیدو تێڕوانینی پزیشکیەوە، لە دنیا جیابوونەوە. (واتە) چیدی (شێتەکان) رەگەزی چالاكو شوناسکەرو خود (سوژە) نەبوون. بەمانایەکی تا رادەیەك ئاشکرا، چیدی بە ((مرۆڤ)) دانەدەنران. شێتی بە غەریزەیەکی ئاژەڵی دانراو ئەو دڵڕەقیەش کە لە بەرامبەر ((دڕندەیی ئاژەڵیدا)) بە ڕەوا دەزانرا، لەبەرامبەر شێتەکانیشدا بە رەوا لەقەڵەمدراو بەکاریش هات تەنانەت لە تێڕوانینی یاسایشدا خۆپاراستن لە سەگێکی هار وەك خۆپاراستن لە ((شێتێکی هار)) رێگە پێدراو بوو. فۆکۆ دەنوسێت ((بوارێکی تازە پەیدا بوو، فەزایەکی نوێو شێوەیەکی تازەی تەنیایی!!.. بێدەنگیەکیناچاری کە تیایدا ((فەزایەکی داخراو دروستبوو کە شێت تەنها دەیتوانی لەوێدا قسە

بکات))[11]. جێگایەك کە تیایدا ((رەچەتەی پزیشکی)) بە بەڵگەی بنەڕەتیی و دوا حوکم دەزانرا.. بەڵگەیەك کە ئیدی وتووێژی نێوان شێوازەکانی عەقڵی بێ‌مانا دەکرد. یەك شێوازی عەقڵ‌و عاقڵی لە پەیکەری عەقڵانیەتی مۆدێرنێتیدا قبوڵکرابوو کە ئەویش هیچ وتووێژێکی لەگەڵ شێتیدا نەدەکرد. لێرەوە مۆدێرنیتی بوو بە مەنەلۆج‌و خۆ دواندنی عەقڵ لە بارەی شێتیەوە.

دروستبوونی خەستەخانە بوو بە شێوازێکی دی پەیوەندنی نێوان زانین‌و دەسەڵات: هاوڕێیەتی دەسەڵاتی پزیشکی لەگەڵ دەسەڵاتی یاسایدا (ئەوەی ئەمڕۆ ئێمە لەفارسیدا بە ((پزیشکی یاسایی) ناو دەنێین، شێوازێکی کامڵی هەموو شێوەیەکی کاری پزیشکیە. ئەو شێوازە کلاسیکیانەش کە هەڵگری ئاماژەی پەیوەندی دەسەڵاتی یاسایی‌و دەسەڵاتی تێڕوانینی پزیشکی نین، سەرکوت دەکرێن.) شکڵی دەزگایی ئەم ((پزیشکە رەسمیە)) نهێنیەکی هەیە کە فۆکۆ کەشفی کردووە: دەزگایەك دروستدەکرێت بۆ ئەوەی دەزگایەکی دی بەهێز بێت. بەهۆی سۆزانیخانەوە، بنەمای خێزان‌و بەهۆی شێتخانەوە بنەمای عەقڵخوازی پتەو دەکەن‌و عەقڵخوازی دەبێت بە بنەمای کارکردنی ئەو دەزگایانەی کە سەرەتا وا دەردەکەون کە چ پەیوەندیەکیان بە شێتخانەوە نیە، کۆمەڵگا بۆ بەهێز کردنی دەسەڵاتی یاسا ئەو جیهانە داخراوانە دروستدەکات کە لە هەموویاندا پایەو زنجیرە پلەی دەسەڵات پتەوتر دەبێت. ژمارەیەك لەم دەزگایانە لە زمانی فارسی [و کوردیشدا] بە وشەی خانە تەواو دەبێت: سەربازخانە، شێتخانە، سۆزانیخانە، (خەستەخانە) ... و بەمشێوەیە: یاساڕێزکردن‌و قبوڵکردن بوونە هۆی پەیدابوونی ئەو دەزگایانەی کە لە ناویاندا هەموو ئەوانە کۆکرانەوە کە یاساڕێز ناکرێن‌و ناگونجێن‌و سەرپێچی دەکەن. دیارە پزیشك لەم ئاستەدا دەسەڵاتێکی مەزنی پێبەخشرا. کەسێکی زانا کە تەندروست لە نەخۆش، سروشتی لە ناسروشتی جیا دەکاتەوەو دەستنیشانی دەکات. لە گوتاری یاسای‌و پزیشکی مۆدێرنیتیدا شێتی بوو بە ناونیشانێك بۆ سوکایەتی کردن. [شێتی بوو بە] شکڵی غەریزەیەکی دڕندەو ناکامڵ کە ئامادە نیە بەشداری لە ئەزموندا بکات. نمایشی بەناوبانگی سەدەکانی ناوەڕاست بە مانایەکی تازە بەکارهات: ((کەشتی شێتەکان)) ... بەلەمێك کە شێتەکانی بەرەو ئامانجێکی نادیار دەبرد. ئەم کەشتیە کە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا نمایشێکی ژیانی هەموان بوو، لەسەردەمی مۆدرێرندا بوو بە نمایشێك کە دژی عەقڵخوازی‌و ژیانی گشتە. لێرەوە فۆکۆ دەنووسێت ((ئەمە نموونەی رەوشتێکی تازەیە... سەفەرێکی رەمزیە بەمانایەکی تازە))[12]. عەقڵ دەسەڵاتداری‌و سوکانداری ئەم کەشتیە نیە. لەسەری هەریەك لەم دانیشتوانی کەشتیەکەدا نەخشەیەك هەیە. ئەم نمایشە شێوەیەك لە خواستی ئازادی لەسەری ئەو کەسانەشدا دروستدەکات کە ئەگەرچی لەکەشتیەکەدا نین بەڵام دەنگ‌وباسی دەبیستن. بەلام ئەمڕۆ [واتە لە سەردەمی مۆدێرندا] رەوتەکە گرنگە. هەموو لە ((نەخشەی مۆدێرنیتیدا)) بەشداری دەکەن، کەوابوو [نەك هەر] بە سووکایەتیەوە تەماشای ئەم کەشتیە دەکەن [بەڵکو] لەوەش گرنگتر [بە سوکایەتیەوە تەماشای ئارەزووی] ئازادی‌و مافی تاکەکان بۆ وێناکردنێکی شەخسی لە مانای ئازادی دەکەن. مۆدێرنیتی بە دروستکردنی تەنها یەك نموونە، مافی وێناکردنی (تصور) ئازادی لەناوبرد مۆدێرنیتی تەنها یەك شێوەی رزگاربوونی دروستکرد هەر لەبەرئەوەش رزگاربوونی بێ‌ماناو بێ بایەخ کرد. مۆدێرنیتی بە دوورخستنەوەی شێتی هەموو وێناندنێکی بۆ رزگاری وەلاوە ناوەو سیستمی کۆیلەیەتی مۆدێرنی ناونا شێتی.

فۆکۆ چەندنجار گەڕاوەتەوە بۆ یەکێك لە گرنگترین نموونەکانی سەرەتای مۆدێرنیتی .. واتە بۆ دۆنکیشۆت: ئەو دلاوەرە ئەسپ سوارەی کە یەکەمین سیمای راستەقینەی ئەدەبیاتی مۆدێرنە، پیاوێك کە لە رۆژگاری نوێدا بۆ

دۆزینەوەی سەردەمانێك کە بەبڕوای هەموان بەسەر چووە، سواری ئێسترە بەدبەختەکەی خۆی بوو بۆ ئەوەی بەهاوکاری ئەو حەکایەت و چیرۆکانەی کە لە خەیاڵ زیاتر نەبوون، بەدوای ئامانجەکانی خۆیدا بگەڕێت... بەختیاریەك کە نەك لە ئامانجەکانیدا بەڵکو لە خەیاڵبازیەکانی خۆیدا بە بەختیاری دەزانرا. [ئەمە تەنها] بەپێی عەقڵی باو وا تەفسیر دەکرێت، بەڵام لە ((مانایەکی دیەوە)) ئەم چیرۆکە وانیە. لە ئاسۆی شێتیدا [واتە] لەشێوەیەکی دی سەیرکردنی دنیادا؛ دۆن کیشۆت ئازادترین کەس بوو. ئەو سەختیەکانی ئەزموونی ئازادی بێخۆنواندن و نمایشکردن قبوڵدەکرد. کارەکانی لە چاوی کەسانی دیدا (عاقڵەکان) وەك نمایشکردن وا بوو.. [بەڵام] بۆ خۆی واقعی بوون و دور لە هەموو روویەکی نمایشی. بە پێچەوانەوە ئەوە جیهانی مۆدێرن بوو کە گۆڕابوو بۆ نمایشێکی شەرمەزار.

بەهۆی داهێنانی خود، بکەری شوناسکەر، عەقڵخوازو عەقڵ پیشە، و سودخوازو تەندروست خواز.. [بەهۆی داهێنانی هەموو ئەمانەوە] شێتی مافی قسەکردنی لە دەستدا. لەیدی ماکبیس پێش رۆژگاری مۆدێرن کاتێ کە شێت دەبوو.. تەنهاش کاتێك کە شێت دەبوو، حەقیقەتی دەگوت واتە باری گوناه و تاوانەکانی لە ئەستۆ دەگرت. شالیر ئەو گوناهکارە پیرە لە شێتیدا (هاودەنگ لەگەڵ لێبوکەکەدا) هوشیار دەبوو بە ((مانایەکی دی)) کە مانای راستەقینەی رووداوەکان بوو. لێبوکی شالیر راستگۆترین و بەرپرسیارترین مرۆڤ بوو... واقع بینێك بوو کە دەربڕی ((ویژدانێکی هوشیار)) بوو. شێت بە شێوەیەکی دی بیری دەکردەوەو رەفتاری دەکردبەڵام ئەم شێوەیەی دی لەگەڵ لۆژیکی یەکسانخوازی مۆدێرنیتیدا ناگونجێت (وەك چۆن شێوەیەکی دی ژیانی مرۆڤی بەناو سەرەتای قبوڵناکرێت و ناوی ((درندە)) ی لێدەنرێت).

لێرەوە جگە لە بێدەنگکردنی شێت لە فەزایەکی دەرگا داخراوی وەك شێتخانەدا، هیچ رێگایەك نامێنێتەوە. ئایدیۆلۆژیای بەرهەمهێنان، سودو فراوانی بەرهەم لەگەڵ بیرێکدا ناگونجێت (کە ئیدی بەکارنایەت). لەبەرئەمەش دەریدەکات و دوری دەخاتەوە. بەڵام تەنانەت لەم تاراوگەیەشدا شێتی بەهای زمانی خۆی دەناسێتەوە. جار جار گوێمان لە دەنگی دەبێت بەڵام نەك لە چوارچێوەی ئایدیۆلۆژیای یەکسانخوازی مۆدێرنیتیدا بەڵکو لە دژایەتی مۆدێرنیتیداو دور لەگوتاری لۆژیك و عەقڵی باڵادەست دژایەتی مۆدێرنیتیداو لەسنوری کلتورێکی دوور خراوەدا (بە وتەی جیل دیلۆز - وەك- کلتوری کەمینەکان و بەهۆی زمانێکی نێوەندیەوە) .. کلتورێك کە بە ناچار گرنگترین مەسەلەکانی جیاوازی و نامۆ بوون و لەخۆ نامۆ بوونە. ئەم ((دەنگەی دی)) یان ((دەنگی شێتی)) لە زۆرار دونرڤالەوە تا ئانتوان ئارتۆ، لە هولدرینەوە تا کافکا، لە ئەدەبیاتی نوێدا دەنگیداوەتەوە. هیچ نەبێ لەناو هونەردا (کە تەنانەت کانتی عەقڵخوازیش بڕوای بەوە هەبوو کە سودخوازی نیەو نابێ ببێ) دەنگی شێتی بیسترا. ڤان کوخ دەریخست کە بێعەقڵی ئامێری زانینێکی تازەیەو زانین [تەنها] لە ((هوشیاری عاقڵانەدا)) کورت نابێتەوە. ئیدی (هەنوکە) زانیومانە (خۆزگەش بە راستی زانیبێتمان) کە مرۆڤ تەنها لە خەون و خەیاڵدا نیە کە ژیانێکی تایبەتی هەیە، بەڵکو مرۆڤە بێدارەکانیش هەریەکەیان خاوەن ژیانی تایبەتی خۆیانن. وەك ژاك لاکان دەڵێت: ((مرۆڤ بێ شێتی ناناسرێتەوە، مرۆڤ ئەگەر شێتی لەناو خۆیدا وەك سنوری ئازادی هەڵنەگرتبێ، چیدی ناتوانێ مرۆڤ بێت)).

فۆکۆ تامەزرۆیی و ئارەزووی نوسین لە بارەی شێتیەوەی هێنایە دی. ئەو دەریسخت دەتوانرێت لەبارەی شێتیەوە بنوسرێت نەك لەبارەی دەروون پزیشکیەوە (کە گوتاری باڵادەستی مۆدێرنیتیە

لەبارەی شێتییەوە). فۆکۆ دەیویست ئەو لایەنە غەریزیو زیندووە بدۆزێتەوە کە ((زانین — معرفة) ی رەسمیو باڵادەست، زیندانی کردووە. لە یەکەم کتێبدا کە نووسی .. واتە ((نەخۆشی دەرونیو دەروناسی)) ئەم پرسیارەی هێنایە ئاراوە ((چۆن کلتوری ئێمە مانایەکی ئەمرۆییانەی بەنەخۆشیی بەخشیو نەخۆشی گۆشەگیرکرد))[١٣]. لە مێژووی شێتیدا ئەم پرسیارە قوڵتر بۆوە ((چۆن دەتوانین — کارێك بکەین— دەنگی نەخۆشێکی گۆشەگیر، دەنگبداتەوە)). فۆکۆ مێژوویەکی نووسیوەتەوە لەبارەی گوتاری شێتیەوە ... واتە مێژووی کومەڵەیەکی مێژووی (مجموعة ای تاریخی)ەنووسیوە ... مێژووی دەزگاکان، چەمکەکان، پێوەرە (یاساییو پۆلیسەکان)، چەمکە ((زانستیەکان)).. [واتە مێژووی ئەو شتانەی نووسیوەتەوە] کە پێناسەی ((هەلومەرجی سەرەتاییو دڕندانەی شێتی))دەکەن.

ئەم کتێبە لەبارەی مێژووی شێتیەوە نیە، گریمان مێژوییەکی وا دەتوانرێت بنوسرێت (ئەوا بێگومان) بانگەشەی ناسینێکی عەقڵانی ((شێوەیەکی تر)) دەکات.. بانگەشەیەك کە فۆکۆ بە توندی رەدی دەکاتەوە. ئەم کتێبە لەبارەی ((گوتار)) ەوەیە... دەیەوێت دەربیخات چۆن دەزگاکانی دروستکەری گوتار، شێتیان دروستکردو چۆن ئەم کارەشیان بۆ بەهێزکردنی دەسەڵاتیکۆمەڵگای نوێ ئەنجامدا... واتە چۆن ئەو جیاوازیە هەڵەیەیان لەنێوان عەقڵو شێتیدا دروستکرد کە بەرگری لێناکرێت. لێرەوە رۆڵان بارت سەبارەت بە کتێبەکەیفۆکۆ نووسیوێتی:

((ئەم کتێبە، مێژوویەکە ... بونیادگەر، چ لە شیکردنەوەو لێکۆڵینەوەکانیداو چ لە هێنانە ئارای بابەتەکەدا)) [١٤].

بە بڕوای بارت ((مێژووی شێتی)) سەرکەوتنی میتۆدی ئەنسرۆپۆلۆجیە لە بواری زانستە مرۆییەکاندا. واتە فۆکۆ وەك لیڤی شتراوس باسی کاریگەری سروشتی لەسەر کلتور کردووە. بەڵام بەو جیاوازیەوە کە فۆکۆ باس لەکاریگەری سروشت لەسەر کلتوری کۆمەڵگای مۆدێرن دەکاتو لیڤی شتراوس باس لە کاریگەری لەسەر کۆمەڵگا سەرەتاییەکان.

گرنگی کارەکەی فۆکۆ ئەوەیە کە بەشێوەیەکی روونو جوان ئەو خاڵەی رەدکردەوەو قبوڵی نەکرد کە ((بتوانرێ) شێتی لە سنووری پۆلبەندکردنی نەخۆشەکاندا دابنێین))[١٥]، بەڵکو دەبێت شێتی هاوشان لەگەڵ رەگەزە کلتوریو کۆمەلایەتیەکانی بەکارهێنانی عەقڵدا بخرێتە ژێر باسو تەنهاش بەم مانایە [ئەم کارەی فۆکۆ] بونیادگەرانە بوو. ((مۆریس بلانشۆ)) لە ستایشکردنی ئەم کتێبەدا دەریخست کە ئەم کتێبە ((لەبارەی دیاردەیەکەوەیە کە راستەوخۆ دەکەوێتە دەرەوەی نوسین)). کتێبێك کە خولقێنەری ((ئەو فەزا ئەدەبیەیە کە بە (نوسین لە سنوردا) لە قەڵەم دەدرێت))[١٦]. واتە ئامادەکردنی شتێکە کە لە کلتور باڵاترە، چونکە پەیوەندی بە شتێکەوە دەکات کە نەفی کلتور دەکات: گوتارێکە لە دەرەوەی نووسین، گوتارێکە باڵاتر لە هەرشکڵو هەر سنورێك کە بۆ گوتار وێنای ((تصوری)) دەکەین. کاری سەختی فۆکۆ بریتیبوو لە دۆزینەوەی جێگەی شێتی لە مارپێچی عەقڵی دەسەلاتخوازدا. چەندان ساڵ دوای ئەوە ژیل دۆلۆز لە باسکردنی مارپێچدا دەریخست (ئەنجامدانی) ئەم کارە بۆ ((هیچ دیاردەیەکی باروك)) ئاسان نیە.[١٧]

لە ساڵی (١٩٨٠) دا دوو توێژەرەوەی لاو بە میتۆدێك کە کەم تا زۆر لەو میتۆدە دەچوو کە فۆکۆ لە مێژووی شێتیدا بەکاریهێنابوو، واتە بەهۆی لێکۆڵینەوەی وردبینانەلەو بەڵگەنامانەی لەبارەی شێتیەوەنو (لێکۆڵینەوەی) هەمان ئەو سەردەمانەی فۆکۆ لێیان کۆڵیبۆوە، بە کۆمەڵێ دەرئەنجام گەیشتن کە تا رادەیەك لەو

دەرئەنجامانە جیاوازە کە فۆکۆ پێی گەیشتبوو. ((مارسیل غۆشە)) و ((گلادیس سوئن)) لە کتێبی ((پراکتیکی رۆحی مرۆیدا))[18] (١٩٨٠) پاش لێکۆڵینەوەیەکی ورد لە بەڵگەنامەکان، دەریانخست کە نەك لە سەدەی ١٧ دا بەڵکو لە سەدەی نۆزدەدا بوو کە جیاوازی بنەڕەتیو کامڵ لەنێوان عەقڵو شێتی لە سنوری دەزگا کۆمەڵایەتیەکانو گوتاردا، رویدا. دیارە ئەوانَ پێیان لەسەر بیرۆکەی سەرەکی کتێبەکەی فۆکۆ داگرت (کە ئەویش ئەوەیە) دینامیکیەتی هەلومەرجی مۆدێرنیتی بوو کە ئەم جیاوازیەی کرد بە جیاوازیەکی ناچاری. بەڵام خاڵی گرنگ ئەوەیە ئەم دوو نووسەرە نووسیویانە کە شێتەکان پێش سەردەمی رێنیسانسیش ((وەك ئامێرێکی ئۆرگانی گشتێك - یەك کل- بە ئاسانی نەدەتوانەوە)) بەڵکو شێت لە سەدەکانی ناوەڕاستیشدا ((بە مرۆڤێکی نزمتر)) دادەنرا دیارە لەسەردەمی مۆدێرندا ئەم جیاوازییە توندتر بوو. بەبڕوای (لوك فری)و (ئالن رنو) کە بەتوندی رەخنە لە فۆکۆدەگرن ((ئەو جیاوازیە رەهایە (لە نێوان شێتیو عەقڵدا) لەو چوارچێوە کلتورەیەدا (کە بە بنەما نایەکسانو پلەو پایە سروشتیەکان، پێناسە دەکرێت) ئاشنایی (و قبوڵکردنی) نەدەسڕیەوە))[19]، پێشتریش ژمارەیەك لە رەخنەگران نووسیبویان کە جیاوازی نێوان عەقڵو شێتی کە فۆکۆ دەیگەڕێنێتەوە بۆ مۆدێرنیتی، (بەر لە سەردەمی مۆدێرنیش هەر بە توندی هەبووە. واتە لەسەدەکانی ناوەڕاستدا ئەم ((شێوە نزمترەی مرۆڤ)) بە ((بونەوەرێکی بەدبەخت)) دادەنرا کە چەند مافێکی لە دەستداوە. بەڵام شێتەکان لەسەردەمی مۆدێرندا کە بنەمای سەرەکی بریتی بوو لە یەکسانی مافەکان، لە گروپ یان وەزایەکی جیادا (لە چوارچێوەی ئەو مافانەدا) جێگەیان بۆوە.

لەم رەخنەگرتنو تێبینیانەدا (کە ئاراستەی فۆکۆ کراوە) خاڵێکی سەرەکی فەرامۆش کراوە کە فۆکۆ زۆر پێی لەسەر دادەگرت: جیاوازی نێوان عەقڵو شێتی بەهەر توندیو شێوەیەك لە سەدەکانی ناوەڕاستدا هەبووبێت، [بەڵام] نەبووە بنەمای دەزگا کۆمەڵایەتیەکان ئەم جیاوازیە تەنها لە سەردەمی مۆدێرندایە بووە هۆی دروستبوونی بەندینخانەکان (کە ناوی) خەستەخانەی (لێدەنرێت)، لێرەوە (ئەم جیاوازیە) ئەخلاقی تایبەت بەخۆی دروستکردو بووەهۆی جیاوازی لە گوتاردا. هەر لەبەرئەم هۆیەش (واتە بەپێی دەرئەنجامە عەمەلیەکان) پزیشكو دیدی پزیشکی دەسەڵاتێکی ئەوتۆی پەیداکرد کە پزیشکان لە سەدەکانی ناوەڕاستدا خاوەنی نەبوون. نابێ لە گرنگی پەیدابوونی دەزگاکان کەم بکەینەوە. دەزگاکان بە شێوەیەکی چارەنووسساز هاریکاری بنەمای (دەسەڵاتی نوێ)) یان کرد. ئەو دەزگایانە شێوەیەکی تازەی سەرکوتکردنیان هێناوەتە ئاراوە. جیاوازی نێوان یەهودیو نایەهودی، رەگێکی قوولی لە کلتوری ئەوروپێدا هەیە، بەڵام ئەم جیاوازیە تەنها کاتێك بووبە ((کردارێتی (فعلیت) کاملی کۆمەڵایەتی بۆ پتەوکردنی دەسەڵاتی باو) کە یەهودیەکان سەرەتا بۆ گرتۆکانو پاشان بۆ ئۆردوگاکانی مرۆڤ سوتاندن رەوانەکران.

کاری فۆکۆ لێکۆڵینەوەیە لە دەزگاکانو لەم رێگەیەشەوە لێکۆڵینەوەی بیرۆکەکان بەهۆی گوتارەوە. ئەوەی باسمان کرد تاکە رەخنەیەك لە کتێبەکەی [فۆکۆ]و لە تێڕوانینی بۆ شێتی، نیە. لەچواری مارسی ١٩٦٣ دا فەیلەسوفێکی لاو و نەناسراو کە هێشتا کتێب یان وتارێکی بڵاو نەکردبۆوە، لە زانکۆی سۆربۆنو لەبەردەم مامۆستا سەختگیرەکەیدا: [واتە] ژان ڤاڵ (کە سەردەمێك مامۆستای فۆکۆش بوو) وتارێکی درێژی لەبارەی سێ پەڕەی کتێبی ((مێژووی شێتیەوە)) خوێندەوە.

خوێندنەوەی ئەم وتارە کە فۆکۆش لەناو گوێگرانیدا ئامادە بوو، تەنها لە سێ پەڕەی کتێبە حەوت سەد پەڕەیەکەی [فۆکۆ] ورد بوویۆوە. پاشان دەقی ئەم وتارە لە کتێبی ((نووسینو جیاوازی)) دا (١٩٦٧) بڵاوکرایەوە. ژاك دێریدا لەو وتارەدا نوسیوێتی ((هەر ئەم سێ پەڕەیەی کتێبەکەی فۆکۆ واتە شێوەی خوێندنەوەی دیکارتو Cogito یان منی بیرکەرەوەی‌دیکارت، لە بنەڕەتدا سەرجەم گرفتو کێشەی سەرەکی ((مێژووی شێتی)) ئاشکرا دەکات))[٢٠]. دێریدا دەریدەخات فۆکۆ سەرەتا چەمکی خودی (سوژە) قبوڵکردووە (ئەگەرچی لە بابەتی تایبەتی شێتیدا)) پاشان ناچار بووە سود لە ((خودی سیستمی عەقڵ)) دژی خود وەربگرێتو نموونە لە خود (سوژە) دژی خود بهێنێتەوە[٢١]. فۆکۆ بڕوای وایە دیکارت لەبەردەم دەنگی شێتیدا، بێدەنگ بووە و لە باسەکەی خۆیدا دوری خستۆتەوە. دێریدا بەهۆی وردبوونەوە لەو سەرچاوەیەی‌کە فۆکۆ لە پەرەگرافی تێڕامانی یەکەم لە ((قوڵبوونەوە فەلسەفیەکان)) (١٩٦١) ی دیکارتەوە وەریگرتووە، هەوڵدەدات هۆی ناکامی فۆکۆ لە رەخنەکەیدا ئاشکرا بکات. ئەم وردبوونەوەیە لە پارچەیەکی کورت بۆ دەرخستنی هەڵەگەورەکان، یەکێکە لە شێوازە تایبەتیەکانی دێریدا. ئەو لە ((دەنگو دیاردە)) شدا (١٩٦٧) تەنها چەند رستەیەکی کتێبە گەورەکەی هوسریل: واتە ((لێکۆڵینەوە لۆژیکەکان)) ی خستە ژێر لێکۆڵینەوەوە. خۆی دەڵێت ئەم کارە لە فرۆیدەوە فێر بووە کە بەهۆی (خوێندنەوەی پارچەیەکی کورت لە رووبەڕووبوونەوەیەکی درێژخایەندا) هەوڵدەدات ((نەگونجانی پارچەکە)) ئاشکرا بکات.

فۆکۆ لە سەرەتای فەسڵی ((زیندانی گەورە)) ی کتێبی مێژووی شێتیدا، نوسیوێتی ((ئەگەر چی لە رۆژگاری رێنسانسدا کۆنترۆڵی وێرانکاری شێتی کرا بوو بەڵام هێشتا دەنگی ئازادانە بەرگوێ دەکەوت.. [بەڵام ئەم دەنگە] لە رۆژگاری کلاسیکیدا بێدەنگ بوو، بەهۆی ئەو هێزە مەزنەوە کە بە کارهات.. دیکارت لە رێی گومانەوە شێتی کرد بە هاوڕێی خەونو شێوەکانی دی گوناهەکان (یان هەڵەکان) لە رێنسانسەوە بۆ سەدەی ((١٧)) شتێك رویدا کە بە بڕوای دێریدا دۆزینەوەی، جەوهەری سەرەکی کتێبەکەی فۆکۆیە. بێدەنگی، شێتی. خودی فۆکۆش لە پێشەکی کتێبەکەیدا نووسیوێتی ((زمانی دەرون پزیشکی مەنەلۆجی عەقڵە لەبارەی شێتیەوەو ئەم زمانەش تەنها لەسەر بناغەی ئەو بێدەنگیە، دامەزراوە .. من نامەوێ مێژووی ئەو زمانە بنوسمەوە بەڵکو دەمەوێ رەگو ریشەی ئەو بێدەنگیە بناسم.)) گوتاری دەرون پزیشك لەبارەی عەقڵباوەڕیەوەیە لە لوتکەی دەسەڵاتدا. بەڵام دێریدا دەڵێت ((دەرون پزیشك تەنها یەکێك لە نوێنەرەکانی ئەم سیستمەیەو زیاتر لەوەش نیە)). ئەو دەڵێت ناتوانین بەهۆی خستنە ناو کەوانەی زمانی دەرونپزیشکیەوە، وا بزانین خۆمان لەباری دەسەڵاتو زمانی عەقڵباوەڕی، رزگارکردووە. فۆکۆ کە ((زمانێکی تازەی دروست نەکردووە)) خودی ئەم گوتارە بەکاردەهێنێتو لە ((دەنگو زمانی شێتیەوە) دوورە. واتە هاوبەشی ئەو ((گوناهەیە)) کە دەیگێڕێتەوە، رەنگە کارەکەی فۆکۆ بیتوانیایە ((لە رێگەیەکی دیەوەو بەپێی نەخشەیەکی دی)) بەرەو پێش بچێت، بەڵام زمانی فۆکۆ ((ئەو زمانەی تر)) و لۆژیکی ((ئەو لۆژیکەی تر)) نیەو خودی کتێبەکەش لەسەر بناغەی جیاوازی نێوان عەقڵو شێتی، دامەزراوە.

فۆکۆ خۆی دانی بەوەدا دەنا کە لەسەر بناغەی زمانی عەقڵباوەڕی لەگەڵ عەقڵدا دەجەنگێت. بەڵام چیرۆکی ئەم دژایەتیانە لە فەلسەفەدا، چیرۆکێکی کۆنە. ئەوەی گرنگە

زانینی ((جیاوازی نێوان عەقڵو شێتیە)) کە دروستکراوەو ((لە بنەڕەتدا بوونی نەبووە). بەڵام ڕەخنەکەی دێریدا لەم خاڵە زیاتر دەڕوا.

ئەو دەنوسێت فۆکۆ مێژووی جیاوازی عەقڵو شێتی لەسەر بناغەی زمانی عەقڵباوەڕان نوسیوەتەوە. ئەگەر مێژوو، نەریتو عەقڵ بەهۆی دابەشبوونو جیابوونەوەو جیاوازی عەقڵو شێتی ((بە ماناو بێماناوە)) فۆرمەلە بووە، ئایا مێژوونووس نابێت خۆی بخاتە سەرو ئەم جیاوازیەوە؟ ئایا نابێت بڕوای بەو بێعەقڵیە هەبێت کە کاملترە لەو عەقڵباوەڕیەی لە دابەشکردنی دوالیزمەکانی – وەك عەقڵو شێتیدا– دەردەکەوێت؟ لە ڕاستیدا مێژووی جیاوازی عەقڵو شێتی، تەنها بە زمانێك دەنووسرێتەوە کە ئەم دابەشکردنەی تێپەڕاندبێت، دێریدا دەزانێت کە زمانێکی وا بوونی نیە. کەوابوو داوا لە فۆکۆ دەکات لە نهێنی ئەو دژایەتیە تێبگات کە تووشی بووە: فۆکۆ نازانێت –ناشتوانێت بزانێت– کە شێتی چیەو زمانەکەی کامەیە، بەڵام وا دەنووسێت وەك ئەوەی بزانێت شێتی چیە. تەنانەت پێناسەی ئەو بۆ بێعەقڵی واتە: ((شتێك کە لە نەبوونی عەقڵەوە بەدەست دێت))، دەریدەخات کە بناغەی کارەکەی عەقڵە، بەڵام عەقڵ بە تاوانبار دەزانێتو [بڕوای وایە] ناتوانرێت پشت بە بنەمای کارەکانی ببەستین. دەتوانین لەم شێوازی ڕەخنەگرتنەدا بناغەی کارەکانی خودی دێریداش بناسینەوە: دەبێ لە دوانە لێکدژەکان ڕزگارمان بێت، لەم حاڵەتەدا لە دوالیزمی مانا بێمانایش ڕزگارمان دەبێتو بڕوا بە ((خۆ ئاشکرابوونی)) مانا، ناهێنین، واتە قبوڵیناکەین کە مانا ئامادەیە یان دەتوانێت ئامادەبێت. بە زمانی هایدگەر هێشتا لە سەردەمی میتافیزیکدا دەژینو تەنانەت ناتوانین مۆدێرنیتیش بە فەسڵێکی تازە لەکتێبی میتافیزیکدا، دابنێین، دێریدا دەڵێت مۆدێرنیتی وەك سەردەمی پێش مۆدێرن هەر بڕواهێنانە بە ئامادەبوونی ماناو سەنتەرلیزمی ئاخاوتنو بەکورتی بڕواهێنانە بەوەی پێی دەگوترێت ((میتافیزکیای ئامادەبوون)). بیری مۆدێرن وەك بیری دینیو سیستمە فکریەکانی سەدەکانی ناوەڕاست، بڕوای بە دوانە لێکدژەکان هەیە. ئێستا با زیاتر لە باسەکەی فۆکۆ و دێریدا وردبینەوەو بگەڕێینەوە بۆ بابەتی سەرەکی جیاوازی نێوانیان، واتە [بگەڕێینەوە بۆ] باسەکەی فۆکۆ لەبارەی ئەو حوکمەوە کە دیکارت لە ((قوڵبوونەوە فەلسەفیەکاندا)) لەبارەی شێتیەوە دەرکاندویتی. دیکارت لە یەکەم تێڕاماندا دەنووسێت:

((هەموو ئەوانەی تائێستا وەك بەڵگە نەویستو ڕاسترین بابەت قبوڵمکردووە لە هەستەکانەوە یان بەهۆی هەستەکانەوە فێریان بووم. بەڵام هەندێك جار بەهۆی تاقیکردنەوەکانەوە بۆم دەرکەوتووە ئەم هەستانە هەڵخەڵەتێنەرنو پێویستیەکانی وریایو ئاگاداری (حزم و احتیاط) ئەوەیە زۆر پشت بە شتێك نەبەستین کە جارێك هەڵیخەڵەتاندوین. ئەگەرچی هەستەکان هەندێك جار لەبارەی شتە زۆر وردو زۆر دوورەکانەوە، هەڵماندەخەڵەتێنن، بەڵام ڕەنگە بەرەو رووی زۆر شت ببینەوە کە ئەگەرچی بەهۆی هەستەکانەوە زانیومانە، بەڵام ناتوانین بەشێوەیەکی عەقڵپەسەندانە گومانیان لێبکەین. بۆ نموونە من لە تەنیشت ئاگرەکەمەوە دانیشتووم، جلی تایبەتی ماڵەوەم لەبەر کردووەو ئەم پەڕەیەم بەدەستەوە گرتووەو... شتی لەم بابەتە. بەڵام چۆن دەتوانم نکوڵی لەوە بکەم کە ئەم دەستو ئەم جەستەیە هی منە؟ مەگەر خۆم بەو شێتانە دابنێم کە مێشکیان ئەوەندە پەشۆکاوەو ئەوەندە بە هەڵمی تاریکی زەردوی، ڕەشبووە کە لەوپەڕی بێتوانایدا خۆیان بە شا دەزانن و لەوپەڕی روتیدا خۆیان پۆشتە بە جلێکی ئاڵتونیو ئەرخەوانیەوە دەبینن. یان خۆیان بە کوپە دەزانن یان خەیاڵ ئەکەنەوە جەستەیان لە

شوشەیە. بەڵام ئەمانە شێتن و ئەگەر منیش ئەوانم ئەکردە نموونەی خۆم ئەوسا لە قسەی پڕوپوچدا هیچم لەوان کەمتر نەدەبوو))[٢٣].

دیکارت لە درێژەی باسەکەیدا دەنوسێت تەنها لەو حاڵەتەدا [واتە لەحاڵەتی شێتیدا] دەتوانێ گومان ((لە شتە بەدیهیەکان)) بکات. ئەگینا تەنانەت ڕێگایەك هەیە بۆئەوەی بزانین لە خەودا نین و خەون نابینن یان ئەوەی ڕاستەوخۆ دەیبینین زادەی وەهمەکانمان نیە، شێوەی ڕووبەڕووبوونەوەی دیکارت لەگەڵ ((دەنگی شێتەکاندا)) بەمشێوەیەیە. ئەو شێتی لە ریزی خەیاڵبازیو وەهمو هەڵەو خەوەکاندا، دادەنێ. بەڵام فۆکۆ ئەوە ئاشکرا دەکات کە بەردەوام دیکارت لە باسکردنی ئەم شتانەدا (واتە خەیاڵبازیو وەهمو خەون) بناغەی عەقڵباوەڕی و عەقڵخوازی بە سەقامگیر دەبینێ و تەنها کاتێك دەگاتە شێتی، لێکدژی عەقڵ/ شێتی دەکاتە شتێکی بنەڕەتی. شێتی هەربە نەتوانینی بیرکردنەوەی عەقڵانی دانەدەنرا بەڵکو بە نەتوانینی بیرکردنەوەش دەزانرا. بەم شێوەیە شێتی لە بازنەی لێکۆڵینەوەو باسەکان دەچێتە دەرەوە. بەڵام دێرێدا دەنوسێت دیکارت هەموو ئەو بیرۆکانەی کە سەرچاوەی هەستیان نیە، دەخاتە دەرەوەی بازنەی حەقیقەتو لێرەوە جیاوازی ناکات لە نێوان بیرۆکەیەك کە پەیوەستە بە شێتیەوەو بیرۆکەیەك کە پەیوەستە بەخەوبینەوە. لەلایەکی دیشەوە دیکارت هەر بەنموونەی شێتەوە ڕانەوەستا، بەڵکو نموونەی خەونیشی هێنایە پێشێ. چونکە ڕەنگە خوێنەر یان گوێگرەکەی (کە مەرج نیە فەیلەسوف بێت) نموونەی شێت بەنموونەیەکی ڕاست نەزانێت. بەڵام خەون یانە وەهم یان هەڵە شتێکی هاوبەشە لەنێوان هەمواندا (هەموو ئەو کەسانەی قسەکەر [یان نێرەر] بە عاقڵیان دەزانێت) .. دروست وەك چۆن ئەو وەرگرە (گریمانەیە) دەیتوانی دەرەئەنجامەکانی کاری فرۆید لەهیستریادا قبوڵەکات چونکە نەیدەزانی بابەتی هیستریای نەخۆشەکان بەسەر هەمواندا تەعمیم بکات. فرۆید لە وەڵامی [ئەمەدا] دەیتوانی بڵێ ((زۆر باشە با واز لە هیستریا بهێنین. بەڵام تۆ هەنوکە سەرنج لە شتێك بدە کە لەنێوان هەمووماندا هاوبەشە: خەون))[٢٤].

بەڵێ بنەمانی حوکمی فۆکۆ سەبارەت بە جیاوازی بنەڕەتی عەقڵو شێتی، دەچێتە ژێر پرسیارەوە، بۆچی؟ دێریدا دەڵێت لەبەرئەوەی فۆکۆ خۆی دیلی ئەو جیاوازیەیەو لە گوتاری عەقڵباوەڕانەوە دەست پێدەکاتو بەهۆیەوە بەرەو پێش دەچێت.

## خەستەخانەو بەندیخانە

فۆکۆ پاش مێژووی شێتی، هەر بەردەوام بوو لە لێکۆڵینەوەکانیدا سەبارەت بە پەیوەندی نێوان ئەو دەزگایانەی دەسەڵات لەواقع و لە گوتاردا (و بەهۆی گوتارەوە) پتەو تر دەکەن. فۆکۆ لەکتێبی گرنگی دوای خۆیدا: واتە ((لە دایکبوونی کلینیکی [عیادە])) (١٩٦٣) درێژەی بەم باسەدا[٢٥]، لە چاپی دووهەمی دەقە فەڕەنسیەکاندا ناونیشانی دووهەمی کتێبەکە ((ئەرکۆلۆژیای زانینی پزیشکی))، سەرایەوەو لە وەرگێڕانە ئینگلیزیەکەیدا گۆڕا بۆ ((ئەرکۆلۆژیای ئیدراکی پزیشکی)) بەڵام بە ڕاستی ئەو ناونیشانە دووهەمەی چاپە سەرەکیەکەئامانجی کتێبەکە، ڕون دەکاتەوە: [کە بریتیە لە] لێکۆڵینەوەی لەدایکبوونی ئەو دەزگایانەی کەلە بنەڕەتدا دروستکەری دەزگاو گوتاری دەسەڵاتدارن و لە وشەی زانینی پزیشکیدا دەردەکەوێت. دەسەڵات لە هەناوی هەموو یاریەکی زمانیدا حەشار دراوە. هەر یاریەکی (زمانی) پابەندە بەو ڕێکەوتننامانەوە کە دەبێ قبوڵبکرێت بۆ ئەوەی یاریەکە دروست ببێو بەرەو پێش بچێت. بەرەوپێشچوونی یاری واتە پەیدابوونی هەمە ڕەنگی لە سنوری یاساکاندا. شتێکی بە ڕاستی

تازه بوونی نیه مەکەر یاریەکی تازه به یاسایەکی تازەوە [دروست ببێ]. لەناو ئەم یاسایانەدا یەکێك له شێوه زانراوەکان له پێشەوه دروست دەبێت، شتێکی له پێشەوه زانراو بۆ یاسادانەر نەك بۆ یاریکەر.

فۆکۆ جارێك وتبووی له ((خشتەی وشه یەکتر برەکان)) فێری ئەرکۆلۆژیا بووه. یاساکه بەم شێوەیەیە، له نێوان هەموو شێوەی هاوکێشەکاندا که دەکرێت چونیەك بن.. تەنها یەکێك لێرەدا راسته.. ئەوەی که لەگەڵ (ستونەکەی تردا) دەگونجێ. دۆزینەوەی وشەکه تەنها بەهۆی ئەم گونجاوه مومکین دەبێت. ((لەدایکبوونی کلینیکی)) ئاشکرای کرد لەناو شێوه مومکینەکانی تێڕوانین یان تێڕوانینی پزیشکیدا، ئەوەیان راسته که لەگەڵ یاسا سەرەکیەکانی دەسەڵاتی جێگیردا، دەگونجێت. له یەکەم رستەی کتێبەکەدا دەخوێنینەوه ((گرفتی ئەم کتێبه فەزا، زمانو مەرگه. گرفتی دیدگایه)). تێڕوانینی پزیشکی شێوەیەکی دیدگایه که بەهۆی رێکەوتن نامەیەکی سیمۆلۆجیەوه فۆرمەله دەبێت. له راستیدا ((دیدگا)) مەسەلەی دەرونیو شاراوەی ((مێژووی شێتیش)) بوو، دیدگای ئەرکۆلۆژیست بۆ دیدگای کۆمەڵگا، بۆ دیدگای شێت (و) بۆ عەقڵ.

کاری فۆکۆ له ((لەدایك بوونی خەستەخانەدا)) دۆزینەوەی نهێنیەکی گرنگه: چۆن دیدگای پزیشك بۆ نەخۆش گۆڕا بۆ ((زمانی پزیشکی)) تەنانەت خاڵی سەرەکی لەمەش تایبەتیتره، چۆن زمانی پزیشکی واته زمانی چەمكو میتۆدەکان، زمانی رێکەوتننامه تایبەتیەکان، نەیتوانیوه دەلالەتو مانای ترازیدی مەرگ بگۆڕێت؟ [٢٦] مەرگو شێتی هەریەکەیان به شێوەیەك نکوڵی له (سوژه) یان ((مرۆڤ)) ئەکەن. راڤەکردنی مەرگ واته پوچکردنەوەی ئەم نکوڵیکردنه، ((لەم راڤەکردنی مەرگەوه بوو که پزیشکێك دروستکرا که خۆی به زانست لەبارەی بابەتێکی فەردیەوه، ناونا)) [٢٧]. فۆکۆ له پێشەکی کتێبەکەیدا نووسیوێتی پاش نیتچه ئەو بیرۆکەیەی کانت لەناو چوو که ئەگەری رەخنەکاری دەبەستەوه به بوونی شتێکەوه بەناوی ((زانین))، ئەوەی مایەوه بوونی شتێك بوو بەناوی (زمان))ەوه، زمانیش لەو جێگەیەدا بەکاردێت که ((تەفسیرێك)) له گۆڕێ بێت، واته مانای شاراوەی هەر وتارێك ئاشکرا بکات، ئەم خەسڵەته تەفسیریە رێگا بۆ ((نووسینەوەی مێژووی گوتار)) خۆش ئەکات. بەڵام ئەم مێژووه [واته مێژووی گوتار] کاتێك فۆرمەڵه دەبێت که پەیوەندی گوتار به دەسەڵاتەوه، بناسرێت. لێکۆڵینەوەی دیدگا یان تێڕوانینی پزیشکی خۆی لەخۆیدا، لێکۆڵینەوەی ((گوتاری پزیشکیه)) که له کۆتایی سەدەی هەژدەوه (مانای ئەمڕۆی خۆی وەرگرتووه))و به کەڵکی سەقامگیر بوونی دەسەڵاتی ((خود)) (سوژه) هاتووه. سەقامگیربوونی گوتاری [که خەسڵەتەکانی بریتین لەوەی] نکوڵی له تیۆره دەکات، واز له سیستم دەهێنێ، خاوەن تێڕوانینێکی فەلسەفی نیەو بەتەواوی ئەزمونگەرەو ئەمڕۆ پابەنده به پێشکەوتنی ئامرازو تەکنەلۆژیاوه) له پەیوەندی دەسەڵاتی پزیشك به بێدەسەڵاتی نەخۆشەوه، سەرچاوەی گرتووه. دەسەڵاتێك که پشتی به زانینو ئەزمون بەستووەو هەرچەنده نەك هەمیشه، بەڵام له زۆربەی کاتەکاندا پەیوەندی زانینو دەسەڵات، دەسەلمێنێ.

گوتاری پزیشکی، له لێکۆڵینەوەی جینالۆجیای شێوەکانی گوتاردا (که بابەتی سەرنج راکێشەری فۆکۆ بوو) جێگەیەکی گرنگی هەیه، چونکه گوتارێکی بێپەردەیەو ئاشکراکەری پەیوەندی زانیاری پزیشكو دەسەڵاتی پزیشکه، و له هەمانکاتدا گوتارێکه که بنەمای خۆی وەك گوتار به رەسمی ناناسێت. [دواجار چونکه] بۆ نکۆڵیکردن لەو جیاوازیانەی رێگەیان بۆ ئامادەبوونی وەك گوتارێکیزانستی،

خۆشکردووه، نکولی له خۆی دەکات. لە گوتاری پزیشکی تازەدا [واتە] لە سەدەی نۆزدە بە دواوه) ڕێگایەك كرایەوە كە پێچەوانەی ڕێگای گوتاری فەلسەفیه مرۆڤ لە پزیشکیدا بەپێی سنوردار بە (جەستەیی و فکریەکانی) یەوە پێناسەکراو لە فەلسەفەدا بەپێی خەسڵەتی بڵندەگی (استعلایی) (گریمانەی) خۆی. لە پزیشکیدا شوناسکار لە بابەت (ئوبژە) جیا بۆوه، مرۆڤ توانی نهێنیترین واقعی وجودی مرۆڤێکی دی بناسێت، لە فەلسەفەدا مرۆڤ هەم بابەت و هەم خود بوو. لە دەرئەنجامدا ئەم سەچاوە دژ بە فەلسەفەیە، گوتاری پزیشکی (ناچار کرد) پشت بە پێشکەوتنە تەکنیکیەکان بێ سوود وەرگرتن لە تیۆرە، ببەستێ.

فۆکۆ لێکۆڵینەوەی وردتری لەسەر گوتارو دەسەڵات لە ((وشەکان و شتەکان)) ١٩٦٦، ((ئەرکۆلۆژیای زانین)) ١٩٦٩ و لە وتارێکی زۆر گرنگدا لە ((کۆلێژ دو فرانس)) واتە ((سیستمی گوتار)) ١٩٧١دا، درێژە پێدا. بەڵام (فۆکۆ) لە کتێبێکدا کە پاش هەموو ئەمانە بلاویکردەوە، جارێکی دی دەستیکرد بە جینالۆجیای دەزگا دەسەڵاتخوازەکان و ئەو دەزگایانەی بەستەوە بە سیستمی گوتاری یاسایی و ((تێڕوانینی یاسایی)) یەوە. کتێبی ((چاودێریکردن و سزادان)) (١٩٧٥) بریتیە لە جینالۆجیای یەکێك لە دیارترین دەرکەوتنەکانی دەسەڵات، (واتە) بەندینخانە. ئەم کتێبەش بەرلەوەی ((مێژووی بەندیخانە)) بێت ((دۆزینەوەی چەمکی ئەمرۆیی و مۆدێرنی سزادانە)). کتێبەکە بە دوو بەڵگە دەست پێدەکات. یەکێکیان راپۆرتێکە لەبارەی ئەشکەنجەو مردنی تاوانبارێك لە ساڵی (١٧٥٧ دا کە بە تۆمەتی هەوڵی کوشتنی شا (گیرابوو). ئەشکەنجەو مردنێك کە لە مەیدانی پاریسداو لەبەردەم هەزاران سەیرکەردا بە ئەنجام گەیاندرا. دووهەمیان بەڵگەیەکە کە هەشتا ساڵ پاش بەڵگەی یەکەم نوسراوەو راپۆرتێکی ورده لەبارەی ژیانی رۆژێکی تاوانبارانی دادگای جەزایی فەرەنسا. جیاوازی لەنێوان توندوتیژی (عنف) بەڵگەی یەکەم و توندوتیژی شاراوەی ((بەرنامەی بەندیخانە)) دا هەیە.

بەلام فۆکۆ لە کتێبەکەیدا هەوڵیداوە دەریبخات کە دووهەمیان وێرانکارانەترو ترسناکترە[٢٨]. لە یەکەمیاندا جەستە ئەشکەنجە دەدرێت و بەلام لەدووهەمیاندا گیانی (مرۆڤ) ئازار دەدرێت دەستدرێژی دەکرێتە سەر. یەکەمیان لە ئەشکەنجەدا بەدوای تۆڵەو (بە وتەی خودی ئەشکەنجەدەران) بە دوای دۆزینەوەی راستیدا دەگەڕێت، [بەلام] دوهەمیان لە ئەشکەنجەدا بە وردی بەدوای سزادانا دەگەڕێت و (دەیەوێت) هاوکات لەگەڵ سزادانیدا بیرۆکەی ملکەچی لەگەڵ هاوڕەنگ بوون لەگەڵ کەسانی دیدا، بکات بەیەك شت. واتە بەتەنها نایەوێت سزابدات بەڵکو ئامانجی چاك کردنەوەی رۆح و دوبارە پەروەردەکردنێتی. دەیەوێت پاڵ بەو (کەسەوە بنێت کە) بە ((شتێکی ناسروشتی)) دەزانێت و بەرەو ((سروشتی بوونی)) بەرێت. بەرلەوەی مەبەستی ئازاردان بێت، بەتەمای ئەوەیە ((تاوانبار بکاتە هاوڕێی خۆی)). [واتە] تاکەکان گوێڕایەڵ و ملکەچ بکات.

بەندیخانەو سزادان (بە وتەی فۆکۆ) بەرهەمهێنەرە. [چونکە] مەبەستی بە سوودبوونی مرۆڤ و جەستەکانە. لە قاڵب دەدات و فۆرمەلە دەکات. ئەم تێڕوانینە ((یاسایی – سزایی)) مۆدێرنە، هەمان ئەو کارە دەکات کە ئامانجی ((زانستە مرۆییەکان)) ە. دەسەڵاتی رووتی بەندیوان زانینەوە دەبەسترێتەوە.

رەنگە بتوانین بەسەرنجدان لەم گۆڕانەی مانای زیندان، وەڵامی ئەو پرسیارانە بدەینەوە کە لە سەرەتای کتێبەکەی فۆکۆدا کراون: بۆچی بەندیخانە لە رۆژگاری مۆدێرندا گرنگترین و (رەنگە) تاکە ئامێرێکی بنەڕەتی، سزادانە؟ پەیوەندی بەندیخانە بە دەزگاکانی ترەوە چیە،

کە مرۆڤەکان گوێڕایەڵو ملکەچ دەکەن؟ واتە: خێزان، قوتابخانەو کەلیساو..؟ ئایا چەمکی بەندیخانە (کۆکردنەوەی‌مرۆڤ) لە چەمکی کۆکردنەوەی سەرمایەوە، نزیکە؟ فۆکۆ وتوێتی ((بۆچی جێی سەرسوڕمانە ئەگەر ژووری زیندان بە بەشەکەی تریەوە: واتە کاری ناچاری، و هێزی دەسەڵاتداری بەندینخانە بە هەموو دەزگاکانی چاودێریکردنو دەستنیشانکردنو بە پارێزەرانی ڕێکخستنیەوە [کە هەر هەموویان] بەردەوامی دەدەن بە کاریگەری چەند لایەنەی داوەری -ئامێری مۆدێرنی سزادان بێت؟ ئایا هیچ جێی سەرسوڕمانە گەر بەندیخانە لە کارخانە، قوتابخانە، سەربازخانەو خەستەخانە، بچێت))[٢٩].

گوێڕایەڵکردن، هاو ڕەنگیکردنو یاساڕێژکردن بەبێ چاودێری کردن، ناکرێت. فۆکۆ لە کتێبەکەیدا ئاماژەی بۆ ((ئامانجی چاودێریکردن)) کردووە (کە بریتیە لە) ((بینینی سەرتاسەری )) ئەم ئامانجە لە پێشنیارەکەی ((فەیلەسوفو ئابوریزانی لیبراڵی سەدەی نۆزدەدا) واتە لە ((جرمی بنتام)) داودەبینرێت: دروستکردنی ناوەندێك لە بەندیخانەدا بۆ ئەوەی بەندیوان بتوانێت لەیەك سەیرکردندا هەموو گۆشەکانی بەندیخانەو هەموو ژوورو ڕاڕەوەکان، ببینێ. ئەم نەخشەیە لەلایەن یەکێك لە فەیلەسوفە ئازادیخوازەکانەوە پێشکەشکراوە بۆئەوەی چاودێریکردن ئاسان بکات. فۆکۆ سودی لە دەستەواژەی ((سەرتاسەری بین)) یان ((هەموو شوێن، بین)) وەرگرتووە، بۆ ئەوەی بیرۆکەی ئەمرۆی بەندیخانە روون بکاتەوە : [کە بریتیە لە] یەکسانکردن، هاوڕەنگکردن، چوونیەك کردن. بیرۆکەیەك کە بابەتی دوا کتێبی فۆکۆ بوو (بەلایەنی کەمەوە دەتوانین بە دڵنیاییەوە بڵێین بابەتی بەرگی یەکەمی کتێبەکەی بوو).

کارکردنی سیکسوالیتی چ جیاوازیەکی لەکۆمەڵگای مۆدێرندا بەسەرهاتووە بۆئەوەی چوونیەك کردنو هاوڕەنگ کردن، باشتر دروست ببێ؟ بۆئەوەی مرۆڤەکان بەهۆی تێرکردنی پێویستیەکی غەریزیەوە، زیاتر لەیەك بچن؟

دەتوانرێت بە سوود وەرگرتن لە سەرتاسەربین بەدوای ((ڕەگی هەموو شێوە ئەندێشەیەکی بینراودا)) بڕۆین. دەتوانرێت منداڵانی جیاوازی لەسەر بنەمای سیستمە فکری جیاوازەکان، پەروەردە بکەینو وا لە هەندێکیان بکەین قبوڵی بکەن کە دوو کۆی دوو دەکاتە پێنج یان ئەوەی کە مانگ بریتیە لە پەنیرێك، و پاشان دیسانەوە هەموویان لە تەمەنی بیست یان بیستو پێنج ساڵیدا لە تەنیشت یەکەوەدابنێین.. سەرتاسەر بین لە شێوەی تاقیگایەکی دەسەڵاتداکاردەکات کە بەهۆی میکانیزمەکانی چاودێریو پشکنینەوە دەتوانێت بەشێوەیەکی کاریگەرو بەهێز، کار لە ڕەفتاری مرۆڤەکان بکات. زانستیش پێبەپێی پێشکەوتنی یاسا، پەرەیسەندووەو لە سەرتاسەری سنووری کارەکانی دەسەڵاتدا، بابەتی تازەی بۆ لێکۆڵینەوەو ئاین، دۆزیوەتەوە. بەکارهێنانەکانی سەرتاسەر بین، هەمەڕەنگە زیندانیەکان چاك دەکاتەوە، نەخۆشەکان تیمار دەکات، خوێندکارن پەروەردە دەکات، چاودێری شێتەکان دەکات، سەرپەرشتی کرێکاران دەکاتو سواڵکەرو بێکارانیش دەخاتە سەرکار. سەرتاسەر بین شێوەیەکە لە سەقامگیربوونی جەستەکان لە فەزادا، شێوەیەکە لە دابەشکرنی‌تاکەکان بە نیسبەت یەکترەوە شێوەیەکە لە ڕێکخستنی زنجیرە پلەیی، شێوەیەکە لە دیاریکردنو تایبەتکردنی (تخصیص) پایەو کەناڵەکانی دەسەڵاتو شێوەیەك لە پێناسەی ئامێرو ڕێگاکانی بەکارهێنانی دەسەڵات کە دەتوانێت لە ((خەستەخانە - کارخانە - قوتابخانە و بەندیخانەکاندا)) بەکار بهێنرێت. دەتوانرێت هەرکاتێك باس لە سەپاندنی کار یان ڕەفتارێك

بەسەر کۆمەڵێك تاکەکەسدا کرا، نەخشەی سەرتاسەر بێن، بەکار بهێنرێت.[٣٠]

فۆکۆ گەرچی لەزگەی بونیادگەری بۆ بەرهەمو بۆچونەکانی، قبوڵنەکرد بەڵام لە (وشەکانو شتەکان) دا نووسی ((بونیادگەری میتۆدێکی تازە نیە، [بەڵکو] هوشیاری بێدارو چاودێریکەری زانینی تازەیە)).[٣١]

فۆکۆ لەهەمان ساڵی بڵاوبونەوەی کتێبەکەیدا – واتە ١٩٦٦ – لەبەرنامەیەکی تەلەفزیونیدا بەناوی ((خوێندنەوە بۆ هەمووان)) ەوە، ووتی: ((ئەمرۆ بە زانینێکی پەتی، بە زانستێکی پشت بەستوو بەکار، شتێکی ئەبستراکتو گشتی وەك زماننناسیو بنەڕەتی وەك لۆژیك، گەیشتوین)).[٣٢] ئەو لەم بەرنامەیەدا رایگەیاند لیڤی شتراوس میتۆدێکی دروستی پەیڕەوکردووە. [چونکە] خۆی سەرقاڵی ناسینی هێڵەکانی بەردەوامی پەرەسەندن، نەکرد، بەڵکو هەوڵیدا ((یاساکانی نابەردەوامی)) بدۆزێتەوە. **یاساکانی نابەردەوامی.** ئەگەرچی ئەم زاراوەیە لە سەرنجی یەکەمدا وردبین نیەو وا دێتە پێش چاو کە دژایەتی تێدایە، بەڵام ئەگەر سەرنج لەو خاڵە بدەین کە بە راستی رابردووی کلتووری ئێمە شتێکی (نامۆیە) بۆ ئێمەو شێوەی ئەم نامۆبوونەش دەتوانی یاساو رێسایەکی هەبێت، ئەوا حوکمەکەی فۆکۆ ئەوەندە سەرسوڕهێنەر نابێت. لە راستیدا فۆکۆ بنەماکانی میتۆدی گیانناسی، جیولوجیاو زیندەوەرزانی، بەراست داناوەو [هەمان میتۆدی] لە ((زانستە مرۆییەکان)) دا بەکارهێناوە. خاڵی گرنگ دۆزینەوەی مێژوو نیە بەڵکو دۆزینەوەی رێسایەکی ((مێژوو داماڵینە)).

بایەخدان بە ((خود)) [سوژە] بەمانای نکوڵی کردنە لە ((مێژوو داماڵین)). [چونکە] پەرەسەندنێکی گریمانەی، خەیاڵی، ناواقعیو ((خود پەرستی)) دروستدەکات [هەروەها] وەهمی بوونی زانستێك [دروستدەکات]. (رەنگە مانا لە رووبەرەوە دەست پێبکات وەك رەنگدانەوەیەك... بەڵام خاڵی گرنگو سەرەکی: سیستەمە واتە قوڵاییە)).[٣٣] ژان پیاژە بە دروستی ئاماژەی بۆ ئەوە کردووە کە بونیادگەری جێگایەکە کەلێیەوە مانا دەست پێدەکات. واتە رووبەر بە ئامانجیخۆی دادەنێتو کاری بەسەر قوڵاییەوەنیە.[٣٤]. لێرەوە دەتوانرێت بگوترێت تێڕوانینی فۆکۆ بونیادگەریەکی بێبونیادە. بە مانایەکی تازە، دەتوانرێت کاری فۆکۆ بخرێتە بواری (دابڕانی پاش بونیادگەرانەوە لە بونیادگەری)).

گرنگترین لێکچوونی کاری فۆکۆو لیڤی شتراوس نکولیکردنە بە خود. هەردوو بیریار هیچ جێگایەکیان بۆ مرۆڤ لە بنەمای زانایدا، دانەناو خاڵی بنەڕەتیان لە مۆدێل یان نموونەکان، دەزانی. یۆنانیەکان بیریان لە خواکان، سروشت، جیهانو بەمانایەکی گشتی بیریان لە سیستمی هەبوو یان (COSMOS) دەکردەوەو هیچ پلە [یان بەهایەکیان] بۆ خود یان ئەو کەسەی پرۆسەی شوناسکردن ئەنجام دەدا، دانە دانە، لەگەڵ COGITO و ((من بیردەکەمەوە)) [ی دیکارتدا] ئەم بکەرە فەلسەفیە هاتە دنیاوەو پایەو پلەیەکی سەرەکی وەرگرت. بەڵام ئەندێشەی مۆدێرن لەلایەکی دیەوە لەگەڵ ((ناوەندگەریدا)) (مرکزیت) نەدەگونجا.

ئەستێرەکانی پاش رێنیسانس[٢]. ناوەندگەری زەویان بەلاناو [لێرەوە ئەندێشەی مۆدێرن] بەخێرایی بەو ئەنجامە گەیشت کە ناوەندێك لە ئاسمانەکاندا نیە. تێزەکانی داروین وەك ئەنجامێکی لوژیکی بایەلوجیا کە لە دوو سەدەی پێش داروینەوە پەرەی دەسەند، لەدەرئەنجامدا مرۆڤی بە ((رێکەوتێکی بایەلوجی)) لەقەڵەمدا. فروید دەریخست کە ئەو خودە باڵایە.. ئەو قارەمانەی مۆدێرنیتی، لە راستیدا هیچ نازانێت نە

---

[٢] مەبەستی نوسەر دۆزینەوە بەناوبانگەکەی کۆپرنیکۆسە. (و)

له جیهان دەزانێتو نه له وانی دیو نەله خۆشی. مرۆڤ تەنها له گوتاری فەلسەفیدا بوو که هێشتا پلەو پایەی ناوەندی [مرکزی] خۆی، پاراستبوو. پلەوپایەیەکی بڵندتر له سروشت و [وەك] فەرمانڕەوای سروشت. بەلام بەردەوام رۆڵی هوشیاری مرۆڤ، ئاشکراتر بوو، تا ئەو جێگەیەی ((پیشاندانی فەلسەفیانەی ماهیەتی مرۆڤ)) – وەك جورج باتای دەڵێت – بەبێ دەرئەنجام زانراو و مرۆڤی ئەبستراکت [تەجریدی] (تا رادەیەك بەهۆی هەوڵی فەیلەسوفانی ئینگلیزەوە له ئاسۆی لێکۆڵینەوە، فرێدرایە دەرێ. لیڤی شتراوس وتوویەتی جیهان بێمرۆڤ دەستی پێکردو هەر بێ مرۆڤیش کۆتایی پیدێ)).[٣٦] زانستەکانی ئەمڕۆ له دەرونیشکاریە تا ئەنسرۆپۆلۆجیا زماننناسی، ئەوەیان دەرخستووە که چیدی مرۆڤ ناوەندی جیهان نیە، فۆکۆ لەکاتێکدا ئاماژە بۆ دوو زانستی یەکەم دەکات (کە هەردوکیان مرۆڤیان سڕیوەتەوە))[٣٦]، گوتویەتی ئەمە کاردانەوەیەکە دژی مۆدێرنیتی که لەناو جەرگەی خۆیدا دروست بووە. بەبڕوای فۆکۆ گوتار – کە گرنگترین ئامانجی فۆکۆ بوو تەنانەت گرنگتر له دەسەلاتیش– یەکێتیەکی ((سەرو زەمانی)) و ((سەرو تاکەکەسی))و ((سەرو دەقی))[٢] هەیە. بە سڕینەوەی پلەی ناوەندی مرۆڤ، مرۆڤ لەناو ژمارەیەکی بێشوماری ئاخاوتنی نەناسراودا (واتە) [لەناو] رێسا سەرەکیەکانی گوتاردا) ون دەبێت. مرۆڤ بە هیچ شێوەیەك سوژەی گوتار نیە. سوبژکتفیسم (یان خودێتی) ناتوانی رەگەزێکی دەرەکی (وەك مرۆڤ) بێت، بەڵکو لەناو زەمینەی گوتاردا، [واتە] لەناو کۆمەڵی گوزارەو لوژیکی ئاخاوتندا)، دروستدەبێت. فۆکۆ دەنووسێت گوتاری مۆدێرن ئەو وێنایە [تصور] دروستدەکات (وك ئەوەی ئەوە دەنگی خودی خۆمان بێت کە گوتار بەرەو پێشەوە دەباتو [دەنگی خۆمانە] کە له گوتاردا دەردەبڕێ))، بەلام له راستیدا سیستمی گوتار پێویستی بە خودی دەرەکی نیە، له ((سیستمی گوتاردا)) باسی ئەم سەربەخۆییەی گوتار، کراوە. بە وتەی فۆکۆ گوتار، بەلگەیەك نیە که ئاماژە بۆ شتێکی دی بکات، بەڵکو وەك بینایەکی مێژوویی لەخۆیداو بۆخۆی، مانای هەیە. لێرەشەوە هەم مانای ئەرکۆلۆژیا دەزانرێتو هەم جیاوازی له جینالۆجیاش [ئاشکرادەبێت].

ئەرکۆلۆژیا میتۆدێکە. شێوەی دۆزینەوەی داناییو بەرەو پێشبردنی، زانینە. دۆزینەوەی شێوەکانی گۆڕانکاری ئەو چوارچێوە کۆتاییەیە که تیایدا زانین مومکینو دروست دەبێو دێتەدی، بەلام جینالۆجیا دۆزینەوەی هەلومەرجی مێژووی ئەو دیاردەیەیە کە دەمانەوێت بیناسین. دۆزینەوەی ((هەمەکیەکی [یك کلیت] مێژوویە)). نیچە بەو مانایە له جینالۆجیا تێدەگەیشتو [بەو مانایەش] دەیهێنایە ئاراوە. جینالۆجیا بەم مانایە ((پتر دۆزینەوەی مێژووی ئەمڕۆیە تا مێژووی رابردوو)). هەوڵدانی فۆکۆ بۆ دۆزینەوە ((مێژووی بەندیخانە))، نموونەیەکی باشە. سەرنجدان له هەمەکێتی [کلیت] مێژووی بەندیخانەی مۆدێرن، بۆ دۆزینەوەی کۆمەلگایە (که له بنەماکانیدا، کۆمەلگایەکی سزادەرە)). بۆ ئەم کارەش هەر ئەوەندە بەس نیە رابردو بەسەرەتای ئەمڕۆ بزانین، بەڵکو دەبێ هەنگاوێك بگەڕێنە دواوەو لەسەر پلەیەك راوەستین که بێ هیچ سەرنجێکی رەخنەگرانە بەسەریدا تێپەڕیون: [واتە] تێگەیشتن له جیاوازی ئەمڕۆو رابردوو. ((شێوازی)) فۆکۆ، رابردوو نا ئاشنا دەکات. ئەو زنجیرەیەك روداو ناخاتە ژێر لێکۆڵینەوەوە که له دەرئەنجامدا بەمڕۆ دەگەن، بەڵکو ((شێوەیەکی دی بوونی)) هەر رووداوێکی بۆ گرنگە. واتە ئەوەی بۆئەو گرنگە سیمای جیاوازیو شێوەی

---

[٢] وتارێکی گرنگی فۆکۆیە که له کتێبی ((جینالوجیا المعرفه)) لەلایەن احمد السلطانی عبدالسلام بن عبد الغالی) دوه وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی.

تایبەتی پێشکەوتنی هەر ڕووداوێکە. فۆکۆ تا ئەو شوێنەی پەیوەندنی بە لێکۆڵینەوەی جینالۆجیانەی زانستەمرۆییەکانەوە هەیە، گرنترین چەمکەکانی ئەم زانستەی — نەك وەك چەمکە ناسراو قبوڵکراوەکان، بەڵکو (ئەو [چەمکانەی] وەك [بابەتێکی] لێکۆڵینەوە دەهێنایە ئاراوە. واتە دەیکردن بە گرفتی فەلسەفی.. ڕاستەوخۆ وەك ئەو کارەی لەبارەی شێتیەوە ئەنجامیدا. تا پێش فۆکۆ شێتیان ((بە شتێك کە دەتوانرێت بناسرێت) یان وەك شتێکی ناسراو، تەماشا دەکرد. ئەو دەریخست ئەزمونگەلی چوونیەك، هەمەکی یان ڕەسەن لە شێتی، بوونی نیە. ((پەرەسەندنی)) لەواقعدا گۆڕان نیە، بەڵکو جگە لە نمایشی هەمەڕەنگی چیتر نیە.

فۆکۆ لە (١٩٨٣) و لە وتووێژێکدا، نەخشەی بەرهەمەکانی بەم شێوەیە رونکردەوە: ((سێ بواری جینالوجیا مومکینە: ئەنتۆلۆجیای ئێمە لە پەیوەندیدا بە حەقیقەتێکەوە کە بەهۆیەوە خۆمان وەك خود (سوژە) دروست دەکەین. دووهەم ئەنتۆلۆجیای ئێمە لە پەیوەندیدا بەو پانتاییەی دەسەڵاتەوە کە بە هۆیەوە خۆمان وەك بکەرو ئەنجامدەری کار، دروستدەکەین. سێهەم ئەنتۆلۆژیای مێژووی ئێمە لە پەیوەندیدا بە ئەخلاقەوە کە بەهۆیەوە خۆمان وەك کارگوزاری ئەخلاق دروستدەکەین. کەوابوو دەتوانین سێ تەوەرەی جیاواز بۆ جینالۆجیا دەستنیشانبکەین. هەرسێکیان ئەگەرچی بەشێوەیەکی وردیش نەبێت، لە کتێبی ((مێژووی شێتیدا)) ئامادەن. تەوەرەی حەقیقەت لە ((لەدایکبوونی کلینیکی)) و ((وشەکانو شتەکان)) دا ئامادەیەو تەوەرەی دەسەڵات لە ((چاودێریو سزادان)) و تەوەرەی ئەخلاقیش لە ((مێژووی سیکسوالیتی)) دا[٣٧].

فۆکۆ لە پێشەکی مێژووی شێتیدا دەنووسێت کە بەدوای (خاڵی سفر یان خاڵێکی سەرەتادا))

که بەدوای

دا دەگەڕێت کە ئێمە بەو (ئەزموونە پەتیو بێلایەنە)) [واتە ئەزموونی شێتی] بگەیەنێت.. ئەزمونێك کە هێشتا بەهۆی دابەشبوونەوە، دابەش نەبووە. فۆکۆ لە دۆزینەوەی پەیوەندی دەسەڵاتو زانیندا — واتە ئەو بابەتەی تەمەنێك بیری لێکردەوە — بەشێوەیەکی دی بەدوای ئەو ئەزمونەدا دەگەڕا. بەم مانایەش کارەکەی فەلسەفی بوو. لێرەوە بێهوودە نەبوو کاتێ لە سەرەتای دووهەم بەرگی مێژووی سیکسوالیتیدا نووسی کە ئامانجی کارەکەی لە دەیەکانی ڕابردوودا، شیکاری دیاردەی دەسەڵات یان ئامادەکردنی بنەمایەکی تیۆری بۆ شیکردنەوە دیاردەی دەسەڵات، نەبووە (وەك زۆر کەس وا دەزانن)، بەڵکو ئامانجی سەرەکی بریتیبووە لە تێگەیشتنی لە ئەزموون ئەزموونی دیاریکراوی بوون لەم جیهانەدا. هەر ئەم بنەما یان ناوەڕۆکە فەلسەفیەیە کە کاری فۆکۆ لە هایدگەر (کە فۆکۆ زۆر ستایشی دەکرد) نزیك دەکاتەوە. دەتوانین بەسەرنجدان لەم خاڵە سەرەکیە لەهەوڵی فۆکۆ بۆ دۆزینەوەی پەیوەندی زانین / دەسەڵات، تێبگەین. ئەو دەیویست تێبگات کام زەمینەیە بەشێوەیەکی مێژووی فۆرمەلەی ئەزموونی کردووە. [لە وەڵامدا] زەمینەیەك لە چەمك، تیورەو یاسا سروشتیەکانی دۆزیەوە کە بە ڕاست یان هەڵە بە زانست ناوبانگی دەرکردووەو فۆرمەلەی ئەزموون دەکاتو لێرەوە پەیوەندی بە دەسەڵاتەوە پەیدا دەکات.

(فۆکۆ) تەنها پاش زانینی ئەم چۆنیەتیە بوو (کە بابەتی زۆربەی بەرهەمەکانێتی) سەرنجی گواستەوە بۆ ئەزموونێك لە خود یان ئەوەی فەلسەفەی سەدەکانی ناوەڕاست بە ((ئەزموونی گیان)) — نفس — )) لە قەڵەمیان دەدا، لە کرداری سێکسیدا، [کە تیایدا] ئەوی دی (الاخر) بابەتە، من یان بکەری کردار لە واقعدا جگە لە ((هۆکارێکی کرداری هاوتا — متقابل — )) زیاتر نیە. ئەو پەیوەندیەی لەسەر بناغەی زۆرداریو

دەسەڵات دامەزراوە کە لە کرداری سێکسیدا بەرجەستە دەبێت، هەر لەم خاڵەوە سەرچاوە وەردەگرێت: بەرجەستەکردنی کرداری من لە بەرامبەر کرداری بەرامبەردا.

خاڵێکی گرنگ هەیە کە لە باسکردنی تیورەی فۆکۆ سەبارەت بە دەسەڵات، زوو لەبیر دەچێتەوە: بەکارهێنانی دەسەڵات تایبەت بە دەوڵەت یان زنجیرەیەک دەزگای دەسەڵاتدار (وەک کەلیسا) نیە، دەسەڵات لە شێوەی جیاواز و لە هەلومەرج و فەزای جیاوازدا، بەکاردێت کە هەریەکێک لەم هەلومەرج و فەزایانە (مێژووی تایبەتی و تاکتیکی تایبەتی خۆی هەیە). جێگۆڕکێی شێوەکانی دەسەڵات تەنها یەکێ لە بابەتە تیورییە سەرنج ڕاکێشەرەکانە کە دەتوانرێت لێی بکۆڵرێتەوە. [بەڵام] تیورەی کۆتایی لە لێکۆڵینەوەی گشتیترین شێوەی بەکارهێنانی دەسەڵاتەوە، بەدەست دێت. لێکۆڵینەوەی وردی ئەو جێگۆڕکێیانەی دەسەڵات، فۆکۆیان گەیاندە ئەو ئەنجامەی کە پەیوەندی نێوان سیستەمەکانی دانایی (کە هەندی جار – نەک هەمیشە – خۆی لە جۆرەکانی سیستەمی گوتاردا، دەردەخات) و دەسەڵات، پەیوەندییەکی هەمیشەییە.

هەر گوتارێک (یان هەر سیستەمێکی زانین، یان هەر چوارچێوەیەکی دانایی) شێوازو پراکتیکی تایبەتی خۆی بۆ بەکارهێنان و بۆ ئەزموونی چاودێریکردنی کۆمەڵایەتی هەیە. دیارە ئەم ئەزموونە لە زەمینە یان بابەتێکی تایبەتەوە بەدەست دێت. لێرەوە لێکۆڵینەوەی وردبینی جینالۆجیای دەسەڵات لە دەزگاکانی وەک زیندان، خەستەخانەو قوتابخانەدا ئاسانترە. [بەڵام] کاری گران دۆزینەوەی ئەم ناوکەی دەسەڵاتە لە پەیوەندی مرۆڤدا بەخۆیەوە (کە بەجیا لە لێکۆڵینەوەی پەیوەندیە سێکسیو خێزانیەکان، نازانرێت). بەهەرحاڵ دەتوانرێت لە لێکۆڵینەوەی هەر دەزگایەکدا، شێوازێکی تایبەت لە کارهێنانی دەسەڵات بدۆزینەوە... شێوازێک کە تاڕادەیەک و(بە ڕێژەیەک) لە دەرەوەی ستراتیژی سیستماتیکی دەسەڵاتی چینایەتی و کۆمەڵایەتی، کا ر دەکەن. گرانی لێرەدا ئەوەیە کە ناکرێت ئەوەی لەم جێگەیان فەزایانەدا، ڕوودەوات بەهۆی گەڕانەوەیان بۆ شتێکی تر یان تەنانەت بۆ تیوریەکی گشتی دەربارەی دەسەڵات، بناسینەوە. دیارە لەناو هەموو ئەمانەدا پەیوەندیەک هەیە لەنێوان ئەبستیم و دەسەڵاتدا، بەڵام ئەم پەیوەندیە لە هەر بابەتێکدا شێوەی تایبەتی خۆی هەیەو لە هەریەکێکیاندا قورسایی دەسەڵات یان زانین جیاواز دەبێت.

لەلایەکی دیەوەو لەبەرئەوەی ((ناتوانین هیچ پەیوەندیەک کە لەسەر بنەمای هێزو دەسەڵات دامەزراوە، بدۆزینەوە کە بەرگری لەبەردەم خۆیدا، دروست نەکات))و تەنانەت ((سروشتیترین)) ی ئەم پەیوەندیانەش ڕووبەڕووی بەرگری بابەتی دەسەڵات دەبێتەوە، کەوابوو ڕەنگە بتوانین لە گۆشە نیگایەکی دیەوە سەرنج لەم مەسەلەیە بدەین: [واتە] لە گۆشەنیگای بەرگریەکانەوە، بەڵام ئەم لێکۆڵینەوەیە چەندان جار گرانترە لە لێکۆڵینەوەی بەکارهێنانەکان [واتە بەکارهێنانەکانی دەسەڵات]. ناتوانرێت هیچ نەخشەیەکی خەیاڵی یان یۆتۆپی بدۆزینەوە کە تیایدا چاوپۆشی لە ئومێدی ڕزگاربوون.. واتە ئارەزووی ڕزگاربوون لە دەسەڵات و لە پەیوەندی زانین / دەسەڵات، بکات، یان خۆی پێشنیاری ڕێگایەکی توندڕەوانەو سەرکوتکەرانە، نەکات. ڕەنگە باشترین نمونە مارکسیزم بێت. تیورەیەک کە هەر لە سەرەتاوە پێشنیاری ئەو تەکنیکانە دەکات کە لەسەر بنەمای دوانەی پێکەوە بەستراوی زانین / دەسەڵات و بۆ سەرکوتکردن بەکاردێن. سەرکوتکردنێک کە ((زانستی مارکسی)) یان ((سوشیالیزمی زانستی)) (ئەو سەرکوت کردنەی)) بۆ لایەنگرانی بەڕەوا دانا.

ئەو خاڵەش دەبێ بڵێین کە بەرگریش گشتی نیە، بەڵکو تایبەتە، واتە وەك چۆن دروستکردنی تیورەیەکی گشتی لەسەر بنەمای بەکارهێنانە تایبەتەکانی دەسەڵات گرانە، هەرواش بۆ تیورەی بەرگری گرانە. هەر خوێنەرێکی وردی فروید بەباشی ئاشنای شێوازی کاری دیاریکراو تایبەتی بەرگریەو ئەوەش دەزانێت کە جەوهەری سەرەکی بەرگریەکان ئەوەیە کە لە تیورەیەکی گشتیدا کۆنەبنەوە چونکە بەرگری تایبەتەو بەهەرشێوەیەك بێ بەرکارە [ئینفعالیە] (کاردانەوەیەکە لە بەرامبەر پەیوەندیەکی تایبەتی زانین/ دەسەڵاتداو لە بەرامبەر



شێوەیەکی تایبەتی سەرکوتکردندا). بەوتەی فۆکۆ تەنها دەتوانرێت بەشێوەیەکی چالاك بەشداری بکەین، بەڵام ناتوانین چاوەڕێی وەڵامێکی بنەبڕی تیوریانەی لێبکەین. ئەو راستیەش بەناوبانگە کە فۆکۆ لە دوا دەیەکانی ژیانیدا بەشێوەیەکی چالاکانە سەرقاڵی بەرگریکردن لە کەمینە نەژادی، سیکسوالیتی، پەنابەران و بەتایبەتی بەرگریکردن لە مافی زینداانیەکان، بوو. بەڵام کەمتر سەرنج لەوە دراوە کە ئەو هەرگیز دەرئەنجامێکی تیوری لەم کارە سیاسیەی خۆیەوە، بەدەست نەهێناوە. لە هەندێك حاڵەتی کەمیشدا کە بەم کارە هەڵسا ((بەردەوامی واقع)) بۆی دەرخست هەڵەی کردووە.

لە دوا رستەدا کە نووسیم ناوی بەردەوامی واقعم هێنا، نەك پێشکەوتن. ئەم وردبوونەوەیە (لەوشەکان) ئێمە بۆ باسێکیتر رادەکێشێ. بیرۆکەی پێشکەوتن و گەشەکردن. فۆکۆ نە بڕوای بە پێشکەوتن هەبوو، نە بە بەردەوامی. یەکێك لە دەستکەوتە تیوریە گرنگەکانی کتێبی ((وشەکان و شتەکان)) بریتی بوو لە: دابڕان. لە فەسڵی چوارەهەمیشدا بینیمان[4] کە مەزنەکانی قوتابخانەی فرانکفۆرت (بەتایبەتی ڤالتر بنیامین لە دوا بەرهەمەکانیدا) بیرۆکەی پێشکەوتنیان خستبووە لاوەو بەمەش نکۆڵیان لە یەکێك لە گرنترین بنەماکانی مۆدێرنیتی، کردبوو. بەڵام نکولیکردنی فۆکۆ رەگی لەبەرهەمەکانی نیتچەدایە. نیتچە دەریخستبوو کە ((پەرەسەندنی)) شتێك، خویەك، ئامێرێك یان بیرۆکەیەك بە مانای پێشکەوتن بەرەو ئامانجێکی تایبەتی نیە))[٣٨] پرۆسەیەکی لۆژیکیش نیە کە کورتترین رێگا بێت. یان ((کەمترین هێزی بوێت)). نیتچە دەنوسێت کە پێشکەوتن خەیاڵێکە کە لە جێگۆرکێی ((یەکە)) کەمتازۆر سەربەخۆکان؟ لەسەرماندایە. ئەوانە پارچەی چوارهەمی ((دەجال)) دا دەڵێت بیرۆکەی گەشەکردن، بیرۆکەیەکی مۆدێرنەو ((لە ئەنجامیشدا بیرۆکەیەکی هەڵەیە)).[٣٩] فۆکۆ لە ((وشەکان و شتەکان)) دا دەریخست کە جینالۆجیا بۆ نیتچە بەرلەوەی بریتی بێت لە ((ناسینی رەگ یان ناسینی لایەنی واقعی دیاردە))، بریتیە لە رونکردنەوەی بابەتەکانی لادان [لەو دیاردەیە] نیتچە دەریخست هەرکاتێك ئەمرۆمان بە هەلومەرجێکی مێژووی ناسی، بەردەوامی مێژوویمان پیشان نەداوە، بەڵکو ((نەبوونی

---

[4] ئەم فەسڵە: واتە فەسڵی چوارەم لە ژمارەی یەکی گۆڤاری سەردەمدا کراوە بەکوردی.

بەردەوامیمان)) پیشان داوە، واتە هەلومەرجە جیاوازەکانی ئەبستیمیەکانمان ناسیوە، پەیوەندیانمان بە دەسەڵاتەوە، زانیەوە، بەڵام مێژوومان بەو مانایەی بانگەشەی بۆ دەکەین، نەناسیووە. فۆکۆ کە بەناو بەڵگەکۆن و تۆز گرتووەکاندا دەگەڕا، زۆرتر دەیویست لەو هەموو گەڕان و وردبینی و وردنووسینانەدا، لاینەی بێ هاوتاو دووبارە نەبوەوەی هەر رووداوێك بدۆزێتەوە و پاشان لە ڕێی نکوڵیکردنەوە لە ئامانج خوازی (الغائیە) هیگلی و باوەڕی نیمچە دینی بە کۆتایی و ئامانج، کەشفی بکات چۆن و بۆچی ئامانج بە خەیاڵدا هاتووە... واتە پەیوەندیەکی مێژوویی بە هەر بەڵگەیەکەوە لکێنراوە. ئەمە ئەو وانەیەیە کە فۆکۆ لە نیتچەوە فێری بوو. بەڵام فۆکۆ لە تێگەیشتنی دابڕان و نەبوونی بەردەوامیدا، قەرزاری هایدگەریشە. ئەو دانی بەوەدا ناوە کە ((هایدگەر لە دیدی منەوە بەردەوام فەیلەسوفێکی سەرەکی بووە)) [40].
فۆکۆ لە وشەکان و شتەکانداو لەو جێگەیەدا کە ئەوە روندەکاتەوە کە دواجار مرۆڤ تێدەگات گەڕان بەدوای رەگ و ریشەکانی خۆیدا، بێ مانایە، تاڕادەیەك لە چەمکی هایدگەری ((فرێدانی دازاین بۆ جیهان)) نزیك بۆتەوە. لە وشەکان و شتەکاندا دەخوێنینەوە ((مرۆڤ لە رەگ و ریشەکانی هەڵکەنراوە. هەنوکە لێرەیە)) [41]. نکوڵی لە لێکچوونی ئەم حوکمە لەگەڵ ئاوازی هایدگەردا، ناکرێت، تەنانەت چەمکی ((ئاسۆی دانایی دابڕاو)) چەند لەژێر کاریگەری بونیادگەریدایە هێندەش پەیوەستە بە هایدگەرەوە... فەیلەسوفێك کە دابڕانەکانی لە مێژووی میتافیزیکیدا خستبووە ژێر لێکۆڵینەوەوە. لە (مێژوی شێتیدا و لەو شوێنەدا کە تێئەگات ((هەموو ماهیەتی عەقڵ لەشێوەی عەقڵدا، فۆرمەلە ناکرێت، مەگەر بەلاوەنانی عەقڵ نەبێت)) هەست ئەکەین بە تەواوی لە ئاسۆی فکری هایدگەریدا رادەوەستاوین. [42]

## دابڕانی ئەبستمۆلۆژی

چەمکی دابڕانی ئەبستمۆلۆژی کە رەگەزێکی سەرەکی تێڕوانینی فۆکۆیە، تاڕادەیەك لەسەر بناغەی چەمکی دابڕان لە تێڕوانینی گاستۆن باشلاردا، دامەزراوە. [43] ئەم تێڕوانینەی باشلار کاریگەریەکی قوڵی کردە سەر فەیلەسوفی مارکسی: لوی ئالتۆسێر (کە ماوەیەك مامۆستای فۆکۆش بوو). بەڵام نابێت لەبارەی ئەم کاریگەریەوە، زیادەڕەوی بکەین، واتە نووسینەکانی باشلار تاکە سەرچاوەی چەمکی دابڕان لە تێڕوانینی فۆکۆدا، نین.. لە راستیدا زوربەی بیریاران لە ڕێگایەکی جیاواز لە ڕێگاکەی فۆکۆوە بەو تێڕوانینە گەیشتن کە ناتوانرێت پرۆسەی پەرەسەندنێکی عەقلانی لە مێژووی زانستدا، بدۆزرێتەوە. تا مس کۆهن و پول فیرابندیش بەم خاڵە گەیشتوون. دیدی ئانارشیستانەی (فوضوی) فیرابند زۆر لە دیدی فۆکۆ دەچێت: لە بنەڕەتدا شتێك نیە ناوی ((پرۆسەیەکی عەقلانی [بێ بۆ] رەوایەتی بەخشین [تبریر] بە زانست)). هەر کلتورو هەر سەردەمێك نمونەیەکی خۆی بۆ عەقڵانیەت و عەقڵباوەڕی، بەرهەم دێنێ. ناتوانرێ بەهۆی ئەم نمونانەوە هەلومەرجی ئەندێشەی رۆژگارێکی دی، هەڵسەنگێنین. بەم مانایە پەرەسەندنێکیش لە گۆڕێ نیە. تامس کۆهینیش بەهۆی هێنانە ئارای‌شۆڕش لە ئەبستمۆلۆژیای زانستیدا... واتە تێپەڕین لە نموونەیەکی بالادەست و قبوڵکراو، تا ڕادەیەك لەو چەمکەوە نزیکە کە فۆکۆ بۆ دابڕان هێناویتیە ئاراوە.

فۆکۆ نەك لە فەلسەفەی زانستەوە، بەڵکو لە پرسیارێکەوە دەستی پێکردووە کە تاڕادەیەکی زۆر پرسیارێکی هێرمۆنتیکە: ئایا دەتوانین بەهۆی بیرکردنەوە لە رۆژگارێکی ترەوە – بۆ نموونە: سەردەمێکی دیاریکراوی رابردوو – سیستمی نیشانەیی و ماناو هەلومەرجی ماناناسی ئەو سەردەمە، بناسین؟ واتە تێبگەین چۆن ئەو سیستمانە لەیەك کۆدەبنەوە؟ فۆکۆ دەنووسێت

خۆی هەیە، تەکنیکی خۆی هەیـە میتۆدی خـۆی هەیەو میتۆدێکی تایبەتی خۆی هەیە بۆ گریمانەی ئەوەی زمان مانایەکی هەیە جگە لەوەی دەیلێتو هـەروەها بـۆ گریمانـەی ئـەوەی زمـان لـە هـەموو جێیەکدا هەیە جگە لە زماندا)).[٤٤] فۆکۆ دەیزانی هەمیشە لە پشت گوتارەوە مانا یـان ماناگـەلێکی تر خۆی حەشارداوە. بەڵام رێك لەم خاڵەدابوو لـە هێرمۆنێکی مۆدێرن جیادەبۆوە. بـەبڕوای ئـەو ئێمە هـەرگیز نـاتوانین بگەینـە مانـا شـاراوەو نەوتراوەکانی دەقو گوتـار، بـەڵکو ئـەو [مانـاو نەوتراوانە] دادەهێنـینو دەیخولقێنـین. فۆکۆ لـە (سیستمی گوتار) دا بە راشکاوی نوسـی کـە هـەر تەفسیرێك خوڵقاندنی قسەیەکە کـە بڕوامـان وایـە دەبێ بگوترایە. فۆکۆ لـێرەدا وەك لـە هـەموو شوێنەکانی دیکەدا، لـەم خوڵقاندنی ((گوتـار لە پشـت گوتـارێکی تـرەوە)) یـان ((لـە پشـت خوڵقاندنی مانای تازەوە، هـەوڵدان بۆ رەوایـەتی بەخشـین بـە سیسـتمی جێگـیر، دەدۆزیـەوە، هـەوڵدان بـۆ بـەردەوامی هـێزو دەسـەڵات. سەردەمێك نیتچە تەفسیری لە (کتێبی) ((لـەودیو چاکـەو خراپـە)) وە بـە کردارێـك دانـابوو بـۆ بەرگەگرتنی روداو[٤٥]. فۆکۆ پەنجە دەخاتە سـەر لایەنی نێگـەتیڤی ئـەم کـارە. تەفسـیر یـەکێك لە گرنگـترین شێوازەکانە کـە بەرهەمهێنانی گوتـار رادەکێشێ بۆ ((دیسپلینو چاودێری پۆلیسـی)) و ناهێڵێت کە دەق ((جەنجاڵ دروستکەر)) بـێ. لە راستیدا [تەفسیر] شێوازێکە بۆ سـنورداکردنی مەترسیەکانی گوتـار. شێوازی ئـەرکۆلۆژیا رێـك دەبێت ئـەم مەترسیانە ئاشکرا بکـات. بێگومـان دەتوانرێت لـە هەڵبژاردنـە ئەدەبیـەکانی فۆکـۆدا، ئـەم ئـارەزووە بـۆ ئاشـکراکردنی مەترسـی (نەگونجان، بـەدناوی) ببینـرێ: دون کیشـوت، بـرازای رامـۆ، رۆمانـەکانی مـارکی دوسـاد، وەسوەسـەکانی ئـانتوانی قەدیسـی نوسـینی فلوبێر، چیرۆکـەکانی رۆسلو مۆریس بلانشۆ. ئەمانـە نـەك هـەر تـێڕوانینی باڵادەسـتو



بیرکردنەوە لـە دیدی سیستمە سیمولوجیەکانی ئـەمڕۆوە بـۆ ماناکـانی رابـردوو، شـێوەی کۆبونەوەی سیستمەکانی پێشوو، لەسەر بنەمای ماوەو جیاوازی، راوەستاوە. هەرگیز نـاتوانین لـە ئاسۆی دەلالەتی ماناکانی رابردووەوە، تەماشای شتێك بکەین. کەوابوو (بمانەوێت یان نەمانەوێت) تێگەیشتنی مێژوویی پابەندە بە جیاوازیـەوەو لـە حوکمـی دروسـتکردنی مانادایـە. دروسـتکردنی مانایەکی تازە نەك تێگەیشتن لێی.

فۆکۆ بە پێچەوانەی پەیڕەوانی هیرمۆنتیکەوە بڕوای بە دیاردەیەکی نەمر بەناوی راڤەکردنـەوە، نەبوو. فۆکۆ بڕوای وابوو راڤـەکردن لەسـەردەمە جیاوازەکـانداو لەگـەڵ گۆڕانـی دراوە زانسـتی، کلتـوریو کۆمەڵایەتیـەکاندا، دەگۆڕێـت، ئـەو لـە وتاری (نیتچە، مارکس، فروید)) دا نوسی: ((هـەر کلتورێك سیستمی تەفسـیرو راڤـەکردنی تایبـەتی

دەسەڵاتداریان بەهۆی هێنانە ئارای بیروباوەڕی تر – یان پێویستی ژیان بەشێوەیەکی‌تر و بیرکردنەوەیەکی ترو کارکردنێکی ترەوە دەهێنایە ئاراوەو تەنانەت ئازادی لە کردارە ((نائەخلاقی‌و سیکسیەکانیان)) بۆ جەنگ بانگ دەکرد، بەڵکو هەموویان گوتارێکی تازەیان لەسەر بناغەی ئەم بنەمایە خوڵقاند: هەرچیەکم بوێت، دەیڵێم. ئەم بنەمایە لەسەرنجی یەکەمدا کاری تەفسیرکەر ئاسان دەکات، بەڵام لەواقعدا دەست‌و پێی دەبەستێتەوە.

شێوەی کۆبونەوەی سیستمەنیشانەییەکان‌و دەلالەتی مانای سەردەمە جیاوازەکان چییە؟ فۆکۆ ئەم شێوەیەی بە زاراوەیەکی یۆنانی دیاریکردووە کە پێشتر دیمان لە بەرهەمەکانی هوسرلیشیدا بەکارهێنراوە: ئەبستیم **Epstime**. فۆکۆ لە ئەرکۆلۆژیای زانیندا زاراوەی ئەرشیفیشی بەکارهێناوە کە تاڕادەیەك و (لە هەندێك روەوە) هەر ئەم مانایە دەبەخشێ:

((ئێمە لەجیێ ئەوەی لە کتێبی ئەفسانەیی‌و مەزنی مێژوودا، دێڕی وشەکان ببینین کە بەشێوەیەکی ئاشکرا تەرجومەی تێڕوانینە فۆرمەلەکراوەکان لەسەردەم‌و فەزا مێژوویەکانی رابردوودا، دەکەن، [لەجیێ ئەوە]کاری بڵاوی ئەو سیستمانە دەبینن کە گوزارەکان وەك روداوەکان دادەنێن (بە هەلومەرجی تایبەتی خۆیان‌و سنوری دەرکەوتنیانەوە) و هەروەها گوزارەکان وەك شتەکان فۆرمەلە دەکەن (بە توانستی تایبەتی خۆیان‌و سنووری دەرکەوتنیانەوە). من پێشنیار دەکەم کە سەرجەم ئەم سیستمی گوزارانە (چ روداوبن یان شت) ناوبنێین: ئەرشیفکردن)).[٤٦] ئەم وردبونەوەیە لە گۆشەنیگای گوتارەوەیە، بەڵام لەوێدا ئەم سیستمانە بە ((ئەستی پوزەتیڤانەی زانین)) لەقەڵەم درابوون‌و رێکخستنی تایبەتی ئەو سیستمانە لە هەر سەردەمێکدا بە ((ئەبستیم)) ناو نرابوو. لە راستیدا سەرەتا دێرینەناس (ئارکۆلۆژیست) ئەبستیمی هەر رۆژگارێك بەهۆی ئەو بەڵگەو دراوانەوە کە زادەی ئەو سەردەمەن، بەگریمان وەردەگرێت. دیارە نکوڵی لەوە ناکرێت کە [لەبەرئەوەی] ئەمڕۆ ئەم بەڵگانە دەخوێنینەوە، کەوابوو لەسەر بنەمای راڤەکردنی ئەمڕۆیی [واتە] دروستکردنی مانا تازەکانیان) لەیەك ئەرشیف یان ئەبستمیدا، جیان دەکەینەوە. هەر لەبەر ئەم هۆیەبوو فۆکۆ ((زانین)) ی ((هەم بە سیستمی گوزارەکان‌و هەم بە راڤەکردنیان)) ناونا. ئەرکۆلۆژیای زانین لەسەر بناغەی نەبوونی بەردەوامی مێژووی، راوەستاوە.. رێك وەك زماننناسی کە لێکۆڵینەوەی سایکرۆنی [یان ئاسۆی] رەگەزە تەنیشت یەکەکانی سیستمێك لە لێکۆڵینەوەی مێژووی یان دایکرۆنی بە باشتر دەزانێ. یاساکانی هاوتەنیشتی رەگەزەکانی زمان، تاڕادەیەك لە چەمکی ئەبستیم لەدیدی فۆکۆدا دەچی. هەر شکڵبەندیەکی دانایی (من هەندێك جار ئەم دەستەواژەیە لەجیێ ئەبستیم بەکاردەهێنم). [دیارەئەم دەستەواژەیە] بەرامبەرە ئەدەبیەکەی (ئەبستیم) نیە، بەڵام ئەو مانایە دەگەیەنێ کە مەبەستی فۆکۆ بوو))، کۆمەڵێ ریساو دەستورە کە لەناو کۆمەڵێ سیستەمدا جێگیرن. ئەو رێکخستنەی ئەم ریساو دەستورە لەناو سیستەمەکەدا لەپاڵ یەکەوە دادەنێت، بناغەیەکە کە هوشیاری هەر سەردەمێکی لەسەر راوەستاوە.

هەر ئەبستیم یان شکڵبەندیەکی دانایی لەسەرو پەرەسەندنی مێژوویی یان پەیوەستبوونی رەگەزەکان بە رێسا کلاسیکیەکانی مێژووگەریەوە، دوا سیستمی پەیوەندی رەگەزەکانە. دەتوانرێت لەم پەیوەندیەدا سیستمەکانی هاوتایی‌و جیاوازی (رەگەزەکانیش) بدۆزینەوە. هەر ئەبستمێك رێسایەکی کۆتایی هەیە: [کە بریتیە لە] کلیلی ماناناسیانە یان ((پەیکەربەندی بنەڕەتی زانین)). خەسڵەتی سەرەکی ئەبستیمی رۆژگاری رێنیسانس بە کلیلێك دەناسرێتەوە: لێکچوون. لەوێدا [واتە لە رۆژگاری رێنیسانسدا] جیهانی بچوك، رێساکانی جیهانی گەورەی پیشان دەدا،

جوڵەی جسمە ئاسمانیەکان لەگەڵ جوڵەی شتە وردەکاندا بەیەك شت دەزانرا. وشەکان‌و شتەکان بەم لێکچوونە رێك دەخران. هەموو شتێ لە کتێبێکی مەزندا (کە هەندێك جار بە (کتێبی سروشت) و هەندێ جاریش بە ((ئاخاوتنی بنەرەتی جیهان)) ناودەبرا) یاسا رێژ دەکرا. بناغەو شیرازەی ئەم کتێبە بریتی‌بوو لە ((لێکچوونی هەموو رەگەزەکان لە بابەتی جیاواز لەخۆیان)). یەکەم دابڕانی ئەبستمۆلۆژی کە فۆکۆ لە وشەکان‌و شتەکاندا باسیکرد، لە سەرەتاکانی سەدەی حەڤدەدا رویدا: لەناکاو ئەم ئەبستیمە رما. سیستمێکی تەواو جیاواز لە شتەکان، لە پەیوندی نێوان وشەکان‌و شتەکان سەریهەڵدەدا کە لە ئاستی گوتاردا شێوەیەکی تازەی ئەرشیفکردنیشی فۆرمەلە دەکرد.

لێکچوون وەك کلیلی بنەرەتی مانایی، بایەخی خۆی لەدەستدا. ئەوەی (هاوکات لەگەڵ سەرهەڵدانی سیستمی لۆژیکی‌و بەڵگە خوازی [استدلالی] گوتاری فەلسەفی زانستیدا) دروستبووەوە، ئاشکرا کەری بوو*. لێرە بەدواوە وشەکان ئاشکراکەری شتەکان بوون، نەك لە شتەکان بچن. ئەم دابڕانە تەواوە، زەمینەی خۆشکرد بۆ پەیدابوونی‌خود وەك زیهنیەتی باڵای مرۆیی. کە دەرکەوتنی لە کۆتایی سەدەی هەژدەدا کامڵ‌و تەواو بوو. لەم ئەبستیمەدا، ئاشکراکەری (ناونان لە شتەکان) هاوکات بوو لەگەڵ پێشکەوتنی زانستە سروشتیەکان، بازرگانی‌و لێکۆڵینەوەی مەجازەکانی (مێژوویی). سێ بناغەی سەرەکی ئەو زانستانە دروستبوو کە پاشان بەتەواوی لەیەك جیا بوونەوە: ئابووری، زماننناسی‌و زیندەوەرزانی: بە وتەی فۆکۆ لێرەوەبوو عەقڵی رۆژئاوایی پێی نایە ناو سەردەمی‌داوەری‌و رەخنەکاریەوە.[47] لەم ئاسۆ تازەیەدا، نەخشەی زانستی گشتی، تیورەی کۆتایی نیشانەکان، بیرکارییبوونی سەرجەم بوونیاد زانین (کە رێسا گشتیەکەی جەبرە) و پۆلێنکردنی زانینەکان، دەرکەوتن. دیارە لە سەدەکانی ناوەڕاستیشدا زانستەکان پۆلێن دەکران‌و نموونەی درەوشاوەش لەم پۆلێکردنانە لە بەرهەمی بیریارە موسڵمان‌و مەسیحیەکاندا هەیە.[48] بەڵام لە سەردەمی ئەبستمی ئاشکراکەریدا بوو کە ئەم پۆلینکردنە پێویستی [بوونی] زانینێکی کۆتایی (بۆ نموونە پێویستی [بوونی] دەستورێکی زمانی هەمەکی) یان دەهێنایە پێشێ: ((ئامانجی بونیادی گوتاری کلاسیکی ناونانی شتەکان‌و لێرەوە خوێندنەوەی بوونی شتەکان بوو))[49]. زانستی زمان لە بیرۆکەی ئەم پۆلێنکردنی زانستانەوە بوو کە وەك زانستی سامان‌و زانستی سروشت، دروستبوو.

دەرکەوتنی مرۆڤ یان خودی باڵا، ئاشکراکەری دووهەم دابڕانی ئەبستمۆلۆجیە. لەناکاو لە کۆتایی سەدەی هەژدەدا ئەبستیمی ئاشکراکەری، لەناوچوو. وشەکان توانی ئاشکراکردن‌و شتەکان هێزی دەلالەت ئامێزی خۆیان، لەدەستدا. مرۆڤ‌و سەردەمی نوێ دەستی پێکرد. لێرەدا بە وردترین پێناسی فۆکۆ بۆ ((رۆژگاری مۆدێرن)) دەگەین سەردەمی لەناوچوونی ئاشکراکەری‌و پەیدابوونی مرۆڤ وەك بابەتی ئەندێشەو لە هەمان کاتدا خود یان ئەندێشمەند یان شوناسکەر. بەشی سەرەکی وشەکان‌و شتەکان دەریدەخات ئەم دابڕانە ئەبستمۆلۆژیە چۆن فۆرمەلە بووەو چۆن سێ زانستی: زیندەوەرزانی‌و ئابووری سیاسی‌و زمانەوانی (فیلولوژی یان زمانەوانی مێژوویی) دروستبوون. ئەبستیمی جیاوازی گۆڕا بۆ شتێکی تازە: شتێکی جیاواز بەناوی کارەوە (لەلای ئادام سمیث‌و دیڤید ریکاردۆ کە پاشان مارکس چەمکی هێزی کاری، لەبری دانا) بە بنەمای نرخی کاڵا زانرا. شتێك کە بەشێوەیەکی ورد دەتوانرێ لە سەر بنەمای کاتژێرەکانی کاری رۆژانە ئەندازەگیری لێبکرێ. لە زیندەوەرزانیدا

* (ئاشکراکەری)م لەبری (بیانگری) داناوە.. خۆی دەبوو دەستەواژەکە لە (دەربڕین)ەوە دروست بکرێت، بەڵام لەبەر ئەوەی هەموو (دەربڕین) یان (بیان)یکیش خۆی ئاشکرا کردنێکە.. لەبەر ئەوە ئاشکراکەریە بەباشتر زانی.

((ڕەگەزی زیندوویی – حیاتی –)) هاتە ئاراوە. زانایانی زانستە سروشتیەکان لە ژۆزیفەوە تا لامارک و کوویە، هەوڵیاندا کردار، لە ئەناتۆمیکردنی ئەندامێك بە گرنگتر دابنێن، وەك چۆن لە زمانەوانیدا گرنگی بەکارکردنی ڕەگەزەکانی زمان دەدرا.[٥٠] بەبڕوای فۆکۆ ڕۆژگاری کلاسیکی سەدەی حەڤدە لەناو چوو، بۆئەوەی مۆدێرنیتی فۆرمەلەببێ، واتە پێش مێژوویی کلتوری ڕۆژئاوا بەلەناوچوونی ئاشکراکەری کۆتایی پێهات و سەردەمی هاوچەرخ دەستی پێکرد کە مۆدێرنیتی تەنها ئەمە بەمانای وشە بە مێژوو دەزانێ، ((سەردەمی پێگەیشتنیفکری مرۆیی)) بە وتەی ڕۆشنگەران و کانت. ڕۆژگاری مۆدێرن کە بە ئەبستیمی جیاوازی دەستی پێکرد، ((زمانی)) کە لە سەردەمی کلاسیکیدا بە تەواوی توانای ((ئاشکراکردنی بوونی هەر شتێکی هەبوو))، گۆڕی بۆ سیستمێك لە ڕەگەزە جیاوازەکان. ئێستا زمان هەوڵدەدا ئەو شتانە دەربڕێ کە توانای دەربڕینیانی نیە، ئەگەر زمان کە بناغەی دەربڕینی ئەزموونەکانە (و ئەزموونە کرادریەکانیش)، و بنەمای سەرەکی هەر شکڵێکی زانینی بەڵگە خوازیە (استدلالی)، توانای جێبەجێکردنی ئەرکێکی نەبێت کە لە ئەستۆیدایە، [ئەوا] سیستمی ترانستالی فەلسەفی – زانستی، تێك دەچێت یان دەرکەوتنی ئەم دارمانە لە قەیراندا دەردەکەوێت. مرۆڤیش کە دەسەڵاتی لەگەڵ ئاشکراکردندا نەدەگونجا، دەسەڵات لە ئەبستیمی تازەدا پەیدا دەکات، بەڵام (مرۆڤ) بە لەدەستدانی زمان (واتە ئامۆزای دەسەڵات) ئەم هەلومەرجە تازەیە بە تەواوی لەرزۆك دەبینێ. لە ڕاستیدا سەردەمی سالاری مرۆڤ وەك خودی باڵا، زۆر کورت بوو: لە ماوەی نێوان لەناوچوونی ئاشکراکردن و ئاشکرابوونی بێ توانای لە دەربڕیندا: سەردەمی نوێی ئاڵتونی.

مۆدێرنیزم دەربڕینی کامڵی جیاوازی بوو. مارکی دوساد ماوەی [نێوان] بکەرو بەرکاری پیشاندەدا. **هیگڵ** ماوەی نێوان خودو بابەت و مارکسیش درزی نێوان دوو چینی سەرەکی سەرمایەداری. **گۆڕانی ڕەگەزەکانی سەردەمی کلاسیکی لەگەڵ سەردەمی مۆدێرنیدا**، لەگەڵ چەمکی جیاوازیدا، دەگونجا. ئەوەی لەم سەردەمی کلاسیکیەدا بە حەیقەت دەزانرا گۆڕا بۆ (بوون)، ئەوەی سروشت بوو [گۆڕا] بۆ مرۆڤ، ئەوەی ((ئیمکانی ناسین)) بوو [گۆڕا] بۆ ((ئیمکانی بە نە زانراوی مانەوە)) و دواجار تیورە میتافیزیەکیەکان، گۆڕان بۆ ((هوشیاری پشت بەستوو بە ئەزموون)) لە ڕۆژگاری ڕێنیسانسدا شتەکان بە لێکچوونیان لە شتەکانا، دەناسرانەوە، لەسەردەمی کلاسیکیدا وشەکان دەربڕینی شتەکان بوون. لە ڕۆژگاری مۆدێرندا جیاوازی نێوان وشەکان و شتەکان بووە بە شتێکی بڕاوە. لوتکەی ئەم سەردەمە، ڕۆژگاری ئێمەیە کە بەپێی وتەی ساموئیل بیکیت شتەکان چیدی ناولێنانرێن. زمان کە لە سەدەی حەڤدەدا بە دەستووری زمان (و تیورەی بەیان بە زانستی مەجازەکانەوە)) دەناسرا، گۆڕاوە بۆ گوتار. ئێمە ئەمرۆ بەهۆی ئەم گۆڕانەوە لەماوەی نێوان دال و مەدلول و گرنگتر [لەوەش] لە نەتوانینی ڕونکردنەوەی تێڕوانینە زیهنیەکانمان (مەدلولەکان)، تێ دەگەین. بەم شێوەیە زانستی مرۆیی وەك خودی مرۆڤ (و زمان) بێمانا دەبێت ((زانستی مرۆیی لەو جێگەیەدا هەیە کە بتوانین شیکردنەوە بکەین. نەك لە جێیەکدا کە مرۆڤ خۆی بووە بە گرفت و مەسەلەیەکی سەرەکی و شیکردنەوە لەبواری تایەبتی ناهوشیاریدا، بەرەو پێش دەچێت. ناهوشیاری لەشێوازو ڕێساو گشتگیریە دەلالەت ئامێزەکان کە بۆ هۆشیاری، هەلومەرج و شکڵ و ناوەڕۆکی ئاشکرا بکات. قسەکردن لە زانستە مرۆییەکان لەهەر حاڵەتێکی

تردا، واته به‌کارهێنانی زمان به‌شێوه‌یه‌کی هه‌ڵه)).[٥١]

چه‌مکی ئه‌بستیم له‌ ئه‌رکۆلۆژیای زانیندا که‌ ساڵی تۆفانی (١٩٦٨) دا له‌ تونس نوسراوه‌، به‌کار نه‌هاتووه‌، له‌م کتێبه‌دا ناسینی گوتار له‌ ڕێی گوتاره‌وه‌ به‌ شتێکی نامومکین زانراوه‌.[٥٢] له‌به‌رئه‌وه‌ی ((په‌یوه‌ندیه‌ به‌ڵگه‌ خوازیه‌کان – مناسبات الستدلالی –)) له‌ سنوری گوتاردان، که‌وابوو به‌هۆی گوتاره‌وه‌ ناناسرێن، ئه‌مه‌ دابڕانێکه‌ له‌ بونیادگه‌ری وشه‌کان‌و شته‌کان. خاڵی سه‌ره‌کی کتێبه‌که‌ هه‌ر ((نه‌بوونی به‌رده‌وامیه‌))،به‌ڵام له‌ جیابوونه‌وه‌ی سه‌رده‌مه‌کان تێناگه‌ین ئه‌گه‌ر چه‌مکی ناوه‌ند (و ئه‌وه‌ی به‌ مێژووی گشتی ناو ده‌برێت) وه‌لاوه‌ نه‌نێن. ئێستا بێناوه‌ند، بێڕێنما ته‌نها ده‌توانین سیستم‌و یاسای هاوته‌نیشتی گوزاره‌کان، بناسین، په‌یامی ئه‌رکۆلۆژیاش له‌مه‌ زیاتر نیه‌. بینای کۆن بۆ باستان شوناس ده‌توانێ سه‌رچاوه‌ی هه‌زاران گریمانه‌ یان بابه‌تی لێکۆڵینه‌وه‌ی جیاوازی شیکاری‌و زانستی بێ، به‌ڵام سه‌رتای کاره‌که‌ی جگه‌ له‌ وردبوونه‌وه‌ له‌ په‌یوه‌ندی به‌شه‌کان، شتێکی تر نیه‌. ده‌نگی مێژوو له‌ ده‌وروبه‌ری بیناکه‌دا نیه‌، هه‌ر ده‌ق (یان به‌ڵگه‌یه‌ک) پێویستی به‌ ناسینی (ره‌گه‌زه‌ په‌راوێزیه‌کان)) نیه‌. کاری ئێمه‌ تێگه‌یشتنه‌ له‌ په‌یوه‌ندی نێوان به‌شه‌کان. هه‌ر بینایه‌کی کۆن له‌نێوان ڕێسا‌و ڕوداوه‌کاندا جێگه‌ی بۆته‌وه‌ (ڕۆژێک له‌سه‌ر بناغه‌ی په‌یوه‌ندی نێوان ئه‌و دوانه‌ دامه‌زراوه‌ و ئێستاش له‌سه‌ر بناغه‌ی په‌یوه‌ندیه‌کی وه‌ک ئه‌وه‌ ده‌بینرێت). هه‌ر گوتارێک له‌نێوان ڕێسا زمانیه‌کان (که‌ به‌پێی خۆیان په‌یوه‌ندی ده‌روونی گوزاره‌کان فۆرمه‌له‌ ده‌که‌ن) و ڕوداوه‌کاندا جێگه‌ی بۆته‌وه‌. گوتار له‌ ڕێی لێکۆڵینه‌وه‌یه‌کی زمانه‌وانیه‌وه‌، ناناسرێت. له‌ گریمانه‌ی ڕوداوه‌کان (و نیه‌ته‌کان) یشه‌وه‌ هیچ به‌ده‌ست نایه‌ت.

ته‌نها ده‌بێ بتوانرێ ((په‌ویه‌ندی‌و هاوسه‌نگی نێوان ئاستی بونیادی‌و ئاستی ڕیکه‌وتن)) بناسرێ. لێره‌وه‌ له‌ گوتاردا هه‌ندێک جار ((پانتایی گشتی گوزاره‌کان)) گرنگه‌و هه‌ندێک جار به‌شه‌ تاکه‌کانی‌و هه‌ندێک جاریش پراکتیکی ڕێساکان.[٥٣] کتێبی ئه‌رکۆلۆژیای زانین ده‌ق له‌ناو ((پراکتیکی به‌ڵگه‌خوازیدا (استدلال) داده‌نێ.

**ئه‌م فه‌سڵه‌: واته‌ فه‌سڵی چواره‌م له‌ژماره‌ی یه‌کی گۆڤاری سه‌رده‌مدا کراوه‌ به‌ کوردی.**

چه‌ند تێبینیه‌ک:

❖ ئه‌مه‌ فه‌سڵی شه‌شه‌مه‌ له‌ کتێبی ((مدیرنیته‌ واندیشه‌ ی انتقادی)).. : بابك احمدی له‌به‌رئه‌وه‌ی به‌شی دووه‌می ئه‌م فه‌سڵه‌ له‌ دوا ژماره‌ی گۆڤاری (نڤار) دا بڵاوکراوه‌ته‌وه‌، ئیدی لێره‌دا به‌ڕاستمان نه‌زانی جارێکی دی بڵاوی بکه‌ینه‌وه‌.

❖ هه‌موو ئه‌و نووسینانه‌ی له‌م که‌وانه‌یه‌دا [ ] نوسراون، له‌وه‌رگێڕی کوردیه‌وه‌ن.

❖ له‌ ژماره‌ی یه‌کی گۆڤاری سه‌رده‌مدا فه‌سڵی چواره‌می ئه‌م کتێبه‌مان کردۆته‌ کوردی... له‌وێدا ناوی قوتابخانه‌یه‌کی ئه‌ده‌بیمان به‌ هه‌ڵه‌ نووسیوه‌: (اکسپرسیونیزم) مان به‌ (ئه‌زمونگه‌ری) دانه‌وه‌ که‌ هه‌ڵه‌یه‌و ڕاستیه‌که‌ی ([illegible]).

په‌راوێزه‌کان:

له‌م فه‌سڵه‌دا ئه‌م چاپه‌ سه‌رچاوه‌ی هه‌موو وته‌کانی (فۆکۆ) یه‌ له‌م کتێبه‌دا.

٢٣) ر. دیکارت، تێفکرین له‌ فه‌لسه‌فه‌ی یه‌که‌مدا. ت١، احمدی، تاران ١٣٦٩. ص (١٨–١٩).

٣٠) م. فۆکۆ ((سه‌رتاسه‌ربینی)) ت: ن. موید حکمت، فرهنگ ١٥ پایز ١٣٧٢، ص (٢٩–٣١).

٣٣) وه‌رگێڕاوه‌ له‌ وتوێژی فۆکۆ له‌گه‌ڵ:

٤٣) بۆ نموونه‌ سه‌یری ئه‌م سه‌رچاوه‌یه‌ بکه‌:

٤٥) ف. نیتچه‌: له‌سرو چاکه‌و خراپه‌وه‌. ص ٧٨.

٤٨) بۆ نموونه‌سه‌یری ئه‌مانه‌ بکه‌:

ابو نصر محمد فارابی، احصاء العلوم، ت: ح — خیو جهم — تهران ١٣٤٨.

ابو عبدالله محمد بن احمد بن یوسف کاتب خوارزمی. مفاتیح العلوم، ت: ی.ج. خدیو هم، تهران ١٣٦٢.

1. J.Hyppolite, *Genèse et structure de la phénoménologie de l'esprit de Hegel*, Paris, 1978.

2. J.Miller, *The Passion of Michel Foucault*, New york, 1993, p.8.

3. I.Hacking "Archaeology of Foucault", D.Couzens Hoy, *Foucault, A Critical Reader*, London, 1989, pp. 27-40.

4. M.Foucault, *Maladie mentale et psychologie*, Paris, 1954.

5. M.Foucault, *Les mots et les choses*, Paris, 1974, p.398.

6. M.Foucault, *Histoire de la folie à l'âge classique*, Paris, 1985.

این چاپ ماخذ تمامی نقل قول‌های از کتاب فوکو در این فصل است.

7. M.Foucault, *Histoire de la folie*, Paris, 1964.

8. M.Bakhtine, *L'oeuvre de François Rabelais et la culture populaire au Moyen âge et sous la Renaissance*, tra. A.Robel, Paris, 1985, pp.103.

9. B.Pascal, *Pensées*, ed.L.Brunschvigg, Paris, 1976, p.163.

10. M.Foucault, *Histoire de la folie* ..., p.75.

11. *Ibid*, p.415.

12. *Ibid*, p.19.

13. M.Foucault, *Maladie mentale*..., p.75.

14. R.Barthes, *Oeuvres Complètes*, Paris, 1993, vol.1, p.1295.

15. *Ibid*, p.1293.

16. M.Blanchot, *L'entretien infini*, Paris, 1969, p.292.

17. G.Deleuze, *Le pli*, Paris, 1988.

18. M.Gauchet, Gl. Swain, *La pratique de l'esprit humain*, Paris, 1980.

19. L.Ferry, A.Renaut, *La pensée 68*, Paris, 1988, p.131.

20. J.Derrida, *L'écriture et la différence*, Paris, 1979, p.52.

21. *Ibid*, p.58.

22. M.Foucault, *Histoire de la folie*, p.56.

۲۳. ر. دکارت، تاملات در فلسفه‌ی اولی، ترجمه‌ی ا. احمدی، تهران، ۱۳۶۹، ص‌ص ۱۹-۱۸.

24. B.Flynn, "Derrida and Foucault", H.J.Silverman ed. *Derrida and Deconstruction*, London, 1989, pp 201-218.

25. M.Foucault, *Naissance de la clinique*, paris, 1990.

26. *Ibid*, p.25.

27. *Ibid*, p.26.

28. M.Foucault, *Surveiller et punir, Naissance de la prison*, Paris, 1975.

29. *Ibid*, p.235.

۳۰. م. فوکو، «سراسربینی»، ترجمه‌ی ن. موید حکمت، فرهنگ، ۱۵، پاییز ۱۳۷۲، ص‌ص ۳۱-۲۹

31. M.Foucault. *Les mots et les choses*, Paris. 1974, p.221.

32. F.Dosse. *Histoire du Structuralisme*, Paris, 1991. vol.1. pp.400-401

۳۳. نقل است از گفتگوی فوکو با:

*La Quinzaine littéraire* 5, 15 mai 1966.

34. J.Piaget, *Le Structuralism*, Paris, 1971 p.108

35. C.Levi Strauss. *Tristes tropiques*, Paris, 1962 p 447.

36. M Foucault. *Les mots* ... pp. 390-391.

37. M.Foucault: *The Foucault Reader* ed.P.Rabinow. New york. 1984, pp.351-354.

38. M.Foucault. 'Nietzsche. la généalogie l'histoire'

*Hommage à Jean Hyppolite* ed M.Foucault. Paris. 1971

39. F.Nietzsche, *The Anti Christ*, tra. R.J Hollingdale London, 1971, p 116.

40. M.Foucault. *Les Nouvelles littéraires* 28 juin 1984.

41. M.Foucault. *Les mots*. ., p.343.

42. F Dosse, *Histoire du structuralisme*. vol.1, p.454.

۴۳. به عنوان مثال نگاه کنید به:

G.Bachelard. *Le rationalisme appliqué*. Paris, 1949, pp.101-102.

44. M Foucault. 'Nietzsche, Marx, Freud', *Cahiers de Royaumont*. Paris. 1964 No 6 pp 183-192.

۴۵. ف. نیچه، **فراسوی نیک و بد**، ص ۱۰۸.

46. M.Foucault, *L'archeologie du Savoir*, Paris 1969

47. M.Foucault, *Les mots et*... p.45.

۴۸. به عنوان نمونه نگاه کنید به:

ابونصر محمد فارابی، **احصاءالعلوم**، ترجمه‌ی ح. خدیو جم، تهران، ۱۳۴۸

ابوعبدالله محمد بن احمد بن یوسف کاتب خوارزمی، **مفاتیح‌العلوم**، ترجمه‌ی ح. خدیو جم، تهران، ۱۳۶۲.

49. M.Foucault. *Les mots et* ..., p.136.

50. *Ibid*. p 296

51. *Ibid*. p.376.

52. M.Foucault, *L'archeologie*... p.62.

53. *Ibid* p 106.

# هیربرت مارکۆزو قوتابخانەی فرانکفۆرت

▪ عەبدولڕەسول خەلیلی

● و: ئارام جەمال

((هربـرت مـارکۆز)) بەیـەکێك لـەدوا فەیلەسوفەکانی مارکسیزمی نـوێی ئـەڵمانی دەژمـێردریت. مـارکۆز توانـی بەپـەیڕەوکردنی راستەوخۆ لەفەیلەسوفی مەجـەری ((جـۆرج لۆکـاش)) یارمـەتی جێگۆڕکـێ و نوێکردنـەوەی فیکری مارکسـی بـداتو، سـەرنج لـەگرنگیدان بەبەرهەمەکانی دوایی مارکسەوە بگوێزێتـەوە بۆ گرنگیـدان بەبەرهەمـەکانی سـەردەمی لاوی‌و، بەگشتیش یارمەتی تەوژمێکی نوێ‌بدات بۆ سـەر لـەنوێ پیاچوونـەوە بەچەمکـە مارکسـیەکاندا. بەرهەمـەکانی سـەردەمی لاوی مـارکس لـەژێر کاریگەریی راستەوخۆی فەلسەفەی هێگڵدایە. لەم بەرهەمانەدا پێداگرتنـی دۆگمایی‌و تاکڕەهەندانە لەسـەر فاکتـەرە ئـابووری‌و مادديـەکان، دووردەخرایەوەو، بـەم جـۆرە لـەم نوسـینانەی مارکسدا ئاراستەی لێکۆڵینـەوەو شیکردنەوەکان لەژێرخانەوە بەرەو سەرخان هەڵدەکشا.

مارکسـییە هیگڵییـەکانی وەك ((جـۆرج لۆکـاش))و((ئەنتۆنیۆگرامشـی)) هـەردەم رەخنـەیان لـەتێڕوانینی ئـابووری‌و تاکڕەهـەندی دەگرت. پێیان وابوو کەسەرباری لەبـەرچاوگرتنی هۆکـارە ئـابووری‌و ماتەرییـەکان لـەتیۆرەی مارکسـدا، پێویسـتە جـەخت لەسـەر فاکتـەرە عـەقڵی‌و رۆشـنبیرییەکانیش بکرێـت. هـەروەها ئەمانـە بەمەبەسـتی پڕکردنـەوەی کەم‌وکورتییەکانی دیدگای مارکسـی‌و، راکێشانی فاکتەرە عـەقڵی‌و هزرییـەکان بـۆ ژێـر کاریگـەریی ئەم تیۆرەیە، بـەدوای رەگ‌و ریشـە فیکرییـەکانی هیگڵدا دەگەڕان لەم تیۆرەداو، بەتایبەتیش لەناو نووسینە بەراییەکاندا[1].

مارکسیزمە هیگڵییـەکان بەتایبـەتی جـۆرج لۆکاش دەیانویست بەهۆی گەڕاندنەوە بۆ رەگ‌و ریشـە هـزری‌و فیکـری‌و هیگڵییـەکانی تیـۆرەی مـارکس، بەسـەر سـنورداریتی جەبرگـەریی

مارکسیزم دروستکرد. ئەوان لەپاڵ سوود وەرگرتنیان لەتیۆرەکانی ڤێبەر، هەوڵیاندا مارکسیزم لەگەڵ تیۆرەی تاکخوازانەی فرۆیددا ئاوێتەی یەکتربکەن، تاوەکو رووبەرێکی فراوانتر ببەخشنە تیۆرەی مارکسیزمو دەوڵەمەندی بکەن.

هەروەها لەروانگەی مارکسییە هیگڵییەکانەوە، دەروونناسی یەکێك بووە لەلقە سەرەکیەکانی مەعریفەو،پێیان وابووەوە کەدەبێت ئەم لقەش لەگەڵ تیۆرەی مارکسدا موتوربە بکرێت، ((ئەوانە پەیوەندیی نێوان مارکسیزمو فرۆیدیزمیان بەچاكو بەكەڵك زانیوەو، ئەم دووانە دووگوزارەن بۆ دووئاستی جیاوازی ناویەك هەمەك ((کل)) یاخود هەردووکیان بەهەمەکییەك دەزانن))[٢].

کەواتە مارکۆزەو بیریارانی قوتابخانەی فرانکفۆرت، بەدوای ئەنجامی ئەم جۆرە گۆرانە تیۆرییەوە بوون. ئەوان گوێرایەڵی ئەو رەخنانە دەبوون، کەلە ستراتیژە سەرتاپا ناواقعیەکانی تیۆرەی مارکسیزم دەگیران، کەوای بۆ دەچوون ((ئێمە لەوڵاتانی پێشکەوتووی پیشەسازیدا نەك هەر لەرەوشتێکی شۆرشگێریدانین، بەڵکو تەنانەت لەرەوشتی پێش شۆرشگێریشدانین)).

بەجۆرێك کەدەبێت هەرچەشنە ستراتیژێك لەگەڵ رەوشتی واقعیدا بگونجێتو پراکتیزە بکرێت.

هەروەها مارکۆزەش لەم رووەوە پێی وایە کە((چەمکەکانی مارکس چەمکانێکی دیالەکتێکیو مێژووییە کەدووبارە بوونەوەیان بۆ



هربرت مارکوز

ئابووریدا سەربکەون[٢]. ئەوان دەیانویست بەتایبەتی جێگەیەك بۆ هۆکارە کلتووریو دەروونناسییەکان لەلێکۆڵینەوە کۆمەڵناسییەکانی خۆیاندا بکەنەوە.

کاریگەریی لۆکاش لەو رووەوە گرنگە کە رەگەزێکی تازەو بەهێزی، واتە بیروبۆچوونەکانی ((ماکس ڤێبەر))ی هێنایەناو توێژینەوەی مارکسییە هیگڵییەکانەوە، وێنەیەکی فەلسەفیانەی بەهێزی لەرۆڵی مێژووکردی هزری لەقاڵبی عەقڵی ئازادیخواز لەکۆمەڵگەداو بۆ

نییەو، دەبێت لەگەڵ هەموو گۆڕانەکانی کۆمەڵگادا سەر لەنوێ بخوێندرێتەوە)).

لەم وتارەداو لەمیانەی لێکۆڵینەوە لەمەڕ فیکری هربرت مارکۆزەوە، هەوڵدەدرێت پەیوەندیەکانی بەقوتابخانەی فرانکفۆرتەوە بناسێنرێت و تاووتوێ بکرێت.

هربرت مارکۆز لەساڵی ((١٨٩٨)) لەشاری بەرلین لەدایك بووە. لەزانکۆی بەرلین و لەبەشی زانستە سیاسییەکاندا خوێندویەتی و، لەساڵی ((١٩١٩))دا چۆتە فرایبۆرگ تاوەکو درێژە بەخوێندن بدات، چونکە ئەم شارە یەکێکە لەشارە پڕ لەزانکۆکانی ئەڵمانیا. مارکۆز خوێندنی خۆی لەساڵی ١٩٢٢دا کەهاوکاتە لەگەڵ هاتنە سەرکاری نازییەکان لەئەڵمانیادا ـ بەپلەی دوکتۆرا لەبەشی فەلسەفە تەواوکردو ((پلەی دکتۆراکەی لەسەر نووسینی نامەیەك لەبارەی ئەنتۆلۆژیای هیگڵ و پەیوەندی بەفەلسەفەی مێژووەوە لەهایدگەر وەرگرت. مارکۆز لەساڵی ((١٩٢٨))دا بووە یاریدەدەری ((مارتن هایدگەر))و. تا ساڵی ((١٩٣٢)) لەمیانەی ئاشنابوونی بەتیۆرو بیروبۆچوونەکانی ((هایدگەر))و ((ئادمۆند هۆسرل))ی دامەزرێنەری قوتابخانەی دیاردەگەریەوە؟ کەلەزانکۆی فرایبۆرگ وانەی دەوتەوە؟ توانی رووبەری ناسینی فەلسەفیانەی خۆی فراوانتربکات؟ بەتایبەتی لەرووی ئەو لێکۆڵینەوانەی کەپەیوەندییان بەئەگوستیالیزمی مرۆییەوە هەیە. ئەم جۆرە تێڕوانینە بەشێوەیەك لەشێوەکان لەژێر کاریگەریی نەریتی ئاڵمانیدایە. مارکۆز هەر لەو ماوەیەدا کەبەوتەی خۆی هەتا دەهات سیاسیتر دەبوو. هەستی بەمەترسی فاشیزم دەکرد. هەربۆیە دەستیکرد بەخوێندنەوەیەکی قووڵی فەلسەفەکانی نیچەو مارکس و هیگڵ و پاشماوەیەکی دەرەنگتر بنەماکانی دەرونشیکاریی فرۆیدی خستەژێر لێکۆڵینەوەوە. مارکۆز قیمەت و بەهایەکی ئێجگار مەزنی دەبەخشیە فەلسەفەی یۆنانی بەگشتیو، ئەرستۆش بەتایبەتی، هەروەها فەلسەفەی ((دیکارت)) یشی بەگرنگ دەزانی و، زۆریش ستایشی فەلسەفەی ((کانت))ی دەکرد، چونکە زەمینەی کامڵبونی فەلسەفی بۆ هیگڵ خۆشکرد.

مارکۆز لەگەڵ هاتنە سەرتەختی حکومەتی نازییەکان لەساڵی ١٩٣٣دا، ئەڵمانیای بەجێهێشت و، رویکردە سویسراو، بۆ ماوەی ساڵێك لەجنێف سەرقاڵی وانە گوتنەوەبووە، پاشان لەحوزەیرانی ساڵی ١٩٣٤دا چۆتە ئەمریکاو لەزانکۆی ((کۆلۆمبیا)) دەستی بەوانەوتنەوە کردووە، بەم جۆرە هەتا ساڵی ((١٩٤٠)) لەدامەزراوەی لێکۆڵینەوە کۆمەڵایەتیەکاندا ماوەتەوە ـ کەزۆربەی ئەندامەکانی لەفرانکفۆرتەوە بۆی چووبوون ـ هەروەها هاوکارێکی نزیکی ((ماکس هورکهایەر)) بووە.

ئەوەبوو پاشان مارکۆزە چووە واشنتۆن و هەتا دوای تەواوبوونی جەنگی جیهانی دووەمیش هەرلەوێ مایەوە، لەساڵی ١٩٤٢ ـ ١٩٥٠ سەرۆکی بەشێك بوو لەنوسینگەی ((خزمەتگوزاریی ستراتیژیەکانی)) وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکاو. دواتر هەر لەو شوێنە بۆتە پسپۆر لەبەشی ئەوروپای رۆژهەلات. پاشان لەدوای گەڕاندنەوەی بۆ کۆلۆمبیا. بووە بەهاوکارێکی زانستیانەی ناوەندی لێکۆڵینەوەی روسیا لەزانکۆی کۆلۆمبیا. لەساڵی ١٩٥٣دا لەناوەندی لێکۆڵینەوەکانی لەمەڕ روسیا لەزانکۆی ((هارڤارد)) خەریکی توێژینەوە بووە لەمەڕ مارکسیزمی ستالینی. پاشان ئەوەبوو هەرچییەکی لەم بارەیەوە نووسیبوو. لەساڵی ((١٩٥٨))دا لەژێر ناوی ((مارکسیزمی شورەوی))دا بەچاپی گەیاند. لەساڵی ١٩٥٤ ـ ١٩٥٧ وەك مامۆستایەکی زانستە سیاسییەکان لەزانکۆی ((براندیس)) وانەی دەگوتەوەو. ماوەیەکیشی وەك بەڕێوەبەری لێکۆڵینەوەکانی ((خوێندنگای زانستی لێکۆڵینەوە باڵاکان))

لەپاریس بەسەربرد. لەساڵی ((١٩٦٤))دا وەك مامۆستایەکی میوان وابوو لەزانکۆی فرانکفۆرتو لەساڵی ((١٩٦٨))دا وەك مامۆستایەکی فەخریی‌وابوو لەزانکۆی بەرلین. لەساڵی ١٩٦٧ - ١٩٦٩ لەزانکۆی کالیفۆرنیا لەئەمریکا وانەی دەوتەوە. بەلاّم لەم ساڵە بەدواوەو، لەتەمەنی ((٧١)) ساڵیدا، داوای درێژکردنەوەی وانە گوتنەوەی نەکرد، چونکە دەیزانی کەرازی نابن‌و سەرناگرێت ئەمەش دروست ساڵێك پاش




راپەڕینی توند ئامێزانەی خوێندکاران بوو لەسەرتاسەری ئەوروپاو ئەمریکادا، کەکۆتایی پێهاتبوو، ماوەیەکی کورتیش بەتایبەتی لەپاریسدا ئەو خەیاڵە لەمێشکی خەڵکدا دەسوڕایەوە کەرەنگە شۆڕشێکی واقیعی رووبدات... شۆڕشێك کەپێدەچوو مارکۆز زیاد لەهەرکەسێکی‌دی وەك رابەرو پێشەوایەکی سیاسی پێشکەش بکات، شتێك کەبەوتەی خودی مارکۆز بێگومان هەرگیز بەخەونیش نەیدەدی کەشتێکی لەم جۆرە رووبدات. مارکۆز لەساڵی ١٩٧٩داو لەتەمەنی ((٨١)) ساڵیدا کۆچی دوایی.

بەگشتی گرنگرتین بەرهەمەکانی مارکۆز لەم کتێبانەدا کۆدەبنەوە: ((عەقڵ‌و شۆڕش))، ((عەشق‌و ژیان))، ((مارکسیزمی شورەوی))، ((مرۆڤی تاکڕەهەند))، ((هۆشیاریی‌و کۆمەڵگا))، ((دەرونشیکاریو سیاسەت))، ((لەمەڕ ئازادی))، ئەمە جگە لەوەی کەپێڕستی کتێب‌و وتارەکانی تری لەم ژمارەیە زۆرترن. هربرت مارکۆز یەکێکە لەبەناوبانگترین ئەو کەسانەی کەسەرەڕای پووچەڵبونەوەی هەندێك لەتیۆرە مارکسییەکان لەپێشبینی رووداوەکان‌و دارمان‌و نەمانی سیستمی سەرمایەداریو خۆگرتنی کۆمۆنیزم، بڕوای وابوو کەدەبێت تیۆرە مارکسییەکان سەر لەنوێ بخوێندرێنەوەو چاویان پیابخشێندرێتەوە. لەراستیدا دەتوانین بڵێین کەتیۆرەکانی مارکۆز لەنێوان دوو گروپی مارکسیدابوو:-

یەکەم گروپیان. بەشێك لەو مارکسیانەبوون کەرێکەو راست مارکسیزمیان وەلانابوو، ئەویش بەبەهانەی ئەوەی کەگوایە هەندێك لەرووداوەکان بەپێچەوانەی پێشبینییە مارکسییەکان بوون.

دووەم گروپیان، هەموو ئەو کەسانەن کەسەرباری بەڵگە مێژوییەکانیش، هیچ جۆرە دوودڵییەکیان لادروست نەبوو لەبەرامبەر بنەماکانی ئەم تیۆرەیەو، هێشتا بەوەفاداریی ماونەتەوە بۆ مارکسیزم.

تیۆرە میانڕەوییەکەی مارکۆز، کەبایەخدانە بەو بەرهەمانەی مارکسی لاو کەبەتەواوی لەژێر کاریگەری هیگڵدایە، جگە لەدۆزینەوەی پەیوەندییەکی نوێی نێوان مارکسیزم‌و هیگلیزم، کەلەبەرهەمەکانی جۆرج لۆکاش‌و ئەنتۆنیۆگرامشیدا رەنگیان داوەتەوە، شتێکی ترنین. هەرچەندە ئەم بەشە لەمارکسیزمی فەلسەفی خۆی لەنوسینەکانی لۆکاشدا دەبینێتەوە، کەلەرووی فیکرییەوە لە((نیوکانتیزم))و((ویلهم دیلتای))و((هاینریش ریکرت))ەوە سەرچاوەی گرتووەو، مارکۆزیش کەخۆی ئەندامێکی قوتابخانەی فرانکفۆرتە، لەژێر کاریگەری ئەم ئاراستە تیۆرییە رەخنەگریەدایە

لەفرانكفۆرتدا. ماركۆز لەو نوسەرانەیە كە((هەندێك لەماركسییەكان، نوسینەكانی بەدەستەكو یارمەتییەك دەزانن بۆ گەشەپێدانی خودی ماركسیزم))، ((بەتایبەتیش كەبایەخی كردارییانەی تیۆرەكانی بەشێوەیەكی ناراستەوخۆ، لەلایەن رەخنەگرانی روسیشەوە قبولكراوەو راگەیاندراوە))[٢].

وەك ئاشكرایە بەرهەمەكانی قوتابخانەی فرانكفۆرت كەزۆر لەژێر كاریگەری هیگلدایە، لەسنوری هەندێك لەچەمكەكاندا بەدرێژەدەری نەریتی ماركس دادەنرێت، بەشێوەیەك كەبگوترێت ((گرنگی گەشەكردنی ئەم قوتابخانەیە، بەئەندازەی هەر گۆڕانێكیدی بووە))(٥)، كە بەدرێژایی سالآنی ١٩٦٥ ـ ١٩٦٨ لەبواری ژیاندنەوەی مەسەلە سیاسییەكاندا روویانداوە. كەهاوكاتە لەگەڵ هەریەك لەبزاڤی چەپی نوێی خوێنكارانو ئالوگۆڕە كۆمۆنیستییەكانی رۆژئاواداو. گەشەكردنی ئەم قوتابخانەیە بەیەك ئاراستە لەگەڵیاندا چۆتەپێشو. ئێستاش لەبەشی زانستە سوسیۆلۆژییەكاندا سەركەوتنو كاریگەرییەكی بەرچاوو گرنگی لەزانكۆكانی رۆژئاوادا بەجێهێشتووەو. گەشەو پەرەی بەچەمكو تێڕوانینەكانی خۆی داوە لەكۆمەڵگەی هاوچەرخو مەدەنیانەی رۆژئاواو مەسەلە هەمە چەشنەكانی كۆمەڵناسیدا. بەتایبەتیش ئەم مەسەلەیە بەهۆی تیۆرەكانی ((یورگن هابرماس))ەوە، كەبیریارێكی هاوچەرخی ئەڵمانییە، رەهەندی نوێتری بەخۆوەدیوە.

ئەندامانی سەرەتایی قوتابخانەی فرانكفورت، لەسەرەتاكانی دەیەی ((١٩٢٠))دا لەشاری فرانكفۆرت لەگەڵ یەكتر كۆبوونەوە. كەچەند كەسێكی ماركسی لاو، یاخود لایەنگری چەپ بوون، كەلەبەرامبەر هەردوو سیستەمی سەرمایەداریو سۆشیالیزمی شۆرەویدا نارازیبوونو جیاوازییان بەرزدەكردەوە.

لەراستیدا ئەم قوتابخانەیە گەڕانەوەیەك بوو بۆ بیرو ئەندێشەكانی هیگڵو، هەر لەو روانگەیەشەوە ماركسیزمیان دەدی. ئەوەی بووە هۆی گەلاڵەكردنی ئەم قوتابخانەیە، ئەو هەستەبوو كەپێی وابوو دەبێت سەرلەنوێ ماركسیزم بخرێتەوە ژێر لێكۆڵینەوەو بەرهەم بهێنرێتەوە. ئەمە جگە لەوەی كەنابێت ئەو هۆكارەشمان لەیادبچێت كەرۆڵێكی سەرەكی لەم كارەدا گێڕا، كەئەویش دەركەوتنی فاشیزم بوو، بەلآم مەسەلەكە تەنها بەمەشەوە نەوەستایەوەو، هۆیەكیتریشی بریتیبوو لەپیاچونەوەیەكی رەخنەگرانە بەهەندێك تەوژمی وەك لیبرالیزم (چ لەرووی فیكریو چ لەرووی سیاسییەوە) لەقۆناغی بۆرژوازیدا.

لەمەدا ئەنجامێك كەبەدەست هات ئەوەبوو: كەنەریتە گەورەكەی لیبرالیزم و ئازادیخوازی هەر لەسەرەتاوە توخمەكانی دەسەلآتداریو توتالیتاریی گرتۆتە خۆ، بەلآم ئەم توخمانە لەسەردەمی ئێمەدا بالآدەست بوون. مەبەست لێرەدا بەتایبەتی لەو دوو لێكۆڵینەوەیەی هۆركهایمەرە لەژێر ناوی ((مونتنیو خۆویستن))و((رابوون ئازادییە)). بەلآم لەهەموو ئەمانە گرنگتر، سەرقالبوونی ئەم قوتابخانەیە بوو بەچەمكی سۆشیالیزمەوە، چونكە لەرەوتی گۆڕانكاری تیۆرەی ماركسیدا ماركسیزم وارائەدەكرا كەبریتییە لەگەشەكردنی هێزەكانی بەرهەم هێنان بەشێوەیەكی عەقلآنیترو فراوانترو سوودوەرگرتنی زیاتر لەكادرو دابەشكردنی عەقلآنیتری بەرهەم، لەجیاتی ئەوەی جەخت لەسەر ئەوەبكرێتەوە كەكۆمەڵگەی سۆشیالیستی لەدیدگای ماركسەوە((یان بەلانیكەمەوە بەلای ماركسی لاوەوە)) ئەو كۆمەڵگایەیە كەلەرووی چۆنایەتییەوە جیاوازی لەگەڵ هەموو كۆمەڵگاكانی پێش خۆیدا هەیە، بەشێوەیەكی سەرەكی لەو رووەوە كەلەكۆمەڵگای سۆشیالیستیدا خودی ژیان تیایدا جیاواز دەبێت،

پیاوان‌و ژنان لەسەر بناغەی پەیوەست بوون بەیەکەوە، شێوازی بوون‌و ژیانیان دیاریدەکەن هەروەکو ئادۆرنۆ دەڵێت، جۆرە بوون‌و ژیانێکی بەبێ‌ترس. چیدی کار نابێتە پێوەری سامان‌و بەهاکان‌و مرۆڤەکان چیدی ناچارنابن تەمەنیان لەوکارو فرمانانەدا بەسەربەرن، کەهەموو کاتیان لێدەباتو بەخۆشیان نامۆیان دەکات. جگە لەمەش ئەوان ئەرکی سەرشانی خۆیان بەلێکۆڵینەوەی چۆنێتی دروستبوونی ئەو نائومێدییە دەزانی کەلەئەنجامی ((ئەو سامانە زۆرو زەبەندەوە پەیدابووە کەلەبنەڕەتدا لەئەنجامی سەرکەوتنی سەرمایەداریدا کۆکراوەتەوەو، رۆژانە بەمەبەستی رێگرتن‌و دژایەتیکردنی کۆمەڵگایەکی چاکترو پاکژترو مرۆڤانەتر بەکاردێت، نەك لەپێناوی بیناکردندا)). بەم شێوەیە لەنێوان وێنەی سەرمایەداری پێشکەوتوو بەناو سۆشیالیزمی واقیعیدا، جۆرێك پەیوەندی ترسناك هاتۆتە ئاراوە، واتە بەتەواوەتی سۆشیالیزم بەشێوەیەکی روو لەزیاد وێنەی دوژمنەکەی گرتووە)).

کاری سەرەکی قوتابخانەی فرانکفۆرت، سەرەڕای جیاوازیی بیروبۆچوونەکانیان، بریتی‌بووە لەرەخنەگرتن‌و هەڵسەنگاندن ((جاکەهەندێك جار زاراوەی ((تیۆرەی رەخنەیی)) بۆ بەرهەمەکانیان بەکاردێت، هەر لەبەرئەمەیە)).

بیرۆکەی دامەزراندنی قوتابخانەی فرانکفۆرت، کەبەمەبەستی گۆڕینی تیۆرەی مارکسی هاتەئاراوە، لەلایەن ((فلیکس وایل))ەوە بوو، بەسوود وەرگرتنی لەپارەو پوولی باوکی ((هرمان وایل)) کەخاوەن کارگەیەکی ئەڵمانی بوو.

لەراستیدا ئەم قوتابخانەیە ((یەکەمین دامەزراوەی توێژینەوەو لێکۆڵینەوەی مارکسی بوو لەجیهانی رۆژئاوای سەرمایەداریدا))[7]. ئەندامانی دەستەی دامەزرێنەری ئەم قوتابخانەیە دەیانویست وەك دامەزراوێکی مارکسی ناوی بنێن، بەڵام چاویان لەمە پۆشیو، بڕیاریاندا کەناوی دامەزراوەی توێژینەوە کۆمەڵایەتییەکانی فلیکس وایلی بەسەردادابنێن، بەڵام لەسەر ئەمەش رێنەکەوتن، تائەوەبوو دواجار ناوی ((دامەزراوەی توێژینەوە کۆمەڵایەتییەکان))یان بۆ هەڵبژارد. لەسەرەتادا ئابوریناسێکی قوتابخانەی تەکنیکی باڵا بەناوی ((کورت ئالبرت گرلاخ)) بووە یەکەمین بەڕێوەبەری ئەم دامەزراوەیە. ئەم کەسە لەئۆکتۆبەری ساڵی ((١٩٢٢))دا کۆچی‌کردو، ((کارل گرونبرگ)) جێی ئەوی‌گرتەوە[8].

سەرەنجام دامەزراوەی لێکۆڵینەوە کۆمەڵایەتییەکان لە٣ی شوباتی ساڵی ١٩٢٣دا لەفرانکفۆرتی ئەڵمانیا بەرەسمی دامەزرا. لەمارسی ساڵی ١٩٢٣دا، شوێن‌و جێگەی دامەزراوەکە لەڤیکتوریاو لەحەوشەی زانکۆی فرانکفۆرتدا بوو، بەڵام لە٢٢ی حوزەیرانی ((١٩٢٤))دا بارەگای دامەزراوەکە بەرەسمی کرایەوە.

دامەزرێنەرانی ئەم قوتابخانەیە لەزانکۆی فرانکفۆرتی ئەڵمان، لەو سەردەمەداو، بەتایبەتی پاش ئەوەی هۆرکهایمەر بوو بەسەرۆکی بەئەندامانی قوتابخانەی فرانکفۆرت ناسران، هەرچەندە ئەم ئەندامانە بۆ ماوەیەکی درێژ لەفرانکفۆرت نەمانەوە، بەڵام ئەو ناوەیان هەربەو شێوەیە مایەوە. لەگەڵ هاتنەسەرکاری نازییەکان، ئەم دامەزراوەیە بۆ هەریەك لەژنێڤو پاریس‌و نیۆرك‌و، دواتر بۆ لۆس ئەنجلس گوێزرایەوە.

بەڵام لەدوای جەنگی جیهانی دووەم جارێکی تر گەڕایەوە بۆ فرانکفۆرت، لەئەنجامی بزووتنەوەی خوێندکاران لەئەورووپاداو، لەدەیەکانی شەست‌و سەرەتای حەفتاکاندا، ناوی قوتابخانەی فرانکفۆرت ببووە وێردی سەرزمان. بەڵام لەپاش ساڵانێکی دوای ئەو سەردەمە، هزرو بۆچوونەکانیان لەبەشی زانستە کۆمەڵایەتییەکانی چەند زانکۆیەکی ئەورووپیدا سەرکەوتنی بەدەست

هێناو، لەم ڕێگەیەوە توانی کاریگەرییەکی بەهێزو گرنگ لەسەر هەندێك لەلاوانی هۆشیاری ڕۆژئاوایی دابنێت [10] یەکەمین ئەندامانی قوتابخانەی فرانکفۆرت ئەمانەبوون: کارل گرونبرگ، فردیرك پولاك، ماکس هۆرکهایمەر، تیۆدۆر ئادۆرنۆ، کارل ئگوستو، ویتفوگل. لەونێوەشدا هورکهایمەر لەسالی ١٩٣١ - ١٩٥٨ بەڕێوەبەری ئەم دامەزراوەیە بوو. هورکهایمەر لەیەك کاتدا فەیلەسوفو کۆمەڵناسیش بوو. ((فردریك پولاك))یش ئابورییناس بوو. لەلێکۆڵینەوە ئابورییەکانی دەمەزراوەکەشدا چارەنوسسازی هەروەها ((ئادۆرنۆ)) لەبەرنەوەی توانای بەسەر هەریەك لەفەلسەفەو کۆمەڵناسیو دەروونناسیو مۆسیقادا دەشکا، هەربۆیە هیچ شتێك لەگۆڤارەکانی دامەزراوەکەدا بەبێ ووتوێژکردن لەگەڵیدا بلاونەدەکرایەوە، ئەمە جگەلەوەی کەسەرپەرشتی کاروباری دارایی ئەم دامەزراوەشی دەکرد.

جێگای باسەکە ((هورکهایمەر))و ((ئادورنۆ)) لەو سەردەمەداو بەتایبەتی لەکۆتاییەکانیدا دەستەکو یارمەتی باشیان دەدایە دامەزراوەکە، هەرچەندە بەئەندامی رەسمی دامەزراوەکەش نەدەژمێردران. دواتر خەڵکانێکی تری وەك ((هربرت مارکۆزو، ئەریك فرۆمو، لئلوونتالو، والتەر بنیامینو، کارل کۆرشو، فرانتس بورکناو، پولیان گومپرتزو، هنریك گروسمان، ئارکادی گورلند، برونوبتلهایم، ناتان ئاکرمن، ماری یهودا، ئارتۆکیرشهایمەر))یان پێوە پەیوەست بوون، لەناویاندا ((لوونتال)) بەرەخنەگرێکی ئەدەبی دامەزراوەکە بوو، ((بنیامین))یش نووسەرو بیریارو رەخنەگرو تیۆردانی ئەدەبی بوو، هەرچی ((نۆیمان))یشە فەیلەسوفێکی حقوقیو سیاسی هەڵکەوتووبوو، ((شهایمەر)) لەفەلسەفەی حقوقو سیاسەتدا کاری دەکردو، ((گروسمان)) ئابورییناسو مێژووناسێکی کەم وێنەبوو، کەلەنوسینە ئابورییە سیاسییەکانی خۆیدا تەنانەت پێشبینی سالی کەوتنی سەرمایەداریشی دەکرد. ((گورلند)) خاوەن چالاکییەکی بەرزبوو لەبواری ئابوری سیاسیداو، ((بتلهایم))و ((ئاکرمن))و ((یهودا))ش لەرووی دەروونناسییەوە رۆڵێکی بەرچاویان هەبووە. بەم جۆرە هەندێك لەمانە وەك ((ویتفوگل))و ((فرۆم))و ((بورکنا))و ((نویمان)) بۆ ماوەیەکی کورت لەگەڵ ئەم قوتابخانەیەدا کاریان کرد، ئیدی دواتر ڕێگای خۆیان گرت.

هەروەها ئێستا ((یورگن هابرمان))، کەبەبڕوای ژمارەیەك لەخاوەن فیکرانی زانستە کۆمەڵایەتییەکان، قوتابخانەی فرانکفورتی لەمەرگی حەتمی رزگارکردووە، بەهاوکاری لەگەڵ ((کلاوس ئوخە))و((کارل ئاتواپل))و((ئالفرید ئاشمیت))و((ئالبرشتو لمر))و، لەفەلسەفەو کۆمەڵناسیدا دوای هەموو ئەو ئامانجانە دەکەون لەقالبێکی نوێدا.


فرۆید

بەرهەمەکانی قوتابخانەی فرانکفۆرت جگە لەفەلسەفە، کۆمەڵناسیو دەروونناسیو دەرونشیکاری، مێژوو، ئابوری، مافناسی، ئەدەبیاتو مۆسیقاشی لەخۆگرتووە.

لەڕوانگەی ئەوانەوە، فەلسەفە هەمووکات لەئەفلاتونەوە تائەمڕۆ، بەشێوەیەکی سەرەکی کۆمەڵایەتیو سیاسی بووە، هەروەها سەبارەت بەدەروونناسیش یەکێك بووە لەلقە سەرەکییەکانی

زانین، کەدەبوایە لەگەڵ تیۆرەی مارکسیزمدا ئاوێتەبکرایە، ئەوان مێژوویان بەبنەمای بیرکردنەوەی کۆمەڵایەتی دەزانی. پێیان وابووە کەبوونی تیۆرەیەك لەبارەی مێژووەوە پێویستە بۆ خوێندنەوەی تەواوی هەموو دیاردە کۆمەڵایەتییەکان.

شوناسی تاکەکەسی، پەیوەندییە خێزانییەکان، بیروکراسی، دەوڵەت، ئابووریو کلتوور، ئەوان بەلێکۆڵینەوەی تەوژمی رووڵەزیادی ئاوێتەبوونی ئابووریو سیاسەتو، لەئاکامدا دەستێوەردانی دەوڵەتو لەمەسەلە ئابووریو ئیحتیکارییەکانو، پەیوەندی هەرچی نزیکی ئابووریو دەسەڵاتدارێتیو، لەئەنجامدا لەنێوچوونی داهێنانی خۆیی بەقازانجی رێکخراوێکی بیرۆکراسی بەهێزو خۆبەخشی (دەوڵەتیو تایبەتی)و گشتگیرو، عەقڵانی بوونی هەرچی زیاتری ژیانی کۆمەڵایەتی، لەسایەی پەرەسەندنی


کانت

بیروکراسیو رێکخستنی ژیانی کۆمەڵایەتییەوەو، لێك هەڵوەشاندنو بەش بەشبوونی هەرچی زیاتری دابەشبونی کارو، دابەشبونی روو لەزیادی ئەرکو رۆڵی زانست، ئەوان دەستیانکرد بەلێکۆڵینەوەو ئاشکراکردنی گۆڕانکارییەکانی کۆمەڵگای سەرمایەداری هاوچەرخو، چەمکەکانی بونیادە ئابووریو سیاسیو کلتوورییەکانیان وەك بونیادێکی مێژوویی شیکردەوەو ((سەرمایەداری دەوڵەتیو بونیادەکانو ئایندەی مێژووییان خستە ژێر شیکردنەوەیەکی رەخنەگرانەوە))[١٢].

بیریارانی قوتابخانەی فرانکفۆرت دەیانویست بەگونجاندنی لایەنە جیاوازەکانی تیۆرەکانی کانت، هیگڵ، مارکس، ماکس ڤیبەر، لوکاشو فرۆید، ئەوە دەربخەن کەلەناوچوونی سیستمی سەرمایەداری لەجەبری ئابوورییەوە نایەت، بەڵکو دەبێت بەهۆی دەرخستنی دژایەتیو ناکۆکییەکانی ناو کۆمەڵگاو، شیکردنەوەی ئەو

ئەو ئەرکەی ((دامەزراوەی لێکۆڵینەوە کۆمەڵایەتییەکانی فرانکفورت)) خستبویە پێش هەموو شتێکی خۆیەوە ((بەرهەمهێنانی چەمکێك بوو، کەبونیادە ئابووریو سیاسیو کلتورییەکانی کۆمەڵگای ئەمرۆ، وەك پێکهاتەیەکی مێژوویی دیاریکراو لەخۆبگرێتو، ببێتە بناغەیەك بۆ پێشبینیو دەرەنجامی رەوتەکانی داهاتوو. بونیادی ئەم کارەش، لەهەندێك تێڕوانینی هاوبەشی نێوان هەموو ئەندامانی قوتابخانەکەوە هاتبوو، لەوانە مەرجی یەکەم بۆ تێگەیشتن لەدیاردە کۆمەڵایەتییەکان، بوونی تیۆرێکە لەبارەی مێژووەوە، کەبتوانرێت بەهۆی ئەوەوە هەموو بونیادێکی کۆمەڵایەتی دیاریکراو بخرێتە ژێر رەخنەیەکی بابەتییەوەو کارتێکردنو ئامانجەکانی بەپێی ئامادەیی مێژوویی مرۆڤ بۆ بەدەستهێنانی ئازادی، هەڵسەنگێنێت))[١١].

ئەوانە لەبواری جۆراوجۆردا هەوڵی لێکۆڵینەوەیان داوە، لەوانە وەك دروستبوونی

ئایدۆلۆژیانەی کەرەنگدانەوەی ئەو ناکۆکیانەن، خود هۆشیاریی‌و پراکتیکی کۆمەڵایەتی بگۆڕن‌و، بناغەی دەسەڵاتخوازی لەناو کۆمەڵگادا لەق بکەن‌و، هۆکارێك لەجێی بچێنن کەبێ سەروبەری‌و گەڕەلاوژێی ڕێك دەخات.

ئەوان گرنگیان بەهەمان ئەو مەسەلانە دەدا کەلەسەدەی هەژدەوەو، لەچوارچێوەی ئایدیالیزمی ئەڵمانیدا هێنرابووە ئاراوە، ئامانجیشیان لەبنەڕەتدا بریتی‌بووە بەرهەمی سەردەمی ڕۆشنگەریی ئەوروپایە، کەپێشینەکەی بۆ قۆناغی ڕێنسانس‌و ریفۆرمە ئایینییەکان دەگەڕێتەوە. لەڕاستیدا فەلسەفی رەخنەیی کانت بۆ دەرخستنی بناغە فەلسەفییەکانی مەعریفەیە، بەڵام هەرچی هیگڵ‌و مارکس‌و ئەندامانی قوتابخانەی فرانکفۆرتە، بەرەخنەو هەڵسەنگاندنی ئایدیۆلۆژییەکان، لەجیاتی ئایدیاکان، درێژەیان بەڕێبازی کانت دا.

بەبڕوای ئەوان رەخنەکاری دەبێت ببێتەهۆی رزگاربوون، نەك هەر لەزانینی تیۆریدا بمێنێتەوە، بەڵکو دەبێت کرداری کۆمەڵایەتیشی لەگەڵدا بگۆڕێت[13].

ئێستا بەسەرنجدان لەو کاریگەریانەی قوتابخانەی فرانکفۆرت لەسەر توێژینەوەکانی زانستە کۆمەڵایەتییەکان لەڕۆژئاوادا داناوە، هەوڵدەدەین یارمەتی‌و خزمەتەکانی ئەم قوتابخانەیە لەتێڕوانینی مارکۆزەوە باسبکەین.


مارکس

یەکێك لەکاریگەرترین خزمەتە چاکەکانی قوتابخانەی فرانکفۆرت، پێشبینی‌و تێگەیشتن بوو لەفاشیزم لەرووی پەیوەندی ناوەکی‌و خودییەوە بەسەرمایەدارییەوە. دووەم ـ ئەو شتەی کەبەلای خودی هۆرکایمەرەوە بەبەشێکی دانسقەو روویەکی جوانی ئەم قوتابخانەیە دەزانرێت دەستبردنی ئەم قوتابخانەیە بوو بۆ گرفتە کۆمەڵایەتی‌و سیاسییە گەورەکانی سەردەمەکەمان. واتە فەرامۆشکردنی سنورەکانی دابەشبونی کاری زانکۆیی‌و. سوود وەرگرتن لەکۆمەڵناسی‌و دەروونناسی‌و فەلسەفە لەپێناوی تێگەیشتن‌و چاککردنی گرفتەکانی سەردەم‌و، لەگشتگیرکردنی چەمکی رەخنەکاری‌و راکێشانی سنووری رەخنە لە((فەلەسەفەی رەخنەیی کانت))ەوە بۆ ((فەلەسەفەی رۆحی هیگڵ))و((راڤەی مارکس بۆ مێژوو)). ئەم تێگەیشتنەیان بۆ رەخنەو رەخنەکاری، لەتایبەتمەندییەکانی مێژووی فیکری ئەڵمان‌و،

هــەروەها بەمەبەســتی وەڵامدانــەوەی ئــەو پرسیارەی کە((چ دزێوییەك لەژیاری ڕۆژئـاوادا دروست بووە، کەلوتکەی پێشکەوتنی تەکنیکیدا، نەفیکردنـــەوەی پێشـــکەوتنی مرۆڤایـــەتی دەبینرێت: واتــە نـەمانی مرۆڤایەتیو جوامێریو هەستی مرۆڤانەو زیندوبوونەوەی ئەشکەنجە وەك ئامێرێکی ((ئاسایی)) لێپرسینەوەو گەشەکردنی لایـــەنی وێرانکارانـــەی وزەی ئـــەتۆمیو ژەهراویبوونی ژینگە... هتد

هەموو ئەمانە بەچ شێوەیەك رویدا. بۆ وەڵامی ئەم پرسیارانە. ئێمە لەقوتابخانەی فرانکفۆرتدا بـەمێژووی کۆمەڵایـەتیو فیکریـدا چووینـەوەو. هەوڵماندا ئەوەروون بکەینەوە کـەچ کـارو پەرچە کردارێك لـەنێوان پێشـکەوتنو سـەرکوتکردندا هـــەبووە لـــەمێژووی رۆژئـــاوادا، بەتایبـــەتی لەسـەردەمی رۆشـنگەریدا ((واتـــە ســـەدەی هەژدەهـــەم)) کەبەیـەکێك لەپێشـــکەوتوترین قۆناغەکانی مێژوو دادەنرێت، ئێمە دەمانویست سەر لەوجۆشخواردنە بەڕواڵەت حەتمییەی تەوژمە ئازادیخوازەکـانو تەوژمـــە ســـەرکوتکەرەکان دەربکەین))[١٤].

دیدگای رەخنەگرانـەی مـارکۆز تـەنـها تایبـەت بەکۆمـەڵگا پیشەسـازییەکانی ولاتـانی رۆژئـاواو ئـــەوروپاو ئـــەمریکاوە، بـــەڵکو کۆمـــەڵگای سۆشیالیستی خستۆتە ژێر رەخنەوەو، پێیوایـە کەکۆمەڵگای پیشەسازی نویێ، لەهـەردوو شێوە ســەرمایەداریو سوشیالیســتەکەیدا. زۆر خـــاڵی هاوبەشیان هەیە لەروانگەی مارکۆزەوە ئەم رووە هاوبەشانە بریتیلە ((لەدەستدانی چـاودێریکردنی کار لەکارخانــە گــەورەکاندا، تــەلقینکردن بــەهۆی ئامرازەکـانی پــەیوەندی گشــتییەوە، کـــەژیانی تایبەتییان سنودار دەکاتو دەیخاتـە ژێر رکێفی یاسـاکانی خۆیـەوەو، هـەروەها بلاوبوونـــەوەی توندوتیژیو سەرکوتکردن))[١٥].

مـارکۆز جیـهانی کۆمۆنیسـتی بـەدوژمنی دەرەکـی سیسـتمی سـەرمایەداری نـەدەزانیو دەیگوت جیهانی کۆمۆنیزم، لایەنگرانی چـین یـان شـــۆرەوەی پێشـــووش لـــەڕووی ئـــابوریو سیاســـییەوە، ئێســـتا لـــەریزی سیســـتمە کاپیتالیزمەکاندایە، رمانی شۆرەوی پێشوش ئەم خاڵە دەسـەلمێنێت، ئـەو وەك ((دیمون ئـارون)) بـڕوای وایـە کەهـەموو کۆمـەڵگا پیشەسـازیە پێشکەوتووەکان لەناوەڕۆکدا چوونیەکن.

مارکۆزە ئەوەی بەبیردا دێنێتـەوە کەجیـهانی هاوچـــەرخ واقیعییـــەتی مێـــژووی مرۆڤـــی لــەیادکردووەو، رژێمــی فاشــیزم خــۆی بەســەر گەلانی ئازادی جیهاندا سەپاندوە. بناغەو بنەمای دیموکراسی لەو حکومەتانەی کەبەڕواڵەت پیادەی دیموکراسی دەکـەن، لـەناوچووەو، ئــەم جــۆرە چەمكو واژانــە جێگـای خۆیـان بـۆ ئـەو گوزارشـە تازانە چۆڵکردووە، کـەدەگونجێت لەگـەڵ زەوقی کۆمـەڵگای تەکنـەلۆژیدا. جـا ئـەم گوزارشـتانەش بـەهۆی نزیکبونـەوەی قـازانج پەرستانەی هــێزە فـەرمانڕەواکان بەسـەر چارەنوسـی کۆمـەڵگاوە دەرکەوتوونو، لەئـەنجامدا راستییەکانی کردۆتـە درۆو، درۆکانیشی وەك راستی دەرخستووە.

بــەبڕوای مـــارکۆز لەهـــەردوو سیســـتمی سـەرمایەداریو سۆشـیالیزمدا، بیروباوەڕەکـان، بەهۆی ئەو رێگرانەوە کەوەك سـنوورەکانی تاکـە کەس دەردەکەون، لەکارکـەوتوونو نازانمکـاریو تاوانە باوەکان لەکۆمەڵگای توتالیتاریدا بەڕێگـەو رەسمی راستەقینەی ژیان دەزانرێتو، گــەوجێتی سیاسـییان ئـابووری لەلایـەن کۆمـەڵگاوە قبـوڵ دەکرێت، واتــە بـەردەوامبونی ژیـان لەجیـهانێکدا کەبێعەقڵی تیایدا بەعاقڵانە دەردەکەوێت.

بـەڵام لەگـەڵ ئەوەشدا، کـەمارکۆز سیسـتمی کۆمەڵگا پیشەسازییە سـەرمایەدارەکان بـەڕێگری رزگاری مرۆڤ دەزانێت، هیوای خۆی بەتەواوەتی

لەدەست نادات و، لەنوسینەکانیدا بەدوای پرۆژەیەکی نوێدا دەگەڕێت بۆ ئەم کۆمەڵگایە.

کۆتایی

سەرچاوە/ فرهنگ توسعە ـ شمارە بیست ونهم و سی ام/ل ۹۱ ـ ۹٤.

پەراوێزەکان

+ ۱،۲،۳ ـ نظریه جامعه شناسی در دوران معاصر ـ تألیف جورج ریتزر ـ ترجمەی محسن ثلاثی ـ انتشارات علمی سال ۷٤ ـ ص ۲۵۸، ۲۵۹/ ۸٤.

+ ۳،٦،۱۰،۱٤ ـ مردان اندیشه ـ پدید اورندگان فلسفەی معاصر ـ گفتگوی برایان مکی باهربرت مارکوزه ـ ترجمه عزت فولاوند ـ ناشر طرح نو ـ سال ۷٤ ـ ص۱۰٦،۱۰۷، ۹۸ ـ ۱۰۱.

* ٤ـ بحران جامعه شناسی عزب ـ الوین گولدنر ـ ترجمه فریده ممتاز ـ چاپ اول ـ سال ٦۸ ـ انتشارات انتشار ص ۲٤،٤۹۲.

* ۷ ـ هابرماس و بازسازی نظریه انتقادی ـ حسینعلی نوذری ـ روزنامەی ایران شمارەی ۳۱۱.

* ۸ ـ تأویچەی مکتب فرانکفورت ـ جی مارین ـ ترجمه جنگیز پهلوان ـ انتسارات کویر ـ تهران ۱۳۷۲)).

Ruth A. WallaCE & Alison – Wolf. Cotempary Sociological

Theony 1998: Prentice Hall – INC Engel Wood cliff N. ewgensey PP – 96 – 98.

۱۱ ـ پیشگفتار کتاب ازادی وقدرت وقانون ـ نوشتەی فرانس نویمان بەقلم هوبرت مارکوزه ـ ترجمه عزت ... فولادوند ـ چاپ اول سال ۱۳۷۳ ـ انتشارات خوارزمی ـ ص ـ ۱۰ ـ

۱۲ ـ مقدمه کتاب بهیموت ـ ساختار وعمل کرد ناسیونال سوسیالیسم ـ نوشتەی فرانس نویمان ـ ترجمەی محمد رضا سوداگر ـ چاپ اول ـ سال ۱۳٦۷ ـ انتشارات خوارزمی ـ ص ۱۰۷ ـ ۱۱۳

۱٤ـ منتقدان جامعه ـ اندیشەی اجتماعی رادیکال در امریکا ـ تی. بی. باتومور ـ ترجمەی محمد جوهر کلام ـ چاپ اول ـ سال ۱۳٦۹ ـ نشر سفیر ـ ص ۱٦۷ ـ ۱٦٦.

سەرچاوە/

فرهنگ توسعە ـ شمارە بیست و نهم و سی ام/ لاپەرە ۹۱ ـ ۹٤.

# ڕەخنەو توێژینەوە

■ لێکدانەوە لەنێوان زیندانی عەقڵو زیندانی زماندا



■ مرۆڤ و کەلتوور

■ لەمەڕ شاعیران و قاندرەکانیان

■ رۆمانی نوێی ئینگلیزی تادانیال دیڤۆ



■ تیۆرەو مێژووی وەرگێڕان

# بزاوتی لێکدانەوە لەنێوان

# (زیندانی عەقڵ) و (زیندانی زمان)دا

■ مۆریس ئەبو ناضر
● و: جەمال غەمبار

هەتا ماوەیەکیش بەر لە ئێستا، مەسەلەی سێکوچکەی "نووسەر"و "دەق" و" خوێنەر" وەك سێگۆشەیەکی بنەڕەتیی ، ببووە بنەماو نەخشە ڕێژی سەرجەم ئەو تێزو قوتابخانە ڕەخنەییانەی بیروڕا و بۆچوونەکانی (ئەرستۆو ئەفلاتون)یان کردبووە تێشووی ڕووناکبیریی خۆیان. هەر سێ لایەکەی ئەو سێگۆشەیەش بەپشت بەستن بەهەردوو تەوەری (شوێن) و (کات)، یەکتریان تەواو دەکرد. لەسۆنگەی ئەوەشەوە، هەندێ جار جەخت لەسەر ئەوە دەکرا بیۆگرافیا - تەرجەمەی حاڵ - و کەسێتیی نووسەر دەبوونە پێوەری هەڵسەنگاندنی هەر کارێکی ئەدەبیی و بەهۆی ئەو دوولایەنەشەوە کارە ئەدەبییەکە دیاری دەکرا وەك چۆن ئاوێنە، ئەدگاری ئەو شتانە دیاری دەکات و دەنوێنێ کە دەخرێنە بەردەمی.

هەندێ جاری دیکەش جەخت لەسەر ئەوە دەکرا کە دەق لەڕووی شێوەو ناوەڕۆکەوە هەڵسەنگاندنی لەبارەوە بکرێ ئەویش لەمیانی ئەو زمانەی کە دەقەکە لەگواستنەوەی مەبەستەکانی نووسەردا، بەرجەستەی دەکات. هەرچی حاڵەتی سێیەمیشیانە، جەخت دەکرایە سەر مەوقعیەتی خوێنەرو ئەو پەڕی داخوازییەکانیش لەم کائینە (واتا خوێنەر) ئەوە بوو کە دەبێ ڕێز لەمەبەستگەرایی نووسەر بگرێ بەوەی پشت بەو بەها و ئەرزشە ئیحاییە ببەستێ کە زمانی ئەدەب بەرهەمی دێنێ و دەیبەخشێ.

پاش هەموو ئەوانە، دەرگا لەسەر تێزێکی نوێی ڕەخنەیی خرایە سەرپشت، ئەویش مۆدێرنیتی (الحداثة) و سەرجەمی ئەو پاشبەند و لق و پۆپانەیە کە لەمۆدێرنێتی دەکەونەوە، وەك بونیاد گەرایی و پاش بونیاد گەراییش، لەچەشنی

ئەدەب لەنێوان زاتییەت و مەوزوعییەتدا، دەسووڕایەوە، بگۆڕین بەتوێشوویەکی دیکەی رووناکبیری کە سەرچاوە فەلسەفیەکەی ئەم رووناکبیرییە نوێیە لەسەر بنەماکانی دابڕانی ئەبستیمی (معرفی) و لێکدانەوەو دیاردەگەرایی و مەسەلەی فۆرم و، یەقین و، بونیادی دەق راوەستابوو. ئەم توێشووە بەهۆی گەڕانەوە سەر بیروڕاو تێزەکانی (کانت) و (نیچە)و (هایدگەر)و (فۆکۆ)و فەیلە سووفانی دیکەوە هاتە بوون .. ئەو فەیلەسووفانەی کە بەدرێژایی ئەم سێ سەدەیەی دوایی، نمایندەی مێژووی فەلسەفەی رۆژئاوان.

لێرەوە دەشێ بپرسین؛ دەبێ ئەو رووداوە چی بووبێ کە وای کرد بەرەو گۆڕەپانی شەڕە فەلسەفییەکان پەلکێش بکرێین تاکو پاش ئەوەی دەستبەرداری تفاقە کۆن و تەقلیدییەکانی ڕوانینمان بۆ ئەدەب و سایکۆلۆژیاو سۆسۆلۆژیا بووین، وە دووی تێگەیشتنێکی باشتر پەیوەندی ئینسان بەخواوەندو کەون و زمان دابگەڕێین. (فۆکۆ) لەکتێبی "وشەکان و شتەکان"دا ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە لە و تیۆرەی زماندا کەوا ڕێسا مەعریفییەکانی پێش سەردەمی کلاسیزم بەکاریان دێنا، کارێکی سەخت بوو ڕاستی و دروستیی خودی مەعریفە دەست نیشان بکەیت بەبێ ئەنجامدانی کاری لێکچوواندنی نێوان دەلالەت (وشە)و، ئەو حاڵەتەی کە دەلالەتی لێ دەکرێت. پاش بەرپا بوونی گۆڕانکاریی مەعریفیی لەسەردەمی کلاسیزمدا، چەمکی لێکچواندن واتا (مفهوم التشابه) دووچاری بەسەر چوون و ئاوا بوون هات و، تیۆری زمانی تەمسیلیی جێگەی ئەوی گرتەوە (لێرەدا مەبەست لەزمانی تەمسیلیی، ئەو زمانەیە کە لەڕێگەی وشەوە حاڵەتەکان دەنوێنێ)، دواتریش و لەکۆتایی سەدەی نۆزدەیەم و سەرەتای سەدەی بیستەمدا هەردوو تێڕوانینەکە بۆ زمان، چ وەك لێکچوواندن و چ وەك تەمسیل، بەسەر چوون و لەجێگەیاندا بۆ چوون و تێڕوانینێکی دیکە هاتە گۆڕێ .. ئەو بۆ چوونەش وای لەزمان دەڕوانی کە لەچەند


هایدگەر

تیۆری وەرگرتن (نظرية التلقی) و، ستراتیژییەتی تەفکیکیەت و گەلێ بابەتی دیکەش. هەر لێرەشەوە سێگۆشە سەرە کییەکەی کە پێشتر ئاماژەمان بۆکردو گەوهەری هەڵسەنگاندنی پرۆسەی داهێنانی پێك دەهێنا، کەوتە بەر رەحمەتی ئەم تێزە نوێیەوە و لایەکانی درزیان تێکەوت..

راستە هەر لەسەرەتاوە مۆدێرنێتی بەهەندێ تەجەلیاتی بەرچاوەوە لەبەشێکی هونەرەکاندا وەك دادایزم و سوریالیزم و، هەروەها لەهەندێ فۆرمی ئەدەبیی وەك ڕۆمان و درامادا، درەوشایەوە، بەڵام هەتا ساتە وەختی درەوشانەوەی تەواوی بونیادگەرایی و پاش بونیادگەرایی و دەرکەوتنی تێزەکانی تەفکیکیەت و تێزە نوێیەکانی روانین بۆ مێژوو، هێشتا پەردە لەسەر ئەو سندوقە فەلسەفییە لانەدرا بوو.

ئێمەش، (نووسەر مەبەستی لە ڕوناکبیریی عەرەبییە) لەشەستەکانەوە دەستمان دایە ئەوەی توێشووە کۆنەکەی رووناکبیریمان، ئەو توێشووەی کە لەناواخندا بەدەوری مەسەلەتەقلیدییەکانی وەك (تیۆری محاکاة) و رەخنەی سایکۆلۆژی و رەخنەی کۆمەلایەتیی و،




ڕەگەزێکی شەکڵیی پێک دێت و ئەم ڕەگەزانە لەچوارچێوەی سەمت (نسق) ێکدا کۆدەبنەوەو ئەو سەمتەش بۆ خۆی ڕێکخستنێك بەسەر دەنگ و برگەو ڕەگەکاندا دەسەپێنێ کە جیاوازە لەوەی زمان بەتەنها ئامرازی تەمسیلیی بێت. بەواتایەکی دیکە لەسەرەتای ئەم سەدەیەدا "زمان" گۆڕانکارییەکی وەهای بەسەردا هات لەوە دەرچوو کە نێوەندێك یان پانتایی یەك بێ تیایدا سەرجەمی دەنگ و وشەو شتەکان تەمسیلی ئەو شت و حاڵەتانە بکەن کە زمان خۆی ئاماژەیان بۆ دەکات و، زمان لەونێوەندەوە گۆڕا بۆ ئەوەی لەخودی خۆیدا چەند سەمتێکی تایبەتی کۆ بکاتەوە و هەریەکە لەو سەمتانەش پەیوەندییە ناوەکی یەکانی خۆیان لەگە یەکتریدا دەبەستن.

(هایدگەر) پێی وایە گۆڕانێکی تەواو لە پەیوەندیی زمان بە وجودەوە هەیە، وجود ناگەوێتە پێش زمانەوە بەڵکو لەنێو ماڵی زماندا دەژی یان وجود دانیشتوویەکی نێو ماڵی وجودە.. هایدگەر دەڵێ:" زمان ماڵی وجودە"، هەر لەو ماڵی زمانەشدا مرۆڤ دەژی. ئەوانەی لەڕێی زمانەوە بیر دەکەنەوە و لەڕێی زمانیشەوە داهێنان بەرپا دەکەن، ئەوانە پاسەوانی ماڵەکەن و، پاسەوانێتیی ئەوان ئەوە دەستە بەردەکات کە وجود بدۆزرێتەوە یان کەشف بکرێ. دیارترین گوتەزاش کە هایدگەر تیایدا جەخت لەسەر پەیوەندیی نێوان زمان و وجود دەکات و (باس لەگیرۆدەبوونی ئینسان یان وجود دەکات بەدەست زمانەوە - وەرگێڕ) ئەوەیە کە ئەو زمان بەو شێوەیە دەناسێنێ کە: "زیندانێکی ئەبەدییە بۆ مرۆڤ". لەلایەکی دیکەوە، سایکۆلۆژیستی فەرەنسی (لاکان) پێی وایە زمان بەو (ئەوی دی- الآخر)ە دەناسرێ، کە "من - الانا" یاخود "زات"، هەبوون و ئامادەگیی ئەو (ئەوی دی) یە دیاری دەکات. فەیلەسوفی فەرەنسیش (درێدا) بەچەشن و تەرحی هەریەك لەهایدگەرو سۆسێرو لیڤی شتراوس، هەردوو مەسەلەی "زناك - العلامە"و "دال و مەدلول" دەکاتە تەوەری شیکردنەوە، بەڵام درێدا لەتێگەیشتنیدا بۆ "زمان" لەو نوختەیەدا لەو فەیلەسوفانە جیا دەبێتەوە کاتێ بانگەشە بۆ یەکگرتن و لەیەکتردا توانەوەیەکی سۆفیزمییانە لەنێوان (دال و مەدلول) و (وەرگر- متلقی)دا دەکات و ئازادییەکی تەواوی گەمەکردن بە(مەدلول) دەبەخشێ بەشێوەیەك کە لە (دال) جیا ببێتەوە و سەربەخۆیی خۆی وەربگرێ.

درێدا پێی وایە دوو جۆر چەمك بۆ تێگەیشتنی دەق هەن: چەمکی کۆن و چەمکی نوێ. چەمکی کۆن، ئەو چەمکە تەقلیدییەیە کەپێی وایە هەموو دەقێك دەبێ سیما و سنوورەکانی ڕوون و ئاشکرا بن، دەق ئەو دەقەیە کەسەرەتا و کۆتایی هەبێ، خاوەنی یەکەیەکی گشتگیر و ناوەرۆکێك بێ کەبشێ بەسانایی لەناو خودی دەقەکەدا بخوێنرێتەوە، ئەو دەقە دەبێ ناونیشان و نووسەر و پەراوێزی هەبێ، هەروەها دەبێ ئەو دەقە بەها و ئەرزشێکی مەرجەعیی هەبێ ئەگەرچی لاسایی کردنەوەی دنیای دەرەوەش نەبێ (واتا موحاکاتی دنیای دەرەوەش نەبێ)... بەڵام چەمکی نوێ بۆ تێگەیشتن یان بۆ ڕوانینە دەق، ئەم چەمکەیان والەدەق دەڕوانێ کە جەستەیەکی نوسراوی ڕەسیوو پێگەیشتووە، یان ناوەڕۆکێکە نەك هیچ مەرجەعیەت و پەراوێزێك نابنە لەمپەر و ڕێگری بەردەمی، بەڵکو تۆڕێکی جیاوازو

سەریەخۆیە، چنراوێکە لەڕایەڵی سەرجەم ئەو ئاسەوارانەی کە بەچەشنێکی بێ کۆتا و بێ پایان ئاماژە بۆ ئەو شتانە دەکات کە خودی خۆیان نین، واتا (الی أشیاء ماغیر نفسها)، هەروەها ئاماژە بۆ ئاسەواری سەرجەم حاڵەتە جیاگەرایی یەکانی دیکە دەکات. هەر لەسایەی ئەم چەمکە تازەیەشەوە زمان پلەو پایەیەکی وای بۆ خۆی وەدەست هێنا کە تیایدا بارگاویی ببێ بەخەسڵەتەکانی عەقڵی کانتی (ئەو مەعریفەیەی کە عەقڵ نەتوانێ دەستەبەری بکات، مەعریفەیەکی ناتەواو و نارەسیوو ناکۆتایە)، هەروەها هەمان ئەو پلەوپایەیە جۆریك لەجەبرییەتی بەخشییە زمان و کردییە تاکە ئامرازێك بۆ بەدی هێنان و دەستەبەرکردنی مەعریفە و پەی بردن بە کەینوونەو وجود. لەم بارەیەوە فۆکۆ دەنووسێ: "خەڵکی یان بەشەر وادەزانن کە ئاخاوتنیان لەخزمەتی خۆیاندایە، بەڵام دەرك بەوە ناکەن کە ئەوان خۆیان ملکەچی یاسا و داواکارییەکانی ئاخاوتن کردووە".

هەروەها فۆکۆ لە ڕوونکردنەوەیەکدا دەڵێ: "لەو بڕوایەدام کە هەندێ کەس، لەوانەش خۆم، وادەزانن کە حەقیقەت چ وجودێکی نییە و، بەتەنها زمان وجودی هەیە".

ئەگەر بونیادی زمان یان ڕاستتر ئەگەر بیناکردنی زمان مەعریفەی تاك بەجیهانەوە دیاری بکات، ئەوا ئەمە وا دەگەیێنێ کە "واقیع" خۆی لەخۆیدا وجودێکی نییە، بەڵکو لەڕێگەو بواری زمانەوە شتێك هەیە پێی دەوترێ واقع، سەرئەنجام ئەمەش واتای ئەوە دەگەیێنێ کە زمان بۆتە ئەو زیندانەی جێگەی زیندانە عەقڵییەکەی کانتی گرتۆتەوە. لێرەدا پرسیارێك دێتە گۆڕێ، ئەویش؛ زمان چۆن گەیشتە ئەم ئاست و قۆناغە؟

لەڕاستیدا گەیشتنی زمان بەم ئاست و قۆناغە، هۆیەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو کردەی کۆنترۆڵکردنەی کە ڕێبازی ئەزموونگەرایی (المذهب التجریبی) سەپاندی و چەندین دەستکەوتی بایەخداری زانستی و تەکنۆلۆژیی هێنایەدی، هەروەها بەهۆی پاشەکشێی تێزەکانی عەقڵی کانتییەوە بوو، ئەو عەقڵەی کە مەعریفەی لەنێو چوارچێوەو تخوویەکانی خۆیدا بەند کردبوو.. هەروەها یەکێك لەهۆیەکانی دیکەی گەیشتنی زمان بەم قۆناغە، کاریگەری ڕۆڵی فەیلەسوفی ئەڵەمانی (فریدریك نێچە)و، فەیلەسوفێکی دیکەی ئەڵەمانی (مارتن هایدگەر) بوو.. هایدگەر لەکتێبەکەیدا، (کەینونەو کات) دەپرسێ: "کامیان دەکەونە پێش ئەوی دیکەیانەوە؛ کەینونە یان زمان؟". هەروەها دەپرسێ: "ئایا ئێمە لەکەینوونەوە لەدایك دەبین یان لەزمانەوە؟". هەتا دواجار، هایدگەر دەگاتە ئەوەی بڵێ:" بەبێ زمان، مرۆڤ ناتوانێ بگاتە کەینوونەو دەرکی پێ بکات".

ئەوەی مایەی پیلە بازیی و قسە لەسەر کردن نییە، ئەو پرۆژەی بونیادگەراییەی کەلەگەڵ توێژینەوە و تێزەکانی فردینان دی سۆسێر لەبواری زانستی زمانەوانییدا دەستی پێکرد، ئەو پرۆژەیە نموونەیی ترین و باشترین بەرجەستەکردنی ئەو پلەو پایەیە بوو کە "زمان" لەبواری زانستی توێژینەوە ئەدەبییەکانی ڕۆلان بارت و، شیکردنەوە سایکۆلۆژییەکانی لاکان و ، تێزە نوێیەکانی ڕوانینی فۆکۆ بۆ فەلسەفە و مێژوو، بەدەستی هێنا بوو. ئەوەش بۆ خۆی ئەو بوارەیە کە لەڕووی ئینسانیی و کۆمەڵایەتیی و کلتوورییەوە چەندین مۆرکی جیاجیا لەخۆی دەگرێ و لەوگوتەزا بەناوبانگەدا دەدرەوشێتەوە کەدەڵێ:" زمان ئەوەی لەتوانادایە کەخاڵێکی گشتی بکاتە بنەماو دیدگا بۆ دەق و، هاوکاتیش میتۆدێ بخاتە بەردەست بۆ شیکردنەوەی دەق". بەڵام هێندەی نەبرد بونیادگەرایییەکان خۆیان توانییان پەی بەوە ببەن کە ئەو نموونە زمانییەی لەشیکردنەوەی دەقدا بانگەشەیان بۆ دەرکردو پشتیان پێی دەبەست، بەرەو تەڵزگەیەکی (مأزق) سەختتری بردن، ئەوان بەهۆی ئەو تێزەی خۆیانەوە، بوونە بەندکراوی نێو زیندانی زمان و، بوونە ئەسیری ئەو نموونە زمانییەی کەلەشیکردنەوە داو لەکاتی پراکتیزەکردندا بەسەر هەر دەقێکدا، پرۆسەکە ئاسانتر دەبێ لەشیکردنەوەی شێوازێك کە تایبەتە بەگێڕانەوە

یان سەردییەتی ژانرێکی ئەدەبییەوە. (پێم وایە لێرەدا نووسەر مەبەستێتی بڵێ کە ئەو جۆرە میتۆدو شیکردنەوانە جۆرە فۆرمات "FORMAT"و قاڵبێکی حازر بەدەست لەخۆ دەگرن، بەجۆرێك کە لە شیکردنەوەی هەر دەقێکدا وەك راستە و پرگاڵ بەئاسانیی دێ بەدەستەوە- وەرگێڕ).

ڕۆلان بارت لەنووسینێکیدا دەڵێ: " ئەوەی کەرەخنەگرە شیکاریخوازەکان، ئەوانەی پێشڕەو بوون، دەیانویست پیادەی بکەن ئەوە بوو کە هەموو چیرۆکەکانی دنیا لەیەك بونیاددا ببینن (کردەی بینین لێرەدا مەبەست- رۆیە-یە)، ئەوان بەخۆیان دەگوت لەهەر جۆرە رۆمانێك نموونەیەك هەڵدەبژێرین، پاشان لەسەرجەمی ئەم نموونانە بونیاتێکی باڵاو مەزنی رۆمان دادەڕێژین کە ببێتە ستاندەرێك بۆ هەر چیرۆکێکی زیندوو، ئەوەش بۆ خۆی کارێکی سەختو دژوارە.. سەرەنجامیش وەها کارێك نابێتە پێداویستیو داواکراوێك، چونکە دواجار دەق خەسڵەتی جیاگەرایی خۆی ون دەکات).


کانت

ئەوەی بارت دەیڵێت ئەوەیە کە بونیادگەرایی زمانەوانییو ئەدەبیی پشت دەبەستێ بەبیرۆکەی سیستەمو سەمت (النسق): ئەو سەمتەی کە پەیوەندی نێوان پێکهاتە بچووکەکانی دەق دەباتە رێوەو، لەلایەکی تریشەوە ئەو سەمتە گەورەیەی کە پەیوەندییەکانی نێوان سەمتی فەردیی دەقو سەمتی گشتیی جۆر یان نەوعی دەقەکە دەباتە رێوە.

ئەو قسەیەشی کە دەڵێ سەمتێك یان سیستمێکی گشتیی نەوعیی دەق لەئارادایە بۆ لێتوێژینەوەی سەمتەکان/ دەقە فەردیەکان، وەها قسەیەك دەبێتە هۆی ئەوی گریمانەی ئەوە بکرێت کە دەق سنورێکی کۆتاو داخراوی هەیەو ئیدی جێگەیەك لەدەقەکەدا نامێنێتەوە بۆ مەبەستگەرایی نووسەرێك کە پێشتر جاری مەرگی دراوە (لێرەدا مەبەست لەمەرگی ئاسایی نییە)، بەڵکو ئەو بوارو جێگەیە چۆڵ دەکرێ بۆ رەخنەگری دەقەکە، ئەو رەخنەگرەی بەرگی داهێنانی پۆشیوە و هەوڵ دەدات بێ دەنگییەکانی دەق بهێنێتە قسەو دەنگ و، کەشفی پانتاییە چۆڵەکانی بکات و سەرجەم سەمتو لایەنە لەبەرچاو ون بووەکانی دەقەکە بهێنێتەوە بەرچاوان. ئەم تێڕوانینە بۆ پرۆسەی نووسین و رەخنەگرتن لەلای بونیاد گەراییەکان کە لەپشت بزوێنەرەکانیەوە جۆرە خولیاو پاڵنەرێك هەیە بۆ دەستەبەرکردن و بەدی هێنانی بەزانستی کردنی توێژینەوە ئەدەبییەکان لەڕێی بانگەشە کردن بۆ نموونەیەکی باڵای زمان وەك بنەمایەك بۆ پێشخستنی میتۆدێکی رەخنەیی کە لەڕووە زانستی یەکەیەوە هیچی کەمتر نەبێ لەسەمتی سەرجەم زانستە سروشتییەکان، ئەم تێڕوانینە لەئاکامدا گەیشتە ئەوەی دارشتەیەکی نوێ بۆ جۆرێك لەجەبرییەت بخاتە ڕوو، پایەکانی ئەو جەبرییەتەش زمان بوو.

جەبرییەتی زمان لەتێزەکانی بونیاد گەرایید ا، کاریگەریی و ڕەنگدانەوەی خۆی هەبوو لەتێکشکاندنی تیۆری ئەدەبیی و ئەو سێگۆشە بنەڕەتییەی کە بۆتە بنەمای ئەو تیۆرە بەواتا سێگۆشەی: (نوسەر+دەق+خوێنەر)، ئەوانەی ناوەرۆك و مەغزاکانی تێزی جەبرییەتیان کردبووە پەیامی خۆیان هەبوونی نووسەریان دوای بەرهەم هێنانی دەق بەلاوە دەناو، خوێنەریشیان لەو جوغزە دەهێنایە دەرێ کە کاریکاتە سەر رەخنەگر، چونکە پییان وابوو کە توێژینەوەی دەق لە دیدو بۆچوونی خوێنەرەوە و کاریگەریی ئەو دید و بۆچوونە لەسەر توێژەری دەقەکە، کارێکی وادەکات کە توێژەر بکەوێتە جۆرێك لەنیسبیەتەوە کە هەڕەشە لەشووناسی خودی کارە ئەدەبییەکە بکات.

لەڕووی مێژوویییەوە، تێزی (تەفکیك) وەك درێژەپێدانێکی فەلسەفەی کانت وایە لەجەخت کردنیدا لەسەر مەسەلەی خود - (زات)، بەڵام هاوکاتیش لەڕوویەکی ترەوە لەو فەلسەفەیە تێدەپەڕێنێ ئەویش بەوەی کە لێرەدا قۆناغی (فۆرم) دەست پێدەکات، بەواتایەکی ڕوونتر، تێزی تەفکیکیەت پێی وایە چ زات و، چ زانست

سـەركەوتوو نـەبوون لەدەسـتە بـەركردنی مەعریفەی راستەقینەدا، بۆیە (فۆرم) دەتوانـێ ئەوە دەستەبەر بكات.

لەلایەكی دیكەوە تێزی تەفكیكیەت زیاتر لەفەلسەفەكەی هایدگەر نزیك دەبێتەوە كە فەلسەفەی لێكدانەوەیە (التأويل)، هەروەها لەگەڵ تێزەكانی فەیلەسوفی فەرەنسی (دریدا)دا وێك دێتەوە بەتایبەتی لەمەسەلەكانی؛مانای كراوەو، دەلالەتی ناكۆتاو، بەخراپی خوێندنەوەی دەق دا.

تەفكیكیەكان و لەپێش هەمووشیانەوە دریدا پێی وایە كە ڕۆڵی خوێنەر، ڕۆڵێكی زۆر گرنگە، لە سۆنگەی ئەوەشەوە ماناكان لەلای خوێنەر لەدایك دەبن و، هەر خوێنەریش دەیاندوێنێ. بەبێ ئەم ڕۆڵەی خوێنەریش، شتێك نییە پێی بوترێ، دەق یان زمان، یان زناك، یان نووسەر. رەخنەگری ئەمریكایی ئارت بیرمان لە نووسینێكدا دەڵێ:" دیارترینی دەستكەوتەكانی ئەم تیۆرە ئەوەیە كە هەریەكە لەماناو بونیاد لەكاری ئەدەبییدا، لەئەنجامی كارلێكی خۆیاندا لەگەڵ دەقی خوێنەردا دێنە بەرهەم، ئەو خوێنەرەی كاتێ تەماس لەگەڵ كارێكی ئەدەبیدا دەگرێ، پێشتر بۆ چوونەكانی خۆی لەبارەی زانینی ئەرك و ئامانج و پرۆسەكانی ئەدەبەوە گەڵاڵە كردووە.. كەواتە، ماناو بونیاد بەتەنێ نابنە خەسڵەتەكانی نێو دەق، بەڵكو خوێنەریش بەشداری لەپەی بردن پێیان و دۆزینەوەی ئەو خەسڵەتانەدا دەكات، كەواتە دەكرێ بڵێین خوێنەریش بۆخۆی تاكو ڕادەیەك داهێنەرێكی بەشدارە نەك بەتەنها بۆ خودی دەقەكە، بەڵكو بۆ ماناو، بەهاو، بایەخی دەقەكەش".

ئەوەی دەشێ بەدەروازەیەكی دابنێین بۆ چوونە نێو ستراتیژیەتی تەفكیكیەت ئەوەیە كە ئەم تێزە خوێنەری گەڕاندەوە نێو پانتایی دەق پاش ئەوەی بونیاد گەرایی، خوێنەری لەجوغزی لێكدانەوەی دەقدا فرێ دابووە دەرێ.. بەڵام ئەو دەروازەیە بەبێ كلیل دەمێنێتەوە ئەگەر بێتو لەشوێن و پلەی ئەو (زمان)ە تێنەگەین كە خوێنەر لەلێكدانەوەیدا بۆ دەق پەنای بۆ دەبات.

زمان لای تەفكیكیەكان پشت نابەستێ بە هاوسەنگیی یان وەك یەك بوونی (تعادل)ی هەردوو لای پەیوەندییەكە، واتا دال و مەدلول، بەڵكو پشت دەبەستێ بەمەسافەی نێوان (دال)ێك و (مەدلول)ەكەی، هەندێ جاریش لاوازبوونی پەیوەندی نێوان دال و مەدلول بۆشاییەك دروست دەكات كە سەرجەمی مەدلولەكان بەئازادیی خۆیان گەمەی خۆیان تێدا دەستەبەر دەكەن و، بەوەش ناكۆتابوونی دەلالەت یاخود مانا دێتە دی بەشێوەیەك هەموو خوێندنەوەیەك لەگرێژەنە دەچێ و دەبێت بەخراپی خوێندنەوەی دەق.

لەتوێژینەوەیەكیدا لەبارەی (گراماتۆلۆژی)یەوە، دریدا لەبارەی ئەم كلۆم دان یان داخرانە تەفكیكیەی زمانەوە ئەدوێ و دەڵێ: " ئێمە ناتوانین تخووبی دەق ببەزێنین و بەئاراستەی شتێكی دیكە یان مەرجەعێك ..یان مەدلولێكی دەرەوەی دەقدا، هەنگاو هەڵبگرین، پاشان شتێك نییە لەدەرەوەی دەقدا مامەڵەی لەگەڵدا بكەین.. بۆیە هەر لەسایەی ئەم هەڵوێستەدا كاتێ بەخۆ دەزانین گەیشتووینەتە نێو زیندانی زیندانەكان، كە ئەویش تەفكیكیەتی لێكدانەوەیە كە تیایدا (زمان) وەك كائینێك كە هەست بەوە بكات گەیشتۆتە ئەوپەڕی كامڵ بوون و وەحدانیەتی خۆی و، بەوەش هیچ جێگایەكی بەخاڵیتی بۆ شتەكانی دیكە نەهێشتۆتەوە".

لێرەوە دەكرێ بپرسین؛ بڵێی پێویستمان بەڕوونكردنەوەی زیاتر هەبێ؟ بەتایبەتی لەبارەی ئاست و پلەی زمانەوە؟ لەو بڕوایەدا نین پێویستمان بەوە هەبێ مادامەكی (زمان – پەیوەندی) بۆتە زنجیرەیەكی بێ كۆتایی لە (دالەكان)و، دەقیش بۆتە بیابانێك لەبوونەوە بۆ نائامادەیی و، لەجیاگەراییەوە بۆ بەڕەسەنێتی بوون.

سەرچاوە:
پاشكۆی (آفاق)ی ڕۆژنامەی (الحياة)ی لەندەنی– ژمارە (١٢٨٧٢)ی ڕۆژی ١٩٩٨/٦/١. ل١١
وتاری (حركة التأويل بين "سجن العقل" و "سجن اللغة")
نووسینی/ موريس أبو ناضر.

# مرۆڤ و کەلتوور

## پێناسەکردنی مرۆڤ لە زاراوەکانی کەلتووری مرۆییدا


- ئێرنست کاسیرەر
- و: ئاوات ئەحمەد.


بەوەی کە ئەفلاتوون وتەی (خۆت بناسە) ی لە قالبێکی تەواو نوێدا هەلگرتەوە، وەرچەرخانێکی وا لە کولتوورو فیکری یۆنانیدا بەرپا بوو، کە نەک تەنیا بەلای فیکری پێش سۆکراتیەوە[*] نامۆ بوو، بەلکو سنوورەکانی میتۆدەکەی سۆکراتیشی بەزاند. سۆکرات بۆ بەجێهێنانی داواکاریەکەی خواوەندەکەی دێلفی، بۆ جێبەجێکردنی ئەرکی ئایینی خود ئەزموونکاریی و زانین و خۆبەخۆ، خۆی دابوو لەمەسەلەی مرۆڤی تاک.

بەلام ئەفلاتوون دەرکی بە سنوورداریتی شێوازی پرسیار کردنەکەی سۆکرات کردبوو، بۆ چارەکردنی ئەم گرفتەش ئاشکرای کرد کە پێویستە لە ژێر سایەی نەخشەیەکی بەرینتردا بەڕێوەی ببەین. ئەو دیاردانەی کە لەئەزموونی تاکساریبیماندا {Individoal Experience} تووشمان دەبن، ئەوەندە جیا جیاو ئالۆزو نائاسایین کە زەحمەتە بۆمان شیکار بکرێن. لێکۆلینەوە لە مرۆڤ نابێ لە ژیانی تایبەتیدا بێت، بەلکو دەبێ لە ژیانی سیاسی و کۆمەلایەتیدا بێت. بەپێی ئەفلاتوون سروشتی مرۆڤ وەك دەقێکی گران وەهایە کە دەبێ بەهۆی فەلسەفەوە لێی بکۆلرێتەوە. بەلام لەئەزموونی تایبەتیماندا ئەو دەقە بەهێمای زۆر ورد نوسراوەو ناخوێندرێتەوە، یەکەمین کاری فەلسەفە بریتیە لە گەورەکردنەوەی ئەو هێمایانە. فەلسەفە هەتاکو میتۆدێك لەسەر دەولەت پێش نەخات، ناتوانێت میتۆدێکی گونجاومان لەسەر مرۆڤ پێشکەش بکات. سروشتی مرۆڤ بە پیتی گەورە لەناو سروشتی

دەوڵەتدا نوسراوە. لێرەدا لەپڕ مانا شاراوەکەی دەقەکە دەردەکەوێت، ئەوەی تاریك و تەژم بوو، ڕۆشن و خوێنراوە دەبێت.



ئێرنست کاسیرەر

بەڵام ژیانی سیاسی تاقەفۆرمی بوونی کۆمەڵایەتی‌نیە لە مێژووی چەشنی مرۆڤدا، دەوڵەت لەم شکڵەی ئێستایدا بەرهەمێکی درەنگوەختی پرۆسێسی شارستانێتیە. لەسەردەمێکی زوودا مرۆڤ ئەم شێوازەی بەڕێوەبردنی کۆمەڵایەتی دۆزییەوەو، پێشتریش هەوڵێکی تری دابوو بۆ ڕێکخستنی هەست و خۆزگەو ئارەزووەکانی. ئەم ڕێکخستن و سیستماتیزەکردنە لەزمان و ئەفسانەو ئایین و هونەردا رویدا. پێویستە ئێمە بەم ڕێسا بەرینە قایل ببین، ئەگەر بمانەوێت میتۆدێك لەسەر مرۆڤ پێش بخەین. دەوڵەت لەگەڵ گرنگیشیدا هەموو شتێك نیە، چونکە ناتوانێت هەموو چالاکیەکانی مرۆڤ بگرێتە خۆی و گوزارشتیان لێبکات. بەدڵنیایی ئەم چالاکیانە لە پەرەسەندنی مێژوویی خۆیاندا لەگەڵ پێشکەوتنی دەوڵەتدا تێکەڵاوی‌یەکتری بوون و، گەلێك جار لەسایەی ژیانی سیاسیدا سەربەخۆیی خۆیان پاراستووە. ئەمانە ئەگەرچی خاوەنی بوونێکی جیای خۆیان نەبوون، بەڵام نرخ و بەهایەکی تایبەت بە خۆیان هەیە.

لە فەلسەفەی هاوچەرخدا کۆمت* {Comte} یەکەمین کەس بوو کە خۆیدا لەم گرفت و بەشێوەیەکی روون و سیستماتیزەکراودا فۆرمەلەی کرد. ئەوەی سەیرە ئەوەیە دەبێت لەم مەسەلەیەدا پۆزەتیفیزمەکەی* {Positivism} کۆمت وەکگ هاوتەریبێکی هاوچەرخی میتۆدە ئەفلاتوونیەکەی لەمەڕ مرۆڤ سەیر بکەین. بێشك کۆمت هەرگیز ئەفلاتوونی نەبووە. ئەو هەرگیز نەیتوانیوە ئەو لۆژیك و میتافیزیا پێش گریمانەییەی پێ‌قبووڵ بێت کە میتۆدی ئەفلاتوون لەمەڕ ئایدیاکان لەسەری بینا کراوە. لەلایەکی تریشەوە کۆمت بە توندی پێچەوانەی تێڕوانینی ئایدیۆلۆژیستە فەرەنسیەکان بوو، هیرارکییەکی بۆ زانینی مرۆڤ دروستکرد، لەوێدا دوو زانستی تازە بەرزترین خانەیان داگیرکردبوو، واتە زانستی ئاکاری کۆمەڵایەتی و زانستی دینامیکای کۆمەڵایەتی. کۆمت لەم تێڕوانینە سۆسیۆلۆژییەوە چوو بەگژی فسیۆلۆژیستەکانی سەردەمی خۆیدا. یەکێك لە وتە بنەڕەتیەکانی فەلسەفەکەی ئەو ئەوەیە کە پێویستە میتۆدی ئێمە بۆ لێکۆڵینەوەی مرۆڤ بابەتیی بێت، بەڵام ناتوانێت تاکانە بێت. ئەو بابەتەی کە حەزدەکەین بیزانین بریتی‌نیە لە ئینفیعالە تاکانەییەکان، بەڵکو بابەتێکی گەردوونیە. ئەگەر لە زاراوەی ((مرۆیی)) یەوە بچینەوە بۆ سەر بابەتەکە، ئەوا دەبێ بیسەلمێنین کە راڤەی مرۆیی بە مرۆڤ ناکرێت، بەڵکو مرۆڤ بە مرۆیی راڤە دەکرێت. پێویستە سەرلەنوێ گرفتەکە تاقیبکرێتەوەو فۆرمەلەبکرێتەوە، پێویستە لەسەر بناغەی دروستترو بەرینتر دابنرێت. ئێمە لە بیرکردنەوەی سۆسیۆلۆژیی و مێژووییدا بناغەیەکی وەهامان دۆزیوەتەوە. کۆمت دەڵێت: ((بۆئەوەی خۆت بناسیت، مێژوو بناسە)).

لێرە بەدواوە سایکۆلۆژیای مێژوویی جێگەی هەموو فۆرمەکانی سایکۆلۆژیای تاکی گرتەوە. کۆمت لە نامەیەکدا نوسی ((هەموو ئەو



گۆتە

پشكنينه‌ی لــه‌ مێشــكماندا بــوو هــه‌موويان ره‌وينه‌وه‌و بوون به‌ وه‌هم. هه‌موو ئه‌وه‌ی كه‌پێی ده‌ڵێن لۆژيك، ميتافيزيك، ئايديۆلۆژيا، خــه‌ياڵێكی ئيديــاڵ‌و خه‌ونــه‌. ئه‌گــه‌ر شــتێكی پڕوپــووچ نه‌بێت)).[1]

له‌((وانه‌كانی فه‌لسـه‌فه‌ی پۆزه‌تيفی)) كۆمـت دا، ده‌توانين هه‌نگاو به‌ هه‌نگاو هێڵكاريی ئيدياڵــه‌ ميتۆدۆلۆژه‌بييه‌كانی ســه‌ده‌ی نــۆزده‌ بكێشــين. كۆمت وه‌كو زانايه‌ك ده‌ستی پێكرد، ســه‌ره‌تا خۆی بــه‌ گرفتــه‌كانی ماتمـاتيك‌و فيزيـاو كيميـاوه‌ خه‌ريك كرد. هيراركيه‌كه‌ی ئه‌و بۆ زانينـی مـرۆڤ له‌ فه‌له‌كزانيه‌وه‌ ده‌ست پێده‌كات‌و به‌ ماتمـاتيك‌و فيزياو كيميادا ده‌ڕوات‌و پاشان ده‌گاته‌ بايۆلۆژيا، پاشانيش وا دياره‌ ئاراسته‌كه‌ی وه‌رده‌چه‌رخێت. ئه‌وكاتـه‌ی خۆمـان ده‌ده‌ين لـه‌ جيهانی مـرۆڤ، چيـتر پرنسـيپه‌كانی ماتمــاتيك يــان زانســته‌ سروشتييه‌كان به‌س نين‌و كه‌ڵكيان نابێت. ديارده‌ كۆمه‌لايه‌تيه‌كاندا ياسايه‌ك ده‌يانگرێتــه‌وه‌، ڕێــك وه‌كو دياردە فيزياوييــه‌كان، بــه‌ڵام جيــاوازترو ئاڵۆسـكاوترو بــه‌ زاراوه‌كـانی فيزيــاو كيميــاو لابۆلۆژيا شی‌ناكرێنه‌وه‌.

كۆمــت ده‌ڵێــت: ((لــه‌ هــه‌موو ديــارده‌ كۆمه‌ڵايه‌تی‌يـه‌كان دا، تێبينـی كـاركردنی ياسـا فسيۆلۆژييه‌كانی تـاك ده‌كـه‌ين، لـه‌وه‌ش زيـاتر شـتێك لـه‌ كاريگـه‌رييان كـه‌م ده‌كاتــه‌وه‌ كــه‌ ده‌گه‌ڕێتـه‌وه‌ بـۆ كاريگـه‌ريی تاكـه‌كان له‌سـه‌ر يه‌كتری، كه‌ به‌شێوه‌يه‌كی نـاوازه‌ لـه‌ چه‌شـنی مرۆڤـدا ئـاڵۆز ده‌بێتـه‌وه‌ بـه‌هۆی كاريگـه‌ريی نه‌وه‌كانه‌وه‌ له‌سه‌ر بۆماوه‌كان. بۆيه‌ ئاشكرايه‌ كه‌ زانستی كۆمه‌ڵايه‌تيمان پێويسته‌ لـه‌و شـوێنه‌وه‌ ده‌سـت پێبكـات كـه‌ پـه‌يوه‌ندی بـه‌ ژيـانی تاكه‌كانه‌وه‌ هه‌يه‌.

له‌لايـه‌كی تريشـه‌وه‌، فرسـه‌تی ئـه‌وه‌مان له‌به‌رده‌ستدا نيه‌ كـه‌ گريمانـه‌ی ئـه‌وه‌ بكـه‌ين كه‌ فيزيای كۆمه‌ڵايه‌تی بريتيه‌ له‌ زياده‌يـه‌ك بـۆ سـه‌ر فسيۆلۆژيا، وه‌ك هـه‌ندێك لـه‌ فسسيۆلۆژيسـته‌ ناوداره‌كـان وای بـۆ چـوون. هـه‌ردوو دياردەكـه‌ هاوشێوه‌ نـين بـه‌ڵام يـه‌ك سروشتيان هه‌يـه‌، زۆر گرنگه‌ هه‌ريه‌كه‌يان به‌جيا وه‌ربگرين.

مه‌رجه‌ كرمه‌ڵايه‌تی‌يه‌كان كه‌وتنه‌گـه‌ڕی ياسـا فسـيۆلۆژييه‌كانيان سسـت كـردووه‌، پێويسـته‌ فيزيای كۆمه‌ڵايه‌تی ده‌سـته‌ی چاودێريی تايبـه‌ت به‌خۆی هه‌بێت)) [2].

قوتـابی‌و شوێنكه‌وتوانی كۆمت حـه‌زيان لـه‌م جياكردنه‌وه‌يه‌ نه‌بوو، نكوليیان كـرد لـه‌ جيـاوازی نێـوان فسيۆلۆژياو سۆسيۆلۆژيا، چونكـه‌ ترسـی ئه‌وه‌يان هه‌بوو كه‌ ئه‌و دان پيانانه‌ بيانباته‌وه‌ بۆ

سەر دوانەیەکی میتافیزیکی. ئومێدی ئەوان بریتیبوو لە دامەزراندنی میتۆدێکی پوختەی سروشتی بۆ جیهانی کۆمەڵایەتیو کولتوریی دابمەزرێنن. بۆئەوەی بگەنە ئەم کۆتاییە، پێیان وابوو کە دەبێ هەموو ئەو بۆچوونانە رەت بکەنەوەو بیانرەخێنن کە مرۆڤ لە جیهانی ئاژەڵان جیادەکاتەوە. میتۆدی پەرەسەندن بەراشکاویی ئەو جیاوازییانەی سڕیەوە. تەنانەت پێش داروینیش، پێشکەوتنی مێژووی سروشتی هەموو هەوڵێکی لەمەڕ ئەو جیاکردنەوەیەی پەکخستبوو. لە قۆناغەکانی زووی چاودێریکردنی ئەزموونگەرادا، هێشتا دەشیا کەزانا ئومێدی بەوە هەبێت کاراکتەرێکی ئەناتۆمییانەی یەکجارەکی بۆ مرۆڤ بدۆزرێتەوە. لە کۆتاییەکانی سەدەی هەژدەدا هێشتا ئەو میتۆدەی کە دەیوت جیاوازییەکی نیشانەکراو لەنێوان بونیادی ئەناتۆمیی مرۆڤو ئاژەڵەکانی تردا هەیە، میتۆدێك بوو بە گشتیی قبوولْ دەکرا. یەکێك لە فەزڵە گەورەکانی گۆتە * Goethe لە بواری ئەناتۆمیای بەراوردکاردا ئەوەیە زۆر بەتوندی دژی ئەو میتۆدە وەستایەوە.

ئەم هاوشێوەییە بەشێوەیەکی سەرەکی تەنیا لەلایەنە ئەناتۆمییو فسیۆلۆژییەکاندا نەبوو، بەڵکو بونیادی عەقڵیی مرۆڤیشی گرتەوە،ئیتر وا پێویست بوو هەموو ئەو هێرشانەی کە دەکرانە سەر رێگا کۆنەکانی بیرکردنەوە، لەیەك خاڵدا چڕبکرێنەوە. ئەوشتەی کە دەبوو بسەلمێنرێت بریتیبوو لەوەی، ئەوەی ئێمە پێی دەڵێین زیرەکی مرۆڤ، بەهیچ مانایەك شتێکی سەربەخۆو توانستێکی رەسەن نیە. داکۆکیکەران لە میتۆدە سروشتیەکان دەیانتوانی هەوڵی سەلماندنی ئەو پرنسیپانەی فسیۆلۆژیا بدەن کە لە لایەن قوتابخانە دێرینەکانی هەستیزمەوە (Sensationalism) داڕێژراون. تاین Tine لە کارێکیدا لەمەڕ زرنگیی مرۆڤ [٢] رێسا سایکۆلۆژییەکانی پێشخست بۆ میتۆدە گشتییەکەی خۆی سەبارەت بەکولتوری مرۆڤ. بەپێی تاین، ئەوەی پێی دەڵێن ((رەفتاری زیرەکانە)) پرنسیپێکی سپێشاڵ یاخود رەندە Privilege یەکی سروشتی مرۆڤ نیە، بەڵکو دەورێکی پوختەکراوی ئاڵۆسکاوی ئەو میکانیزمو ئۆتۆماتیزمە دەستەجەمبیانەیە کە لە کاردانەوەی هەموو گیاندارەکاندا دەیبینین. ئەگەر ئەم روونکردنەوەیە قبوولْ بکەین ئەوا جیاوازیی نێوان زیرەکیو غەریزە لێلْ دەبێت، دەبێت بە جیاوازیی لە پلەدا نەك لە چۆنیەتیدا. ئیتر زاراوەی زرنگی سودی نامێنیو لەرووی زانستیشەوە مانایەکی نامێنێت.

سەرسوڕهێنەرترین ئەدگاری ئەم چەشنە میتۆدانە لەو جیاوازییە سەمەرەیەدایە لەنێوانی ئەوەدا کە بەڵێنی بەدیهاتنی دەدەنو ئەوەش کە بەراستی پێشکەشمان دەکەن. ئەو بیریارانەی ئەم میتۆدانەیان بیناکرد زۆر مکوم بوون لەسەر پرنسیپە میتۆدۆلۆژییەکانی خۆیان. ئەوان لە توێی ئەزموونە باوەکانی ئێمەوە قسەیان لەسەر سروشتی مرۆڤ نەدەکرد، ئەوان خەباتیان بۆ ئیدیالێکی بالاتر دەکرد لەمەڕ بوونێکی رەهای زانستیانە. بەڵام ئەگەر سەرەنجامەکانی ئەوان لەگەڵ ئەم ستاندەردەدا بەراورد بکەین، ناتوانین نائومێد نەبین.

(غەریزە) زاراوەیەکی زۆر تەژمە (Vague) رەنگە خاوەنی بەهایەکی وەسفیی بێت، بەڵام بەبێ شك بەهایەکی راشکاوی نیە. بەگێڕانەوەی چەند پۆلێکی ئۆرگانی یاخود دیاردەی مرۆڤ بۆ چەند غەریزەیەکی بنەڕەتی، لافی هۆکارێکی نوێ لێنادەین، بەڵکو تەنیا ناوێکی تازەمان داناوەو هیچی تر. ئێمە پرسیارێکمان بەرزکردۆتەوە، وەلامێکمان نەداوەتەوە.

زاراوەی (غەریزە) لە باشترین حاڵدا بریتییە لە ئیدیۆمێك لەسەر ئیدیۆمێکی تر، لە زۆربەری حاڵەتەکاندا بریتییە لە تاریکستان لە تاریکیدا. تەنانەت لەوەسفکردنی هەڵسو کەوتی

ئاژەڵانیشدا زۆربەی زانایانی بایۆلۆژیاو سایکۆ بایۆلۆژیا دوودڵن لە بەکارهێنانی. ئەوان وریامان دەکەنەوە ئەو بیرۆکە هەڵانەی کەلێی دەکەونەوەو رزگاربوون لێیان زەحمەتیش دەبێت. هەوڵ دەدەن کە تا رادەیەك خۆیان لابدەن لە چەمکی بەهەڵە هەڵچنراوی غەریزە. یان بەتەواوی وازی لێ بهێننو چەمکی زیرەکی بەکاربهێنن کە چەمکێکی ئاسانترە. رۆبەرت .م. یەرکێس لە تازەترین کاریدا ئاشکرای دەکات کە هەردووزاراوەی غەریزەو زیرەکی باویان نەماوەو، ئەو چەمکانەی کە ئەوان بۆی دامەزراون پێویستی بەسەرلەنوێ پێناسەکردنەوە هەیە [٤].

بەڵام لەبواری ئەنترۆپۆلۆژیای فەلسەفیدا ئێمە هێشتا دووریین لەپێناسەکردنەوەیەکی لەم چەشنە. لێرەدا ئەو زاراوانە چەندان جار بەساویلکەییو بەبێ رەخنەی شیکاریی قبووڵ کراون. کاتێك چەمکی غەریزە بەم شێوەیە بەکاربهێنرێت، دەبێت بە نموونەیەك بۆئەو تەرزە هەڵە میتۆدۆلۆژییانەی کە ولیەم جێمس وەکو باوەڕی هەڵەی سایکۆلۆژییانە وەسفی کردووە.

وشەی (غەریزە) کە رەنگە سودمەندبێت بۆ وەسفکردنی رەفتاری ئاژەڵ یان مرۆڤ، وەردەسوڕێت بۆ چەشنە هێزێکی سروشتی. گەلێ جار ئەوبیریارانە دووچاری ئەم هەڵەیە بوون کە وایان هەستکردووە کە چیتر ناچنەوە بۆناو ریالیزمی سکولاستی یان (سایکۆلۆژیای هەستی). روونترینو کاریگەرترین رەخنەکە لەم مۆدێلەی بیرکردنەوە گیرابێت لەلایەن جۆن دێویی* یەوە بوو لە لێکۆڵینەوەی سروشتی مرۆڤو پیادەکردنەکانیدا. دێوی نوسی ((شتێکی نازانستییە کە چالاکییەکان پێوەند بکەین بە ژمارەیەکی زۆر دیاریکراوو نیشانەکێشراوی غەریزەکان. سەرەنجامی پراکتیکیی ئەم کارە زیانبەخشە. پۆلاندن هەتا سروشتیتربێت باشترە. ناسنووریيە لە ژمارەنەهاتووەکانی یەك رووداوی دیاریکراویان گۆڕاو، لەناو فیکردا دەگەن بە کردەی بەلیستەکردنو، خستنە ناو خشتەوە، پێوان بەپێی کۆمۆنییو بەستنیان لەناو گورزەو چەپکدا.. بەڵام کاتێك گریمانەی ئەوە دەکەین کە لیستەو چەپکەکانمان نوێنەری گرویی جیا جیای دیاریکراون بە شێوەیەکی سروشتی، ئەوا لەبری یاریدەدان قۆرت دەخەینە بەردەمی مامەڵەکردنمان لەگەڵ شتەکاندا. تاوانبار دەبین بە جەسارەت کردنێك کەهەرزوو سروشت سزای دەدات. ئێمە وا لەو ناشایستەییە دەکەین کە کاریگەرانە لەگەڵ سروشتی نیانو داهێنەری ژیندا مامەڵە بکات .. مەیلی لەبیرکردنی ئۆفیسی جوێکردنەوەو پۆلاندنو، وەرگرتنی شتەکان وەکوو شتی نیشانەکراو لەخۆیاندا، بریتییە لە باوەڕی هەڵەی ئێستایی تایبەت بەزانست .. ئەو هەڵوێستەی کە جارێکیان لە زانستە فیزیاییەکاندا گەشەی کرد، ئێستا بەرەو تیۆرزەکردنی سروشتی مرۆڤ دەڕوات. مرۆڤ خراوەتە ناو هەڵبژاردەیەکی غەریزە سەرەتاییەکانەوە، کە دەشێ یەکەیەکە پیشان بدرێنو ژمارەیان لێبدرێتو بکرێن بە کەتەلۆك. تیۆریستەکان دەچنەوە سەر ژمارەو زنجیرەکانیان. هەندێك دەڵێن خود _ خۆشەویستی، هەندێکی تر دەڵێن ئیگۆیزمو غەیریزم، هەندێکی تر سێ زاراوە بەکاردەهێنن، چاوچنۆکیو ترسو شکۆداریی، لە کاتێکدا کە نوسەرانی ئەمڕۆی ئەزمونکار زاراوەکانیان فراندووە بۆ پەنجا _ شەست زاراوە. بەڵام لە راستیدا گەلێ کاردانەوەی تایبەتی دیکەش هەن، کە ئەگەر ماوەیان هەبێت مەرجی ماندەرانەی جیاواز دەخەنە روو، هەروەها لیستەکانمان تەنیا پۆلاندنن بۆ مەبەستێك [٥].

دوابەدوای ئەم پێداچوونەوە کورتەی ئەو میتۆدە جیاجیایانەی خۆیان تەرخانکردووە بۆ وەڵامدانەوەی پرسیاری مرۆڤ چیە؟ ئێستا دێینە سەر ئەسڵی مەبەست. ئایا ئەم میتۆدانە پڕاوپڕی مەبەستەکەن؟ یاخود هێشتا نزیکبوونەوەی تر هەیە بۆ ئەنترۆپۆلۆژیای فەلسەفی؟ ئایا لەپاڵ ئەم ئاواخن پشکنینە سایکۆلۆژیەو، چاودێریی

کردنە بایۆلۆژییەو، لێکۆڵینەوە مێژووییەدا، هیچ ڕێگایەکی تر بەکراوەیی ماوەتەوە؟ من لە فەلسەفەی فۆرمە سیمبۆلییەکەمدا [٦] هەوڵم داوە نزیکبوونەوەیەکی دیکە کەشف بکەم. میتۆدی ئەو کارە بە هیچ مانایەك بریتی نیە لە نوێکردنەوەیەکی رادیکاڵانە. وا نەکێشراوە کە تێڕوانینە پێشینەکان بەدرۆ بخاتەوە. بەڵکو بۆئەوەی تەواویان بکات.

فەلسەفەی فۆرمە سیمبۆلییەکان لە بەڵگەنەویستێکەوە دەست پێدەکات، کە ئەگەر هیچ دیاریکردنێکی سروشت یان کرۆکی مرۆڤ لە گۆڕێ بێت، ئەوا ئەو دیاریکردنە تەنیا وەزیفەیی دەبێت نەك راستەقینەو واقیعیو تۆکمە.

ناتوانین مرۆڤ بەهیچ پرنسیپێکی وەها دیاری بکەین کە کرۆکە میتافیزییەکەشی بگرێتەوە _ نە بەهۆی ئەو ئامادەییە عەقڵییە خۆڕسکە یان غەریزەییەوە کە لە ڕێی چاودێریکردنی ئەزمونییەوە بەدی دەهێنرێت. کاراکتەری سەرنج ڕاکێشی مرۆڤ، نیشانەی جیاکەرەوەی ئەو، بریتی نیە لە سروشتی میتافیزییانەی یان فیزیاوییانەی ئەو _ بەڵکو بریتییە لە کاری ئەو. ئەم کارەیە سیستەمی چالاکییەکانی مرۆڤ کە بازنەی مرۆڤایەتی دێنێتە بوونو دیاریشی دەکات. زمان، ئەفسانە، ئایین، هونەر، زانست. مێژوو هەموویان پێکهێنەرو دیاریکەری ئەو بازنەیەن. بۆیە ((فەلسەفەی مرۆڤ) بریتی دەبێت لەو فەلسەفەیەی کە بونیادی پێکهێنەری هەریەکە لەو چالاکییانەی مرۆڤمان دەداتێو لە هەمان کاتیشدا وامان لێدەکات کەوەك گشتێکی ئۆرگانی لێیان تێبگەین.

زمان، ئەفسانە، هونەر، دین، هەریا شتی بێسەروبەرەو دورەپەرێز نین، ئەرانە هەر هەموویان بەبەندێکی کۆمۆن پێکەوە بەستراوین. بەڵام ئەو بەندە بەندێکی ماتریاڵی نیە، وەك سکۆلاستییەکان دەیانوت، ئەوە بەندێکی وەزیفەییە. پێویستە لە پشتی شکڵە جۆراوجۆرەکانی ئاخاوتنو، ئەفسانەو، هونەرو، دینەوە بگەڕێین بۆ وەزیفەیەکی سەرەکیو

دواجار لەدواشیکردنەوە دا بگەڕێینەوە بۆ رەسەنێکی میللی.

بێشك لە جێبەجێکردنی ئەم ئەرکەدا ناتوانین هیچ تەرزە زانیارییەك پشت گوێ بخەین. پێویستە هەموو بەڵگە ئەزمرونیە ئامادەکان تاقی بکەینەوە، هەموو میتۆدە ناواخنیەکان، چاودێریکردنە بایۆلۆژییەکان، پرسیارکردنە مێژووییەکان بەکار بهێنین. نابێ ئەو میتۆدە کۆنانە پشتگوێ بخرێن، بەڵکو دەبێ بخرێنە ناو سەنتەرێکی رۆشنبیریی نوێوەو لەگۆشەیەکی تازەوە بۆیان بروانرێت. لە وەسفکردنی بونیادی زمان، ئەفسانە، دین، هونەرو زانستدا هەست دەکەین بە بەردەوامی پێویستیمان بە زاراوەکانی سایکۆلۆژیایە.

لەسەر ((هەستی)) دینی، لەسەر ((ئەندێشە)) ی هونەرییان ئەفسانەیی، لەسەر بیرکردنەوەی لۆژیکی یان عەقڵانی قسەدەکەین. بەبێ دەنگی میتۆدێکی زانستیی سایکۆلۆژیا ناتوانین بچینە ناو ئەوجیهانانەوە. سایکۆلۆژیای منداڵ بیرۆکەیەکی باشمان دەداتێ بۆ لێکۆڵینەوەی پێشکەوتنی گشتی ئاخاوتنی مرۆڤ. هەروەها لێکۆڵینەوەی سۆسیۆلۆژیای گشتی یارید دییەکی باشمان دەدات. ئێمە ناتوانین لە فۆرمی بیرکردنەوەی ئەفسانەیی بەرایی تێبگەین بەبێ ئەوەی بایەخ بدەین بە فۆرمەکانی کۆمەڵگای بەرایی. هەروەها هێشتا بەکارهێنانی میتۆدە مێژووییەکان زۆر گرنگە.

پرسیاری وەك زمانو ئەفسانەو دین چین؟ وەلام نادرێتەوە ئەگەر بایەخ نەدرێت بە پەردسەندنی مێژووییان.

بەلام ئەگەر بشێت وەلامی ئەم پرسیارە سایکۆلۆژییو سۆسیۆلۆژییو مێژووییانە بدرێتەوە، پێوستە هێشتا لەر گۆرەپانەدا بمێنینەوە کە جیهانی ((مرۆڤ)) پێك دەهێنێت: پێویستە سنورەکەی نەبەزێنرێت. هەموو کارەکانی مرۆڤ لەژێر سایەی مەرجی مێژوویی و

سۆسیۆلۆژیی تایبەتدا دەردەکەوێت. بەڵام هەتا ئەو پرنسیپە بونیادییە نەدۆزینەوە کە ئەو کارانە دیاریی دەکات، ناتوانین لەو مەرجە تایبەتییانە تێبگەین. لە لێکۆڵینەوەماندا بۆ زمان، هونەرو ئەفسانەدا گرفتی مـن پێش گرفتی پێشکەوتنی مێژوویی دەکەوێت.

لێرەشدا دەتوانین گۆڕانێکی هێواش و بەردەوام بەدیی بهێنین لە چەمکە میتۆدۆلۆژییەکان و ئیدیالەکانی زانستە ئەزموونگەراکاندا. بۆ نموونە لە زمانەوانیدا، ئەو تێگەیشتنەی کە دەڵێت مێژووی زمان سەراپا بواری زمانەوانیی داپۆشیوە هەتا ماوەیەکی دوورو درێژ دۆگمایەکی قبولکراوبوو. ئەم دۆگمایە لە سەدەی نۆزدەیەمدا شوێنەواری خۆی لەسەر پێشکەوتنی زمانەوانیی بەجێ هێشتووە. لەم ڕۆدا بەتەواویی ئەم تاکڕەهەندییە لەبەین چووە.

پێویستیبوونی میتۆدێکی سەربەخۆ بۆ راڤەکردنی شیکاریی، بەگشتی بەرچاو کەوتووە[٧]. ناتوانین ئومێدی پێوانەکردنی قووڵایی لقێك لە کولتوری مرۆڤ بخوازین، هەتا ئەو پێوانە کردنە لەلایەنی راڤەکردنی شیکارییەوە پەسەن نەکرابێت. ئەم تێڕوانینە بونیادگەرایە بۆ کولتور، دەبێ لە پێشەوە تێڕوانینێکی مێژوویی هەبووبێت. خودی مێژوو لەناو ئاپۆرای حەقیقەتە پەرتو بڵاوەکاندا ون دەبێت ئەگەر سیستمێکی بونیادیی گشتیی بۆخۆی نەبێت بەومانایەی کە ئەوحەقیقەتانە بپۆلێنێتو ڕێکیان بخاتو بیان سازێنێت. لە بواری مێژووی هونەردا سیستمێکی لەویابەتە پێشخراوە، بۆ نموونە لەلایەنی هنریش وڵفلینەوە ڕێکخراوە. بەپێی وڵفلین مێژوونووسی هونەر ناتوانێت هونەری سەردەمە جیاجیاکان یاخود هونەرمەندە جیاجیاکان ڕێك بخات ئەگەر چەند چینو توێژێکی بنەڕەتی هونەری لەبەردەستدا نەیێت. ئەم چینە جیاجیایانەی بە لێکۆڵینەوەو شیکردنەوەی مۆدێلو شێمانە جیاجیاکانی گوزارشتی هونەری دۆزییەوە. ئەو شێمانانە
گوزار

بێسنوور نین، وەکو مادەیەك بۆ حەقیقەت دەشێ ببرێنەوە بۆ سەر ژمایەرەکی بچوکتر. وڵفلین لەم گۆشەنیگایەوە وەسفکردنە بەناوبانگەکەی خۆی بۆ هونەری کلاسیكو باڕۆك پێشکەش دەکات.

لێرەدا هەردوو زاراوەی کلاسیكو باڕۆك بۆ دیاریکردنی ماوەی مێژوویی بەکارنەهاتوون.ئەوانە بۆ دەرخستنی هەندێ بەشی بونیادیی گشتی بەکارهاتوون نەك بۆ دیاریکردنی ماوەیەکی تایبەتی وڵفلین لە کۆتایی پرنسیپەکانی مێژووی هونەردا وتی:

((ئەوە هونەری سەدەی شازدە یاخود حەڤدە نیە کە بەتەنیا وەکو سیستمێكو شێمانەیەکی خولقێنەری بەرچاو شی کراوەتەوە، لەکاتێکدا کە هونەر لە هەردوو بارەکەدا هەیە. بۆ کورتکردنەوەی ئەمە، دەتوانین بەشێوەیەکی سروشتی، بەگەڕانەوەبۆلای کارە تایبەتەکانی هونەر دەست پێبکەین، بەڵام هەموو ئەو شتانەی کە رافائیلو تیتیان وتویانە، کە رامبرانتو فلاسکیز وتویانە، تەنیا خولانەوەیەکی گشتییە بەدەوری شتەکاندا .. هەموو شتێك بەقۆناغەو گرانە وەڵامی ئەو پیاوە بدرێتەوە کە مێژوو وەك سێڵاوێکی بێکۆتایی وەهایە. بە نیسبەتی خۆشمانەوە، پاراستنی رۆشنبیریی لەوەدایە کە رووداوە بێکۆتاکان ببەینەوە بۆ سەر چەند ئەنجامێکی کەم))[٨].

زمانەوانو مێژوونووسی هونەر داوای چینە بونیادییە بنەڕەتییەکان دەکەن بۆ ((خود _ ئیدامەکردنی رۆشنبیرییانە))، ئەم چینو توێژاڵانە بۆ وەسفکردنی فەلسەفییانەی شارستانێتی مرۆڤیش زۆر پێویستن. فەلسەفە ناتوانێت خەریکی شیکردنەوەی فۆرمە تایبەتییەکانی کولتوری مرۆڤ بێت. داوای تێڕوانینی گەردونیانەی ئاوێتە دەکات کە هەموو فۆرمە تایبەتەکانیش دەگرێتە خۆی. بەڵام نەك هەموو گۆشەنیگاکانو کارە مەحاڵەکان، ئەوە وەهمێکی رووتە (لێرەدا کاسیرەر یارییەك بە وشە دەکات، وشەی Chimera بەکاردەهێنێت کە لە لایەکەوە مانای وەهمو خەیاڵە، لەلایەکی

تریشەوە، دەبێت بەکایمێرا، کەلە میتۆلۆژیای یۆناندا بریتی‌یە لە درنجێکی سەیر، ڕەگەزەکەی مێیە، سەری شێرە، جەستەی بزنەو کلکیشی مارەو لە دەمیەوە ئاگر فڕێ دەدات.

مەبەستی کاسیرەر لەمە ئەوەیە ئەگەر تێڕوانینێکی گەردوونیی وەها بێتە گۆڕێ کە هەموو فۆرمەکانی هونەر بگرێتە خۆی، ئەوا شتێکی وەك ((کایمێرا)) دەردەچێت _ وەرگێڕ _)). لە ئەزموونی مرۆڤدا ئەو چالاکییە جیاجیایانەی کە جیهانی کولتور پێك دەهێنن بەهیچ مانایەك لە هارمۆنیایەکدا ڕیز نابن. بە پێچەوانەوە ململانێیەکی سەرمەدیی هەیە لە نێوانی هێزە ناکۆك و بەگژیەکدا چووەکاندا. بیرکردنەوەی زانستی نکوڵیی لەبیرکردنەوەی ئەفسانەیی دەکات و سەرکوتی دەکات. دین لە بەرزترین پێشکەوتنی لاهوتی و میتۆدیی خۆیدا، بریتی‌یە لە داکۆکیکردن لە پوختەیی ئیدیاڵەکەی خۆی لە دژی ئەندێشەزێدەڕۆکانی ئەفسانەو هونەر. بۆیە یەکێتی و هارمۆنیای کولتوری مرۆڤ وا دەردەکەوێت کە تۆزقاڵێك لە خەڵەتاندنێکی شەریفانە زیاتر بێت کە بە بەردەوامی کۆمەڵێك ڕووداوی ڕاستەقینە دەوریان داوە.

بەڵام لێرەدا دەبێت جیاوازیی بکەین لەنێوانی تێڕوانینە ماتریاڵەکان و تێڕوانینە شکڵییەکاندا. بێشك کولتوری مرۆڤ دابەش دەبێت بۆ چەند چالاکییەکی جیاجیا کە بەهێڵی جیاجیادا دەڕۆن و دەگەنە کۆتایی جیاجیاش. ئەگەر خۆمان بەوە قایل بکەین کە لەسەرەنجامی ئەو چالاکییانە رابمێنین _ خولقاندنی ئەفسانە، سروت یان باوەڕی ئاینی، کارەکانی هونەر، میتۆدە زانستیەکان، ڕەنگە مەحاڵ بێت کە هەر هەموویان ببەینەوە بۆ سەر یەك پێگەی کۆمۆن. بەڵام پێکهاتەی فەلسەفە شتێکی جیاوازترە. لێرەدا ئێمە باسی یەکگرتوویی هۆکارەکان ناکەین بەڵکو باسی یەکێتی جووڵان دەکەین، یەکێتی بەرهەم نا بەڵکو یەکێتی پرۆسیسە خولقێنەرەکان. دواجار ئەگەر زاراوەی (مرۆیی) مانایەکی هەبێت، ئەوا لەناو ئەو هەموو جیاوازیی و ناکۆکییەدا، لەو هەموو فۆرمە جیاجیایانەدایە، ئەوا سەرباری هەموو شتێك بەرەو کۆتاییەکی کۆمۆن کاردەکەن. لەمەودای درێژدا، دەبێ شێوازێك، کاراکتەرێکی گەردوونیی هەبێت، کە تیایدا هەموویان هارمۆنیایەکی ساز پێك بهێنن. ئەگەر بتوانین ئەوکاراکتەرە دیاریی بکەین، ڕەنگە داوە پەرش و بڵاوەکانی کۆببنەوەو لە چەقێکی بیرکردنەوەدا دەریکەون. وەك ئاماژەی بۆکرا، ڕێکخستنێکی لەو بابەتەی کولتوری مرۆڤ ڕێگایەك بۆ خۆی دەدۆزێتەوە لەناو زمانەوانیا. لەناو لێکۆڵینەوەی بەراوردکاری ئەفسانەو دیندا. لە مێژووی هونەردا. هەموو ئەو زانستانە لەیەك پرنسیپەوە دەردەچن، بۆ دیاریکردنی چینەکان، بەفەزڵی ئەوەی کە دیاردەکانی دین و هونەر و زمانی سیستماتیزەکرد. کاتێك کە ئەم پێکهاتەیە نەبێت بەوهۆیەی کە زانستەکان فەلسەفەی خۆیانی لێوە وەردەگرن، ئەوا خاڵێك نامێنێ بۆ دەستپێکردن. لەولاشەوە فەلسەفە ناتوانێت لێرەدا ڕابوەستێت. پێویستە هەوڵ بدات بۆ بەدیهێنانی چڕکردنەوەیەکی زیاترو سەنتەرکردنێکی تەواوتر. لە هەمەچەشنیەکی ناکۆتادا لەگەڵ فرەیی ئەندێشەی ئەفسانەیی، دۆگماکانی دین، فۆرمەکانی زمانەوانی، کارەکانی هونەر، بیرکردنەوەی فەلسەفی یەکێتی مۆدێلێکی گشتی کەشف دەکات، کە هەر هەموو خولقێنراوەکان تیایدا کۆ دەبنەوە. ئەفسانە، دین، هونەر، زمان، تەنانەت زانستیش، هەموویان چاویان بڕیوەتە بابەتێکی کۆمۆن _ ئەرکی سەرشانی فەلسەفەیە کەوا لەو بابەتە بکات قابیلی تێگەیشتن بێت.

پەراوێزەکان:

بەشی یەکەم:

ئەو زاراوانە (یان ناوانە) ی کە نیشانەی (*) یان لەلاوە دانراوە، لەلایەنی وەرگێڕی بابەتەکەوە پەراوێزیان بۆ ئامادە کردواە:

* ئێرنست کاسیرەر: لە ساڵی (١٨٧٤) دا لەدایك بووەو لە ساڵی (١٩٤٥) دا مردووە. یەکێکە لەکانتیە نوێیەکان و ئەندامی قوتابخانەی ماربورگە (قوتابخانەیەکی

فەلسەفیی میسالییە، ئەندامەکانی پێیان وابوو کە فەلسەفە جیهانمان پێناناسێنێت، بەڵکو پێڕەوێکە بۆ توێژینەوەو لۆژیکی زانستە تایبەتیەکانە). کاسیرەر لەسەرەتادا سەرقاڵی ئەپستمۆلۆژیا بوو لەساڵی ١٩٠٤ بەرگی یەکەمی مێژووی ئەپستمۆلۆژیای بڵاوکردەوە (کە خۆی چوار بەرگ بوو).

لەدوای جەنگی جیهانی یەکەمەوە کاسیرەر خوی دایە میتۆدی فۆرمە سیمبۆلییەکان The Theory of symbolic Forms و لە سێ بەرگدا بڵاوی کردەوە، لە ساڵی (١٩٢٣ _ ١٩٢٩) بەم کارەوە خەریك بوو. دوایین کاری کاسیرەر بریتی بوو لە کتێبی مەقالێك لەسەر مرۆڤ An Essay on man، لە ساڵی (١٩٤٤) دا، ئەم بابەتەش لەو کتێبەوە وەرگیراوە.

* کۆمت یان کۆنت فەیلەسوفێکی فەرەنسییە (١٧٩٨ _ ١٨٥٧)، هاوڕێی سان سیمۆن و دامەزرێنەری فەلسەفەی پۆزەتیفیە، داوای جیاکردنەوەی سۆسیۆلۆژیای کرد لە فەلسەفە. بەبڕوای ئەو فیکری مرۆڤ بە سێ قۆناغدا تێپەڕیوە: قۆناغی لاهوتی و قۆناغی میتافیزیکی و قۆناغی زانستی. گرنگترین نوسراوی کۆمت کتێبی ((چەند وانەیەك لە فەلسەفەی پۆزەتیڤیدا)) یە (١٨٣٠ _ ١٨٤٢).

* پۆزەتیفیزم: یەکەمین کەس کە ئەم زاراوەیەی بەکارهێنا کۆمت بوو. مەبەست لێی راڤەکردنی سروشتی پێشکەوتنی مێژوویی کۆمەڵگاو سروشتی سۆسیۆلۆژیایە وەکو زانستی سەربەخۆ. لێرەدا کۆمت بڕوای وابوو کە کۆمەڵگای مرۆڤایەتی بەسێ قۆناغدا تێپەڕ بووە. کۆنت لەفەلسەفەی پۆزەتیفیزمدا بەشێوەیەکی سەیر پرنسیپی یاساو پرنسیپی ئاراستە تێکەڵاوی یەکتر دەکات ئەمەش گەورەترین هەڵەیە لێی بگیرێت.

* گۆتە: شاعیرو بیریاری ئەڵمانی (١٧٤٩ _١٨٣٢) بڕوای تەواوی بەوە هەبوو کە میتۆدو تاقیکردنەوە یەك شتن، دەبوت یاساکانی سروشت هەموویان بابەتین، زۆر لە ژێرکاریگەری سپینۆزادا بوو، بڕوای بە یەکێتی بوون هەبوو. دیارترین کاری گۆتە (فاوست) ە.

بەشی دووەم: پەراوێزەکانی نووسەر:

1) Comte, Letters a Valat, P 89, cited from L.Levy Brohl ....

2) Comte, Cours de philosophie positive. English trans. By Harrier Martinear Positive philosphy (newuork 1855) Intro, chap. ii, 45f.

3) De, l inte lligence (Paris 1870). Z vols.

4) Chimpanzees, P 110.

5) john Dewey, Human nature and conduct (New York, Helt & co. 1922) pt. Ll. Sec 5. P131.

6) Philosophie der symbolischen Formen. Vol Idie Sprache (1923), Vol II Das myth ische Denken (1925). Vol III phea nomanologie der Erkenntintis (1929).

7) For a Foller discussion of the problem See chap 8 PP 155- 158.

8) Wolfflin, Kunstgeschichtliche Grond begriffe. English trans. By M.O. Hottinger (London. G. Bell & sons, 1923) PP 226. F.

سەرچاوە:

Ernst Cassirer
**An Essay on Man**
**An introdoction to philosphy**
**Of Homan culture**
**New York (1953)**
**Pt. II, Sec. 6**
PP. 87- 96

(*) لە هەر جێگایەکدا خوێنەر ئەم نیشانەیەی بەرچاو کەوت، دەتوانێت سەیری یەکەمین بەشی پەراوێزەکان بکات کە لەلایەن وەرگێڕەوە ئامادەکراوە.

# لەمەڕ شاعیران و قاندڕەکانیان[1]

■ بێن ئۆکری[2]

● و: شێرزاد حەسەن

یەکەم:

ئەو جیهانەی کەدەبێ شاعیر تیایدا بژی مەرج نی‌یە کەشیعر ئامێز بێ. ئەو جیهانە، هەر جیهانێك بێ وابەئاسانی نایەتە بەردەستی شاعیر، بەڵکو هەمیشە سرکەو خۆی نادا بەدەستەوە.

تەنها لەڕێی راوکردن و سەرلەنوێ دارشتنەوەو پشکنیندا ئەو جیهانە سرکەی کەخۆی نادا بەدەستەوە ماڵی دەبێ و دەکرێ وای لێبێ بگۆڕێ بەبابەتێك پڕ لەخوازەو رۆحی ستران و شیعر.

کەواتە جێی سەرسامی نی‌یە گەر بڵێین شاعیرەکان هاتوونەتە دونیا تا رووبەڕووی ئەو جیهانە بوەستنەوە. شاعیر پێویستی بەوە هەیە کەشەوان بیداربێ، ئەو وەختەی هەموو دونیا نووستووە. پێویستی بەوە هەیە لەهەموو شوێنە دوورە پەرێزو لاتەریك‌و زۆر سەیرەکاندا بژی، لەوکاتە ((تاو)) بڕوای بەوەیە کەدەبێ بسرەوتێ، پێویستی‌بەوە هەیە کەلەو شوێنانەدا ئامادەبێ کەجاڵجاڵۆکەکان بەنهێنی‌و بێدەنگ تەونی خۆیان رایەڵ دەکەن، دوور بڕواو تادەگاتە شوێنە پەنهانەکان.. پێی ئاسایی بێ دەنێو چلپاودا بژی.. بگاتە نێو هەموو ئەو درزو چینانەی کەلەوێدا خەونەکانمان جێگیرن‌و دەلەوەڕێن.

شاعیرەکان پێویستیان بەوە هەیە کەلەو شوێنانەدا بژین کەخەڵکی دیکە رووی تێناکەن‌و نایبینن، خۆ گەرەکە واش بکەن، چونکە گەر وانەکەن چۆن دەتوانن پەی بەو هەموو نهێنی‌یانەی ئێمە ببەن، چۆن دەتوانن ئەو هەموو هەرێمە تازەیە لەژیان‌و بوونی ئێمەدا بدۆزنەوە، چۆن لەسترانەکانیان جێمان دەکەنەوە؟

شاعیرەکان پێویستیان بەوە هەیە کەخاوەنی چەندین کارەکتەربن، بەواتا مەرجە کەسایەتی‌یەکی رەنگاو رەنگیان هەبێ، لەواقیعدا چەندین حاڵەتی جیاهەن، وەك چۆن لەئاهەنگی دەمامکبازەکان دا چەندین دەمامك هەن، بۆ

شاعیر مەرجە هەر هەموو رووخسارەکانی پشت دەمامکەکان بناسێتەوە، تاوەکو بتوانێ هەرهەموو رەهەندەکانی ئەو ژینەمان پێئاشنا بکات کەبەزەحمەت خەیاڵیش زەفەری پێدەبات، تۆماری هەموو ساتە وەختە ناخۆشەکانی.. هەموو ئەفسوونو سەمایەکی خواهانە.. هەر هەموو گۆشە پەنهانەکانی.

هەموو رووداوە زۆرەکانی هەر رۆژە بەئاڕاستەیەکدا دەڕوات، گەرەکە شاعیر بەئاڕاستەی جیاوازو پێچەوانە بڕوات خۆ هەندێجار دەقاودەق رووبەڕوو دەجوولێ، هەندێ جاریش بەحاڵێ تەماس لەگەڵ مەودا ئینسانییەکاندا دەکاو هەندێجاریش زۆر بەقووڵی. لەوە دەچێ ئەو وەختەی شاعیر لەبەرامبەر جیهاندا رووبەڕوو دەوەستێ، بۆ ئەوەیە تابەردەوام پێمان بسەلمێنێ کە ئەو جیهانە سنووردارەی ئێمە جگە لەدرۆیەك هیچی دیکە نییە: درۆی سنووربەندی دونیاکەمان، بەدیوی ئەودا وادەکا بڕوا بەوە بێنین کەئەو مەملەکەتەی ئێمەی تیا دەژین تائەوپەڕی فراوانەو بێسنوورە.

شاعیر وادەکا زەوی ببێ بەدایك، ئاسمانیش دەبێ بەسێبەرو سایە، خۆریش دەکا بەخوداوەندێکی پڕ نهێنیو نادیار. شاعیر هەموو کەسە ((پراگماتیست))ەکان سەغڵەت دەکا، ئەو کەسانەی کەبەدەرئەنجامەکان بەهای فەلسەفەو بیرو هەڵدەسەنگێنن، شاعیر دژ بەوانەیە کە دونیا لەژێر یەك ناوو یەك رەنگو شێوەدا دەبینن. ئەوانەی دەبنە ملۆزمو قاندرِی شاعیرەکان ئەوانەن کە نایانەوێ واقیع لەدۆخی سروشتیو کرانەوەی خۆیدا ببینن. ئەوانەن کەناتوانن لەوە تێبگەن واقیعیەتی هەر تاکە کەسێك لەگەڵ واقیعیەتی کەسێکی دیکەدا جیاوازە. یاساکان ناتوانن ئیدراکو هەست کردنمان بەشتەکان بخەنە چوارچێوەو بەندیان بکەن. بەقەد ژمارەی جۆری ژیان: دونیای جیاواز هەن. مەسەلە بەتەنها ئەوە

نییە کە کەسە بێخەیاڵەکان گرفتاربن: چونکە ئەوەیان بۆچوونێکی هەڵەیە؛ ئێمە هەر هەموومان بێخەیاڵ نین. بەڵام زۆر کەس لەئێمە ناتوانن ئەو خەیاڵە بخەنەگەڕ. کەممان هەن کەڵك لەو خەیاڵە ببینن. گرفتەکە ئەوەیە کەزۆر کەس هەن لەو هێزی خەیاڵە دەترسن کەسنووری نییەو هیچ کۆتو بەندێکی نییە، گرفتی هەندێ لەوانە ترسیانە لەو کەسانەی کەدەتوانن بەردەوام بانەزنەی ئەگەرەکانو شتە شیاوەکان بەرفراوانتر بکەن، ئەوانەی کەبێ وەستانو بێپسانەوە دەتوانن سەر لەنوێ لەخەونەکانیا دونیا دروست بکەنەوە سەرلەنوێ بوون بەرهەم بێننەوە، ئەو کەسانەمان بۆ بێننەوە کەلەسەر رۆخی هەڵدێر دانیشتوون.. ئەوانەی بزرنو لەهیچ تۆمارێکدا ناویان نییە.

دوژمنانی شاعیرەکان ئەو کەسانەن کەبیرکردنەوەیەکی ئایین پەروەرانەو راستەقینەیان نییە ـ لەم قسەیەشدا مەبەستمان جۆرە ئایینێکی دامەزراوو دەزگایی نییە. تاوەکو رۆحێکی ئایین پەروەرو راستەقینەت هەبێ گەرەکە خاوەن هەستێکی واکوشندە بێت کەلەترسو تۆقین بگەیت. لەهەستو سۆزو بەزەیی.. لەوەی کەخاوەن خەیاڵێکی دەوڵەمەند بیت. بڕواشت بەوە هەبێ کە لە(سێ رەهەند) زیاتر هەیە. ئایین لەو شوێنەدا رۆحمان داگیردەکا کەدەکرێ خەیاڵ بەشتە زۆر پیرۆزو خواهانەو ئاسمانییەکان تێکەڵ بێ. شیعریش لەو شوێنەدا تەماسمان پێوەدەکات کەتیایدا ئایین لەهەرچی شتێکی ئادەمیانە هەیە جوێ نابێتەوە. لەوەناچێ لەنێو بەهەشت دا شیعر هەبێ. دیارە کەناکرێ دەنێو، دۆزەخیشدا شیعر هەبێ. شیعر تەنها لەبوارێکدا. لەدونیایەکدا. لەسەر ئەستێرەیەکدا دەخولقێ کە(بەهەشتو دۆزەخ) بەیەکەوە لێك بدرێنو بونیاتێکی ئادەمیزادانەی لێبسازێ. بونیاتێك کەبۆنی خاكو مرۆڤی لێبێ.. دەکرێ تەنها لەم شوێنەدا شیعرشیاوبێ.

دەکرێ بڵێین شاعیر کەلەبەرامبەر دونیادا دەوەستێتەوە؛ هی ئەوەیە کەناتوانێ بەوە رازیبێ کەهەیە. ((ئیلیاس کانێتی)) لەشوێنێکدا نووسیویەتی - ((هەر بیرۆکەیەکی درەوشاوەی شاعیر، هەر خەیاڵێکی خۆشو پەنهان، هەر ئاماژەو هێمایەکی شاعیر دەبێ چیبن جگە لەسەرکێشییە لەبیرکراوەکانی یەزدان)) شاعیرەکان ئەو یاسا دانەرانە نین کەهیچ کەس دانیان پیانەنێ، کەهیچ کەس لەدونیادا حیسابیان بۆ نەکات، ئەوان لەو کەسانە نین کەلەسەر دیواری بەردینو تاقەکانو سەکۆکان یاساکان بنووسنەوە، ئەوان قسەش بۆ یەزدان ناکەن. ئەوان قسە بۆ ئێمە دەکەن.

دواجاریش دەکرێ بڵێین ئەو (دامێنان)ە کەقسە بۆ شاعیرەکان دەکا، ئەوانیش گوێ دەگرن، ئەوان سەرلەنوێ دونیا لەوشەدا هەڵدەشێلنو دروستی دەکەنەوە، سەرلەنوێ لەخەونەکاندا بونیاتی دەنێنەوە. ئەو یاساو دەستوورانەی کەدەرکێ بەتەنها لەدەمی بزرو نهێنی خوداوەندەکانەوە بێنە دەرێ، بەدرێژایی ژیانو بوونو سروشت ئەو یاسایانە بەگوێی ئەواندا دەدرێ، بەگوێ هەموو ئەو نوێنەرە دیارو نادیارانەی شاعیرەکان. زریانو باووبۆران قسە بۆ شاعیرەکان دەکەن، بروسکەکان هەناسەیان بەسەردا هەڵدەکێشن. بۆ هەمیشە ئازاری مرۆڤایەتی ئەوان لێدەخورێ. ئەوە گوڵەکانن کەوا دەکەن قەڵەمی شاعیرەکان جوانی بنووسنەوە، وشەکان بۆ خۆیان شاعیرەکان دەدوێنن، ئەوەش وا دەکا ئەوان پتر وشە ببارێنن. دیسانەوە شاعیرە کەویژدانمان مەزنترو ناسکتر دەکاو وەئاگای دێنێ. شاعیر بەخەمو دەردو مەینەتییەکانی ئێمە دەتلێتەوەو تێکەڵیان دەکاتەوە بەهەموو تلانەوەو ئازارە لەبیرکراوەکانی منداڵیی. ئێمە لەزاری شاعیرەکانەوە سەرلەنوێ گوێمان لەهەموو تاسەو ئارەزووە کوشندەکانی ژیانمان دەبێتەوە.

ئەوانەی کەیاساو دەستوور بۆ دونیا دادەمەزرێنن؛ ئەم دونیایە وەکو خۆی قەبوڵ دەکەن. ئەوانە رقیان لەنهێنیو لەغزو هەموو شتێکی پەنهانە? چونکە نهێنیو لەغز نابنە شفرەو وەك یاسا تۆمار ناکرێن. شتە زۆر سەیرو سەمەرەو سیحراوییەکان ناکرێن بەیاسا. هەربۆیە دامەزرێنەرانی یاسا سنووری هەر هەموو شتەکان وەکو خۆیان دەپارێزن. سیاسەتبازەکان. سەرۆکی دەوڵەتەکان. سەربازەکان. دەوڵەمەندەکان. هەر هەموو پیاوە بەهێزو دەستەلاتدارەکان. پادشاکان. قەشەکانو پیاوە ئایین پەروەرەکان - ئەوانە هەر هەموو وازەن دەکەن کەپادشاکانی سەر ئەو مەملەکاتەنەی سەر زەوین. ئەوانە لەمەڕ حەقیقەتو شتە راستەقینەکان دەدوێن، لەمەڕ مەسەلە رامیارییەکان، سەرژمێریو ئامارەکان، پرۆگرامەکان، لەمەڕ مۆراڵی (ئەخلاقی) زۆر کوشندەو ئەبستراکت. بەڵام هەیهوو.. خەونی خەڵکی زۆر لەوان دوورە، خەونی خەڵکی ئەم زاتانە دەترسێنێ.

ئەو کەسانە دەنێو دونیای حەقیقەتدا ون دەبنو دەتۆقێن، ئەوانە لەراستییەکانی ژیانەوە دوورن، ئەوە تەنها ئەو کەسانەن کەبەر بەروانینی شاعیر دەگرن، روانینی بۆ راستیو حەقیقەتو واقیع.ئەوە ئەوانن کەداوا دەکەنو دەبنە هۆی ئەوەی کەشیعر ببێ بەمەیدانێك کەشەق لەهەموو جوانیو مەنتقێك هەڵبدا ئەو وەختەی نایانەوێ رووبەرووی تراژیدیاکان بوەستنەوە، ئەوان هەندێ لەو کۆلکە شاعیرانە بەکرێ دەگرن کەبەمەرامەکانی ئەوان شیعر بهۆننەوە، قسەی هەلەقو مەلەقی پێدەنووسنەوە بەو بیانووەی کەئەوەی بۆ شاعیر دەشێ بۆ خەڵکی دیکە نارەوایە، ئەوە ئەوانن کەداوا دەکەن شیعر (پارتیزان)بێ، شیعر لایەنگریێ، هەڵبەت لایەنگری ئەوان بێ، ببێ بەبارگیری مەرامو مەسەلەکان، مەرامەکانی ئەوان... مەسەلەکانی ئەوان، جا ئەوان هەرچی کەسێك بن.

ژیانی ئێمە بەرادەیەکی یەکجار زۆر بەرتەسک بۆتەوە وەك ئەوەی کەهەیەو هەستی پێدەکەین، خەونەکانی ئێمە ئالەوپەڕی هەوڵو تەقەللادایە کەرووبەری ئەم ژیانە بەرتەسکە فراوانتر بکات، هەر خەونە وامان لێدەکا بەردەوام شتی تازەو پەنهان بدۆزینەوە، ئەو هەستە زۆر خۆشە ویژدانی وەئاگا هاتوومان پتر ئاسوودە بکات، بۆ دۆزینەوەی شتە سەیرو پەناهنەکانیش کۆڵنێ دڵخۆش دەبین، چونکە ئەو شتانە دەکەونە دەرەوەی توانای بینینمان. ئێمە نابێ شاعیرەکانمان ناچاربکەین کەزیاتر ئەو جیهانەی هەمانە سنووربەندی بکات، چونکە ئەوەیان تاوانێکە دژ بەخودی ژیان خۆی. خۆ گەر شاعیر بەتەنها قسە لەسەر شتە داخراوو بەرتەسکەکانی نێو ژیان بکات، لەسەر ئەو شتانەی کەبێ هەوڵو ماندووبوون دەتوانین تێیان بگەین، هەرسیان بکەین‌و بیانناسینەوە، گەر لەمەڕ ئەو شتانە قسەبکات کەپێیان سەغڵەت نابین، لێیان ناترسین، ئەو شتانەی نامانوروژێنن، تووڕەمان ناکەن، هانمان نادەن، یان ئەوەتا پتر تووشی دڵەڕاوکێمان ناکەن، یان پتر بۆ یەکسانی هاواربکەین‌و بگرین، پتر بەدوای خەیاڵو بیرۆکەی کوژراودا بگەڕێین‌و بیاندۆزینەوە، ئەو بیرو خەیاڵە جوانانەی کەلەسەردەمی جحێڵیمان کوژراون‌و لەکیسمان دان، گەر شاعیر بەتەنها خۆی لەگۆشە داخراوەکاندا بەند بکات‌و ستران بچڕێ، بەزمانێکی داخراوو لەقاڵب دراو بنووسێ، وشەو دەستەواژەی وشك‌و برینگ بەکاربێنێ.. کەواتە گەر وابکات دەبێ ئێمە چ هیوایەکمان هەبێ.. جاچ لەسەر ئەم ئەستێرە بژین‌و چ لەسەر ئەستێرەیەکی دیکە... دەبێ چاوەڕێی چ خۆشنوودییەك بین.

گەر کەسانێك هەبن بەم دونیایە ڕازیبن. وا کەمتەرخەم‌و بێباك بن. دەکرێ بڵێین چ بەڕۆح‌و چ بەلەش زۆر بێخێرو ترسنۆکن. ئێمە لەهەموو کردەیەکی مەزن‌و پاڵەوانبازانە دەترسین. ئێمە زەندەقمان لەجیهانێك چووە کەبتوانێ سەرلەنوێ یەك بگرێتەوە. ئێمە هەترەشمان لەخەرمانی بەبەرەکەتی (بوون) چووە. ئێمە زۆر تەمبەڵو تەوەزەل لێی دانیشتووین‌و داوا لەشاعیرەکانمان دەکەین کەئەگەر بکرێ ئاسۆمان لێنزیك بخەنەوە. ئەو تاڤگەیەی کەڕەنگاورەنگ دەڕژێ. ئەو کانیاوەی دەتەقێ: پروشەی ئاوەکان بەشێوەیەکی زۆر سەیر دەمانترسێنێ. ئێمە چیتر خۆمان ناناسینەوەو نازانین کێین. بیریشمان چۆتەوە کەلەمەوبەر چیبووین. لەچ حاڵێکدا بووین لەمیانەی ئەو قۆناغانەی کەتیایدا بۆ ماوەیەکی درێژتر وەئاگا بووین. ئەوە ئەو کەسانەن کەلەواقیع‌و حەقیقەت دەترسن. لەراستییەکانی خۆیان دەترسن. لەمێژووەکانی خۆیان. ئەو کەسانەن کەلەناخی خۆیاندا وەڕسن لەوەی کەهەن. قێز لەبوون‌و ژیانی خۆیان دەکەنەوە. ئەوانەن کەزەندەقیان لەو دەم‌وچاوە سەیرانە چووە کەهەر دەڵێی دەمامکن. بەڵام ئەو دەم‌وچاوە دەمامکدارانە دەم‌و چاوی خۆیانە کەلەئاوێنەکانی زەمەندا دەیانبیننەوە، ئەوە ئەوانەن کەدژ بەهەموو شتێك دەوەستنەوە کەشیعر ئامێزە، لەبەرامبەر هەموو شتێکی شاعیرانەدا دەجەنگن. ئەوان بەهەرچی هێزی شاراوەی کەهەیانە بەڕووی ((شیعرییەت)) دەوەستنەوە، چونکە گەر وانەکەن، وزەو هێزی ئەو وشانەی، ئەو رازو قسانەی کەوان لەنێو مێشکیانا دەتەقنەوەو هەموو دەرگاکانی ناوەوەی رۆح دەکەنەوە، گەر وانەکەن چیبکەن، ئاخر هەرچی دڕندەکانی کەوان لەناخداو هەر لەوێشدا دەلەوەڕێن، بەبازێك خۆهەڵدەدەن‌و دێنە دەرەوەو بەسەر مافووری هەست‌و ویژداندا رادەبوورن‌و ویرانی دەکەن. ئاخۆ ئەوسا چی پارچە لێك ترازاوەکانی نێو گیان بەیەکەوە دەنووسێنێ‌و گرێیان دەدا؟ دەبێ ئەوان هەرچی شتێك کەبەرۆحی شیعر بارە بیکوژن‌و لەباری ببەن. یان ئەوەتا بەشێوە شێواوەکەی

وەربیگرن، یان لەسادەترین حاڵەتی‌لاسایی‌کردنەوەدا هەنگاو بنێن، ئاشکراشە بۆ؟ چونکە ئەوان لەدەمێکەوە هەوڵیان داوە چی کەف‌و کوڵ‌و شۆڕشی ژیان هەیە دایمرکێنن، چی رەنگی جۆراوجۆر هەیە بمرێنن، هەرچی دووانەی سروشتی‌ی شتەکان هەیە لێکیان بکەن‌و نەیان هێڵن.

ملۆزەمان‌و دوژمنانی شیعر ناتوانن گرەو ببەنەوە. راستە کەجیهان، لەوە دەچێ، خۆ بەدەستەوە نەداو نەگیرێ، بەڵام لەناو خۆیدا تائەبەد ئەو ئارەزووە هەڵدەگرێ کەخۆ بەبەرگ‌و رەنگێکی دیکە بگۆڕێ‌و بنوێنێ، ئارەزووی ئەوەی بەشتێکی بالآتریبێ‌و بگۆڕێ. لەدەرەوەراو لەڕووکەشدا وادەردەکەوێ کەجیهان جڵەوگیر نەبێ‌و خۆ بەدەستەوە نەدات، بەڵام وەك چەند هێزێکی دیاریکراو لەهەوادا،رەنگە چاوەڕێ‌ی جۆرێك لەخەیاڵ بکاو بیەوێ ئەو سیحرو ئەفسوونە لەناو خۆی‌دا ئازاد بکات. شاعیر بەتەنها خولقێنەر نی‌یە، بەڵکو بوونەوەرێکی کیمیاگەرە. شاعیران بیانەوێ نەیانەوێ لەتەك هێزو سیحرە مەزنەکانی ناو ئەم گەردوونەن. لەتەك مەسەلە هەرە مەزنەکاندان، هەمیشە خەون بەداهاتوویەکەوە دەبینن کەپڕاوپڕە لەدادپەروەری‌و بەها گەورەکان.

مادامەکێ بڕوامان بەوە هەیە کەشاعیرەکان هەمیشە روو لەئایندەن، مادامەکێ لەو بەرەیەدان کەخەونیان بۆ داهاتوو لەبن نایە، بۆیە دەکرێ بڵێین کەپێویستیان بەوەیە لەبەرامبەردا کۆمەڵێ دوژمن‌و ملۆزمیان هەبێ. هیندی‌یە سوورەکانی ئەمریکا ئیدیۆمێکی سەیریان هەیە کەتیایدا دەڵێن - ((خوا بکەم دوژمنەکەت بەهێزبێ.)) هەرچییەك کەخوێن بەرەکانی ژیانمان وشك بکات دوژمنی گەورەی ئێمەیە: ئەوە بۆیە هەتا پێغەمبەرەکانیش بەو دڵگەرمی‌و جگەر سۆزییەوە؟ بێ‌پسانەوە دەنگ هەڵدەبڕن‌و قسە لەسەر مرۆڤ دەکەن؟ مرۆڤ ئەو کاتەی خۆی وێران دەکات؟ هەر بەو مانایە هەموو پێغەمبەرەکان شتێك لەڕۆحی شاعیرەکانیان تیایە؟ بەڵام هەموو شاعیرەکان پێغەمبەر نین. گەرشاعیر وەك فیزیاگەرێك. یان وەك زانایەکی سروشت. وەك پزیشکێك. یان وەك فریشتیەك یان هەتا گەر ئەهریمەن پەرستیش بێ ناگرێ بێز لەو دونیایە بکات کەتیایدا دەژی. شاعیر خۆی بەگەورەتر نابێ لەو دونیایەی تیایدا دەژی. شاعیریش وەك زانایەك وایە. هیچ زانایەك کەدەروانێتە بروسك‌و چیاو ئەستێرەکان. قەت خۆی بەگەورەتر نازانێ. شاعیریش هەروا. بۆ هەر کردەو کارێك هیچ شتێکی نزم‌و بەرز لەئارادا نی‌یە. یان گەورەو بچووکی. بەڵکو ماناو بەهاکان دیدمان بۆشتەکان پێ‌دەگۆڕێ. خۆشەویستی شاعیر لەچۆنیەتی خەونەکان‌و کارەکانیدا وەدەردەکەوێ. چەندە قووڵتر هەست بەشتەکان بکات؛ ئەوەندە قووڵتر دەپشکنێ‌و نهێنی‌یەکان دەدرکێنێ. چەندە پتر بمانەوێ شتەکانی ئەم دونیایە بەیەکەوە گرێ بدەین. ئەوەندە پتر دەتوانین شوێن هەنگاوەکانی شاعیر بکەوین.. ئەوکاتەی کەدەکەوێتە ئاڵ‌وگۆڕە مەحاڵەکان. ئەوان حیساب بۆ هەر کردەوەیەی پاڵەوانبازانە دەکەن: بەپێ‌ی هوشیاری لەهەر تەمەنێکی جیادا. ئەوەش راستە کەدەڵێن مەرج نی‌یە شاعیرەکان بەپێش زەمەنی خۆیان کەوتبن. ئەوە تەنها ئێمەین کەکەوتووینەتە دوای زەمەنی خۆمان.

دووەم:

برسیەتی یەکێکە لەو ملۆزمانە، چەندین جۆری برسیەتی. دەکرێ پێناسەی کۆمەڵگا وەك ئەو مەیدانە یان فەزایە وابێ کەهەموو جۆرەکانی برسیەتی ئێمە تیایدا بەیەك دەگەن، وەك ئەوەی کەلەبازاڕێکی گەورەو قەڵەباڵغ‌و پڕ هەرادابن. برسیەتی شاعیر برسیەتی ئێمەیە.. برسیەتی‌یەك بۆ ژیانێکی فرە بەبەهاو دەوڵەمەندتر.

هەر هەموومان، هەندێجار، دەکەوینە ژێر ئەو حاڵەتە کوشندەیە. هەندێجار وەکو مێگەل مامەڵەمان لەگەڵ دەکرێ، پێ لەپشتی ملمان دەنێن، فێڵمان لێدەکەن و بەرێی وێڵدا دەمانبەن.. کەلەوەدەچێ ئەو رێگایانە نەچنەوە سەر هیچ مەنزلگایەك، مەگەر تەنها بچنەوە سەر گۆڕستانەکان. پرسیار ئەوەیە: ئاخۆ ئێمە خۆمان رێگاکانمان هەڵبژاردوون؟ یان رێگاکان ئێمەیان هەڵبژارد؟ ئێمە لەبری خەڵکی دیکەو بەناوی ئەوانەوە هاتینە سەر ئەم رێگایانە یاخود بڕیاری خۆمان بوو؟

ئێمە هەموومان دەکەوینە ژێر ئەم پرسیارانەوە. بەلام هەر هەمووشمان دەکەوینە ژێر سیحری ئەو مەیلەی وادەکات خۆمان بەیەکدییەوە ببەستینەوە. هەر هەموو لەدەوری بانگەشەکەی (دانتی)) کۆدەبینەوە. بانگەشەی خۆشەویستی. ئەو "خۆشەویستییە کەوا دەکات خۆرو ئەستێرەکان لەخولگەکانی خۆیاندا بسووڕێنەوە" (دانتی) وای دەیوت. هەندێ ئەو ئەفسوون و خۆشەویستی و گیرۆدەبوونە ئەو وەختە دێ کەئێمە کەمتر خۆمان بۆ ئامادە کردووە. ئەو وەختەی ئێمە زۆر رووتین. خەوتووین. بەبێ دەنگی دێ. درەنگی شەو کەهەموو شتێك خامۆش و مردووە: دێ. دێ وەك سوپا حەقیقیەکانی ـ ریلکە ـی شاعیر دێ، ئەو سوپایەی گەمارۆی ((شارە هێمنەکان)) دەدا، ئەو شارانەی دەکەونە دەرەوەی دیوارو شوورەکان... وەك گوندە دوورە دەستەکان، وەك ئەو کەسانەش دێن ((کەهیچ کەسێك بۆ هەرەشە نانێرنە نێو ئەو شارانە، یاخود بەڵێنێك بدا، یان ئەوەتا دان و سانیان لەگەڵدا بکات.)) بەلێ... هەندێ جار بەشەودێ، ئێمەیش لەخەو رادەبین و ئارەقە دەکەین، ناشزانین بۆچی لەخەو هەڵساین یان چی ئێمەی وەئاگا هێنا؟ بۆچی لەخەو راچەنین؟ چیبوو ئاوا هی شپرزەی کردین و خەوی لێزڕاندین؟

پەتۆکان لەسەر خۆمان وەلادەدەین و لەنێو پێخەفەکان دێینە دەرێ. بەنێو ماڵەکاندا دێین و دەچین تابزانین هەموو شتێك لەشوێنی خۆیەتی. هیچ بووە.. هیچ گۆڕاوە. کەچی دەبینین دونیا خامۆشەو خەڵکی لەپرخەی خەودایە... پرخەیەك لەسەرخۆ. پاشان هەوڵ دەدەین بچینەوە نێو پێخەفەکانمان. بەلام ئەو پرسیارە هەراسانمان دەکا: بۆچی لەخەو وەئاگا هاتین؟ ئاخۆ کەی بوو کەبۆ دواجار ئاواهی و بەبێ هۆیەکی ئاشکرا لەخەو رابووین؟ پاشان گەر بەخت یاربێ، هێدی هێدی هەست دەکەین کەلەوەدەچێ شتێکی زۆر پەنهان، بوونەوەرێکی کپ و مەنگ لەنێو رۆحی خۆماندایە، لەنێو بوون و ژیانماندایەو دەیەوێ بماندوێنێ، ئەوسا تێدەگەین کەئێمە لەبەر هۆیەکی زۆر سەیرو سادە لەخەو رابووین:

ئەویش ئەوەیە کەخەومان لێتێکچووە. ترسێکی گەورە، سۆزێکی بێپایان و تاسەیەکی کوشندە لەنێو رۆحی خۆماندا دەخولقان، بەلام بێئەوەی بزانین لەکەیەوە ئەو ترس و سۆزو تاسەیە دەرستان. ئێمە نازانین چۆن مامەڵە لەگەڵ ئەو ترس و تۆقینەدا بکەین، ترس و تۆقینێکی داخراوو پەنهان، یان چۆن چۆنی ئەو بۆشاییە گەورەیەی ناو رۆح پڕبکەینەوە، ساخود چۆن چۆنی بەر بەپێشبینیەکانی شەڕ بگرین. خۆ لەوانەشە دەرك بەوە بکەین کەلەو چەند رۆژە کەمەی دواییدا ئاسمان تاریكو لێڵترە.. لێڵترە چونکە ئێمە رۆژەکانی خۆمان پڕکردووە لەقرت و پرت و دڵەراوکێ.. یان پڕلەخووی خەراپ و رۆح مراندن. وێ دەچێ رووخساری مرۆڤ بەردەوام بەدوو رەنگی جیا خۆبنوێنێ، دوو شێوەی دژ بەیەك.. رووخسارو شێوەی ئەوانەی لەگەڵ ئێمەدان، هی ئەوانەش کەدژ بەئێمە دەوەستن. دیارە ژمارەی ئەوانەی کەدژن: زۆرترن. لەوە دەچێ ئیدی ئێمە چیتر نەتوانین جیهان وەکو خۆی ببینین. تەواو.. چیتر ناتوانین لەشتەکان رابمێنین، چیتر چاوی

ئەوەمان پێوە نییە لەجوانیی ورد بینەوەو پێی سەرسام بین، نا.. ئێمە چیتر ناتوانین بەدیقەتەوە سەرنجی شتەکان بدەین، هەر بەراستی بیرمان نایەتەوە کەی بوو کەبۆ دواجار توانیمان گۆشەیەکی تاریك رووناك بکەینەوە، پەردە لەسەر شتێکی پەنهان وەلابدەین و نادیارێك ئاشکرا بکەین.

ئەو هەست و روانینە قووڵانە خەو راو دەنێن. هەستێکی سەیرو پەنهان لەناوەوە را داماندەگرێ، هەشێك کەپراوپرە لەشڵەژان و شپرزەبوون و دڵساردی، لەناوەوە پتر جێ بۆخۆی داگیردەکا، هەروەك هەست کردن بەگوناه کەکتوپڕ بەرەڵلا دەبێ، خۆ لەدەست ((لەبیرچوونەوە)) ئازاد دەکا، بیرچوونەوەیەك کەخۆمان بەهەموو دڵ مەبەستمان بووە ئەو هەستی گوناهکاری‌یەی تیا بکوژین. پاشان وای لێدێ کە گومان بکەین، گومانی ئەوەی لەشوێنێکدا، بەشێوەیەك لەشێوەکان، لەپێچێکدا رێمان هەڵەکردبێ و هەر هەموو سەفەرەکەش رێ ون کردن بووبێ، کەلەوانەیە لەزەمانێکی دێرینەوە ئەو گەشتە دوورو درێژە لەپێچەرێیەکی وێڵدا دەستی پێکردبێ، هەر لەو کاتەوەی ئێمە دەنێو گەرداوێکی پڕ لەشپرزەبوون و سەر لێشێوان و بێسەرو بەرێدا خۆمان لێبزر بووبێ. دەکرێ بڵێین وێدەچێ و زۆر لەگوینەکە رووەو ئەو مەنزڵگایەی کە مەبەستمان نییە بۆی بچین رێگەیەکی زۆرمان بڕیبێ، هەنووکەش کەشەو داهاتووەو چوار دەورمان پڕە لە خامۆشی و بێدەنگی گەورە، بەهەر چوار لادا کەدەڕوانین: نەشارەزای رێگەکەین و نەمەنزڵگاکەش دەناسینەوە.

لەخۆمان دەپرسین: ئاخۆ کەی بوو کەلارێ و پێچی هەڵەمان گرتەبەر؟ کەیەکەمجار هاتین؟ بۆ ئەم سەفەرە؟ کام رێگەمان هەڵبژارد؟ لەپاش بێنەو بەردەیەکی زۆر، لەدوای بیرکردنەوەیەکی قووڵ گومانی ئەوە دەکەین کەئەو پێچەی شارێگەی لێون کردین: لارێیەك بوو کەهیچ نیشانەیەکی بەسەرەوە نەبوو.. هیچ دەلیلێك نابمانخاتە سەر شارێگە.. ئەو لارێ و پێچە هەڵەیەش هی سەردەمانێکی زووتر بوون لەئێستا... ئەو سەردەمەی کەهێشتا سەرگەرم و لاوبووین، ئەو رێیە بوو کەبەدوودڵی و راڕایی و قرت وپرت و بەڵێن و خەیاڵ و بیرۆکەی سەیرو پەنهان چەوپێژکرابوو، بیرۆکەو خەیاڵی خۆش بەداهاتوو بێئەوەی هیچ کارێکمان بۆکردبێ، کە تیایدا جیهان بەهەزارەها رەنگی جوان و دڵگیر دەدرەوشایەوە، تیایدا شیعرو سترانەکان دڵەکانیان پڕ دەکرد لەتاسەو ئارەزوو، کەتیایدا هەر هەموو هەست و نەستەکانمان زۆر رۆشنتر دەبوونەوە.

دەنێو، پێخەفەکەتدا ئۆقرە ناگریت و خۆ وەردەگێڕی کەلەکان دەگۆڕی، هەر دەڵێی پێخەفێکی دڕکاوی‌یە. لەوە سەرسام دەبیت کەچۆن ئەو هەموو ماوەیە لەنێو هەمان پێخەفدا خەوتووی، شەو لەدوای شەو. هەر دەڵێی قەفەزێکی داخراوە. لەخەو رادەبیت، بەژوورەکەتدا دێیت و دەچیت، هیچ شتێك نایە بەدەستەوە.

دیوارەکان رەق و تەق - لەوەناچێ هێرشی لەشکری ئەو حەقیقەت و واقیعەی ((ریلکە)) لێی دەدوا بتوانێ بەبێ دەنگی ئەو دیوارانە ببڕێ و بپرمێنێ. بەڵام تۆ بەدوو چاوی پڕ لە سەرسامی دارو دیواری ماڵەکەت دەپشکنی؟ کەی بوو کەتۆ لەم ماڵداو لەم ژوورەدا نیشتەجێبووی؟ کەی‌بوو ئەم ماڵت بوو بەلوول پێچ؟ کەی‌بوو بوو بەبەندیخانە؟ ماڵەکە لەنائاسایی دەچێ و بۆنی بێگانەی لێدێ، هەروەك بڵێی کەسێکی غەریب و نەناس بەپەلەو بۆ ماوەیەکی کورت تیایدا نیشتەجێ بووبێ و چیتر حەزی نەکردبێ بیکا بەماڵ و خێر لەشتەکانی ببینێ. لەم ساتەوەختەدا کەل وپەل و هەر هەموو شتەکانی ناو ماڵەکەت: وا دەردەکەون کەبەقەرز هێنابتن. ئەو ماڵە بەم

حاڵەوە بەتەواوی بێزارو تووڕەت دەكات.
ئائەوەی باسمان كرد... بوونی ئەو ماڵە یەكێكە لەپێچەكانو لاڕێگاكان، بەڵێ.. ئەو ماڵە، ئەو ژوورە بۆتە یەكێك لەرێگاكان. ئیدی تۆ تابێ رووەو هەڵدێرەكان غل دەبیتەوە، رووەو دونیایەك لەهەڵوەشانو تێك شكان. لەهەموو شوێنێكدا باڵەخانەی خەونەكانت دادەرمێن، یان دارماون، كەخۆت لەناو وێنەكاندا بەسڕیو بێجووڵە دەبینی، ئائەو وێنانە بەجۆرێك لەجۆرەكان گاڵتەت پێدەكەن.

پاش تاوێك قاوەیەك سازدەكەی، شتێك لەتۆدا دەگۆڕێ، شتێك پێدزكە دەكاتو لەدڵتا جێگیر دەبێ. پاشان، لە ساتەوەختێكدا، بێئاگاداری ئەو رووخسارانەت دێنەوە یاد كەلەو لاڕێو پێچانەدا ونت كردبوون، ئەو لاڕێو پێچانەی پیایاندا ڕۆیشتیت تاوەكو ئەوانت لێنەیەتو بەهەمان ڕێدا نەڕۆی. خەونەكانی سەردەمانێكی زووت بیردەكەونەوە، لافو گەزافو خۆبادانی سەردەمی لاوی، ئەو هەموو كەسانەت بیر دێنەوە كەچیتر نایانبینی. دەپرسیت: هەنووكە ئەو كەسانە وان لەكوێ؟ ژیان بەرەو چ گەرداوێكی بردن؟ دونیا چی لێ كردن؟

لەنێو كورسییەكەتدا دەجووڵێی، كورسییەكە زیكەزیك دەكا. ژیان لەژێر قورسایی تۆدا زیكەزیك دەكا، لەسەرخۆو هێواش دەست بەرداری تارمایییەكان دەبیت. دەتەوێ خۆت وەبیر بێتەوە، خۆت وەبیربێتەوە لەجوانترین ساتەكانی ژیانتا.

وەلێ وێنەكان تەڵخو لێڵن. كەیفو هەواو لافو گەزافو خۆ بادان بەسەركەوتنەكانتەوە هیچ مانایەك ناگەیەنن ئەو وەختەی دەرك بەپووچی بێهوودەیی ئەو سەركەوتنانە دەكەی، یان لەبنەڕەتدا هەموو سەركەوتنێك رێژەیییە. كەخۆت دەبینی، هەنووكە، وادڵڕەقانە دەڕوانیتە ئەوانی دیكە، كتوپڕ بەهەمان هەستو بەشێوەیەكی زۆر پەنهان خۆتت خۆش ناوێ، بگرە رقت لەخۆتە. سەیرت لێدێ كەتۆ چۆن بوویت بەو كەسەی كەهەیت، چۆن بەم حاڵە گەیشتی، هەوڵ دەدەی شتێك لەشكۆمەندی بۆخودی خۆت بگەڕێنیتەوە. لەژێرەوەو هەر بەچرپە لەگەڵ خۆتدا هەر هەموو سەركەوتنو دەستكەوتەكانت دووبارە دەكەیتەوە، بەلام تارادەیەك بەشانازییەوەو بەدزییەوە لەبەرخۆتەوە دیانڵێتەوە. بەلام ئەوەیان هەرگیز قرتو پرتو دڵەڕاوكێیەكانت ناكوژێ، ناتهێنێتەوە سەر ڕاستە ڕێگاو ونو بزر لەسەر كوێرە ڕێگاكان دەمێنیتەوە، هەرچییەكی كەتۆ لەبەرخۆتەوە ناویان دەنێیتو بەدەستكەوتیان دەزانی، هەر لەگەڵ ناوهێنانەكە نامێنن. تۆ لەخۆت دەپرسیت: دەبێ چیبكەم تاشتێك لەمن دا زۆرتر لەخۆم بژی، كەئەگەر بكرێ جوانتر بێ هەرچەندە زەمەن دڵڕەقی بنوێنێ، ئەو شتەی كەلەنێو رۆحی مندا كپو خامۆش نیشتەجێیە، ئەو شتەی كەپتر یارمەتیم دەدا پتر بپشكنمو پتر بدۆزمەوە؟ هەرچەندە بیر دەكەیتەوە هیچت بەخەیاڵدا نایەت؟ هەناسەیەكی سارد هەڵدەكێشی؟ شتێك لەنێو رۆحتدا نوقم دەبێو دەخنكێ؟ شتێكی غەمناك دڵو دەروونت داگیر دەكا؟ خەیاڵێكی پووچ داگیرت دەكا؟ بیرۆكەیەك زۆر بێهوودە دەڵێ: دەكرێ ژیانت جۆرێكیتر بێ؟ جیاواز؟ بەلام هەرچەند دەكەیتو دەبەیت: نازانیت چۆنو بەچ شێوەیەك.

واهەنووكە خەریكە قاوەكەت سارد بێتەوە، بیر لە شتە هەرە پڕو پووچەكان دەكەیتەوە، بەو مێشكەی خۆتەوە حەز ناكەی رووبەڕووی ئەو هەموو مانا شاراوانەی ناو راستییەكانی خۆت ببیتەوە، بۆیە دیسانەوە بۆ ئەوەی فێڵ لەخۆت بكەی، جارێكی تر دەكەویتەوە سەر كوێرە ڕێگەیەكو خۆت لەپێچێكدا ون دەكەی، یەكەمین لاڕێو پێچ پیایدا دەڕۆیت. بەدەم ڕێوە بیر لەشتی دیكە دەكەیتەوە: باری داراییت، بیر

لەشتێك دەكەیتەوە كەدوێنێ یەكێك وتوویەتی، رەنگە شتێكی بچووك و هیچ بێ، بەلاَم لەوانەیە كەمێك برینداری كردبێت، كەمێك لەشكۆمەندی تۆی دابێ، رەنگە لەگەلْ خۆتدا بیر لەوە بكەیتەوە كەبەو قسەو ئامازەو پلارانە مەبەستیان چیبووبێ. دیسانەوە ئۆقرەت لەبەر دەبڕێ‌و لەنێو، كورسییەكەتدا جێبەخۆت ناگری. دیسانەوە راڕاییو وەڕسیت لێ‌دەڕژێ. بەدحالی بوونت لەخۆتو لەدونیا دەتگەیەنێتە حالەتێكی وا ناچیرە كەهیچت بۆ نەمێنێتەوە جگە لەخۆ تاوانباركردن. ئەوەتا جارێكی تر هەر خۆتی لەبەردەم خۆتدا، تاسەو ئارەزوویەكی كوشندە وەئاگات دێنێ كەناوی نییەو تێی ناگەن. هەستێك داتدەگرێ كە ئەگەر واپاك‌و روون بەڕێگەی خۆیدا بڕوات، لەوانەیە هەموو ژیانت بگۆڕێ: هەنووكە وابیر دەكەیتەوە كەبێداربوونیش بۆ خۆی كەمێك وەڕسكەرە. لەگەلْ خۆتدا دەیلێیتەوە: دەكرێ سەر لەبەیانیێ:یان مرۆڤ خەیالْ‌و ختوورەی وای بەزەین دابێ. رووتبوونەوەیەكی لەو بابەتە، ئەو هەستە كەدەنێو رەگو ریشەی شیعردا جێگیر دەبێ، كەلەبنیدا دەمەیی، ئەو رووتبوونەوەو هەستەی لەو گۆڕانەوە دێ، لەو پێشبینیو دەرك پێكردن پڕ لەسەلیقەیە: وادەكات كەبەهرەی فریو دەرانەی رۆح ئەوپەڕی هەولی خۆی بدات تائاگادارت بكاتەوە، تاهەموو رەمزو هێماو ئامازەكان بخاتە بەردەمت، بەلاَم چ كەلكی هەیە كەدەبینی هەموو ئەوانە پەردەپۆش دەكرێن، دەخنكێندرێن، هەواو ترو تۆپێك، لافو گەزافێك ئەو هەموو هەستە، ئەو هەموو خەیالە تاریك دەكات. نووسەری ئەمریكی ((سۆل بیلۆو)) راستی كرد كەنووسی ـ ((كارێكی خەرایە.. بەلاَم تەنها ئازارو تلانەوەیە كەدەكرێ رۆح لەخەو بێداربكاتەوە.))

تەواو، لەم ئانو ساتەدا، قاوەكەت سارد دەبێتەوەو دەبێ بەدەمی مردوو. هەلْدەستیت تاسۆلەكانت لەپێ‌بكەی، بەلاَم پێیەكانت تێیان گیر نابێ، سەیریان دەكەی، پاشان بەزۆر هەولێكی دیكە دەدەی تاسۆلەكان بكەی بەسەر پێتەوە، كوپەكەت هەلْدەگریت‌و دەیبەیتە موویەقەكە، دەتەوێ كەمێ مالەكەت رێك بخەیتەوە، بەلاَم ئەم هەستەت لەلا كزە، هەر هەموو گلۆپەكانی ژوورەكان دادەگیرسێنیت. چیتر شتەكان سەیرو نائاسایی نین، هەموویان دەناسیتەوە، هەر هەموو شتەكان بەتۆ ئاشنان، ئابەم شێوەیە داتمەزراندوون، هەربەم شێوەیەش پێكت وەناون، ئائەمەیان ژیانی تۆیە، واهەستدەكەی كەحالت لەحالی ملیۆنەها كەس چاكترە، كەبەژووری میواندا رادەبووری، ئیقاع‌و ئەندازەسازی شوێنەكە لەبەرچاو دەگری، بەدەنگێكی بەرز دەلێ‌ی: لەوانەیە پەردەكان بگۆڕم، یان هەندێ رایەخی تازە بێنم، رەفەی كتێبەكانت بەرچاو دەكەون، لەبەرخۆتەوە دەلێ‌ی:

ئەوەیان جارێكی تر. گلۆپەكان دەكوژێنیتەوە، هەست دەكەی كەلەناو خۆتدا كەمێك ئارامتری، واهەست دەكەی كەكەمێك لەمالی خۆتدا جێگیری، بەلاَم نازانیو تێناگەی بۆچی وایت.

رەنگە ئەوەیان ئەو حالەتەبێ كەداگیرت دەكا: حالەتی خەون بینین بەوەی كەدەبیت، ئەوە حەقیقەتە كەئەم هەستە تازەیە باریگەو دەبێ تۆ لەهەموو شوێنێكدا هەلیبگریت، هەر نوشوستییەك، هەر شكەستییەك كەدروچاری دەبیت بارێكی دیكەیە، هەر حالەتێك كەتیایدا دەژیت بارێكی قورسە هەر قورساییەكی ماددی.

بەلاَم كەوتنە ژێر بارێكی دەروونی ((رەوانی)) قورسترە لەكەوتنە ژێر بارێكی فیزیكی یان مادی، چونكە ئەوەی یەكەم بارێكی قورسە بەسەر رۆحتەوە، تارمایی ئەگەرەكان دەورت دەدەن‌و دەست دەنێنە بینەقاقات، بەوپەڕی نەزانینەوە هێزە شاراوەكانی رۆح دەكوژرێن، شتێكی پەنهان

دەمرێ، بەڵام گەرتۆ لەژێر ئەوبارە دەرهاتیت، ئەگەر توانیت لەحاڵەتێکی جوانترو باڵاتر بژیت، ئەوساش بوونەوەرێکی باڵاتر لەنێو خودی تۆدا نیشتەجێدەبێ، ئەوساش هەڵچوونو داچوونت، موودت ((میزاج))ت، گرژیو خاوبوونەوەکانی رۆح زیاد دەکەن.

هەمیشە شتێك لەتۆدا کەم دەبێتەوە، کەچی لەولاوە تابێ باری شانت قورستر دەبێ، دەچێتەوە نێو پێخەفەکەت، بەڵام وەنییە یەکەسەر بخەویت. هەندێ دەموچاوی غەمگینو خنکاو، هەندێ قسەی لەیادچوو، هەندێ وەڵامی بەپەلە کەتۆ نەتتوانی لەبەرامبەر تانەوتەشەرو پلاری خەڵکیدا بیدەیتەوە بەروویاندا: هەر هەموو ئەم شتانە بەخەیاڵتا گوزەر دەکەن. لەراستیدا، ئا لەو شەوەدا، تۆ ناتوانیت بەئارامی بنوویت. ئالەم ساتەوەختە پڕ لەنهێنییانەدا نکۆڵی لەرۆحی شیعر دەکەینو دەیکوژین، هەر بەم شێوەیەش خەونەکانی خۆمان سەردەبڕین. ئەوساش رۆحی کوژراوی شیعر هەڵدەگرینو دەیبەینە نێو، ژیانو زیندەگی خۆمان، ئەمجارەیان بەوپەڕی ئاگاهی خۆمانەوە تۆڵە لەجیهان دەکەینەوەو رقی خۆمانی پێدەرێژین. ئا ئاواهی دەبین بەدوژمنانی شیعر: بەوەی کەخۆ بەدوور دەگرین لەهەموو جۆرە رووبەڕووبوونەوەیەك لەگەڵ زاتی خۆماندا، بەوەی کەنهێنییەکانمان دەشارینەوەو کەچی پتر لافو گەزافی پێوە لێ دەدەین.

لەساتانی بێداریمان پتر لەخۆمان دەخۆین... ئابەم چەشنە دەبین بەملۆزمی شیعر و شاعیرەکان ـ دژ دەوەستین. دژی ئەوەی واقیع پتر سیحراوی بێ.. دژی ئەوەی جیهان لەوە گەورەتر بێ کەهەیە، هەر بەم شێوەیە تابۆمان بکرێ ئەو هەستی سەرسامییە بەرامبەر بەدونیا بەر تەسکتر دەکەینەوە. قاندرو دوژمنانی شاعیرەکان وان دەنێو ئەو کەسانەی رقیان لەژیان دەبێتەوە، بەڵێ ئەو ملۆزمانە زیندەگی کوژن، ئەو کەسانەن کە((دانتی)) لەدۆزەخدا شوێنێکی تایبەتی داونەتێ، بازنەیەك لەئاگر.

سێیەم:

شاعیرەکان بەیەك دەنگ گۆرانی بۆ هەموو جیهان دەچڕن، گۆرانی بۆ هەموو کەسانە دەڵێن کەئەو خۆراکە دەگمەنو رۆحییەیان مەبەستەو دەیخوازن. ئەوان دەچنە پاڵ ئەو کەسانەی کەدەنگیان ناگات بەدونیا، هاواریان نابیسترێ، دەچنە پاڵ خەڵکی بەش مەینەتانو بێدەرەتانو لەقورداچەقیوەکانی سەر ئەم ئەستێرەیە، لەوانەیەو لەوانەش نییە، لەوانە نییە: چونکە چی لەشاعیرانی دەربار دەکەی؟ بەڵام پێویستە هەوڵی ئەوە بدەن هاریکارییەکی گەردوونی وەدەست بێنن. پاڵپشتی ویارمەتی کۆزمۆکی. چونکێ ئەوان بەناوی ئێمە دەدوێنو ئەم (لەبری دوانە) یان (لەبری قسەکردنە) گەلێ پێویستە. چونکە ئەوان دەنگی هەقو ویژدانن. ئەوان وەك سەربەستی خۆی سرکو سەیرن. گەر شاعیران بیانەوێ دەتوانن دەنگی ئێمەبن. ئەم خۆ هەڵبژادرنو نوێنەرایەتییەش لەجۆری خۆشەویستی ئەوان بۆ ئێمە خۆ دەنوێنێ؟ دەتوانن. لەپای ئەوەوە. لەبری ئەوەی راڕاییو دڵەڕاوکێ بیانکوژێ: بەو موحیببەتەی کەهەیانە خۆیان ئاسوودە بکەن. دەتوانن هەرچی وزەو هێزی زیندەگی هەیە لەبەرامبەر ستەمو نایەکسانیدا وەئاگای بێنن. دەتوانن یارمەتی کوێرەکان بدەن. رێی خۆیان ببینن. دەتوانن وەك ((عیسا)) موعجیزە بنوێنن. ئەوەی ((پاسکال)) ناوی نابوو حیکمەتەکانی مەسیح. حەکایەتە پڕ رەمزو هێماکانی: ئەوانەی پڕ بوون لەمانای مۆراڵی: شاعیر دەکرێ خاوەنی هەر هەموویان بێ. دەتوانێ ئەو کەسانەش کوێریکا کەدەبینن. لەهەر شوێنێکدا ئازار هەبێ، ئەوان دەچن کەمی بکەنەوە، لەهەر کوێ دەردو دوو هەبێ: ئەوان دەیانەوێ فریابکەون تابیپەڕێنن، لەهەر کوێ کارەسات هەبێ: ئەوان فریاد رەسن،

ئـەوان شـۆڕشو ڕاپەڕینـەکانی وەئاگـا دێنـنو گۆرانیـان بۆ دەچڕن، ئـەوان خـەونان دەچێنـن، هیـواو ئومێد دەبەخشـن، خـەونو هیـواو ئومێـد بەسەربەستی. ئینجیل ڕوونو ئاشکرا دەڵێ ((بۆ وەدی هێنانی خەونو بینین خـەڵکی ((مریدانـی)) من خۆ بەخت دەکەن)).

خـەڵکی بەتەنها لەبرسانا نامرن، نـەهاتیی نایانکوژێ، ئـەوان بۆیـە دەمـرن، چونکـە چیـتر خۆراکی ڕۆحی‌یان دەست ناکەوێ، دەمرن چونکه بـەدبینو بەدخـەونبین دەبـن.. دەمـرن چونکـە دووچاری ((ئـایدزی)) ڕۆح دەبـن.. سنندانی ڕۆح. چونکە لەهەر قۆنـاغو سـەردەمێکی دیاریکراوداو لەهەر شوێنێکی ئەم دونیایەدا بین: لەنێو خودی ئێمـەدا چـەندین زاتو خـودی دیکەهـەن کـەدەبێ تـێربکرێن، بـەلأم ئێمـە ئـەوەندە شـاعیری زۆرو بەتواناشمان نی‌یە کەئەو خۆراکە بدەنو ئەو خەڵکە تێربکـەن. ((سـوقرات)) زۆر بـەقووڵی ئاگـای لـەوەبووە کەوتوویـەتی - ((زۆرن ئەوانـەی ئـەو بەیداخـەیان هـەڵکردووە؟ بـەلأم کـەمن ئەوانـەی کـەخاوەن سروشـتو بـەهرەدارین.)) ئـەو شـاعیرانەی کـەدەکرێ زۆر باشـترین لەباشـەکان: ئەوانـەن کەوشـەکانیان پڕگڕو ورشـەدارن. کـەوا دەکـەن ((بـا))کـان هەڵبکـەن. هـەوای پاکـتر هـەڵمژن. ئەوانـەن کـە شـەڕی بێکۆتاییـان دژ بـەملۆزمانو قـاندڕانی شـاعیران ڕاگـەیاندووە: جانەو ملۆزمانە چ لەناوەوە بنو چ لـەدەرەوە، چ تـاك بـنو چ بەکۆمـەڵ. یـەکجار کـەمن ئـەو شـاعیرانەی کـەبتوانن بـەدرێژایی ژیـان ئـەو شەڕەبکەنو گرەوی ئەو ململانێیە بەرنەوە، یـان بتوانـن دۆزەخ وەکـو خـۆی ببینـن، یـان لەشاکارەکانیاندا وەك (هۆمـیرۆس) بکـەن کەلـە ((ئۆدیسە))دا کردوویـەتی، کەبـەزمانی سروشـتی ترسناکی (دێلفی).. بـەلأم بـەڕوونی وتوویـەتی - ((من گوێم لەسترانەکانی - سایرانەکان - ە))

(سـایرانەکان: ئـەو کۆمەڵـە بوونـەوەرە ئەفسـانەیی‌یە بـوون، لـەلای یۆنانیـیـەکان، کەسەریان هی ئافرەتو لەشیان هی مـەل بـوون، بەسترانەکانیان سیحریان لەدەریاوانەکان دەکردو ڕووەو مـەرگو خنکـانو تەهولکـە دەیانـبردن - وەرگێڕ).

دەی شـاعیرەکان.. هـەوڵدەن کـەزیتو زیندووبن، شارەزای بـەندو باوو فێربن، خۆتـان فێری هـەندێ ئەفسـوونو موعجـیزەو پـەرچوو بکەن، چ لەژیاندا بێو چ لەشیعردا هەوڵدە هەموو گۆرانەکانت لەخۆتدا ببینەو بچنە.. هەموو ڕەنگو دەنگـەکان. هـەوڵدە بـژی، زیندووبـە.. خـۆت مەفەوتێنـە، خـۆت شـێت مەکـە، لێمەگـەڕێ پێناسـەت بکـەن، لێمەگەڕێ کۆتو بـەند بخەنـە گـەردنت، نـەهێڵی بێدەنگیـت بکـەن، ئەگـەر سنووریان بۆ دانای، گـەر کۆتو بـەندیان خستە دەستو پێـتو گـەردنت، گـەر زیندانیـان کـردی، هـەوڵدە کێویانـە... پێغەمبەرانـە گۆرانـی خـۆت بچڕە... بەسیحری سترانەکانت دەتوانـی لـەو بەندیخانەیـە بێیتـە دەرێ. دژە بەملۆزمـەکانو قاندڕەکانت بجەنگە، ئەفسانەو تەلیسمەکانیان تێـك بشـکێنە، گـەر دژ بەئەفسـانەکانی تـۆش جەنگان: تۆش بجەنگـە. ئـەو کاتـەی دوژمنـەکان لەهەموو شوێنێکدا وێرانەیی‌و کاولکاری جێدێڵن، تۆ برۆو ڕووناکی‌یان تیابچێنـە، بـەردەوام بچێنـەو تـۆو بکـە، زەمانـە خـۆی بەرووبوومـەکان.. خێرەکـانی درووێنـە دەکـا. گۆرانی‌یـەکانت بچنـە: بەهەرچی چۆنێك کەدەتوانی، دەمێکە ((نیتشە)) وتوویـەتی - ((ئـەو شـتـەی کـەنامانکوژێ. بـەهێزترمان دەکـا.)) هیچ هۆکـارێکی وا لـەئارادا نی‌یـە کـەبۆچی شـاعیر. هەرچـەندە خـۆی بەشـێوەیەکی سروشـتی خـاوەن زیرەکی‌یـەکی سەیرو مەزنە. کەچی ناتوانێ وەك سیاسـەتبازێك یان خاوەن بانقێك بژی. ناتوانێ بمێنێـەوەو هـەر وەك حـەز دەکـا زیندووبێ، بۆچی ئـەوان بۆیـان هەبێ بژینو کەچی شاعیر بۆی نەبێ. ئەی شاعیر قـەت مەهێڵـە بوونـەوەرێکی مـردوو بیـت، هێلکەیـەکی پیس مەبـە.. بالەپشتی نەوەیـەکی

زینـــدووەوە بێـــت. چـــاوەڕێ بەکەخـــەرمانی بەبەرەکەت و جوانـت هەڵگریتـەوە. ئێمـە زۆرمـان پێویســـت بەتۆیــــە، هــــەتا لــــەو کاتانــــەش کەدوژمنایەتیت دەکەین. ئەوەت لەیادبێت کەتۆ دەستەڵاتی گەورەو هێزی مەزنی خۆت لەهێزی زۆری ملۆزمەکان و دوژمنەکانت وەردەگریت.

ئەوانن وادەکەن کەپێویست بکا تۆ لەوە گەورەتر بیت کە هەیت، واچاکە پەیرەوی ڕێنماییەکەی ((مێلڤل))ی ڕۆماننووس بکەی کەوەك پەندێك لەسەر مێزەکەی خۆی نووسیویەتی و دەڵێ: ((با ڕاستگۆو بەوەفا بیت لەگەڵ خەونەکانی سەردەمی جحێڵیت))

لەواقیعدا هەر هەموو ژیان، بەقورسایی خۆیەوە، وا لەپاڵ تۆدا لەپاش مەرگی ناوەختی تۆش، بۆ ماوەیەکی درێژ. هەر هەمان قسە دووبارە دەکەینەوە. ئەو مەرگەی دونیا بۆ ماوەیەکی درێژتر شینی بۆ دەگێڕێ. تەنها لەو ساتە وەختەدا دەگرین و دەلاوێنینەوە کەئێمە چۆن تۆمان لەکیس دا، چۆن دەنگی جوان و دلێرو دەگمەنی تۆمان دۆڕاند، چۆن ئەفسوون و سیحری تۆمان لەدەست دا، هەستی پاراوو موودی شیرینت.. هەمیشە ئامادەگیت کەئێمە مەتڵەبمان بوو.

هۆ شاعیرەکان، باوەکو کیسەڵ وابن: کیسەڵ ئەو توێکڵە بەردین و قورسەی سەرپشتی هەڵگرتووە، دەبا ئێمەش جیهان بخەنە سەر شان و بڕۆن، بەڵام مەرجە لەژێر ئەو بارە قورسەشدا گۆرانی خۆتان هەر بچڕن، ئەو شیعرە ڕەنگاوڕەنگ و پڕ لەسۆزی بەجۆش و خرۆشی خۆتان بڵێن، ئەو گۆرانی و شیعرانەی دەنێو خوێنی ئێمەدا ساوان، دەنێو ئازارو ئەشکەنجەی ئێمە، خۆشەویستی و مێژووی ئێمە، دەنێو کوێربوونی ئێمەدا خولقاون. تاکە ڕاستییەك کەهەڵاتن لەبەردەمیدا مەحاڵە، تاکە ڕاستییەکی زۆر سادە ئەوەیە کەئێرە، ئەوەی هەیەو دەیبینی تەنها مەملەکەتێکە کەئێمەی شاعیران هەتا هەتایە دەبنە خاوەن و سەرداری، ئەو سەرنشینی ئەو میرنشینەن. ئائەوەیان ماڵی ستران و هۆزانی تۆیە.

---

(١) ڤاندر: واتا دوژمن یان ملۆزم... کەئینگلیزییەکەی دەکا (**Antagonist**)

(٢) بێن ئۆکری: نووسەرێکی نایجیریا - یەو لە - لەندەن - نیشتەجێیە. چوار کتێبی بڵاوکردوونەتەوە کەدووانیان کۆمەڵە چیرۆکن لەژێر ناوی ((ڕووداوەکانی تەك ئەو مەزارە))و ئەستێرەکانی سەر لەئێوارەیەکی نوێ)). بێن ئۆکری چەندین خەڵاتی وەرگرتووە؛ لەوانەش خەڵاتی ((ئاغا خان)) لەگۆڤاری پاریس کەتایبەتە بەئەدەبی چیرۆك و ڕۆمان، کۆمەڵە شیعرێکی لەساڵی (١٩٩١)دا بەچاپ گەیاندو لەهەمان ساڵدا ڕۆمانی ((ڕێگای برسیەتی)) بڵاوکردەوە.

سەرچاوە:

**New Writing**
**An Anthology edited by**
**Malcolm Bradbury and judy cooke**
**Minerva is association with the British council**
**© British council /1992.**
لاپەڕە (١٥١ - تا - ١٥٩)

# ڕۆمانی ئینگلیزی لەسەرەتاوە

## تازەمانی دانیال دیفۆ[1]

▪ ئیفۆر ئیڤانس

• و: موحەمەد رەمەزانی

لەنێو بابەتەکانی ئەدەبیدا، چیرۆك لەهەموویان زۆرترە. شیعری حیماسی، بەیت و لاوك، حیکایەت و داستانی دڵداری، وێکرا چیرۆکن.بەڵام لەلایەکی دیکەوە، ڕۆمان بەو مانایەی ئەمڕۆ من و تۆ دەیزانین، لەمێژ نیە پەیدابووەو جۆرە حیکایەت گێڕانەوەیەکە:

هێندێ کەس دەڵێن چیرۆك لەسەدەی هەژدەدا و لەسەر ریشەی حیکایەتی ((پامێلا[2]) نووسراوی ریچاردسن[3] وەسەری هەڵدا. بێگومان ڕۆمانی ئینگلیسی لەسەدەی شازدە یانی لەحیکایەتی ئارکادیای نووسراوی سێر فیلیپ سیدنی[4] بەرەو دواتر ناچێ و ئەویش زۆر لەخوێنەرانی ئەمڕۆیی لایان وایە ئەم حیکایەتە، دارو باری ڕۆمانی زۆر کەم تێدایە. جالەبەر ئەوەیە، دەبێ ڕۆمان و حیکایەت گێڕانەوە لێك جیابکەینەوە. ڕۆمان نەسرە، بەڵام بەشی زۆری حیکایەتی زەمانی زوو، هۆنراوەن. هەڵبەستی Troilus and Criseyde چاوسر[5] هەموو ئەو شتانەی تێدایە کەخوێنەری ئەمڕۆیی لەڕۆماندا چاوەڕوانی دەکات، بەینەڵلا تەنیا شتێکی هەونیەو ئەویش ئەمەیە کەبەشێوەی هۆنراوە. پارچە هەڵبەست، هەرجارێ ناجارێ، دەبێتە شێوەی حیکایەت گێڕانەوەو دەکەوێتە سەر زاری خەڵك. سروالتر سکات و لۆرد بایرن ئاخر کەس بوون کەلەنووسینی داستانی دڵداری بەشێوەی هەڵبەستدا، سەرکەوتوو بوون. بەڵام سکات نیشانی داین کەنەسر بەرینایی و بناغەی چیرۆك وادادەنێ کەهەڵبەست بەتۆزیشی ناگات.

رۆمان نووس بەو دووشتە یانی بەرینایی‌و بناغەی چیرۆك، هونەرەکەی لەحیکایەت گێڕانەوە لێك جیا دەکاتەوە. رۆمان نووس حیکایەتێك دەگێڕێتەوە، هیچ بەچیرۆکەکەی شتێکیشمان پیشان دەدا. رۆمان جگە لەحیکایەت گێڕانەوە، کەسەکانی چیرۆك‌و دارو باری کۆمەلایەتی‌و (لەچیرۆکی ئەمڕۆییدا) ناو مێشکی بنیادە مەکانمان نیشان دەدات. رۆمان نووس هەر بەرزە فڕیەکی هەبێ کەیفی خۆیەتی بەلام، واباشە ئەمەی لەبیر نەچێ کەوەك حیکایەت بێژ دەستی بۆ پێنووس بردووەو هەرچی بکا ناتوانێ خۆی لەم سەرچاوەیە دەربازبکات. چاکە وایە پیاو دەتوانێ رۆمان ئاوا دیاری بکات کەبلێ: رۆمان گێڕانەوە، شتێکە بەنەسرو لەسەر بناغەی چیرۆکێك، و نووسەر ئەتوانێ کەسەکان‌و ژیانی خەلك لەسەردەمێکدا پیشان بداو هەست‌و ناو دەروونی ژن‌و پیاوان‌و هەلوێستیان سەبارەت بەدەورو بەریان لێکداوەتەوە. رۆمان نووس، بۆ ئەم کارە رەنگە یان کات‌و شوێنی سەردەمی خۆی هەلبژێرێ یان هینی رابوردوو. لەوانەشە کارەکەی بەکات‌و شوێنی ئاسایی دەست پێبکات‌و رۆمانەکەی بۆ پیشاندانی جیهانێکی خەیالی و دونیایەکی دوور لەراستی بێنێتە کایەوە.



لۆرد بایرن

رۆمان تازەترین شێوەی ئەدەبیە کەجێی خۆی کردۆتەوە، بەلام ئەو رمێنەی لەسەدەی هەژدەوە پەیدای کردووە، لەوانەیە پیاو لێی بترسێ. لەو کتێبخانە گەڕۆکانەی کتێب بەکرێ دەدەن، بازاڕی چیرۆك حیساب‌و کیتابی خۆی هەبوو ولەسەدەی هەژدەدا خەلك هاواریان لێپەیدابوو کە بابە کارو پیشەی ئەو عالەمە هەر بەجارێ بۆتە چیرۆك خوێندنەوە. بەلام هۆگری خەلك

داهاتوودا ژنان دەست لەپیاوان دەستێنن. رەنگە خوێنەری رۆمانی ئەمڕۆیی زۆرتر ژنان بن تاپیاوان. بەڵام دەبێ دان بەوەشدا بنێین کەلەبەشی دووهەمی سەدەی بیستدا، لەوەدەچێ بازاڕی رۆمان خوێندنەوە لەکزی دابێ، پیاو ناتوانێ بێنێ هەم وردو بەجێ وری رۆمان بخوێنێتەوەو هەم چاو لەتەلەفزیۆنیش بکات. تەلەفزیون تەنانەت بازاڕی رۆمانە هەرە باشەکانیشی شکست پێداوە. جارێ هێشتا پیاو ئیمانی زایە دەبێ ئەگەر بڵێ خوێنەری رۆمانە هەرە باشەکان روو لەکەمیە، بەڵام ئەم قسەیە لەداهاتوودا رەنگە رێی تێبچێ.



جیمس جۆیس

بەرۆمانەوە هێندەش جێی سەرسووڕمان نیە. بۆ زۆرکەسان، رۆمان تەنیا دەربیجەیەکەی کەبەرەو دونیایەکی پڕ تەجروبە دەکرێتەوە.

کەسانێکی دی کەتامەزۆری رێنوێنی فەلسەفی و ئەخلاقین. تاسەیان بەرۆمان خوێندنەوە دەشکێنن و رۆمانیش خۆوحاست ئەوە ناکا کە هێندی رێوشوێن بنێتە بەردەمی خەڵك بڵێ وابکەو وامەکە، بەڵکوو بەکردەوە شتەکە نیشان دەدات. ئەم قسانە بەجێی خۆی، هونەری رۆمان نووس، هونەرێکی گەورەیە. چونکێ نووسەر سەردەکا بەهەموو کون و قوژبنی ژیاندا و باسی شتێکت بۆ دەکا هیچ، بەڵکو وەك شانۆ نووسێکی لێهاتوو، وتووێژی بنیادەمەکانت بۆ دەگێڕێتەوە. رۆمان ئەو شێوەیەیە لەئەدەبدا کەورد ورد چۆتە بنج و بناغەی ژیانی بنیادەمی ئاساییەوەو ئەو شتە بەلایەوە هێندە پڕ بایەخە کەدەبێ نیشانی خوێنەری بدات. هۆیەکی هەیە کەرۆمان شێوەیەکی وایە لەئەدەبدا کەژنان لەو بوارەدا توانیویانە بەبێ پیاوان دەرچن و لەرۆمانی

رۆمان هونەرێکی بەرزە، بەڵام هونەرێکیشە رێگای ئەوە دەدا کەئەو بنیادەمانەی تەنیا لێهاتوویەکی مام ناوەندیان هەبێ، دەستی بۆ بەرن. نووسینی مێژووی رۆمان چەرمەسەرێی زۆرە، چونکێ رۆمان هێندە زۆرن کەلەژمارنایەن. ئەگەر مێژووی رۆمان هەروا بەسەر پێیەکەوە لێك دەیەوە، ئەبینی رۆمان لەپەستاو رۆژ لەگەڵ رۆژێ پێچو پەنا پەیدا دەکاو عالەمەکەش ئیدی بەوەیان تاسە ناشکێ کەچیرۆك هەر تەنیا حیکایەت گێڕانەوە بێ و هیچیتر. رۆمان ئەورۆکە هێندە زۆر بووە کە پیاو ناتوانێ شێوازە جۆراوجۆرەکانی دیاریبکاو هەروا سووك و هاسان لێکیان جیابکاتەوە.

رەنگە سنووری زۆر لەبەرچاو تەنیا لەنێوان دوو جۆرە رۆماندا هەبێت: یەکیان ئەوەی کەهەر باسی زەمانی نووسەر دەکات وەك ((تۆنۆ بوون گێی))[٦] نووسراوی ئێیچ. جی. وێڵز[٧]،و ئەویدی باسی کات و شوێنێکی مێژوویی دەکات.

ئەوەیان والەزەمانی نووسەر دەدوێ زۆرتر رئالیستیە و ئەوی دیکەیان باسی بەسەرهاتێکی

تایبەت دەکات. ئەوجۆرە رۆمانە رێالیستیەی لەزەمانی نووسەر دەدوێ لەمێژوودا وەك داستانی دڵداری خێرا هەڵنادا، بەڵام هەر کە بەخۆیدابێ، شوێنێکی زۆر گەورە لەسەر مێشکی خەڵك دادەنێ. ئەم جۆرە رۆمانە بۆ خۆی زۆری لق لێدەبێتەوەو ئەم لقانە بەقەد ئەو بەشانەی شانۆ لەنێو ((هەملێت))دا دەبن کەپۆلۆنیوس



دیاریکردوون: رۆمانی پێکەنین مان هەیە وەك ((سەنەدەکانی پیك ویك)). هێندێکیان کۆمەڵناسانەن وەك ((بۆ بادانەوە بۆسەر رێگای چاکە هەرگیز درەنگ نیە)) نووسراوی چارلز رید[8]. یان دەنا فەلەسەفین وەك ((دایانای خەڵکی کراس وێیز[9]))

رێگایەکی لەشانان خۆشی دیکە بۆ دیاریکردن سنووری رۆمان ئەوەیە بێنی فۆرم (شکل)ی رۆمان بکەیە بناغەی کار، بەڵام لێرەشدا گیروگرفتی کار کەم نیە. رۆمان نووس رەنگە چیرۆکێك بێ پێچوپەنا بگێرێتەوەو رووداوەکان، بەپێی زەمان، بەدووی یەکدابێن. کەم چیرۆکنووس واهەیە ئەم شێوە نووسینە.

تاسەی دڵی دامرکێنێ. هەرچەند هێندێ نووسەری وەك ئەنتنی[10] ترالپ هەن کەرووداوەکانی چیرۆکیان بەشێوەیەکی هەر زۆر ساکار هێناون. هێندێك لەنووسەران زۆرتر بایەخیان بەفۆرم (شکل) داوە وەك ستێرن[11] لەچیرۆکی ((تریسترەم شەندی))دا. ئەم نووسەرە پێشەنگی نووسەرانێکە کەلەفۆرمدا خۆیان تاقیکردۆتەوەو لەم بوارەدا ئەوانەی زۆر دیارن بریتین لە دۆرۆسی ریچاردسن‌و جەیمس جۆیس‌و ڤیرجینا وۆلف هەروەها ئەنتنی پاول لەزنجیرە رۆمانە باشەکانی بەناوی ((مۆسیقای زمان، هەرچەند پاول وەك ئەو نووسەرانەی سەرەوە نایەتەوە. پێویست ناکا هەموو نووسەرێ وەك ئەم نووسەرانە، بەدانستەو بەجارێ خۆ لەتاقیکاری فۆرمەوە وەردا. تامس لاف پیکاك[12] و ئەڵدس هاکسیلێ، هەرکامیان بەجیا بەڵام هەردووکیان بەیەك شێوە، رۆمانیان لەحیکایەت گێرانەوەی وشك‌و برینگ دوورخستۆتەوە لەبەر ئەوەی کارێ بکەن کەرۆمان ببێتە گاریەك بۆ هەڵگرتنی بیرو باوەڕو وتووێژ. لەسەدەی هەژدەدا، ساموئیل ریچاردسن، خوداو راستیان بەم شتەگەیی کەبەنامە ئەتوانێ هەستی خۆی لەرۆماندا لێکداتەوە. پیاو لێرەدا بۆ ئەم راستەقینەیە دەگەڕێتەوە کەفۆرمی رۆمان تێکەڵاویەك لەچەند شتە. کاتێ رۆمان نووس وتوێژی نێوان کەسەکانی چیرۆك زیاد کاو تەوسیف هەر زۆر کەم کاتەوە، کارەکەی لەشانۆ نزیك دەبێتەوە. رۆمانی ((خۆبەزل زانین‌و خێرەسەری)) نووسراوی جێین ئۆستین ئەوەندەی وتو وێژی بنەڕەتی تێدایە کەهەر بەو تێمەوە بۆ شانۆ دەبێ‌و ئەم قسەیە رێو راست چیرۆکی ((خۆ خۆشەویست))ی مێرێدیث[13] دەگرێتەوە. لەم بوارەدا، ئەگەر رۆمان نووس روو لەلایەکەی دیکە بکات دەگاتە مەقالەو وتاری وەك کارە پڕ لەبیرو تێرامانەکانی (ماریوسی ئێپیکوری)) نووسراوی وۆلتە پێیتە.[14]

لەم پەڕانەی خوارەوەدا، شوێن پێی مێژووی رۆمانی ئینگلیسی هەڵدەگرین تادەگەینە ئەو

ڕۆمانانەی کە لە کاتی پێگەیشتنیان ئەم تایبەتمەندیانەی سەرەوەیان پێوە دیاری داوە. سەرەتای کارمان (هەر چەند سەرەتایەك لەگۆڕێدا نیە) لەسەر فیلیپ سیدنی (٨٦ - ١٥٥٤) لەویلتن وەیانی لەو خانوو بەرە جوان و لەبارەی کۆنتێسی پێمبرۆك خوشکی سیدنیەوە دەست پێدەکەین کەلەوێوە نووسەر. نووسراوەیەکی بەناوی ((کۆنتێسی ئارکادیای پێمبرۆك)) نوسی کە دۆستو برادەری پێ سەرگەرم کات. ئەمە داستانێکی دڵداری پڕ لەلق و پۆپە. بەسەرهاتی کوڕە شازادان دەگێڕێتەوە کەپاپۆڕەکەیان لەدەریا غەرق بووە. باسی شازادە خاتوونی جوان دەکا. سەر گوزیشتەی پاڵەوانان دەگێڕێتەوە. مێرگ و مێرخوزاری لادێت دەهێنێتە بەرچاوی کەدونیایەکی وەك بەهەشت خۆشەو ئەمانە خەیاڵێك بوون کەهەموو دەربارییەك پێ مەست بوو. ئەم شێوە نووسینە تاسەدەی هەژدە باوبوو تاگەیی بەچاپکەرێکی بوورژوا بەناوی ریچاردسن کەبەیادی یەکێ لەکەسەکانی چیرۆکەکەی سیدنی. ناوی چیرۆکەکەی بەنێوی قەرەواشێك بەناوی پامێلاوەکرد. هەر لەو زەمانەدا بوو کە چیرۆکێکی بەتەواوی جیاواز لەمانە بە پێنووسی گەنجێکی زۆر بەتوانای کەمبریج بەناوی جان لیلی[15] (١٤٠٤ - ١٥٥٦) نووسرا.

ئەم نووسەرە بێتوو ئەوەندە زوو شکسپێری بەدوودا نەهاتبایە. زۆرتر وەك نووسەرێکی کۆمیدی. ناوی لەبیر دەما. چیرۆکەکانی کە(یووفیووز)) (ساڵی ١٥٧٨)و(یووفیووز و ئینگلیستانەکەی)) یان نێو بوو. لەباری چیرۆکەوە لاوازوبوون بەڵام لەباسی ڕێو ڕەوشتی خەڵکەوەو هەستو دەروونو ئەخلاقیاتیانەوە. زۆر ئەنتیکەن. هێندێك لەبابەتەکانی نووسینی لەکتێبێ: بەناوی ((دەرباریان)) نووسراوی کاستی جلیۆنی[16] ئیتالیاییوە هەڵگوێزراوە. ئەم کتێبە خوێنەر فێردەکا کەچۆن وەك نەجیم زادان هەستێو دانیشێ.

جان لیلی، چیرۆکەکەی پێش کەش بەخاتوونەکانی ئینگلیس کردووە، هەروەك ئەوەی تۆ بڵێی ئەم کابرایە وەك غەیب زان پێش بینی کردبێ کەبازاڕی ڕۆمان لەنێو ژناندا گەرم دەبێ. سێهەم دەستە لەنووسەرانی دەورەی مەلیکە ئیلیزابێت، لەچینی فەقیرو هەژاری کۆمەڵ بوونو بۆ ئەوەیان دەنووسی کەپوولو پارەیەکیان دەست کەوێ، هەر چەند وەکی لەژیان نامەی ئەم نووسەرانە دەردەکەوێ، ئەگەر چی زۆریان خۆ دەکوتا بۆ ئەوەی بەدڵی خەڵك بنووسن، چی وایان وەگیرنەدەکەوت. رابرت گرین[17] (٩٣ - ١٥١٦) شانۆنووس. مقالەنووس. شاعیرو بنیادەمی وەك کەس نەچوو. برێك شتی نووسی کەتەنیا کارێکی کردیان ئەوەبوو شوێنەواری چیرۆکەکانی سیدنیو لیلی بردە ناو خەڵکەوە. لەم کارنەدا پەڕاوێکیان بەناوی (پەندۆستۆ)) (١٥٨٥) تێدابوو کەشکسپیر لەشانۆی ((حیکایەتی زستان))دا کەڵکی لێوەرگرت.

رابرت گرین شێوازێکی تایبەت بەخۆی داهێناو ئەویش ئەوەبوو کەباسی ژیانی ((خەڵکی هەرچی و پەرچی)) وەك دزو بەرەڵلاّ وسڕو سواڵکەرو بنیادەمی هیچکەو پووچەکەی شاری لەندەنی زەمانی مەلیکە ئێلیزابێتو هەر وەها باسی کەڵەكو کۆڵەکەکانیانو ئەو بەستزمانانەی دەکرد کەبەداویانەوە دەبوون.

تامس لاج[18] (١٦٣٥ - ١٥٥٨)یش چیرۆکی بەهەردووك بارەکەدا تاقیکردەووە. هەم بەشێوازی سیدنی لەچیرۆکێك بەناوی ((ڕۆزالیند)) (١٥٩٠)داو هەم بەشێوە مقالەی ریالیستی. چیرۆکەکانی تامس دلۆینێ (١٦٠٠ - ١٥٦٣) زۆر خۆشنو پیاویان پێی سەرگەرم دەبێ. بەحیکایەتی سادەی کەدابی نەماوە بەڵام بناغە ریالیستیەکەیان پتەوە. باسی پیشەی وەستاکاران دەکات. لەچیرۆکی ((جەکی خەڵکی نیوبری)) باسی ژیانی جولاّیان دەکا. لەچیرۆکی

((پیشەی ئابڕوومەندانە))دا حیکایەتی پێڵاوکەران ئەوەندە بەجیۆرێ باس دەکا کەپیاو سوێند دەخوا دەڵێ ئەوە راستیە. وێرای ئەم نووسەرانە. تامس دێکە[١٩] کەبۆ خۆشی شانۆنووس بوو. ژیانی سەردەمی خۆی لەچەند پەڕاودا نیشان داوەو کتێبی ((گالس هۆن بووك))[٢٠] (١٦٠٩) لەهەموویان سەرکەوتووترە کەژیانی بنیادەمی ((سڕو سواڵکەری)) لەندەنی جوان خستۆتە بەرچاوی خوێنەر.

هەرچەند ئەم نووسەرانە ریالیست بوون، چیرۆکەکانیان هێندەیان فۆرم تێدا نەبوو. بەلاّم تامس نەش[٢١] (١٦٠١ ـ ١٥٦٧) لەباری فۆرمەوە برێك چووەپێش. ئەم نووسەرە. لەچیرۆکی ((جەك ویلتن))دا چەند رووداوی بەدووی یەکدا هێنا کەزۆربەیان لەژیانی پڕ گێژاوی خۆیدا بەسەری هاتبوون. پاڵەوانی چیرۆکەکەی کەبابایەکی رەش‌و رووت بوو لەپێشدا لەسوپای هێنری هەشتەمدا بوویە سەربازو لەسەفەرەکانیدا تووشی بنیادەمی زیت‌و وریا هات. لەناو رۆمانی سەدەی شازدەدا. ئەمەیان لەهەموویان ریالیستی ترە.

زۆر سەیرەو پیاو نازانێ چۆنی لێك داتەوە کەچیرۆك کەلەزەمانی مەلیکە ئێلیزابێت دا ئاوا سەری هەڵداو چاوەڕوانی ئەوەی لێدەکرا لەسەدەی حەڤدەدا پەرەبستێنێ بۆچی بەپێچەوانە، لەگەشەکەوت. مشت‌و مڕی ناو لقەکانی ئایینی، ناکۆکی کۆمەلاّیەتی‌و دوای هەموان ئەو شەڕانەی ناوخۆ، کۆڵێك مقالەی بەدووی خۆدا بەجێ هێشت‌و هێندێ کەس لەسەر ئەم بڕوایەن کەنووسران هێندەیان خۆ بەم شتانەوە ماندووکرد کەئیتر تاقەتی چیرۆك نووسین بۆ کەس نەما. بەلاّم، سەرەتای سەدەی حەڤدە، بەشی خۆی یاریدەی مێژووی چیرۆکی داوە. کەرەسەیەکی تازەی چیرۆك نووسین کەلەهەموان گرینگتربوو لەچیرۆکی فەرەنسی یانی لەرۆمانسە رازاوەو دوورو درێژەکانی مەدلێن دۆ سکوودێی غییەوە[٢٢] سەرچاوە دەگرێ کەچیرۆکی ((کوورشی مەزن)) یان لەساڵی (٥ ـ ١٦٥٣)دا لێوەرگێراوەو خەڵك باشی بەرەو پیرچوون. زۆرتر لەهەموان خانزادەکان ئەم رۆمانسانەیان بەدڵ بوو. بەلاّم خەڵکی دیکەش هەر زۆریان پێ‌خۆش بوون . لەم رۆمانسانەدا، بەنەسر لاسایی شیعری حیماسی‌و رۆمانسی یۆنانی کۆن کرابۆوەو هەست‌و کەسایەتی چیرۆك‌و تێم (مەوزوع) بەشێوەیەکی بەرزو بێ‌عەیب هاتبوونە گۆڕێ. ئەم حیکایەتە درێژانە باسی رووداوی وایان دەکرد کەلەژیانی بنیادەمی ئاسایی‌و رەش‌و رووت دانەبوو و ئینگلیسەکان خۆیان ماندووکرد کەنێوێك بۆ ئەو جۆرە چیرۆکانە ببیننەوەو نێویاننان ((چیرۆکی رۆماننتیك)).

لەبەشی دووهەمی سەدەی حەڤەدا، چیرۆك گەشەی کرد. ئەگەرچی رۆمان بۆخۆی هێندەی هەنگاو بەرەو پێش نەنا، بەلاّم ئەتدی لێرەو لەوێ، ئەم‌و ئەو باسی ژیانی خۆیان دەنووسی. سامۆئێل پێچی‌و[٢٣] جان ئێلڤین[٢٤]، لەیاداشتە رۆژانەکانیاندا کەرەسەیەکی نووسینیان لەکارکرد کەرۆمان نووسان لەرۆژی خۆیدا کەڵکیان لێوەرگرت.

ئەو جۆرە هەڵوێستەی سەبارەت بەژیان کەبووە هۆی ئەوەی ئەمان‌و نووسەرانی دوای خۆیان، لەهەموو کەلێن‌و قوژبنی ژیانی رۆژانە ورد ببنەوە، ئەوا خەریکە بارو دۆخێك دێنیتەدی کەچیرۆك تێ‌یدا ببێتە شتێك کەپیاو وەربەر دڵی بکەوێ.

گەورەترین چیرۆکنووسی سەدەی حەڤدەو یەکێ لەو ناوە درەوشاوانەی ئەدەبی ئینگلیس، کەرەنگ بوو بۆ خۆی خۆ بپارێزێ لەوەی نێوی رۆمانووس لەخۆی بنێ، جان بونیان بوو[٢٥]. (٨٨ ـ ١٦٢٨) جان کوڕی بازرگانێکی خەڵکی بێدفۆردشایر بوو. لەئەرتەشی جومهووریدا سەربازی کرد. قەشەبوو و مەوعیزەی دەکرد.

عاریفو خواناس بوو. لەبەرئەوەی پادشایەتی چارلزی دووهەمی (لەساڵی ١٦٦٠دا) قبووڵ نەبوو، دوازدە ساڵ کەوتە زیندان. یەکەم چیرۆکی ((بەخششی خوا یەکجار زۆرە)) (١٦٦٦)ەکە باسی سەیرو سلووکی روحانی خۆی دەکا. یەکەم بەشی چیرۆکی (هەنگاونانی زیارەت کەر)ی کەلەسەردەمێکی ناوبەندیخانەیدا نووسیبوو، لەساڵی ١٦٧٨ بڵاوکردەوە. بەشی دووهەمەکەی لەساڵی ١٦٨٢دا بڵاوبۆوە. چیرۆکێکی دیکەی هەیە کەبەقەد ئەمەیان پیاو بۆلای خۆی رادەکێشی کەچی زۆری نێوبانگ دەرنەکردووەو ناوی ((ژیان و مەرگی کاکی بەدکار))ە (١٦٨٠)و هەر راست لەچەشنی چیرۆکی زیارەتکەری باشو لەوێنەی چیرۆکی دوورو درێژ بەرزی ((شەڕی پیرۆز)) (ساڵی ١٦٨٢)ە. رەخنەگری ئەمڕۆ بەشوێن نووسەری پرۆلتێریدا دەگەڕێن، کەچی هیچ لەبیریان نیە کەئاخر لەم بوارەدا لە(بونیان) باشتر کێمان هەیە. ئەڵبەت پیاو ئەوەش بڵێ کە (جان بونیان) کاری بەکاری کێشەی چینایەتیەوە نەدابوو و ئەو کێشەیەی ئەو لێدەدوا لەبەر خاتری رۆحی مرۆڤ بوو وئەم بابەتە لەئەدەبی ئینگلیسدا هەتا چەند سەدە وەك شتێکی لەهەموان گرینگتر چاویان لێدەکرد.

جان بونیان بێئەوەی خوێندنێکی بەجێو رێی ناو فێرگەو زانستگای بووبێو یان رێو شوێنە ئەدەبیەکان رێگایان لێتەسك کردبێتەوە، لەئەسر نووسیندا تەنیا سەرچاوەیەکی گەورەی بەدیکردووەو ئەویش ئینجیلی ئینگلیسە. لەسەیرو سلووكو بیرکردنەوەی قووڵی ئاینیدا تەجرووبەی هەرە گەورەی لەبواری کێشەی بەشەر لەگەڵ گوناه لەدونیادا وەدەست هێناو لەمانای قووڵی خراپەو تاوان لەکەسایەتی ئادەمیزادا کەلەعیرفاندا شتێکی ئاساییە، گەیی.

جان بوینان لەچیرۆکی ((هەنگاو نانی زیارەتکەر))دا لێبڕا بەزمانی حیکایەتی رەمزی کەباسی سەفەرێك دەکا، لەسیمای ژیان بدوێ. حیکایەتی رەمزی رەنگە لەچاو چیرۆکی وا لەخەیاڵەوە سەرچاوە دەگرێ، شتێکی ناخۆشو لەشانان گران بێ. بەڵام بونیان، بۆ باسی شتی وردو گێڕانەوەی بەسەرهاتو باسی شێوەکانی نێو چیرۆكو داهێنانی وتووێژ لەناو کەسەکانی چیرۆکدا، لێهاتوویەکی خودا دای هەبوو. بونیان ئەم لێهاتووییەی لەو چیرۆکەدا واپیشان داوە کەبائەوەی باسی جیهانی رۆحو مەعنەویات دەکات، چیرۆکەکەی بۆتە ریالیستیو سوێند دەخۆی دەڵێی ئەوە راستەو هەر لەزەمانی خۆماندا رووی داوە. برێك کەس ویستوویانە سەرچاوەی نووسراوەکانی بزانن بەڵام، کاری لەهەموان ئاقڵانەتر ئەوەیە گوێی بۆ قسەی خۆی شل کەین کەدەڵێ من ئەو شتانەم پێئیلهام کراوە. پیاو دەست لێك هەڵپێکانی ئەم ریالیسمەو تەجروبە روحیەکانی بونیانی لەوەوە بۆ وەدەر دەکەوێ کەنووسەر لەچیرۆکی ((بەخششی خوا یەگجار زۆرە))دا چەندە بە وردیو بەجێو رێ باسی ئەو رووداوانە دەکا کەبوونە هۆی ئاڵووگۆڕی بیروباوەڕی.

ئەم چیرۆکە، کاردەکاتە سەر دڵو مێشکی بنیادەمو لەباری دەروونناسیەوە سەیر پیاو رادەکێشیو نووسەر لەرووی تەجروبەی خۆیەوە نیشانمان دەدا کەچۆن رێی رزگاری لەیەکەم حوکمی ناتوانیاری مرۆڤەوە دەست پێدەکاو بەناو کێشە لەگەڵ نەفسداو گیرو گرفتەکانی رێگادا تێدەپەڕێ تادەگا بەباوەڕێکی پتەو بەخوا. تۆ لەمێژووی ئەدەبی ئینگلیس دا هەرچەندی بەشوێن ئەو کەسانەدا بگەڕێ کەرچەیان بۆ ئەو جۆرە نووسینانەی جان بونیان شکاندبێ، هەرچەند شێوەی حیکایەتە رەمزیەکانی هینی سەدەکانی ناوەڕاستە، یان لەدووی ئەو نووسەرانە بگەڕێی پێیان نابێتە جێ پێی بونیان، سوودی نیەو بەهیچ کوێ ناگەی. نووسەرمان لەچەشنی جان بونیان نەبووەو

نووسراوەكانی ئەچێتە ئەو بەشە لەئەدەبی ئینگلیس دا كەسنووری زەمان تێدەپەڕێنیّو هەتا هەتایە نەمرە.

ئەگەرچی ڕۆمان لەسەدەی شازدەو حەڤدەدا سەری‌هەڵداو لقو پۆپی دەركرد، لەسەدەی هەژدەدا بووكە چیرۆك وەك فۆرمێكی ئەدەبی جیّی خۆی كردەوەو لەوكاتەیەوە كەكاری ڕۆمان نوسین نەوێستاوە. سەدەی هەژدە بەكاری دانیەل دفۆو[٢٦] (١٧٣١ - ١٦٦٠) دەست پێدەكا. پیاو لەنووسراوەی ئەم نووسەرە پرنهێنیە تێر نابیّ. بەلاّم ئینگلیسەكان هەرچەند نەماون بۆ بیوگرافی. هەرگیز باوەشێكی پڕ لەخۆشەویستیان بۆ ئەم نووسەرە نەكردۆتەوە. دانیەل دفۆو لە كۆلیجی ((علم التشریح))ی ستۆوك نێوینگتن خوێندنی تەواكرد. دفۆو نووسەرێكیش نەبوو كەبڵێی لەنووسیندا لێی نابڕیّ. پیاوی دەوڵەت بوو و یان بۆ حیزبی ویگ كاری دەكرد یان بۆ حیزب تۆریو بەئیمانی هێندیّ كەس كاری بۆ هەردووك لایان دەكرد. دفۆو نووسەرێك بوو سەرنجی خەڵكی زۆر بۆلای خۆی ڕاكێشا. داهێنەر بوو. دەستی لەزەردو بەرد بۆوەو تاقە پووڵێكی بۆ نەماوە. گەریدەبوو. ڕۆژنامەنووس بوو. جارێكیان بۆ تەمێیانە. سەرو دەستیان كرد بەناو تەختە بەندێكی زەلامداو هێنایانە ناو عالەم كەتیزی پێبكەن. چەند جاریش لەبەندیخانەیان توندكرد. هەرچەند بەكردەوەو لەسورشتیدا ئەوەندە دەربەستی ئەخلاق نەبوو. لەگۆشەیەكی مێشكیدا ئەو ئەخلاقیاتە پیورتیانیەی[٢٧] هەڵگرتبوو كەلەفێرگە لەگەڵیانا گەورەببوو. ڕۆمان نووسین تەنیا یەكیّ لەكارەكانی بوو و درەنگی دەست پێكردو كاتیّ دەستی بۆ پێنووس برد كەساردو گەرمی ڕۆژگاری زۆر چەشتبوو. لەناو نووسراوەكانی یەكەمجاریدا. ((چاو پێداخشاندنەوە)) (١٣ - ١٧٠٤) زۆر لەبەرچاوە و لەمێژووی ڕۆژنامەگەری و گۆڤار نووسینی ئینگلیسیدا رچەیەكی تازەی شكاند. جگە لە((پەیدابوونی خاتو ڤیل)) (١٧٠٦) كەوەك حیاكایەتێكی خەیاڵی دەچی بەلاّم دفۆو لەدوای لێكۆڵینەوەكانی خۆیدا نووسیویەتی. یەكەم چیرۆكی ئەم نووسەرە ((رابین سن كرووزۆ))ی (١٧١٩) ناوە. ئەم پەراوە لەتەمەنی شەست ساڵی نووسەرا بڵاوبۆوەو خەڵك بەگەرمی بەرەو پیریەوە چوونو هەر ئەمە دفۆوی هان دا كەدەست بەجیّ بەشوێنیا ئەم كتێبانەی خوارەوە بڵاوبكاتەوە: ((كاپتكان سینگلتان)) (١٧٢٠). ((مال فلەندز)) (١٧٢٢). ((سەرهەنگ ژاك)) (١٧٢٢). ((ڕۆژنامەی ساڵی تاعوون)) (١٧٢٢)و ((راكسانە))(١٧٢٤).

شێوە ڕوانینی دفۆو لەڕۆماندا لەچیرۆكی ((ڕۆژنامەی ساڵی تاعوون)) دا باش وەدەر دەكەویّو زەمانیّ خەڵك وەك چیرۆكێكی خەیاڵی چاویان لێدەكرد كەبناغەكەی لەسەر زنجیرە ڕووداوی زیرەكانەو بەجیّو ڕیّ دامەزراوە. ئەوەی ڕاستیبیّ ئەم چیرۆكە لەباری ناوەڕۆكی داستانیەوە بیّهێز نیە بەلاّم، لەسەر بناغەی ئەو بیرەوەریانە سەبارەت بەتاعوون دانراوە كەلەكاتی منداڵی دفۆودا خەڵك دەیانگێڕاوەو دفۆو بۆ خۆشی لەناو سەنەدو مەدرەكە مێژوییەكاندا بۆیان گەڕاو خوێندنیەوە. جگە لەم قسانە، دفۆ كاتێك ئەم بابەتەی كردە چیرۆك كەشتەكە ئاسایی بوو و هێشتا ئەو مەترسیە هەبوو كەتاعوون سێبەری ڕەشی جارێكی دیكە بەسەر خەڵكدا بكێشیّ. دانیەل دفۆو ڕۆمانەكەی نەوەك چیرۆكێكی خەیاڵی، بەڵكوو وەك ((حیكایەتێكی ڕاستی)) چاولێدەكاو تەنانەت كاتیّ، پێزی ڕاستەقینە لەچیرۆكەكەیدا لەكەمی دەدا، دەست بۆ جۆرە ریالیسمێك دەبا كەشتەكەی وەك ڕاست بچیّ. دفۆو سەلیقەی خوێنەرەكانی لەبەرچاو دەگرتو زۆرتر بۆچینی مام ناوەندی پیوریتانی دەنووسیو بابەتی وای هەڵدەبژارد كەئەوان دەست بەجیّ گیرۆدەی بن. بەڕواڵەت ئەم دوو شەرتە دەبوونە هۆی ئەوەی

کەچیرۆکەکانی لەباری ڕەسەن بوونەوە لەکزی بدەن، بەلاّم دفۆو ئەوەندەی تواناو لێهاتووە کەبابەتەکەی دەکاتە چیرۆکێکی بەجێوڕێ و بەشێوازێکی پڕ لەوردەکاری بەلاّم ساکار و لەشانان خۆش دەینووسێ، بێئەوەی بەزۆر سینگت لێبێنێتە پێش. ئەم چۆنایەتیانە لەرۆمانی ((رابین سن کروو زۆرو))دا وایان دەست لێك هەلّپێکاوە کەچیرۆکە بۆتە شتێکی زۆر خۆشی کەهەمیشە تام و چێژی هەر دەمێنێ. لەراستیدا ئەم چیرۆکە لەسەر بناغەی بەسەرهاتە کانی ئەلیگزەندە سێلکریك[٢٨] دانراوە. سیلکریك کەشتیەوانێك بوو کەساڵهای سال بەتەنیا لەجەزیرەی خوان فێرنەندزدا[٢٩] دەژیاو ئەم قسەیەش بەوەدا ڕێی تێدەچێ کەدفۆو بەسەرهاتی سەفەری ئەم و ئەوەی زۆر دەخوێندەوە. ئەم ڕۆمانە لەو ڕووەوە مام وەستایانە نووسراوە کەهەموو شتەکانی زۆر بەوردی باس کردووەو هەمووی هەر لەراست دەچێ. فۆرم، لەمانای پڕ لەوردەکاری خۆیا، ئەوەندەی شوێن لەسەر کاری دفۆو دانەناوە: چیرۆکەکانی دەڕۆن و دەچنە پێش تا بۆخۆیان لەپڕێکا وەك سەعاتی دیواری قورمیشەکەیان تەواو دەبێ و ئەوێستن. بەلاّم هەتا ئەو کاتەی ڕۆمانەکە بەرەو پێش دەڕوا، سەرنجی خوێنەر بۆلای خۆی هەر رادەکێشێ. ئەگەر چی دانیەل دفۆ، حەزی لەوە بووە بزانێ کەلەناو دەروونی بنیادەمەکاندا چی دەگوزەرێ، ئەو جۆرەی کەپیاو چاوەڕوانی لێدەکا ئەوەندە دەربەستی ئەوە نیە بزانێ لەنێو مێشکی رابین سن کروو زۆودا چ دەگوزەرێ و بەخوا خۆش دەبوو پیاو بزانێ ئاخوا ئەگەر هەر ئەم چیرۆکەت بدایەتە دەست هێنری جەیمز[٣٠]، چۆنی دەنووسی. ئەو بەشە لەچیرۆکەکە کەخوێنەر زۆری لەوەڕەز دەبێ ئەوەیە کەبیری ئاینی و ئەخلاقی تێدایەو لێرەدا دفۆو لەو ئەرزشە ئەخلاقیە پیوریتانیانە کەلّك وەردەگرێ کەبێ ئەوەی گەردیان لێنیشتبێ لەگۆشەیەك لەمێشکیا جێگیر ببوون. دفۆو دەشیزانی کەخوێنەری زەمانی خۆی ئەم قسانەی پێخۆشە. چیرۆکی ((رابین سن کرووزۆو)) ئەوەندە درەوشاوە کەچیرۆکە بەچێژو تامەکانی دوایی دفۆو ئەخلاقی بوون بەلاّم لەژیانی سڕو سوالّکەران دەدوان، شەوقێکی وایان نەبێ.

چیرۆکی ((کاپیتان سینگلتان)) کەلەسەر بناغەی دزی لەدەریاداو ڕوودای لە ئەفریقا دامەزراوە، چیرۆکێکی خۆش و بەتامە. و ژنانی سڕو سوالّکەری وەك ((مال فلەندن))و خاتوونێکی بەسەلیقەی وەك ڕۆکسانا، لەو کەسانەن کەدفۆو سازی کردوون و پیاو لەبەسەرهاتیان تێرنابێ.

بۆ ئەوەی بزانی دفۆو چەندە شیرین بەلاّم بەزمانێکی ساکارو ڕەوان شتی دەنووسی، سەرنجی ئەم بەشە بدە لەچیرۆکی رابین سن کرووزۆودا کەوای ئەزانی جزیرەکە هەر تەنیا خۆی تێدایە کەچی ڕۆژێکیان بۆ یەکەم جار لەسەر خیزی گوێی دەریا چاوی بەجێ پێی بنیادەم دەکەوی:

ڕۆژێکیان لای نیوەڕۆ بەرەو لای لۆتکەکەم دەچووم کەدەمم هەر بەجارێ بوو بە تەڵەی تەقیوو، چونکێ لەگوێی دەریا چاوم بەشوێن پێی بنیادەمێك کەوت کەبەپای پەتی هاتبووو ڕۆیبوو و شوێنی پێیەکە جوان جوان بەسەر خیزەلانەکەوە دیاریوو. ڕاوەستام. هەر دەتگوت هەورە تریشقە لێی داوم یان شایەتینی و شتی وام دیووە.گوێم ڕاگرت، چاوم بەدەور لای خۆما گێڕا. بەلاّم نەسریووەیەکی هاتە گوێم و نەهیچم هاتە بەرچاو. چوومەسەر بەرزاییەك کەدوورتر بڕوانم. ئەم سەرەو سەری گوێی دەریاکەم کرد، بەلاّم هەر ئەو شوێن پێیە بووو هیچی دیکە. ئەوەندەی چاوم گێڕا شوێن پێی ترم نەهاتە بەرچاو. دیسان هەر هاتمەوە جێیەکەی هەوڵم کەبزانم ئاخوا جێپێی دیکە دیارنیەو یان چاوم ڕەشکەو پێشکەی نەکردووە. بەلاّم، کورە کار لەو قسانەدا

نەبوو. جوان جوان دیاربوو، جێپێی بنیادەمێك بوو، جێقامکەکانی دیاربوو، پاشنەی دیاربوو و خولاسە جێی لاقی بەجوانی دیاربوو: ئەم بنیادەمە دەبێ چۆن هاتبێتە ئێرە، نازانم. شتی وامەر بەخەوی شەوانیشمدا نەدەهات.

سەدان خەیاڵی جۆراوجۆر بەمێشکمدا هات و ئیتر تیژ تێپەڕی، بەڵام لەپاشان کەدەتگوت بەدار لەتەپڵی سەریان داوم یان بەجارێ شێت بووم، رووم کردەوە ماڵەکەم کەقەڵای من بوو.

هیچ وام نەدەزانی کەبەسەر عەرزیدا دەڕۆم، کەچی لەترسان حەجمانم لێبڕا. هەر دووسێ هەنگاو دەڕۆیشتم ئاوڕم دەداوە، هەر بنچیك و دارو کۆلکێکم لەدوورەوە بدیبایە، لێم دەبووە بنیادەم. لەگێڕانەوە نایە کەچەندە ترسابووم و چۆن جروجانەوەری دونیام هاتە بەرچاو و سات بەسات دەیان خەیاڵی خۆنناکم دەهات بەمێشکمداو خولاسە، هەزاران خەیاڵ و شتی سەیرو عەلامەتم دەهاتنە بەرچاو.

کاتێ گەیشتمەوە قەڵاکەم (وابزانم دوای ئەم رووداوە بوو ماڵەکەم نێوم ناقەڵا). هەر بەپرتاو خۆم پیداکرد، دەتگوت ئەوە بەچەند کەس کەوتوونە سەرم. لەبیرم نیە کەئایا لەپێشدا بەنەردیوانەکەدا چوومە ژوورێ یان لەو کونەوەی کە بۆ خۆم نێوم نابوو درگا. نا وەڵڵا رۆژی دواییش وەبیرم نەهاتەوە، چونکێ هەرگیز هیچ کەروێشکێك کەلەترسان خۆی حەشاردابێ یان هیچ رێویەك کەلەترسی گیانی خۆی لەکونەکەی کوتابێ، بەقەد منی کەئاوا خۆم بەژووریدا کردبۆوە، نەترساوە.

پەراوێزەکان

(١) ئەمە فەسڵی دەهەمە لەکتێبی ((کورتەیەك لەمێژووی ئەدەبی ئینگلیس) A short History of English Literature

(٢) pamela

(٣) Richardson

(٤) sir philip sidney

(٥) chaucer

(٦) Tono Bangay

(٧) H.G, Wells

(٨) Charls Reade

(٩) crossusays

(١٠) Anthony trollope

(١١) sterne

(١٢) Thomas Love Peacock

(١٣) Meredith

(١٤) Walter Pater

(١٥) John lily

(١٦) Castiglione

(١٧) Robert Green

(١٨) Thomas Lodge

(١٩) Thomas Dekker

(٢٠) Guls Horn - Booke

(٢١) Thomas Nashe

(٢٢) Madelaine de scudery

(٢٣) Samuel Peppy

(٢٤) John Elvin

(٢٥) John Bunyan

(٢٦) Danil Defoe

(٢٧) Purition لقێك بوو لەئاینی پروتستان کەلەسەدەی ١٦، ١٧ی ئینگلیس دا سەریهەڵداو لەباوەڕی ئاینیدا توندوتیژو وشك بوون و خۆش و رابواردنیان پێگوناح بوو. (و)

(٢٨) Alexander Selkrik

(٢٩) Juan Fernandez

(٣٠) Henry James

# تیۆرەو مێژووی وەرگێڕان

■ جۆرج مۆنین

● و: یاسینی فەقێ سەعی

**بەشی یەکەم: چەند سەرەتایەك**

**وتاری یەکەم:**

**وەرگێڕان لەجیهانی مۆدێرندا**

وەرگێڕان بەدرێژایی چەندین سەدەو بێ ئەوەی هیچ یاسایەکی تایبەتی پارێزگاری لێ بکات، هەبووەو وەك چالاکیەکی مرۆیی ژیاوەو گەشەی کردووە. بەلام ئینسیکلۆپێدیا گەورەکانی دنیا، وەك ئینسیکلۆپێدیای بەریتانی، یان ترێکانی ئیتالی، لەکاتێکدا، بەوپەڕی گرنگی پێدانەوەو لەبالای وتارێکی دوورو درێژدا وەسفی چۆنێتی نالکردنی ئەسپ دەکەن. کەچی هەر لەوکاتەدا بەتەنیا یەك دێڕ باس لەم چالاکیە مرۆییە ناکەن کەوەرگێڕانە. لەلایەکیتریشەوە، لەسەرجەم رێکەوتننامە گەورەکان و رێنماو رێسا زمانەوانیەکانداو لەمانەش گرنگتر لەتوێژینەوە فەلسەفیەکاندا، بچوکترین ئاماژە بۆ کاری وەرگێڕان وەك بەرهەمێکی زمانەوانی ناکەن.

لەوکاتەشدا کەزۆر بەقوڵی باس لەپەیوەندیەکانی نێوان زمان و فیکر دەکەن، زۆر بێبەزەییانە خۆیان لەباسکردنی وەرگێڕان دەدزنەوە، کەدەکرێت لەوەرگێڕانی بونیادی فیکرێکەوە لەزمانێکەوە بۆ زمانێکی تر. سەرەتاکانی توێژینەوەو راڤەکردنی پەیوەندییەکانی نێوان زمان و فیکر دابرێژرێ.

لەم سالانەی دوایداو لەبانگەوازی پاراستنی مافەکانی نووسەرو داهێنەردا، هەر لەو بڕگانەدا کەداکۆکی لەمافی نووسەرو پاراستنی خاوەنێتی داهێنەر دەکات، کەچی مافی ئەو جۆرە نووسەرە هەزارەی کەپێی دەڵێن (وەرگێڕ) پێشێل دەکات، کەهیچ گومان لەخاوەنێتی ناکرێ بەسەر ئەو بەرهەمانەدا کەبەتواناو شارەزایی خۆی لەزمانێکەوە دەیانگۆڕێتە سەر زمانێکیتر.

پشت گوێخستنی وەرگێڕ، تا ئەو دەمەی کەوەرگێڕە فەورییەکان، لەکۆشکی دیبلۆماسیدا، فەرمانبەرێکی پلە دووی سادەو ساکاربوون، دەکرا بەردەوام بێت. یان تا ئەو کاتەی کە(وەرگێڕ) شوێنی خۆی نەدەزانی لەنێوان (سەنعەتکار)و(کرێکار)داو خۆی وانیشان دەدا کەبۆ ئارەزوو کاردەکات، نەك بۆ نان پەیداکردن و ژیان... بەلام لەجیهانی مۆدێرندا ئەمە مەحاڵە،

ئەمڕۆ وەرگێڕەکان توێژێکی پسپۆڕو شارەزاو بەژمارەش روو لەزیادبوون دەکەنو بەهەموو دنیاشدا بڵاوبوونەتەوەو لەپۆستی گەلێ گرنگی دەزگا فەرهەنگیو ئیدارییو رەسمییەکاندا کاردەکەنو ناکرێت لەئاستی مافو خاوەنێتی بەرهەمەکانیاندا بێدەنگ بین. دیارە زۆربوونی ژمارەی وەرگێڕەکان بەپلەی یەکەم دەگەڕێتەوە بۆ زۆربوونی ژمارەی ئەو خوێندنگەو پەیمانگاو کولێژە تایبەتیانەی کەلەسێبەری زانکۆ هەرە ناودارەکانی دنیادا دەکرێنەوە. ئەمەش بۆخۆی گەورەترین بەڵگەی پێداویستی شارستانیەتە بەکاری تایبەتمەندی وەرگێڕان. بۆیە لەمڕۆماندا، پاش تەواوبوونی قۆناغی پشتگوێ خستنی وەرگێڕان، ئەم پیشەو شارەزاییە بۆتە دیاردەیەکی گەلێ بەرفراوانی شارستانی. ئەمەش لەشارستانیەتێکدا بایەخ پەیدادەکاتو دەگەشێتەوە کەتیایدا بەزاندنی سنورەکانی زمان گەلێ گرانترە لەبەزاندنی سنوورە جوگرافیەکان. لەراستیدا. سەدەی بیستەم زۆر بەئاسانی سەرجەم ئەو سنوورو رێگرو بەستەڵەکە گەورانەی لەپانتایی جوگرافیدا هەبوون. بەزاندنیو خۆی گەیاندە هەموو شوێنێ، بەڵام نەیتوانیوە ئەو رێگرە نەبینراوانە بشکێنێ کەبەو قووڵییە دوو مرۆڤی زمان جیاواز لەیەکتری دادەبڕن. هەرلەم بارەیەوە گەورە پیاوێکی وەك (قەشە ئەگۆستین) دەڵێت: تەنها وشەیە دەتوانێ بمانکات بەمرۆڤو پێکەوەمان ببەستێتەوە، کەواتە دوو مرۆڤی زمان جیاواز، لەبەرامبەری یەکتردا کەسیان بۆئەویتریان مرۆڤ نین. ئەگەر هەریەکەیان تەنها زمانەکەی خۆی بزانێ.

### هەندێ ژمارە

لەساڵی ١٩٣٢، یان باشترە بڵێین ١٩٤٨، بەدواوە. پاش ئەوەی یۆنسکۆ (بەیاننامەی وەرگێڕان)ی بڵاوکردەوە. دەتوانین زۆر بەوردیەوە ئەو پەرەسەندنو گەشەکردنەی چالاکی وەرگێڕان بنرخێنینو لەبایەخی گەشەو بەرفراوانبوونی زیاتریشی تێبگەین.

لەبڵاوکراوەکەی یۆنسکۆدا (Lindex Translationum)، چەندین ژمارە هاتووە، کەلەئاکامی ئامارکردنی چالاکیی وەرگێڕان لەچەندین وڵاتدا کۆکراونەتەوە، بەڵام ئێمە دەبێت بەوریاییەوە بڕوانینە ئەم ژمارانە... چونکە هەندێ لەو وڵاتانە ئاماری ناتەواوو هەڵەیان داوە بەیۆنسکۆو و هەندێ وڵاتیش ئەوەندە بەتەواوی ئاماری چالاکیی وەرگێڕانی لەسنووری وڵاتەکەیدا کردووە، کەدیسانەوە هەر تووشی هەڵەبوون... یۆنسکۆ تەنها ئاماری ئەو بەرهەمانەی دەویست کەلەزمانەکانی دنیاوە وەرگێڕاونەتە سەر زمانی نەتەوەیی دانیشتوانی ئەو وڵاتە، نەك وەرگێڕانی لەزمانێکەوە بۆ زمانێکیتر بەڵام لەسنووری ئەو وڵاتەدا (بۆ نموونە: ئەگەر لەئیسرائیل، بەرهەمێك لەلاتینیەوە کرابێت بەیۆنانی، ئەمە نابێ بخرێتە ئاماری ئەو وڵاتەوە). لەلایەکی ترەوە گومانی ئەوە هەیە لەهەندێك وڵاتدا بەرهەمێك چەند جارێك حساب کرابێت. هەرچەندە بڵاوکراوەکەی یۆنسکۆ مەبەستی سەرەکی پێشکەشکردنی ئامارێکی زانستیانەی کاری وەرگێڕان نییە، تەنها دەیەوێت رێنمایەك بێت لەبارەی وەرگێڕانەوە لەجیهانی مۆدێرندا، بەڵام ژمارەکان وامان لێدەکەن کەهەندێ روونکردنەوە بدەین، چونکە لەهەندێ وڵاتدا، بەرهەمی وەرگێڕراوی سێساڵ بەیەکەوە کۆکراونەتەوەو لەخانەی یەك ساڵدا نووسراون، بۆیە بەرامبەری ناوی وڵاتێکی چکۆڵە ژمارەیەکی قەبەدەبینین گەر سەرنج بدەینە ئەو بڵاوکراوەیە، هەر لەساڵی (١٩٥٦)ەوە لەهەموو وڵاتەکاندا ژمارەکان پلەبەپلە روویان لەزیادبوون کردووە.

ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە کەکاری وەرگێڕان لەدوای ئەو ساڵەوە بەشێوەیەکی گشتی لەدنیادا بایەخی پەیداکردووە، دیارە بەڵگەشە بۆ زیادبوونی ژمارەی وەرگێڕەکان، ئەو زانیاریانەی

یۆنسکۆ خستونیەتە بەرچاومان زانیاریی تایبەتن بەوەرگێڕان لەکێرڤی (١٣) ساڵداو بایەخێکی گرنگیان هەیە بۆ توێژینەوە. بەتایبەتی لەو وڵاتانەدا کەهەر لەکۆنەوە چالاکی وەرگێڕان هەبووەو وەرگێڕیش کەسایەتیەکی گرنگی ناو بواری ڕووناکبیریان بووە، بۆیە ئاماری ئەم چالاکیەیان دروست و بێهەڵەیە.

لێرەدا لەم خشتەیەی خوارەوەدا، بەرلەهەموو شتێ سەرنجی هەردەم ڕوو لەزیادبوونی ژمارەکان دەدەین، لەلایەك ساڵ بەساڵ ژمارەی ئەو وڵاتانەی چالاکیی وەرگێڕانیان تێدابووە، زیادی کردووەو لەلایەکیتریشەوە شان بەشانی ئەم گەشەکردنە بەرهەمە وەرگێڕدراوەکانیش زیادیان کردووە. یۆنسکۆ (٢/٣) دوو لەسەر سێی وڵاتە بەهێزو دەوڵەمەندو گەورەکانی دنیای لەو بڵاوکراوەیەدا کۆکردۆتەوەو لەساڵی (١٩٤٨)ەوە هەتا ساڵی (١٩٥٩) ئاماری ژمارەی بەرهەمە وەرگێڕدراوەکانیشی بەرامبەریان داناوە، بەتەنها زانیاری دەربارەی وڵاتی (چین) بەدەست نەکەوتووە، کەگەلێ گرنگە:

| ساڵ | ژمارەی وڵات | ژمارەی بەرهەمی وەرگێڕدراو |
|---|---|---|
| ١٩٤٨ | ٢٦ | ٨٥٧٠ |
| ١٩٤٩ | ٣٢ | ١٠٠١٤ |
| ١٩٥٠ | ٣٤ | ١٣٥١٦ |
| ١٩٥١ | ٤٤ | ١٧٨٣٤ |
| ١٩٥٢ | ٤٩ | ١٦١٣١ |
| ١٩٥٣ | ٤٧ | ١٨١٣٩ |
| ١٩٥٤ | ٤٨ | ٢١٦٧٦ |
| ١٩٥٥ | ٥١ | ٢٤٢٧٤ |
| ١٩٥٦ | ٥٢ | ٢٧٦١٧ |
| ١٩٥٧ | ٦٥ | ٢٧٩٧٨ |
| ١٩٥٨ | ٦٤ | ٢٩٢١٣ |
| ١٩٥٩ | ٦٣ | ٢٩٦٦١ |

هەر لەبڵاوکراوەی ناوبراوداو بۆ هەمان ئەو ساڵانە خشتەیەکیان بەناوی ئەو وڵاتانە خستۆتە بەرچاو کەساڵانە زیاتر لە(١٠٠٠هەزار) بەرهەمی وەرگێڕدراو تیایاندا چاپو بڵاوکراوەتەوە. ئەم خشتەیە ئەو ڕاستی‌یە دەسەلمێنێ کەهەتا هۆیەکانی چاپو بڵاوکردنەوە لەڕووی تەکنیکی‌یەوە گەشەبکەن. چالاکی وەرگێڕانیش گەشە دەکات. ئەمەش بەبەراوردکردنی ڕێژەی ناوکۆیی ئەم ساڵانە لەگەڵ ساڵانی بەر (١٩٣٩) دەردەکەوێ.

| ساڵ | ژمارەی وڵات | ناوی وڵاتەکان، ئەوانەی ساڵانە لە(١٠٠٠) بەرهەمی وەرگێڕاو زیاتریان بەرهەم هێناوە. |
|---|---|---|
| ١٩٤٨ | ... | ... |
| ١٩٤٩ | ٠١ | ئەڵمانیا. |
| ١٩٥٠ | ٠٣ | ئەڵمانیا، فەرەنسا، یۆگۆسلاڤیا. |
| ١٩٥١ | ٠٥ | ئەڵمانیا، فەرەنسا، دانیمارك، پۆڵۆنیا، چیکۆسلۆڤاکیا. |
| ١٩٥٢ | ٠٥ | ئەڵمانیا، فەرەنسا، چیکۆسلۆڤاکیا، یابان، ئەرجەنتین. |
| ١٩٥٣ | ٠٦ | ئەڵمانیان، فەرەنسا، چیکۆسلۆڤاکیا، یابان، ئیتالیا، ئیسپانیا. |
| ١٩٥٤ | ٠٧ | ئەڵمانیا، فەرەنسا، چیکۆسلۆڤاکیا، یابان، ئیتالیا، پۆڵۆنیا.. هتد |
| ١٩٥٥ | ٠٨ | ئەڵمانیا، فەرەنسا، چیکۆسلۆڤاکیا، یابان، ئیتالیا، پۆڵۆنیا، هۆڵندە، سۆڤیەت. |
| ١٩٥٦ | ١٢ | ئەڵمانیا، فەرەنسا، چیکۆسلۆڤاکیا، یابان، |

| | | ئیتالیا، پۆلۆنیا، هۆڵندە، سۆڤیەت، ئیسپانیا، ئیسرائیل، ڕۆمانیا، تورکیا. |
|---|---|---|
| ١٩٥٧ | ٠٩ | ئەڵمانیا، فەرەنسا، یابان، ئیتالیا، هۆڵندە، سوید، سۆڤیەت.. هتد. |
| ١٩٥٨ | ١٠ | ئەڵمانیا، فەرەنسا، یابان، ئیتالیا، هۆڵندە، سوید، سۆڤیەت، بەلجیکا.. هتد. |
| ١٩٥٩ | ١١ | ئەڵمانیا، فەرەنسا، یابان، ئیتالیا، هۆڵندە، سۆڤیەت، بەلجیکا، ئیسپانیا، سوید، ئەمریکا... هتد. |

لەو وڵاتانەدا کەکاری وەرگێڕان مێژوویەکی کۆنو پڕ بایەخی هەبووە هەر لەو وڵاتانەشدا زووترو بەپەلەتر یاسای تایبەتی بۆ پاراستنی مافەکانی وەرگێڕو خاوەنێتی بەرهەمەکانی دارێژراوەو کاری پێکراوەو سەقامگیربووە. هەربەم شێوەیەش ئاماری بەرهەمە وەرگێڕدراوەکان لەو وڵاتانەدا وردترەو زیاتر لەراستیەوە نزیکە. لەم خشتەیەی لای خوارەوەدا، ئاماری بەرهەمی وەرگێڕدراو بۆماوەی ساڵانی (١٩٣٤ هەتا ١٩٥٩)ی(٧) وڵاتی هەرە گەورە دەخەینەڕوو، بۆ زیاتر تێگەیشتن لەبایەخ پەیداکردنی وەرگێڕان لەدنیای مۆدێرندا:

| وڵات | ١٩٣٤ | ١٩٣٧ | ١٩٤٨ | ١٩٥٠ | ١٩٥٢ | ١٩٥٤ | ١٩٥٧ | ١٩٥٩ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ئەڵمانیا | ٤٠٠ | ٦٨٠ | ٩٠٤ | ١٤٧٧ | ١٣١٨ | ١٨٠٤ | ٢٠٤١ | ٢٠٦٨ |
| فەرەنسا | ٥٤٦ | ٦١٦ | ٩٠١ | ١٠٠٣ | ١٢٣٥ | ١٤٥٢ | ١٤١٩ | ١٤٦٢ |
| یابان | ... | ... | ... | ٩٢٦ | ١١٧٣ | ١٠٦٣ | ١٤١٣ | ١١٢٩ |
| ئیتالیا | ٧٧٩ | ٦٨٦ | ٦٥٨ | ٨٩١ | ٩٢٤ | ١١١٦ | ١٤٠٤ | ١٢٢٧ |
| ئەمەریکا | ٢٩٠ | ٣٥٦ | ٢٩٠ | ٤٦٩ | ٧٣٥ | ٦٣٨ | ٧٩٩ | ١١١٣ |
| بەریتانیا | ٣٤٦ | ٣١٠ | ٣٤٣ | ٤٧٨ | ٥٦٤ | ٦٢٢ | ٦١٦ | ٧٥٢ |
| سۆڤیەت | ٦٩٣ | ٥٨٥ | ... | ٢٩٤ | ٤٠٧ | ٧٧٦ | ٤٦٠٨ | ٥٢٣٤ |

زانیاریی هەرە ئاشکرا ژمارەی بەرهەمە وەرگێڕدراوەکانە لەهەریەك لەو وڵاتانەدا. بەڵام بۆ دانانی چوراچێوەیەکی گشتی بۆ وەرگێڕان لەدنیای مۆدێرندا، پێویستە لەکۆی بەرهەم هێنانی دەزگاکانی چاپو بڵاوکردنەوەی هەریەك لەو وڵاتانە، لەلیستی جۆرو بابەتو بوارە جیاجیاکان وردبینەوە، لێی بکۆڵینەوە، لەمەش گرنگتر لێکۆڵینەوەیە لەلیستی ئەو بەرهەمە وەرگێڕدراوانەی بەچاپ نەگەیەنراون. پاش هەموو ئەمانە دەتوانین لەبایەخ و گرنگی وەرگێڕان بگەین لەهەریەك لەو وڵاتانەدا. هەروەها بۆ دارشتنی بیرۆکەسەك لەو بارەیەوە، گەلێك گرنگە لیستێك بەناوی وەرگێڕە پسپۆرەکان ئامادەبکرێت، بەڵام نەلەبڵاوکراوەکەی یۆنسکۆداو نەدواتریش ئەم کارە ئەنجام نەدراوە. هەرچەندە دەبوو شان بەشانی بەرنامە دەوڵەتیو نێو دەوڵەتیەکان، لیستی ناوی وەرگێڕە بەتواناو ناودارەکانی هەر وڵاتێك بەجیا ئامادە بکرێتو لەکاتی پێویستدا توێژەرەوەکان کەڵکی لێوەرگرن. ئەم کارە وەك وتمان ئەنجام نەدراوە، هەرچەندە خودی بڵاوکراوەکەی یۆنسکۆ، ئاماژەی بەرێکخستنی لیستێکی لەو بابەتە کردووە کەبەپێی ئەلفوبێ ئامادەبکرێت. لەلایەکیترەوە بۆ ئەوەی ڕوانینمان بەرامبەر وەرگێڕان ڕوونتربێت. پێویستە ئاوڕێك لەبواری سینەما بدەینەوە، کەبەهۆی فیلمە دۆبلاژکراوەکانەوە، ئاسانکارییەك کراوە بۆ گۆڕینی ئەو دۆبلاژانە بەنووسین، ئەمەش ژمارەی بەرهەمە وەرگێڕراوەکان زیاد دەکات[1]. بۆ نموونە: لەفەرەنسا، هەرچەندە یاسای هێنانی فیلمی

بیانی بۆ ناو فەرەنسا گەلێ توندوتیژە، بەلاّم لەماوەی یەك ساڵدا، نزیكەی (٢٠٠) دوسەد فیلم دۆبلاژكراون. هەموو ئەوانەش كەلەبواری بەرهەمهێنانی سینەمایی و دابەشكردنی فیلمدا كاردەكەن، ئەو راستیەیان سەلماندووە كە(٣/٢)ی داهاتی ئەو فیلمە بیانیانە، بەهۆی دۆبلاژكردنەوە پەیدابووە[٢].

لەكۆتاییدا، پاش یەكەمین كۆنگرەی رێكخراوە زانستیەكان كەساڵی ١٨٢٩ لەشاری (پیزە)ی ئیتالی سازدرا، ئیتر ساڵ لەدوای ساڵ ژمارەی بەشداربوانی ئەم كۆنگرەیە زیادیان كردووە، بۆ تێگەیشتنی ئەم بەشداربوانە لەیەكتر، پێداویستیەكی زۆریان بەوەرگێڕی فەوری هەبووە، پسپۆڕی و شارەزایی وەرگێڕەكان رۆڵێكی هێندە گرنگیان لەو كۆنگرانەدا گێڕاوە، كەبوونەتە مایەی هەمیشە زیادبوونی ژمارەی رێكخراوە زانستیەكان، تاگەیشتۆتە (١٥٠٠) رێكخراو.

لەبلاّوكراوەی تایبەتی كۆنگرەی نێودەوڵەتی زانستدا، كەساڵی ١٩٦١ سازدراوە[٣] ژمارەی بەشداربووان (١٣٢٠) رێكخراوبوون. ئەمانە هەر هەموو لەیەك كۆنگرەدا بەشداربوون و دواتریش بەجیا كۆنگرەی گچكەتریان بەستووە. ئەمانە لەسەرتاپای ولاّتانی دنیاوە هاتوون و بەبێ وەرگێڕ، نەیان توانیوە بەرنامەكانی یەكتری شارەزابن یان نەتوانراوە ئالوگۆڕی بازرگانی و زانستی ئەنجام بدرێ.. هەر لەەو ساڵەدا (٧٥٤) رێكخراوی زانستی و مەڵبەندەكانی توێژینەوەی زانستی كۆنگرەی تریان بەستووە.. كەواتە وەرگێڕ ئەو هونەرمەندە بەهرەمەندەیە و هەرواش دەمێنێتەوە، بەپێی ئەو ژمارانەش كەخستمانە روو، لەجیهانی مۆدێرندا، زۆر چالاكتر رووەو گۆڕانی گەورە بەرەو پێشەوە دەچێ... هەتا دەگاتە ئەوەی كەبەتەواوەتی ببێتە چالاكیەكی پیشەسازی..

## وتاری دووەم:

### چەند پێناسەیەك..

بەرلەوەی بچینە ناو باسەكەوە، باپرسین وشەی وەرگێڕانTradurre چۆن پەیدابووەو مانای چیە. مێژووی ئەم وشەیەو هەموو ئەو زاراوانەی ئەو مانایەیان بەخشیوە، لەگەڵ مێژووی ئەو كەسانەدا كەبەم كارەوە خەریك بوون، مێژوویەكی دووورودرێژەو پێویستە هێندەی گرنگی بەوشەكان دەدرێ، گەلێك زیاتر بایەخ بەشارستانیەت Civiltaبدرێ.

وشەی TRADUCTEURی فەرەنسی وشەیەكی تازەیە، بەكەمێك دڵنیاییەوە پەیدابوونی ئەم وشەیە دەگەڕێتەوە بۆ ( ETIENNE DOLET/١٥٠٩ - ١٥٤٦). ئەم وشەیە بەرەچەڵەك ئیتالیەو پاش بەكارهێنانی لەلایەن نووسەری ناوبراوەوە ئیتر دەموودەست ناوبانگی پەیداكردووە. هەر لەم بارەیەوەو بۆ دڵنیابوونی دەتوانین سەرنج بدەینە كتێبی (DEFFENCE ET ILLUSTRATION DE LA LANGUE FRANCAISE) كەلەلایەن (JOACHIM DU BELLAY)یەوە نووسراوە لەساڵی ١٥٤٩دا. ئەم نووسەرە سێوتاری گرنگی كتێبەكەی تەرخان كردووە بە(TRADUCTEUR)و(TRADUCTION).

وەرگێڕی فەوری

(INTERPRES)و (وەرگێڕی رێنووس - TRANSIATEUR).

بەر لەنیوەی سەدەی شانزەهەم، ئایا چ ناوێكیان لەم چالاكیە ناوە، چیان پێ وتوە؟ زاراوە فەرەنسیە هەرە كۆنەكان ئەمانەن: TRANSLATION. TRANSLATEUR.TRANSLATER . كەهەر لەسەدەی سیانزەهەمەوە بەپێی بەڵگەنامە مێژووییەكان. ئەم زاراوانە بەكارهاتوون. (هەر هەمان ئەم زاراوانەشن. كەپەڕنەتەوە بۆناو زمانی ئینگلیزی و

تائەمڕۆش لەو زمانەدا بەزیندوویی ماونەتەوە وەك:

TRANSLATION ، TO TRANSLATE بەرلەو سەردەمەش کەباسمان کرد، چەند زاراوەیەکی لاتینی وەکو: INTERPRETARI ،INTERPRES بەکارهاتوون. ئەم زاراوانەش لەمانادا هەردو جۆرەکەی وەرگێڕان (فەوری‌و بەنووسین)ی لەیەك زاراوەدا کۆکردۆتەوە؛ لەلایەکی ترەوە هەر لەسەدەی دوانزەهەمەوە زاراوەی تایبەت بەجۆری یەکەم (وەرگێڕانی فەوری) هەبووەو بەکارهاتووە وەك زاراوەی فەرەنسی - TRUCHEMENT، کەلەمانادا هەمیشە لەزاراوەی TRANSLATEUR جیاکردۆتەوە، کەبۆ جۆری دووەم بەکارهێنراوە.

کۆتایی سەردەمی زاراوە لاتینیەکان، کەم تازۆر، دەبێتە سەرەتای سەردەمی یەکەمین جیابوونەوەو پێناسەکردنی زاراوەکان‌و تایبەتمەندێتی جۆرەکانی وەرگێڕان دیاری‌دەکرێ. بۆ ئەو کارەی بەزمانی قسەکردن ئەنجام دەدرێ زاراوەی (INTERPRETE - وەرگێڕانی فەوری) بەکاردێت‌و بۆئەو جۆرەشیان کەبەزمانی نووسین ئەنجام دەدرێ. زاراوەی TRADURRE (وەرگێڕان) بەکاردێت. هەمان ئەم پێناسەکردن‌و جیاکردنەوەیە تائەمڕۆش هەر بەکاردەهێنرێ: وەرگێڕانی فەوری‌و وەرگێڕان بەنووسین. گەرچی هەردوو جۆرەکە لەلایەن یەك تاکە کەسیشەوە ئەنجام بدرێت. بەلام دووجۆر چالاکیی گەلێ جیاوازن، لەسەر میتۆدی جیاواز دارێژراون، تەنانەت لەهەندێ لایەنەوە هەریەکەیان پێویستیان بەشارەزایی‌و پسپۆری ئەوەندە جیاواز هەیە، کەلەبەرامبەر یەکتردا دژ دەوەستنەوە. لەبەشەکانی داهاتوودا باشتر لەم بارەیەوە دەدوێین..

بۆ ئەوەی ناوێك لەو چالاکیە تایبەتمەندانە بنرێت. لەبەرەبەیانی سەردەمی مۆدێرنداو بەکاریگەرێتی چەندین هۆکاری مێژوویی، زنجیرەیەك زاراوەی نوێ پەیدابوون، کەلەڕووی ماناوە یەك سەرچاوەیان هەیەو لەفۆرمدا جیاوازن.

بیرۆکەی (پەڕاندنەوە)، ئاسانکاری لەپەڕاندنەوەی شتێك لەزمانێکەوە بۆ زمانێکی‌تر، یان بیرۆکەی (گوێزانەوە)، گواستنەوەی مانای ئیدیۆمێك بۆ زمانێکی‌تر، هەر هەمان بیرۆکەیە کەلەسەردەمی لاتینەوە دەست پێ‌دەکات‌و بەشێوەی (پەڕینەوە/ TRA-DUCO)یان(گواستنەوە/TRANS - FERO) کەرابردووی تێنەپەری دەبێتە - TRANSLATUS هەتا دەگاتە زاراوەکانی ئەمڕۆ لەدنیادا بۆ وێنەکردنی ئەوکاری وەرگێڕانە بەکاردێت وەك زاراوەی (TRADURKE)ی ئیتالی‌و (TRADUIRE)ی فەرەنسی‌و (UBERSETZEN)ی ئەڵمانی‌و (PEREVODIT)ی رووسی. نەك هەر لەم فۆرمەیاندا. لەفۆرمەکانی تریشیاندا وەك (TRANSFERES ،TRANSPOSER ،TRANSPORTER). هەرهەموویان دەربڕینی جۆراوجۆرن بۆ گۆڕینی بەرهەمێك لەزمانێکەوە بۆ زمانێکی‌تر... بۆ وەرگێڕان[٤]..

وەرگێڕانی دەقاودەق - VERSIONE - و وەرگێڕانی مانایی - TRADUZIONE

سەرەتا پێویستە لەو راستی‌یە دڵنیابین کەکاریگەرترین فاکتەری جوڵاندن‌و بەرەو پێشەوەبردن‌و پەیدابوونی پێناسەی ووردترو بەئاگاتری کاری تایبەتمەندی وەرگێڕان. دەگەڕێتەوە بۆ کەلتووری ئاینی‌و تەفسیری کتێبە ئاسمانیەکان. هەرلێرەوە بریان واڵتۆن (BRYAN WALTON - مامۆستای تیۆلۆژیای زانکۆی کامبریج) لەساڵی ١٦٥٧دا. لەکتێبە بەناوبانگەکەیدا: BIBLIA SACRA POLYGLOTTA، بەوپەڕی پسپۆڕی‌و شارەزاییەوە شێوەو جۆرەکانی وەرگێڕان دیاری دەکاو پێناسەدەکاو لەیەکتریان جیادەکاتەوە.

بۆ هەرجۆرێکی وەرگێڕان زاراوەیەك دادەنێ، کەتائەمڕۆ لەزمانەکانی دنیادا بەکاردەهێنرێن. ئەم توێژەرەوەیە، ئەم جۆرانەی وەرگێڕان لەیەکتر جیادەکاتەوە:

١- VERSION = وەرگێڕانی دەقاودەق

٢- LA VERSIONE INTERLINEARE = وەرگێڕانی دەقاودەق بەتەفسیرەوە

٣- TRADUZIONE = وەرگێڕانی مانایی

٤- L,INTERPRETAZIONE = وەرگێڕانی دارشتنەوە

٥- PARAFRASI = وەرگێڕانی خوێندنگەیی

ئەم زاراوانە لەکەلتووری ئاینی‌دا سەرهەڵدەدەن‌و دەچنە نێو کۆشك‌و تەلاری فەرهەنگی کلاسیکەوە، ئیتر لەوێدا هەتا کازیوەی سەدەی بیستەم بەزیندوویی دەمێننەوە. بنەماکانی لەیەك جیاکردنەوەی ئەم جۆرانەی وەرگێڕان دەبنە مایەی گەورەترین‌و دووروودرێژترین گفتوگۆو لێکۆڵینەوەی زمانەوانی‌و ئەدەبی، چەندین پسپۆرو شارەزا لەبارەیانەوە دەنووسێ. لەئینسیلکۆپێدیای -DIDEROT - ساڵی ١٧٥٦دا، لەوتاری تایبەت بە(وەرگێڕان - TR/.DUZIONE)دا، نووسەر هەوڵی‌داوە راوبۆچوونی سێ‌سەدە لەبارەی وەرگێڕانەوە، لەوتارەکەیدا چڕبکاتەوە.

دەپرسێ: ئایا کرۆکی جیابوونەوەی وەرگێڕانی دەقاودەق - VERSIONE لەوەرگێڕانی مانایی - TRADUZION - چی‌یە؟

لەوەڵامی ئەم پرسیارەدا دەڵێت: ((وەرگێڕانی دەقاودەق واتە وەرگێڕانی حەرفیی بەرهەمێك، کەواتە هەرگیز لەگەڵ وەرگێڕانی مانایی‌دا دوو زاراوەی هاومانانین[٥] لەچەندین رووەوە لەیەك جیاوازن. یەکەمیان (VERSIONE) وەرگێڕانێکی وابەستەیە بەبونیادی زمانەوانی زمانە ئەسڵیەکەوە، وەرگێڕ لەسنوورێکی تەسکدا کارەکەی ئەنجام دەدات، بەستراوەیە بەپرینسیپەکانی زمانی بەرهەمەکەوە، بەلام دووەمیان (TRADUZIONE) بێ‌باکانە بەرامبەر مانای (مجرد)ی وشەو دەربڕینەکان دەوەستێ، مانای ئەو دەربڕینە لەزمانە تازەکەدا دەدۆزێتەوەو بەپێی بونیادی زمانە تازەکە دایدەڕێژێ. **ئیدیۆمێك بەحەرفی وەرناگێڕێ. بگرە دەگەڕێت بەدوای ئیدیۆمی هاومانای ئەودا لەزمانە تازەکەدا. کەواتە لەمیاندا وەرگێڕ دەبێت** بەهەمان ئاست شارەزایی لەهەردوو زمانەکەدا هەبێت، پاش تێگەیشتن لەمانای دەربڕینەکان، دەگەڕێت بۆ دۆزینەوەی شێوازی ئاخاوتنی ئەو دەربڕینە لەزمانە تازەکەدا))[٦].

لێرەدا دەتوانین ئەو بنەمایانەی لەمێژووی کۆندا هەبوون بۆ جیاکردنەوەی دووجۆری وەرگێڕان لەیەکتری بەئاشکراتر بخەینە بەرچاو، جیاوازیی وەرگێڕان بەنووسین لەوەرگێڕانی فەوری - بەقسەکردن - یان جیاوازی وەرگێڕانی دەقاودەق لەوەرگێڕانی مانایی کەناسراوە بە(بێ‌وەفا جوانەکان)، لێرەدا لەبەرئەوەی وەرگێڕ ئازادە، بەلام باش دەنووسێ، لەئازادیەکەیدا بەرامبەر دەقە ئەسڵیەکە بێ‌وەفایەو لەدارشتنەوەی نوێشدا کارێکی جوانکاریی ئەنجام دەدات. یان جیاوازی نێوان وەرگێڕانی خوێندنگەیی‌و وەرگێڕانی ئەدەبی. ئەم دوو جۆرە بەردەوام لەدژایەتیکردنی یەکتریدان‌و هەندێجار گاڵتەش بەیەکتری دەکەن. بەلام لەراستی‌دا بنەماکانی جیاکاریی نێوان دووجۆری وەرگێڕان، ئەوەندە سنووردارنین کەباس دەکرێت، نووسەری هەمان وتاری ئینسیکلۆپێدیای ناوبراو لەشوێنێکی‌تری وتارەکەیدا دەڵێت: ((بێ‌سێ‌و دوون. هونەری وەرگێڕان لەوەرگێڕانی دەقاودەقدا دەردەکەوێ؛ بۆیە ئەو شێوە وەرگێڕانەی بەلاوانی خوێندکار راڤەدەکرێ وەرگێڕانی دەقاودەقە: هەر لەبەرئەم هۆیەشە؟ وەرگێڕە لاوەکان؟ لەبەرهەمەکانی سەرەتایاندا؟ ناتوانن‌و نابێت لەوەرگێڕانی دەقاودەق لابدەن)). لەپاش ئەزمونێکی زۆر

ئەوکاتەی دەبنە وەرگێڕێکی پسپۆڕو بەرهەمی وەرگێڕانی تەواوەتی پێشکەش دەکەن. ئیتر وەرگێڕانی دەقاودەق تەنها وەك قۆناغی یەکەمی تەمەنی بەهرەمەندیان دەمێنێتەوە. لەلای ئەم وەرگێڕە پسپۆڕانەش. گرنگیدان‌و بایەخیان بەلایەنی ئیستێکای دارشتن‌و پاراستنی شێوازی تایبەتی خۆیان وەك (STILE)یێك، هەرگیز بە(بێوەفایی) پاساو نادرێتەوە.

دەستەواژەی (بێوەفا جوانەکان) دانراوی قەشەیەکی رووناکبیرە بەناوی (BATTEUX) کەلەشوێنێکیتردا دەڵێت: - وەرگێڕانی بەرهەمێك نابێت بەهیچ شێوەیەك کەم‌وزیاد یان گۆڕانکاری لەدەقە ئەسڵییەکەدا بکرێت کەواتە نە ( VERSIONE) تەواوەو نە (TRADUZION). زاراوەی (COMMENTO) دروست ترە. واتە (لێکدانەوە تأویل). لەسەدەی هەژدەهەمدا. گەر لەلایەك ئەدەب بەئەوپەڕی هوشیاریەوە تیۆریزەی (بێوەفا جوانەکان)ی کردبێت. ئەوا لەلایەکی ترەوە لەکۆشك‌و تەلاری فەرهەنگدا هەوڵی دراوە بۆ دۆزینەوەی ناوەڕاستێکی دروست لەنێوان ئازادیی راڤەکردن لەلایەك‌و (کۆیلەیەتی) وەرگێڕانی حەرفیی لەلایەکیترەوە. واتە دروستکردنی وەرگێڕانێکی خوێندنگەیی - PARAFRASI - کەزۆر بەوەفابێ بۆ دەقەکە، یان راسترە بڵێین بەپێی زاراوە نوێیەکان، دارشتنێکی خودی یان ئازادیەکی گونجاندن هەبێت نەبێوەفایی تێدابێت‌و نەکۆیلەیەتی.

بنەماکانی جیاکاری نێوان (VERSIONE - دەقاودەق TRADUZIOE - مانایی)[٧] هیچ مانایەکیتر ناگەیەنن، ئەوەنەبێت کەبنەمای جیاکاری نێوان وەرگێڕانی حەرفیی (TRADUZIONE LETTERAAIA)و وەرگێڕانی ئەدەبی (TRADUZIONE LETTERARIA)ن، ئەمەش لەسەرتای سەدەی نۆزدەهەمەوە کاری پێکراوە.

لەلایەکیترەوە ئەم بنەمایانەی جیاکاریی نێوان (دەقاودەق - مانایی). کەئینسیکلۆپێدیا هەوڵدەدات بەپێداویستی نێوفەرهەنگ پاساویبداتەوە. لەراستیدا بناغەو رەچەڵەکێکی. لەسەدا سەد مێژوویی هەیە. لەم بارەیەوە دەڵێت: ((بەرامبەر بەوەرگێڕانی ئینجیلی گریکی یان لاتینی. زاراوەی VERSIONE - دەقاودەق. دەبێ بەکاردێت؟ بەرامبەر بەبەرهەمێکی تریش کەتازە دەکرێت؟ زاراوەی (TRADUZIONE - مانایی) بەکادێت، کەواتە یەکەمیان تایبەتە بەوەرگێڕان لەزمانە کۆنەکانەوەو دووەمیان تایبەتە بەوەرگێڕان لەزمانە تازەکانەوە)). ئەمەش رای (LITTRE)یە کە لەساڵی (١٨٨١) قاموسێکی داناوەو لەبارەی وەرگێڕانەوە وتارێکی تیانووسیوە بۆ ئاڵۆزکردنی شتەکان، لەقۆناغێکیتردا، رێبازێك پەیدا دەبێت بەناوی ((بەکارهێنانی مۆدێرن))، کەلەوە دەچێت ئاوڕدانەوەیەك بێت بۆسەر لەنوێ رێکخستنەوەی پەیوەندیەکانی نێوان هەردوو زاراوەی (TRADUZIONE - VERSIONE)، کەدووەمیان بەوشێوەیە پێناسە دەکات کەکارێکی بابەتییە، زانکۆییە، پسپۆڕییە، لەکاتێکدا یەکەمیان (بەتایبەتی ئەوەندەی پەیوەندیی بەدەقە ئەدەبییەکانەوە هەبێت) ئەو شێوە وەرگێڕانەیە کەوا بەستەیە بەهەڵبژاردنی تاکە کەسی خودی وەرگێڕ خۆیەوە، لەزۆربەیکاتدا نووسەر هەر بۆخۆی لەمیاندا دەبێتە وەرگێڕی بەرهەمەکەی خۆی: نموونەش ئەوەیە کەکاتێك شایەتێك شایەتی دەدات، پێی دەڵێن (VERSIONE) کەبێگومان تاکە کەسیو خودییە ئەوکاری شایەتیدانە - بەرامبەر ئەو بەسەرهات‌و کارەساتەی بینیویەتی بەشێوازی تایبەتی خۆی.

لەبەرئەوە، چ لەفەرەنساو چ لەئیتالیا، ئەو حاڵەتە خراوەتە بەر لێکدانەوە، کەوەك دیاردەیەك لەو دوو وڵاتەدا دەرکەوتووە، دیاردەی ئەو وەرگێڕانەی خودی نووسەری بەرهەمێك بۆ بەرهەمەکەی خۆی دەکات.

ئەم کارەش وەك (وەرگێڕان) ناوزەد ناکات‌و ناوی لێدەنێت (VERSIONE). واتە ئەگەر نووسەرێکی فەرەنسی وەك (PAUL VALERY) بەرهەمێکی خۆی بکا بەئینگلیزی، نانووسێ

(وەرگێڕانی بۆ ئینگلیزی) دەنووسێت (VERSIONE)ی ئینگلیزی فلانە کتێبم.

## وەرگێڕانی مۆدێرن

کاتی ئەوەهاتووە، بەراستی لەخۆمان بپرسین، لەمرۆدا کاتێك دەڵێین (وەرگێڕان - TRADUZIONE) مەبەستمان لەچییە؟

أ) وەرگێڕانی دێڕبەدێڕ (کەلەنێوان دێڕەکانی دەقە ئەسڵیەکەدا دەنووسرێتەوە)وەیان دێڕبەدێڕ لەلاپەڕەی بەرامبەریدا (دێڕ بەرامبەر بەدێڕ). هەر دووشێوەکە. هەردەم بەوەرگێڕانی حەرفی دەناسرێ. بەتایبەتی یەکەمیان (واتە لەبۆشایی نێوان دێڕەکانی دەقە ئەسڵیەکەدا) لەدووەمیان بەحەرفیتر دەناسرێ کەدەکرێ کەمێك بەئازادتر لەقەڵەمی بدەین. هەرچەندە ملکەچی درێژیی دێڕێك یان نیوە دێڕی شیعرێکیش بێت. وەك نموونەیەك بۆ جۆرییەکەم . دەتوانین ئاماژە بۆ وەرگێڕانی (PARADISE LOST)ی میلیتۆن بکەین کەلەلایەن (LUNEAUA DE BOISJERMAIN)ەوە کراوە بەفەرەنسی. وەیان ئەوەی (کۆمێدیای خواوەندیی - DIRINA COMMEDIA)کە(MAXIME FORMANT) وەریگێڕاوە: لەکاتێکدا بۆ جۆری دووەم دەتوانین ئاماژە بە(GIORNO)ی (PIERINI پێرینی) بکەین کەبەرهەمی وەرگێڕدراوی (SEBASTIAN CAMUGLI) وەیان (کۆمێدیای خواوەندیی) وەرگێڕدراو لەلایەن (LONGNON)ەوە ((وەرگێڕانێکە کەزۆر زۆر نزیك بۆتەوە لەدەقە ئەسڵیەکە، کەدێڕ بەدێڕ بەرامبەری یەکن)).

وەیان وەرگێڕانی (ئەنتۆلۆژیای شیعری ئینگلیزی) لەئامادەکردنی (LOUIS CAZAMIAN) کە (جگە لە هەندێ حاڵەتی زۆر دەگمەن. ئیتر وەرگێڕانێکە. دێڕبەدێڕ: واتە بەرامبەر بەهەموو دێڕێکی ئینگلیزی، دێڕێکی فەرەنسی دانراوە.)) لەلایەن رەخنەگرێکی ئەدەبی وەك (PAUL VALERV) زۆر بەتوندی ئەم جۆرانەی وەرگێڕان دژایەتی دەکران و پێی دەوتن: ئامادەکردنی ئەنەتۆمی - توێکاریی -، پێی وابوو، وەرگێڕانی لەو جۆرە دەبێتە هۆی زیندە بەچاڵ کردن و ناشتنی ئەو دەقە بیانیە جوانانە. کەچی نووسەرێکی تری وەك BENEDETTO CROCE زۆر پشتگیری لێ‌دەکردن - کەپێ دەچێت زیاتر وەك وەزیری پەروەردە قسەی کردبێ نەك وەك رەخنەگرێکی ئەدەبی - چونکە لەو بارەیەوە دەڵێ: ئەم وەرگێڕانە، سادەترین و بێگەردترین ئامێری پەروەردەیی و فێرکردنن، خوێنەر دەتوانێ بەو هۆیەوە تێبگات و شیتەڵی بکات و رەگەزە پێکهێنەرەکانی لاتاشکرابێت، چونکە کورتکراوەی وشەکانی زمانە ئەسڵیەکە بەزمانە تازەکە دەخرێتە بەرچاو.

بەلام بۆدڵنیایی هەموو لایەك، گەرخۆمان بهاوینە جوانکاریی هونەریی دەقەکانەوە، ئەوا لەنەفرەت کردن و تاوانبارکردنی ئەو وەرگێڕانە زیاتر هیچیترمان پێناکرێت، چونکە لەقوتابخانەکاندا ئەو شیعرە جوانانە بەشێوەی پەخشان وەردەگێڕن، چەپ و راست کەوتونەتە قەتڵ و عامکردنی شیعرەکان؛ هەرچەندە لەراستیدا بەبێ‌وەرگێڕانی دەقاودەقی ئەو شیعرانە بەشێوەی پەخشان ناتوانین فێری خوێندنەوەی بەرهەمەکانی شاعیرانی گەورەی وەکو (ORAZIO)و(PINDARO) ببین: بەپێچەوانەوە زۆرباشە کەناوبەناو فێربین چۆن لەشاعیرە میللیەکانمان تێبگەین. بۆ نموونە هەندێ لەشاعیرانی سەدەی سیانزەهەممان وەیان تەنانەت شاعیرانی وەکو (FOSCOLO)و (LEOPARDI)و (CARDUCCI). ئەمانە بەبێ ئەو شێوە وەرگێڕانە. مەحاڵە لێیان تێبگەین - . وەرگێڕانی دەقاودەقی ئەو بەرهەمانە - یان بەشێوەی پەخشان یان لاسایی‌کردنەوەی کێش و قافیەکانیان - پێویستە هەمیشە بەبەراورد لەگەڵ دەقە ئەسڵیەکاندا ئەنجام) بدرێن.

ب) وەرگێڕانی حەرفیی (یان بابڵێین وشە بەوشە). ئەو وەرگێڕانەیە کەلەکۆندا کراوە

لەلایەن وەرگێڕەکانی نووسین و ڕێنووسەوە (ئەمانە پەنایان بردووە بۆ وەرگێڕانی حەرفیی نەك لەبەر پاراستنی لایەنی هونەریی و دارشتنی تایبەتمەندانەی دەقەکان. بگرە لەبەر پێداویستی تیۆلۆژی و ئاینی)، وەیان جگە لەمانە ئەو کەسانەی لەبواری ئینسیکلۆپێدیادا کاریان کردووە، یان تەنانەت یەکێکی وەکو (BENEDETTO CROCE)، ئەمانەش هەر ئەم شێوە وەرگێڕانەیان بەپێی پێویست بەباش زانیوە. بەلاّم لەم پرۆژەیەی ئێمەدا، توێژینەوەو لێکدانەوەی ئەو شێوازە کۆنانەی وەرگێڕان جێگایان نابێتەوە.

ج) وەرگێڕانی مۆدێرن: بەمانای تەواوەتی خۆیەوە. لەنموونە هەرە باشەکانیدا ئەم جۆرەی وەرگێڕان، دەرئەنجامی سەرتاپا ئەزموونی رابوردووە لەم بوارەدا: ئەم جۆرە دەیەوێ هێندەی دەتوانێ ـ ڕێز لەزمانە بیانیەکە بگرێت. لەوشە بەوشەی. لەسەرجەم دارشتنی تایبەتمەندی وەلەهەموو شێوەو شێوازی تایبەتی زمانەکە. لەگەلّ ئەوەشدا زۆر بەبایەخەوە دەڕوانێتە پاراستنی تایبەتمەندێتی زمانە تازەکەو بەم شێوەیە لەهەمان کاتدا ڕێز لەرۆحی زمانە ئەسلّیەکە دەگرێت و ئاگای تەواویشی لەزمانە تازەکەیە: هەموو ئەمەشا بەهێشتنەوەی وەفایەکی زۆر بۆ دەقە ئەسلّیەکە. کەنابێت لێی کەمو زیادبکات و نابێت هیچی لێبگۆڕێت...

### وەرگێڕان وەکو (METAFORA . مجاز)

ئەمڕۆ کەوەرگێڕان بۆتە بابەتی توێژینەوەی زانستی توندو تۆلّ لەلایەن هەموو پیاوانی لۆژیك و ماتماتیك و زمانەوان و ئەوانەش کەدەیانەوێ کاری وەرگێڕان چکۆلّە بکەنەوە بۆ زنجیرەیەك مامەلّەی ئۆتۆماتیکی. پێناچێت کارێکی بێکەلّك بێت. ئەگەر بەئەوپەڕی وردەکارییەوە (وەرگێڕان TRADURE-) پێناسەبکەین بەهەموو بەکارهێنانە (مجاز)یەکانیەوە ـ ئاساییە. کەهیچ کەسێك بیر لەبەراوردکردنی زانستیانەی وەرگێڕانی تەواوەتی (مەبەست لەگەڕانە بەدوای نهێنیەکانی هونەری وەرگێڕاندا) ناکاتەوە لەگەلّ ئەو کارەی کەئەنجام دەدرێت لەلایەن ئەکتەرێکەوەو پێی دەوترێت: ئەم ئەکتەرە زۆر بەجوانی نمایشی یان تەرجەمەی هونەریی (شالیر)ی شکسپیر دەکات. وەیان لەگەلّ ئەو هونەرمەندە مۆسیقیەیدا کەپێی دەلّێن: پیانۆژەنێکی زۆرچاکەو نمایشی یان تەرجمەیەکی بەوەفای بتهۆڤن دەکات. (لێرە مەبەست لەبەکارهێنانی وشەکانە لەنێوان ـ نمایش ـ و ـ تەرجەمەی هونەریی ـدا ـ وەرگێڕ) بەلاّم لەم سالانەی دوایدا چەند توێژەرەوەیەك هەولّیانداوە کەکاری وەرگێڕانی بەرهەمێك لەزمانێکەوە بۆ زمانێکی دیکە بەراوردبکەن لەگەلّ ئەو بوارانەی تر کەزمان بەهەمان شێوە وشەی (TRADURRE ـ وەرگێڕان) تیایدا بەکار دەهێنێ. لەوانەیە، بەبێ (مجاز) بتوانین بلّێین، ئامێرێکی (ستینۆگراف ـ بروسکە) کاتێ بەزمانێکی ئاسایی نامەیەکی دەدەینێ دەبێت نامەکان (وەربگێڕین) بۆ چەندین سیمبۆلی بروسکەیی، یان کارمەندێکی تێلێگراف کاتێك نامەیەك یان نووسراوێکی دەدەینێ (وەریدەگێڕێتە) سەرچەندین (مۆرس)ی تایبەت بەتەلەگراف. یان دەقێکی ئاسایی کە(وەریدەگێڕینە) سەرنووسینی تایبەت بەکوێرەکان (بەرجەستە). ئەمانە هەموو وشەی (وەرگێڕان) یان بۆ بەکاردەهێنین، تەنانەت (آلە الحاسبة)ش هەر وەرگێڕانی ئەو ژمارانەیە بۆچەندین کاری جەبریی. ئایا ئەمانە هەموو پێکەوە دەتوانن ڕووناکی بخەنە سەر میکانیزمی قوولّی کاری وەرگێڕان؟

سەرەڕای ئەو هەموو توێژینەوەو لێکدانەوانەی کەتا ئێستا ئەنجام دراون[8] بەلاّم ناچارین لەوەلاّمی ئەو پرسیارەدا بلّێین.. نەخێر. لەبەرئەوەی هەموو ئەو کارانەی لای سەرەوە هەرئەوەندە پەیوەندیان بەکاری (وەرگێڕان)ەوە

هەیە. کەهەمان کرداریان بۆ بەکاردەهێنین وەك شکلی کرداری (وەرگێڕان). بەلام لەراستیدا هەرهەموویان کۆمەڵە کارێکن زۆر زۆر جیاوازن لەکاری وەرگێڕان.

أ) گۆڕینی فۆرمی وتارێکی گوتراو، بۆ وتارێکی نووسراو، بەم کارە دەوترێ TRASCRIZIONE [9] - یان وتارێکی گوتراو بەشێوە زمانێکی تایبەتی ناوچەیەك کەنانووسرێتەوە. کاتێ دەکرێت بەنووسین لەلایەن توێژەرەوەیەکی زمانەوانیەوە. بەمەش هەرهەمان شت دەوترێ. گەرچی راستتر وایە بەم حاڵەتانە بڵێین تێبینگەرایی NOTAZIONE - . کەئەسڵە لاتینیەکەی - SCRIPTIO - یە. چونکە بەراستی خەریکە زاراوەی - TRASCRIZIONE - دەگاتە ئەومانا پڕ لەخەیاڵو ئەفسانەیەی کەدەتوانێ نووسراوێك بگوێزرێتەوە بۆ شێوە نووسراوێکی تر. کەلەسەدا سەد ئەم بۆچوونە گەلێك جیاواز و دوورە لەمانای راستەقینەی خۆی.

ب) کاتێك وتارێکی نووسراو لەرێنووسێکەوە بگوێزرێتەوە بۆ رێنووسێکی دیکە. لەراستیدا ئەمەش حاڵەتێکی دیکەی جیاوازە، یاساو رێساکانی بەتەواوەتی جیاوازن. ئەگەر بەشێوەیەکی گشتی بەهەموو نووسراوێك بڵێین سیستەمێکی (جفرە) ئەوا ئەم کارە: گۆڕینی جفرەیەکە بۆ جفرەیەکیتر. بۆنموونە گۆڕینی دەقێکی فەرەنسی لەنووسینی ئاساییەوە، بۆ نووسینی بروسکەیی (ستینۆگراف)(وەك دەزانن ستینگراف حساب بۆ ORTOGRAFIA - ئیملا)ی شێوە وتنی تایبەتی فەرەنسی دەکاتو: راستەوخۆ دەنگە فەرەنسیەکان وێنە ناکرێت بەسیمبۆلەکانی ستینۆگراف. بەلام ئاشکرایە بۆ کاری بروسکەیی بەر لەهەموو شتێ دەبێ بزانین بنووسین). نموونەیەکی تر: گوێزانەوەی دەقێکی ئیتالی لەزمانی ئاساییەوە بۆ زمانی (مۆرس - MORS (تایبەت بەتەلەگراف) یان گۆڕینی بۆ شێوە رێنووسی بەرجەستەکراو (تایبەت بەکوێرەکان). یان بۆ سیمبۆلی تایبەتی (کریتۆگراف) (بۆ نموونە أ=١؟ ب=٢؟ ج=٣... هتد). هەموو ئەم کارانە پێیان دەوترێ - TRANLITTERAZIONI [10] ئەمەش مانای گۆڕینی نووسراوێکە لەرێنوسێکەوە بۆ رێنوسێکیدیکە (پیت بە پیت): بۆ نموونە گۆڕینی (پیت بەپیت)ی ووشەیەکی رووسی وەکو "CMOBAPG" واتە: قاموس؟ بەئەلفوبێی لاتینی دەبێتە (SLOVAR). ئەم گۆڕانکاریانەی جفرە؟ دەبنە جۆرێك لە - TRANSLITTERAZIONO - ئەگەر لە (ئەلفوبێ)یەکەوە بگوێزرێتەوە بۆ (ئەلفوبێ) یەکیتر. بەلام لە(پیت)ەکانەوە دەپەڕنەوە بۆ (برگە - SILABA)کان. واتە وێنەکردنی دەنگەکان برگە بەبرگە بەئەلفو بێیەکی تر. هەرهەموو ئەم کارانە (واتە گۆڕینی نووسراوێك لەزمانێکی ئاسایی نووسراوەوە بۆ ستێنۆگراف؟ یان بۆ شێوەی نووسینی کوێرەکان؟ یان بۆ ئەفوبێی - جفرە - کریتۆگراف... هتد) بەتەواوەتی جیاوازن لەکاری وەرگێڕان - TRADUZIONE: هەرهەموویان کۆمەڵە کارێکن، جێبەجێ دەکرێنو زۆر بەسادەیی لەشێوەی وشەی گوتراوەوە دەگۆڕێن بۆ وشەی نووسراو، بەلام بەهیچ شێوەیەك پەیوەندەی بەمانای ئەو وشانەوە نییە. بەهەرحاڵ، کارگێڕی ئامێری ستینۆگراف، ئەو کەسەی کەوتارێکی نووسراو - TRANSLITTARE - لەرووی (ئەلفوبێ)وە دەگۆڕێ بۆ سیستەمێکی (جفرە) یان (مۆرس) یان (بەرجەستەکراو - BRAILLE). یان ئەو کەسەی کەنووسراوێك دەکاتە کۆمەڵێ (جفرە)ی تایبەت بەئامێری (CRITTOGRAF - کریتۆگراف)، تەنانەت ئەو کەسە شارەزاو پسپۆرەش کە(زاراوە)یەکی قسەپێکراو دەگۆڕێ بۆ زمانێکی نووسراو، دەتوانن زۆر بەچاکی کاری خۆیان ئەنجام بدەن، بێئەوەی لەیەك وشەی ئەو وتارەی کەرێنووسەکەی دەگۆڕن بۆ رێنووسێکیتر تێبگەن! (بێگومان مەبەستمان لەگۆڕینی دەقێك نییە لەزمانێکی

ئاسـاييەوە بـۆ زمـانێكىتر)، لـەكاتێكدا كـارى (وەرگـێڕ ـ TRADUTTORE) ئەوەيـە كـەدەبێت لەسەرجەم مانـاىو وشـەكانى زمانـە ئەسـڵيەكە تێبگات، بۆ ئـەوەى بـەچاكى وەريبگێڕێتـە سـەر ئـەو زمانـە تازەيـەى كەدەيـەوێت: كـەبێ گومـان ناتوانێ بەبێ تێگەيشتن (ترجمە)بكات.

كەواتە، سـەرجەم ئـەو هەوڵانـەى بەبـەردەوام دراون بۆ داماڵينى نهێنى كارى وەرگێڕان، بەهۆى بەراوردكردنيەوە بە(گۆڕينى گوتراو بـۆ نووسـراو، گۆڕينـى ڕێنـووس، گۆڕينـى زمـانێكى ئاسـايى بـۆ سيستەمێكى (جفرە)يان(مـۆرس) يـان بەنووسـين كردنـى گوتراوێـك كەبـە(زاراوە)يـەك وتـراوە نانووسـرێ)، هەرهـەموو ئەمانـە مايـەپوچ دەمێننـەوە، چونكـە دەتوانـن تەنـها هـەندێ هاوشێوەى رووكەش لـەكارى وەرگـێڕان دابماڵن، ئەمـەش بـەهۆى بـەكارهێنانى چەند (مجـان)ێـك لەگـەڵ وشـەى (وەرگـێڕان ـ TRADURRE)[11]دا. لەبەشـى داهـاتوودا، باسـى حاڵـەتى (EMILE DE LAVENAY) دەكـەين كەزۆربـەتوندى دژى بـەكارهێنانى وشـەى (وەرگـێڕان ـ TRADURRE)، هەرجارێك كەبكاردێت بۆ باسكردنى گواستنەوەى نووسـراوێك لەسيسـتەمێكى سـيمبۆليەوە بـۆ سيسـتەمێكىتر هـەروەكو ئـەو توێژەرەوەيـە دەڵێت: وشـەى وەرگـێڕان تەنـها بـۆ ئـەو كـارەى بـەكاردێنن كەگفتوگۆيـەك لـەزمانێكى (ئاسايى)يەوە دەگۆڕێتە سەر زمانێكىتر[12].

پەراوێز/

*/كتێبـى(تيـۆر و مێـژووى وەرگـێڕان ـTEORIA E STORIA DELLA TRADUZIONE) بەرهـەمێكى گەلـێ تايبەتى نووسەرى فەرەنسى (جۆرج مۆونين ـ GEARGES MOUNIN ). خـاتوو (ستێفانيە مۆرگـانتى ـ STEFANIA MORGANTI) وەريگێڕاوەتـە سـەر زمـانى ئيتـالى. ناونيشانى ئەسـڵى ئـەم كتێبـە (وەرگـێڕانو وەرگێڕەكـان ـTRADUCTIONS ET TRADUCTEURS)ە. نووسـەر بەتايبـەتى ئـەم كتێبـەى نووسيوە بـۆ زنجيرەى كتێبـى (كتێبخانەى چكۆلەى ئيناودى ـPIECOLA BIBLIOTECA EINAUDI)، كـەزنجيرە كتێبێكـى تايبەتـە بـە(فيلۆلـۆژيا، زمانـەوانى، رەخنـەى ئـەدەبى)، لەبـەر پێداويسـتى پەيمانگاو زانكۆ تايبەتەكانى زمانـەوانىو وەرگـێڕان، ئـەم كتێبە لەسالى ١٩٦٥ هەتا ١٩٨٢ پێنج جار چاپكراوەتەوە ئەم كتێبە لەپێنج بەش پێكهاتووە:ـ

يەكەم/ چەند سەرەتايەك.

دووەم/ كورتە باسێكى مێژوويى.

سێهەم/ گيروگرفتە مۆدێرنەكان.

چوارەم/ جۆرەكانى وەرگێڕان.

پێنجەم/ وەرگێڕەكان.

خوێنـەرى خۆشەويست ئاگاداردەكەينـەوە، كەئـەم كتێبـە (بـەش.. بـەش) دەكەينـە كـوردىو لـەگۆڤارى (سەردەم)دا بلاوىدەكەينـەوە، بـەو هيوايـەى لـەكۆتاييدا بكرێتە كتێبێكى سەربەخۆ.

ناونيشانى دەقەكە بەئيتالى:ـ

GEORGES MOUNIN

TEORIA E STORIA DELLA TRADUZIONE

PICCOLA BIBLIOTECA EINAUDI, 61

TORINO – 1982

پەراوێزەکان:

١- CIR. CARY E. LA TRADUZIONE NEL MONDO MODERNO. کەچەندین ژمارەی گرنگمان لەبارەی ساڵەکانی. ١٩٤٦ - ١٩٦٢ دەخاتە بەرچاو. لاپەڕە (٩٣-١٩١) (٦٠-٦٢).

٢- CAILLE P.F , CINEMA E TRADUZIONE, IN ژمارەی تایبەت بەسینەماو وەرگێڕان کە گۆڤاری (BABLE) مجلدی شەشەم ژمارە (٥) لاپەڕە ١٠٣.

٣- بڵاوکراوەکانی (یەکێتی ڕێکخراوە نێو دەوڵەتیەکان)ی برۆکسل.

٤- بۆ نموونە زاراوە رووسییەکە دەبێتە (PEREDAT).

٥- ووتارەکە لەلایەن (IAUCOURT DE)ەوە نووسراوە.

٦- نووسەری بەشی هەرەگرنگی ئەم باسە قەشەی (LA CHAPELLE)یە.

٧- زاراوەی TERANSLATION. لەوتاری تایبەت بە(VERIONE)دا لەئینسیکلۆپیدیاکەدا، زاراوەیەکە هاومانەیە بەڵام دەمێکە کاری پێناکرێت..

٨- CIR. WARREN، WEAVER،TRANSLATION WEAVER، (LOCKE)، (BOOTH)؛:-
MECHANICAL TRANSLATION OF LANGUAGE, CHAPMAN & HALL, LONDON. P. 22.
CIR, A.G. OETTINGER, AUTOMATIC LANGUAGE TRANSLATION, HARVARD UNIVERITY PRESS, CAMBRIDGE (MASS.) 1960, PP. 40 –45.

٩ - بەپێی پێناسەی - ISO - ڕێکخراوی نێودەوڵەتی ئاسانکردن (ORGANIZZAZIONE INTERNAZIONALE DI NORMALIZZAZIONE): ((TRASCRIZIONE)) واتە: گۆڕینی دەنگ (فۆنێتیک) لەڕێگەی حەرفو نیشانەکانەوە، بەشێوەیەک کەخوێنەر بتوانێ ئەو وشەبیانیە لەڕێگەی ئەو گۆڕینەوە بەجوانی و چاکی بخوێنێتەوە)).

١٠ - بەپێی پێناسەی (ISO) ((TRANSLIITTERAZIONE)) واتە: شێوەی پاک و بێگەردی مامەڵەکردن لەگەڵ نووسراوێکدا: دەقێکی (ترانزسلیتێر) کراو، هەمان شتە وەک دەقە ئەسڵیەکە، لەبەرئەوەی هیچ کەسێك کەئەو زمانە نەزانێ، ناتوانێ فۆنەتیکی بکات، لەبەر ئەوە ترانزسلیتێر دەکرێ. ئەم کارە تەنها کار ئاسانیەکە بۆ تێگەیشتن)). (وەك - مسجد - MASJID یان مدرسە - MADRASA... هتد - وەرگێڕ)

١١- DELAVENAY, EMILE, LA MACHINE A TRADUIRE, PUF, PARIS 1959, P.13.

١٢- بۆ گفتوگۆیەکی تێرو تەسەلتر لەم بارەیەوە، گەڵێ گرنگە لەتیئۆری (نیشانەکان)دا یان (سیمیۆلۆژیا) زیاتر سەرنج بدەین:-
(هتد.... CFR. OETTINGER, A.G.).
٢- (BULLETIN DE IA SOIETE DE) LINGUISTIQUE

# لەئەدەبی گەلانەوە


کوندێرا


مارکیز


میشیما


سەید عەلی ساڵحی


بیژەنی جەلالی

■ چیرۆک :

١/ زێڕینە سێویک بۆ ئارەزوویەکی نەمر

٢/ ئیزابیل لەگێژەنی گەرداودا

٣/ ئەوینی نیشتمان

■ شیعر:

قەسیدەیەکی درێژی (سەید عەلی ساڵحی)

چەند شیعرێکی (بیژەنی جەلالی)

# دوو چیرۆک
# لەچیکەوە بۆ کۆلۆمبیا

یەکەم: زێڕینە سێوێك بۆ ئارەزوویەکی نەمر ـ میلان کۆندێرا

دووەم: ئیزابیل لەگێژەنی گەرداودا ـ گابریل گارسییا مارکیز

شێرکۆ بێکەس

لەعەرەبی‌یەوە کردوونی بەکوردی

## ١/ زێڕینە سێوێك بۆ ئارەزوویەکی نەمر

**مارتن**

ئەو نیشانەی بە مارتن ئەکرێن من بۆ خۆم لە ئاستیاندا دەستەوەستانم. ئەو ئەتوانێ لەسەر هەر جادەیەك و هەر ژنێکی مەبەست بێ خۆی لێیان نزیك بکاتەوە. ئەبێ ددان بەوەیشدا بنێم. لەو وەختەوە ناسیومە (لە دەمێ ساڵەوە). سوودێکی زۆرم لەو سەرچڵی و وریاییەی بینیوە. چونکە ئەو چەند شێت و شبری ژنانە منیش ئەوەندە. بەڵام ئەوەی راستیی بێ من ئەو رووقایمی و سەرچڵی‌یەی ئەوم تێدا نی‌یە.

مارتن لەوەیشدا بەهەڵەدا چووە کە ئەم پڕکێشی وخۆنزیکردنەوەیەی لە ژنان کردووە بەجۆرە تاقیکردنەوەیەك بۆ سەرچڵیی و هەر ئەوەندەیش نا بەڵکوو کردوویەتی بە ئامانجیش و

تەنانەت بە منەتێکەوە خۆی بەو یاریزانی فتبۆڵە دڵ فراوان و بەخشندەیە بەراورد ئەکات، کە لە تیپەکەی خۆیداو لەوەختی یاریکردندا. پشت بەستوو بە لێزانی خۆی و بە بڕواوە ئەتوانێ بەردەوام پاسی مسۆگەر بدا بە هاوەڵەکانی و ئیتر ئەوانیش بە ئاسانی گۆڵی خۆیان بکەن.

عەسری دوو شەممە، دوای تەواو بوونی کاری ڕۆژانەم لە یەکێك لەو چایخانانەی کە ئەکەوێتە گۆڕەپانی ((سان فنسیلاس)) چاوەڕێی ((مارتن))م ئەکرد. دانیشتبووم و لەناو خوێندنەوەی کتێبێکی ئەڵەمانیدا غەرقبوو بووم. کتێبەکە لە بارەی کولتووری کۆنی گەلی ((ئاتروسك)) هوە نوسرابوو. چەند مانگێك بوو، چاوەڕێی گەیشتنی ئەم کتێبە بووم تا لە کتێبخانەکەی زانستگا وەریبگرم. ئەمە دوای ئەوەی ئەوانیش لە ئەڵەمانیاوە بۆیان قەرز کردبووم. ئەوەتا وا ئەمڕۆ گەیشتۆتە دەستم و منیش بەوپەڕی حەزو ئاگالێبوونەوە هێناومە بۆ ئێرە. لە ناخی خۆیشمدا گەلێ بەختیارم بەوەی لێرەو لەسەر مێزی ئەم چایخانەیە چاو بەلاپەڕەکانیدا ئەخشێنم و لە چاوەڕوانی ((مارتن)) یشدا ناهێڵێ بێ تاقەت بم. خوێندنەوەی کتێبێ کە لە دەمێکەوە ئاواتەخوازی گەیشتنی بووم.

ئەو کاتەی خەونیش بەم کولتوورە کۆنانەوە ببینم ئیتر یەکسەر هەستێکی پڕ لە تاسەو شەوق بەرامبەر رابوردوو دامئەگرێ. حەزو شەوق و بێگومان بیرکردنەوەیش لەبارەی ڕەوتی هێواش و دلگیری مێژووی ئەو قۆناغانەوە، کولتووری کۆنی میسریی هەزاران ساڵ تەمەنی بووە. چاخەکانی کۆنی گریکیش لە هەزار ساڵ زیاتر بەردەوام بووە. لەم ڕووەوە ژیانی مرۆڤایەتی لە مێژوو ئەچێت، چونکە یەکەم جار بەشێوەیەکی لەسەرخۆو بێجووڵە بزر ئەبێ و ئیتر ئەوەندە نابات وردە وردە ئەکەوێتە خۆو تیژ تێئەپەڕێ. دوو مانگیش لەمەوبەر ((مارتن)) لە چل ساڵی تێپەڕاند.

## **سەرەتای سەرچڵیی**

ئەو بوو گەیشتو لە خەیاڵ و بیرکردنەوەی کردم. کوتوپڕ لە ڕاڕەوی شووشەبەندکراوی باری ئاب جۆکەوە دەرکەوت و بەرەو رووم هات و بەسەرو دەست ئاماژەی بۆ کچێك ئەکرد کە لەولاترەوە بە تەنیا لەسەر مێزێك دانیشتبوو، فنجانێ قاوەیشی لەبەردەمدابوو. لەتەنیشتمەوە دانیشت و بەلام چاوێکیشی هەر لە کچە بوو.

لێی پرسیم ((ها .. چۆنە؟)).

هەستم بەجۆرە شەرمێك کرد: ئا .. وایە!. بەلام من لەبەرئەوەی لەناو خوێندنەوەی کتێبەکەدا نوقم بوو بووم. ئاگام لە هاتنی ئەو کچە نەبوو. ئەوەی ڕاستیش بێ جوان بوو.

لەو ساتەدا کچەکە هەر لەسەر کورسیەکەی خۆی تۆزێ خۆی گورجکردەوە ئەوسا بانگێکی لە خاوەن چایخانەکە کرد کە کەرەویتەیەکی رەشی بەستبوو، بۆ ئەوەی حسابەکەی بداو بڕوات.

دەمو دەست ((مارتن)) یش ئەمری بەسەرمندا کردوو وتی: ((دەی تۆیش حسابەکەت بدە!))

ئەبوایە جادە بەجادە دوای کەوین. بەلام خۆشبەختانە لایداو لەبەردەم ژووری جل و بەرگەکاندا وەستا. لەوێ جانتایەکی دەستیی دانابوو. ژنە کارمەندەکە چوو بۆی بێنێ و کە هاتەوە خستیە بەردەمی. کچەکە دەستی بردوو هەندێ وردەپارەی دایە. هەر لەوساتەدا، ((مارتن)) کتێبە ئەستوورە ئەڵەمانیەکەی لێسەندم و هەر بەهەمان دەستووری ئەمرکردن وتی: ((با ئەمە بخەینە ئێرەوە)). ئینجا بە هێواشیی دەستی بردوو کتێبەکەی خستە ناو جانتای کچەکەوە، کچەیش وەك ئەبلەق بووبێ نەی ئەزانی بلێ چی.

((مارتن)) لەسەر قسەکردنی خۆی ڕۆیشت و رووی دەمیشی لە کیژەکە بوو ((هەڵگرتنی

جانتایەکی وا قورس بۆ تۆ کارێکی ئاسان نییە))
ئەوسا گلەیشی لەمن کرد کە چۆن ئەبێ ئاوا بێدەربەست بم. چونکە لەوساتەدا کچەکە ئەیویست جانتاکە هەڵبگرێ.

ئەم کیژە لە ئەخۆشخانەی ناوچەیەکدا کاری سیستەریی ئەکرد. بەسەردانێك هاتووە بۆ ((بوراگ)) و ئێستەیش پەلەیەتی بگاتە تەرمینالی پاسە گەورەکان. ئێمەیش بۆ ئەوەی بە چاکی بیناسین ئەبوو تا وێستگەی شەمەندەفەرە کارەباییەکە لەتەکیا بڕۆینو ئەوسا لەگەڵیا رێ بکەوین بۆئەوەی شەممەی داهاتوو بچین بۆ شاری ((ب)) لەوێ ئەم کیژۆڵە جوانە بەسەر بکەینەوە. کە بێگومان هەر ئەبێ هاوڕێی جوانو نازداری چون خۆی هەبێت، هەر وەکوو ((مارتن)) بیری لێ ئەکردەوەو ئەوخەیاڵەی خۆیشی بە جوانترین قسە ئەرازاندەوە.

شەمەندەفەرەکارەباییەکە هێواش هێواش گەیشتو کیژۆڵەکەیش جانتاکەی خۆی لە دەست وەرگرتینو ئینجا ویستی کتێبەکەی لێدەر بێنێ،بەڵام ((مارتن)) دەم بە خەندەو بە نەزاکەتەوە نەیهێشتو داوای لێکرد کە چی تێدایەو گرنگ نییە با لەلای بێو بیخوێنێتەوەو رۆژی شەممەی داهاتوو بمانداتەوە.

کیژەکە پێکەنیو بەڵام دیار بوو بێزاریشەو ئەوسا سەرکەوتە سەرەوەو چووە ناو واگۆنەکەوەو ئێمەیش لەلای خۆمانەوە بەدەم زەردەخەنە گرتنو دەست هەڵبڕینەوە ماڵئاواییمان لێکرد.

نەمتوانی هیچ شتێك بکەم. ئەو کتێبەی لەدەمێکەوە چاوەڕێو تامەزرۆی بووم وا لەناکاو لێم دوورکەوتەوەو لەوانەیشە ئیتر نەیبینمەوە. من ئەگەر بێتووڕەبوونو بە خوێن ساردیشەوە لەم کارە وردبمەوە، ئەزانم کارێکی هەر تەواو ناجۆرو وەڕسکەرە. بەڵام من نازانم کام جۆرە شێتگیرییەك بوو وا بە خێرایی خستمیە سەر باڵە کراوەکانی خۆی، کەچی ((مارتن)) بێئەوەی زەڕەیەك چییە خۆی لێل بکات یان تۆزقاڵێ وەختی خۆی بەفیڕۆ بدات، هەر لەو ساتەدا بیری لەوە ئەکردەوەو بەشوێن ئەو بروبیانوانەدا ئەگەڕا بیاندۆزێتەوە تا ژنەکەی پێ قایل بکات وەختێ رۆژی شەممەی داهاتوو شەوی یەك شەممە لەماڵ نابێت. (مارتن ژنێکی جوانی هەبوو، سەیر ئەوە بوو زۆریشی خۆش ئەویست، لەمەیش سەیرتر ئەوەبوو لێشی ئەترسا لە مانەیش سەیرترو سەیرتر ئەوەبوو دڵیشی لێی پیس بوو).

## سەرو سۆراخێکی سەرکەوتوو

ئۆتۆمبێلێکی فیاتی جوانم بۆ ئەم سەفەرەمان بەکرێ گرت. سەعات دووی نیوەڕۆی رۆژی شەممە چووم بۆ ماڵەوە بەشوێن ((مارتن)) دا. وەختێ گەیشتم چاوەڕێی ئەکردم. هەڵمگرتو تێمان تەقاند. مانگ مانگی تەموزو قرچەی گەرمایش بوو. ئەمانویست بەزووترین کات بگەینە شاری ((ب)) بەڵام ئەو کاتەی بە گوندێکی سەرەڕێدا رەت ئەبووین، دوو کچی گەنجی سەروقژ تەڕمان بە پانتۆڵی کورتی ریازەوە بەدیکرد. دەمو دەست ئۆتۆمبێلەکەم راگرت گۆمەکەیش دوور نەبوو کەوتبووە پشت ماڵەکانەوە. سەرەڕای ئەوەی خۆیشم پێویستم بەوەبوو لەشم فێنك کەمەوەو ((مارتن)) یش بەمە رازیی بوو.

جلەکانمان گۆڕیو دەرپێی مەلەکردنمان لەپێکردوو خۆمان هەڵدایە ناو گۆمەکەوە. من بە ماوەیەکی کورتو کەم خایەن پەڕیمەوە ئەوبەری گۆمەکە. بەڵام ((مارتن)) پشیلەشۆر خۆی تەڕکردوو هەر ئەوەندەو چووە دەرەوە. ئەوکاتەی بە روکاری پێچەوانەدا گەیشتمەوە کەنار. تەماشام کرد ((مارتن)) لە خەیاڵێکی قوڵدایە. لەولایشەوە کۆمەڵێ منداڵە ورتکە لە تەنکە بواری گۆمەکەدا خەریکی شەڕە ئاوو گەمەکردنن. بەولا تریشەوە دەستەیەك هەرزەکار خەریکی تۆپ تۆپێنن.

بەڵام سەرنجی ((مارتن)) ڕێك و ڕێك بەلەشی توندو تورتی کچێکی جوانەوە نووسابوو. کچەکە بە دووریی پانزەمەترێك و پشت لەئێمە ڕاوەستابوو چاویشی بڕیبووە پانتایی گۆمەکە.

((مارتن)) پێی وتم: تەماشا!

- ئەزانم.
- ئەڵێی چی؟!
- ئەتەوێ چی بڵێم؟!
- ئەی بۆچی نازانی ئەبێ چی بڵێی؟!
- ئەبێ چاوەڕێ بین .. تا وەرئەگەڕێ و ڕوومان تێ ئەکات.
- من پێویستم بەوە نییە چاوەڕوان بم تا وەر ئەگەڕێ و ڕوومان تێ ئەکات .. ئەوەی لە منەوە دیارە بەسەو هەموو شتێکە!
- ڕازیم. بەڵام درەنگەو وەختیش نەماوە..

((مارتن)) وەڵامی دایەوە ((بۆ تاقیبکردن .. بۆ سۆراخ کردن)). ئەوسا ڕوویکردە مێرد منداڵێ کە پانتۆڵێکی کورتی ڕیازەی لەپێدابوو ((کوڕە بچکۆل! بە یارمەتی خۆت.. ئەزانی ناوی ئا ئەو کچە چییە؟!)) بە پەنجە ئاماژەی بۆ کرد. کچەیش جۆری ڕاوەستانەکەی خۆی چۆن بوو تێکی نەدابوو. لە شوێنی خۆیدا چەقی بوو.

- ئەو کچە ئەڵێیت؟!
- بەڵێ .. ئەو..

مێرد منداڵەکە وتی: خەڵکی ئێرە نییە

ئینجا ((مارتن)) ڕوویکردە کیژۆڵەیەك کە تەمەنی هەر لە دەوروبەری دوانزە ساڵدا ئەبوو. لەوڵامانەوە خۆی لەبەر هەتاو هەڵخستبوو. ((کچە جوانەکە! ئا ئەو کچە ئەناسیت کە لە گوێ ئاوەکە ڕاوەستاوە)).

کیژۆڵەکە ترساو هەستایە سەرپێ و وتی:

- ئەو کچە ئەڵێی! .. ئەوە؟!
- بەڵێ.
- ئەوە ماریە.. ناوی ماریە.
- ئەی ناوی خانەوادەکەی؟!
- ماری بانێك .. خەڵکی شاری بوزدرانی!

تا ئەو کاتەیش کچەکە هەر پشتی تێکردبووین و لە ڕۆخی گۆمەکەدا وەستابوو. ئینجا دانەوێوەو کڵاوی حەمامەکەی هەڵگرت و سەروقژی پێ داپۆشی. لەوساتەدا. ((مارتن)) هاتبووە لامەوە. ((ناوی _ ماری بانیك)) ە و خەڵکی بوزدرانییە .. با بڕۆین! ((مارتن)) بێدەنگ و هێور بوو. بە ڕواڵەت وای نیشان ئەدا بیر لە هیچ ناکاتەوە جگە لە سەفەرەکەمان!.

## کەمێك لە بیردۆزیی

((مارتن)) ئەمەی ناو ناوە ((تاقیب و سۆراخکردن)). لە ئەنجامی ئەزموونی زۆرو دوورودرێژی خۆیەوە گەیشتبووە ئەو ئاکامەی، بۆ کەسانێ کە مەرام و خۆزگەو داخوازییان زۆرە گرانترین شت ئەوەیە لەوە بگەن: مەسەلەکە بەتەنها هەر ئیغراکردنی کچێکی هەرزەکار نییەو بەس، بەڵکوو لێرەدا گرنگ ئەوەیە چۆن ئەو کچانە کەمەندکێش بکەین کە هێشتا تووشمان نەبوون و ڕامانەکێشاون. کەواتە ئەو باس لەوە ئەکات پێویستە بەردەوام و بێ پسانەوەو لە هەمووکات و شوێن و بارودۆخێکداو بەشوێن ژنانەوە لە سۆراخکردنێکی تولانیی و هەمیشەییدا بین. یان بە واتەیەکی تر . لەناو دەفتەرێکی بچکۆلانەی بەرباخەڵدا یان لە بیرو خەیاڵی خۆماندا، ناوی ئەو ژنانە بنووسین، کە حەزمان لێکردوون و لەوانەیشە بتوانین ڕۆژێك لە ڕۆژان خۆمانیان لێ نزیك بکەینەوە.

((خۆ نزیك کردنەوە)) بریتییە لە پلەیەکی بەرزی چالاکی و بزوتن یان ئەوە ئەگەیەنێ کە ئێمە ئەتوانین جۆرە پەیوەندییەك لەگەڵ ئەم خاتوون یان ئەو خانمەدا دروست بکەین و بیانناسین و بە ئاسانی دەستمان بیانگاتێ.

ئەوانەی بە فیزێکەوە ئاوڕ لە ڕابوردو ئەدەنەوە کەسانێکن هەمیشە باس لە ژمارەی ئەو ژنانە ئەکەن کە گیرۆدەو کەمەندکێشیان کردوون. بەڵام ئەوانەی ئەیانەوێ ڕوو لە

سبەینێو ئاینده بکەن، پێویستە بەر لە هەموو شت، بایەخ بدەن بەوەی ((لە ڕێی سۆراخکردنو)) و ((خۆ لێنزیک کردنەوەوە)) زۆرترین ژمارەی ئافرەت بناسن.

لە پشت ((خۆ لێ نزیك کردنەوەوە)) هیچ شتێ نییە جگە لە یەك حاڵەتی سەرەتاو کۆتایی نەبێ. بۆ ئەوەی ((مارتن)) یش رازی بکەم، حەز ئەکەم ، لەم بارەیەوە پێ لەسەر ئەوە دابگرم. ئەوانەی بە تەنها ئەڕواننە دوا نیازو دوا مەبەست پیاوانێکن بەسزمانو لە پلەوپایەشدا وان لە خوار هەمووانەوە. ئەم جۆرە پیاوانە ئەو یاریزانە لادێیانەمان بیرئەخەنەوە، وەختێ هێرش ئەبەنە سەر گۆڵی بەرامبەریان هەر مل ئەنێنو نازانن بە تەنها ئەوە بەس نییە شێلگیرانە ئابلۆوقەی دژەکانیان بدەنو گۆڵێك یان چەند گۆڵێك تۆمار بکەن. بەڵکوو پێویستە بەر لە هەموو شت. لە عەردی یاریگادا یارییەکی شەریفانەو ڕێكو پێك بکەن.

دوای ئەوەی دەستمان کردەوە بەلێخوڕین. بەدەم ڕێگاوە لە ((مارتن)) م پرسی: ئایا لەو بڕوایەدای ڕۆژێ لەڕۆژان دەرفەتێکی وات بۆ بڕەخسێ تابەنیازی بینینی ماری سەفەرێکی بوزدرانی بکەیت؟.

وەڵامی دایەوە: خوا ئەزانێ.

دوای ئەوە منیش هەڵمدایەو وتم:

ئەمڕۆمان باش لێ ئەڕوات!

## گەمەو پێداویستی

بە میزاجێکی باشەوە گەیشتینە بەردەمی خەستەخانەی ((ب)). سەعات نزیکی سێو نیو بوو، لە کابینەی بەر دەرگاکەوە، بەتەلەفۆن قسەمان لەگەڵ سیستەرەکەماندا کرد. دوای قەیرێك هاتە خوارەوە. کڵاوی سیستەری لەسەرداو کراسێکی سپیشی لەبەردا بوو. کە تەماشام کرد. لەشەرماندا سوور هەڵگەڕابوو. من ئەمەم بۆ خۆمان بە بەختێکی باش لەقەڵەمدا.

((مارتن)) دەستو برد کەوتە قسەو، کچەکەیش ئەوەی پێ ڕاگەیاندین، سەعات حەوتی سەر لە ئێوارە ئیشی تەواو ئەبێو داوای ئەوەی لێکردین لە هەمان سەعاتدا، لەبەردەم دەروازەی خەستەخانەکەدا چاوەڕێی بکەین.

((مارتن)) لێی پرسیی: قسەت لەگەڵ هاوڕێیەکەتدا کرد؟!

کچەکە بەسەر وەڵامی دایەوەو .. ئینجا وتی:

- ئەبین بە دووان.

((مارتن)) وتی: زۆر چاکە. بەڵام ئاخر من ناتوانم هەر بە قسەیەك هاوڕێکەم دڵنیا بکەم

کچەکە وەڵامی دایەوە:

- باشە. ئەتوانین بچین بیبینین. ئەو ئێستە لە بەشی نەشتەرگەریکار ئەکات.

بە کاوخۆ حەوشەی خەستەخانەکەی ئەبڕی. بەشەرمێکەوە لێم پرسی: ((کتێبەکەت هەر لەلا ماوە؟!))

سیستەرەکە بەسەر جوڵاندنی دڵنیای کردم. کەواتە تا ئێستەیش کتێبەکە هەر لەلای خۆیەتی. لەوساتەدا هەستم بەوە کرد خەمێکی گەورەو گرانم لەکۆڵ بۆوە. ئیتر منیش پەرۆش گیرانە داوای ئەوەم لێکرد کە هەر ئێستە بڕوات کتێبەکەم بۆ بێنێتەوە.

بێگومان ئەم داواکردنەوەی کتێبە بەلای ((مارتن)) ەوە کارێکی نەشیاو بوو کەمن کردم. واتە چۆن ئەبێ من فەزڵی کتێبێ بدەم بەسەر ژنێکدا کە سیستەرەکە ئەیهێنێتو پێشکەشی منی ئەکات. بەڵام ئەوەی ڕاستی بێ ئەمەیان لە دەسەڵاتی خۆمدا نەبوو.ئەو چەند ڕۆژەیش کە کتێبی ناوبراو دەربارەی کۆنە کولتووری ئەتروسکیم لێ دوورکەوتبۆوە هەر تەواو نیگەرانو پەرێشان بووم. بەڵام من هەوڵم داو ددانم بەخۆمدا گرت هەرچۆنێك بێ تووڕە نەبمو سەفەرەکە تێك نەدەم. ئەم سەبرو ئارامگرتنەیش یەکێکە لەو خەسڵەتە باشانەی کە هەر لە منداڵییەوە لە مندا بووە. بەردەوام ئەوەیشی لێوە فێر بووم نەهێڵم

لە هەڵویستی وادا هەرچی هەوەس و ئارەزوو قازانجە تایبەتیەکانی خۆم هەن سەربەرز بکەنەوە.

ئەو ساتەی کتێبەکەم وەرگرتەوە گەش بووبوومەوە. ((مارتن)) لەگەڵ سیستەرەکەدا لە گەرمەی دەمەتەقێدابوو. تەنانەت گفتوگۆ گەیشتبووە ئەو ئاستەی سیستەرەکە پێی ئەوت: لەبەر خاتری ئەمشەو بە نیازە کۆلوانە شاڵێك لە کچێکی هاورێی خۆی بخوازێ کە ماڵەکەیان نزیك گۆمەکەی ((هوشر)) ە. بەراستی هەرسێکمان تابلێی بە کەیف و بەختیار بووین. دەستمانکردەوە بە رۆیشتن و روومانکردە ئەو خانووە بچووکە رەنگ کەسکەی کە بەشی نەشتەرکاریشی لە خۆی گرتبوو. هەر لەو ساتەدا لەلایەکی ترەوە سیستەرەکەی ترمان بینی کە لەگەڵ دوکتۆرێکدا پێکەوە ئەرۆیشتن. دکتۆرەکە پیاوێکی باریکەلەی درێژو لاواز بوو. دوو گوێچکەی رەپی پێوە بوو، دیمەنی ئەو گوێچکانە پیاویان ئەخستە پێکەنین، هەر ئەمەیش بوو کە سەرنجی منی راکێشابوو. سیستەرەکەی هاورێمان ئانیشکێکی تێوە ژەنیم و کەوتمە پێکەنین. دوای ئەوەی هەردووکیان دوورکەوتنەوە. ((مارتن)) ئاورێکی لێ دامەوەو وتی:

((کوری باش! بەراستی بەختەوەری! کچێکی وا جوان قابیلی تۆ نییە!))

من نەمتوانی وەڵامی بدەمەوەو پێی بڵێم: ئەوەی راستی بێ من تەماشای ئەو دوکتۆرە درێژو بێهەناوەم ئەکرد. بەڵام هەرچۆنێك بوو قسەکانیم پەسەند کرد. جگە لەوەیش ئەو قسەیەی ((مارتن)) بۆ مەرایی کردن نەبوو. چونکە من بۆ خۆم زەوقی ئەوم لە زەوقی خۆم لەلا جوانتر بوو. من ئەمزانی زەوقی ئەو بەدوای قازانجێکدا ئەگەرێ کە لە قازانجی من گەورەترە. من لە هەموو شتێکدا _ بە دڵداریشەوە _ حەز بە رێك و پێکی و تاوتوێی بابەتیانە ئەکەم، ئەمەیش وەك شارەزاو پسپۆرێك ئەڵێم نەك وەك هەواداری.

رەنگە هەندێ کەس ئەوە بە جۆرە ریباییەك لەقەڵەم بدەن منی بێوە پیاو ((بەر لە ئێستە)) سەرگوزشتەی دڵداری و سەرەرۆیی خۆی بگێرێتەوە ((ئەگەر چی ئەمە یەکەم نموونە نییە)) و ئینجا خۆیشی هەر بە هەوادار بزانێ و بەس. ئەشێ بوترێ من تەمسیلی ئەو شتە ئەکەم کە ((مارتن)) بە راستی تیا ئەژی هەندێ جاریش وای بۆ ئەچم کە ژیانی خێزاندارییم ئەبێ هەر لاسایی‌کردنەوەی هەمان داب و نەریتی ژیانی پیاوانی دیکە بووبێ. من بۆ خۆم نکولی ناکەم لەوەی کە بۆ خۆم چێژ لەو تەقلیدکردنە وەرئەگرم. بەڵام من ناتوانم بیر لەوە نەکەمەوە. کە لەم چێژ وەرگرتنەدا شتێك هەیە پەی پێ نابەم. شتێك ئازادو بێبەهاو بێپاساو، وەك ئەو کەسەی کە لەسەردانی پێشانگایەکی هونەری و دۆزینەوەی دیمەنە غەریبەکانی نێو سروشتدا هەستی پێ‌ئەکات و هەرگیز مل کەچیش نییە بۆ پێداویستییە بەپەلەکان. تەواو وەك ئەوەی من لە پشت ژیانی سێکسی ((مارتن)) ەوە ئەیبینم. ئەو شتەی من فەرزئەکات بەسەر ((مارتن)) دا ئەو پێداویستییە بەپەلەو خێرایانەیە. ئەو کە رایەك دەربارەی ژن دەرئەبرێ، سروشتی شتەکان دیارو پێداویستیەکان هەردووکیان زاری ئەو دەربرینانەن.

## پرشنگی ماڵەوە

ئەو وەختەی لە خەستەخانەکە چووینە دەرەوە ((مارتن) ئیحایەکی وای دامێ کە هەموو شتێ بە شێوەیەکی جوان بۆ ئێمە رەخساوە. ئینجا وتی: ((بەڵام ئەم ئێوارەیە ئەبێ توزێ پەلە بکەین چونکە من ئەبێ سەعات نۆ لە ماڵەوە بم!)).. لەشم خاو بۆوەو سست بووم.

- سەعات نۆ؟! واتە ئێمە ئەبێ سەعات هەشت لێرەوە برۆین.. ئێ باشە چاکتر نەبوو هەر نەهاتینایە! من وام زانی ئەمشەو لێرە ئەمێنینەوە.

- ئێستە بۆ وەخت ئەکوژی!
- هەمووی لەبەر یەك سەعات! ئەمە لەگەڵ هۆی سەفەرەکەی ئێمەدا ناگونجێ.. باشە تۆ ئەتەوێ لە سەعات حەوتەوە بۆ هەشت چیبکەین؟!
- هەموو شتێ.. گوێت لێبوو؟! ئەو ئێستە شاڵەکەی پەیدا کردووە.. چون رەوڕەویەکی بچوك هەموو شتێ بەجوانیی رێی خۆی ئەکات.. مەسەلەیش لەسەر تۆ راوەستاوە.. پێویستە بەچاکی خۆتی بۆ ئامادە بکەیت.
- باشە ئاخر پێم نالێی بۆچی ئەبێ سەعات نۆ لەماڵەوە بیت؟!
- بەڵێنم بە جورجیت داوە.. چونکە هەردووکمان لە سەعات نۆوە دەست ئەکەین بە یاریی کاغەز بەرلەوەی بنووین!
- هەناسەیەکم هەڵکێشا: ئای خوایە!
- هەروەها دوێنێش جورجیت هەندێ سەریەشەو گێرمەوکێشەی لە شوێنی ئیشەکەی بۆ دروست بوو بوو. یەعنی تۆ ئەتەوێ لە رۆژی شەممەیشدا تۆزێ دڵی خۆش نەکەم.

جگە لەوەیش خۆت ئەزانیت جورجیت مەزنترین ئافرەت بووە لە ژیانی مندا!. هەروەها وتی: ((جگە لەوەیش تۆ ئەتوانی دڵخۆش بی بەوەی کە شەوێکی دووردرێژت لەبەردەمدا ئەبێ بۆ ئەوەی لە بوراگدا رابوێری)).

من ئیتر زانیمو تێگەیشتم هەموو قسەکردنێ لەگەڵ ئەودا ئاسنی سارد کوتانە. چونکە ئەو بۆئەوەی ژنەکەی دڵنیا بکات. هیچ شتێ ناتوانێ ئەو دڵەڕاوکێو وەسواسییەی بڕەوێنێتەوە. هەر سەعاتو دەقیقەیەك ویستی دڵخوازیو غەزەلی خۆی ئەکات!.

((مارتن)) پێی وتم: ((دەی وەرە! سێ سەعاتی تەواومان لەبەردەمدایە.. لە ئێستەوە تا سەعات حەوت با هەروا بە فیڕۆیان نەدەین!.

## فیلّ

چووینە سەر جادە بەرینەکەی نێو باخچە گشتییەکە. بە وردی لەو پۆلە کچانە ورد بووینەوە کە دوو دوو بەبەردەمماندا تێئەپەڕین. یان لەسەر کورسیەکان دانیشتبوون. بەڵام لە بار دڵمان پەسەند نەبوون، نەئەچوون بە عەقڵماندا. لەگەڵ ئەوەیشدا ((مارتن)) لە دوانیان نزیك کەوتەوە کەوتە قسەکردن لەگەڵیاندا بەڵێنی ژوانیشی لێ وەرگرتن.

بەڵام من ئەمزانی بە راستی نییە. ((مارتن)) ناوی ((مەشق کردن بۆ لێنزیك بوونەوە)) ی لەم جۆرە دیدارانە نابوو. ئەو خۆی ناوبەناو ئەم جۆرە پرۆڤانەی ئەکرد لە ترسی ئەوەی نەبادا کارەکەی لە بیر بچێتەوە.

بە نابەدڵیی باخچەکەمان جێهێشتو چووینە سەر ئەو شەقامانەی کە بەنێو ئەم شارۆچکە پەستو چۆڵەدا بڵاوبوو بوونەوە.

((مارتن)) وتی: ((وەرە با شتێ بخۆینەوە.. من تینوومە!))

شوێنێکمان بەرچاوکەوت ناوی ((چایخانە)) ی لەسەر نوسرابوو. بەڵام لە راستیدا دیار بوو لەوشوێنانەیە کە ئەبوو خۆت خزمەتی خۆتی تێدا بکەیت. هۆڵێکی چوارگۆشەی ساردو پۆخڵ. رومان کردە ئەو جێیەی ساردیی لێ ئەفرۆشن. فرۆشیارەکە ژنێکی دەموچاو گرژومۆن بوو. دوای ئەوە چووینە سەر مێزێك تا ساردییەکانمان بخۆینەوە. بەڵام سەر مێزەکە پیسو ئاوی شۆربای بەسەردا رژابوو. ئیتر ئەمە ئەبوو وامان لێبکات یەکسەر هەڵبێینو ئەو شوێنە بەجێبهێڵین.

((مارتن)) وتی: ((گوێ مەدەرێ!. لەم دنیایەدا ناشیرینیو پیسو پۆخڵیش دەوری باشەی خۆیان هەیە. مرۆڤ بەردەوام لەیەك شوێندا نابێت. ئەوکاتەی لە جێگایەکی وادا جێنیشتە ئەبین. هەر زوویش بەجێی ئەهێڵین.

هەر ئەمەیش کارێکی وایکردووە کە ژیان ئەم شێوە ئیقاعانەی خۆی هەبێت.چاکتر وایە ئەوەندە بایەخیان پێ نەدەین. ئێمە ئەتوانین لەپاڵ ئەم پیس و پۆخڵییەی ئێرەدا لەگەڵ شتی تر بدوێین. ((مارتن)) دوای ئەوەی شەربەتی لیمۆکەی خواردەوە، لێی پرسیم: لە نزیکەوە کچە هاوڕێیەکەت .. خوێندکارەکەی کۆلیجی پزیشکیت دیوە؟!

- ئەی چۆن بێگومان.
- چۆنە؟! بۆم وەسف ناکەی؟!

بۆم وەسف کرد. ئەم وەسفکردنەیش بۆ من شتێکی گران نەبوو. ئەگەرچی لە بنەڕەتەوە کچێکی لەو جۆرە هەر وجودی نەبوو. بەڵێ، ئەم باس و خوازەیش ئەمڕۆ بۆ من مایەی دڵخۆشی نەبوو. بەلام بەهەرحاڵ .. ئیتر ((دروستمکردبوو)). هەرکەسێکی دیکەیش گوێی لێبگرتمایە هەر وای ئەزانی راست ئەکەم.چونکە من ئەمەم بە نیەتێکی پیسەوە نیشان ئەدا، گوایە بۆئەوەی شارەزایی و دانایی خۆم نیشانی ((مارتن)) بدەم یان بەمەبەستێ بیجولێنم.من بوونی ئەم کچە خوێندکارەی کۆلێجی پزیشکیەم، لەبەرهۆیەکی زۆر بچووک خولقاندبوو، لەبەرئەوەی من نەمئەتوانی لەبەردەم زۆربلێیی و سەر کردنەسەری بەگیروگازی ((مارتن)) دا بەرگە بگرم.

((مارتن)) لێنەئەگەڕاو ئەیویست بە هەموو هەڵس وکەوتێکم بزانێت. ئەو بڕوای وایە من هەموو رۆژێ ئافرەتێکی تازە ئەدۆزمەوە. دیارە ئەمەیش پێچەوانەی حەقیقەتی منە. خۆ ئەگەر پێشی بڵێم: بابە وانییە و من تاقە ئافرەتێکیش شك نابەم و هەفتەی جارێکیش دەستم بەردەستی مێینەیەك ناکەوێت. ئەو هەرگیز بڕواناکات و وا ئەزانێ من درۆی لەگەڵدا ئەکەم! لەبەرئەوە بەناچاریی بەر لەچەند رۆژێ پێم وت:

من ئێستا لە سۆراخی کچە خوێندکارێکی کۆلێجی پزیشکیدام. ئەویش گەشایەوەو هانیدام کە ئیتر لە قۆناغی سۆراخکردنەوە بچمە قۆناغی خۆلێنزیك کردنەوەوە .. ئەوەتا وا ئەمڕۆیش ئەوەم لێدووبارە ئەکاتەوە.

((ئەو کچە ئەبێ شێوەی .. شێوەی)) چاوی نوقاندبوو لە خەیاڵی خۆیدا بیری لەوە ئەکردەوە بە ژنێکی تری بچوێنێ. ئینجا ژنە هاوڕێیەکی هەردووکمانی بیرکەوتەوە ((ئەبێ شێوەی لە شێوەی سیلفی بچێت)).

پێم وت: لەویش جوانتر.

((مارتن)) سەری سوڕماو وتی: گاڵتە ئەکەیت!

((مارتن)) ژنەکەی خۆی بە جوانترین ژنی دنیا ئەزانی. ئەم قسەیەی گەلی پێخۆش بوو ئیتر خۆیدا بەدەم شەپۆلی خەوبینینەوە.

## خۆ نزیك کردنەوەیەکی سەرکەوتوو

دوای ئەوە کچێکی گەنج. پانتۆلێکی قەیفەی لە پێدابوو خۆیکرد بەژووردا. چووە بەردەم ژنەفرۆشیارەکەو ریزی خۆی گرت. ئینجا لەبەردەم مێزێکی تەنیشتمانەوە راوەستاو بێئەوەی دانیشێ هەر بەسەرپێوە ساردیەکەی خواردەوە.

((مارتن)) ئاورێکی لێدایەوەو پێی وت ((خانمەکەم! ئێمە هەردووکمان غەریبین، ئەمانەوێ هەندێ پرسیارت لێبکەین)) کچەکە زەردەخەنەیەك گرتی، بە راستی زۆر جوان بوو.

- ئێمە وا خەریکین لە گەرمادا بپرووکێین .. نازانین چی بکەین؟.
- بڕۆن مەلە بکەن!.
- وایە .. بەلام ئێمە نازانین مەلەگای ئەم شارۆچکە گچکەیە لە کوێدایە؟!
- هیچی تێدانییە.
- ئەی کەواتە چۆن؟!
- حەوزێك هەبوو .. بەلام ئەوە بۆ مانگێك ئەچێ وشك و برنگە.
- ئەی روبارەکە؟!

- ئەویش پاك ئەكەنەوە!
- كەواتە ئەی لەكوێ مەلە بكەین؟!
- بەتەنها هەر گۆمی ((هوشر)) هەیەو بەس ئەویش لێرەوە بەلایەنی كەمەوە حەوت كیلۆمەترێ دوورە.
- ئەوە گرفتێك نییە. ئۆتۆمبێلمان پێیەو تەنها ئەوەندە هەیە تۆ یاوەرمان بیو رێنومایيمان بكەیت.

ئینجا من وتم: ببی بە كەشتیوانمان!

((مارتن)) وتی: ببی بە كاپتنمان!

منیش وتمەوە: ببی بە ئەستێرەمان!

دوای كەمێك دوودڵیی، كچەكە رازی بوو بەوەی لەگەڵماندا بێت، بەڵام ئەو ئەبوو پێشتر هەندێ شتومەك بكڕێتو ئینجا مایۆی مەلەكردن لەگەڵ خۆیدا بێنێت. رێككەوتین دوای یەك سەعاتی تر هەر لێرەدا یەكبگرینەوە.

هەر تەواو بە كەیفو دڵخۆش بووین. ئەو رۆیشتو ئێمەیش لە دواوە تەماشای لەرینەوەی سمتو كەفەڵیو پرچە رەشەكانیمان ئەكرد.

((مارتن)) وتی: ئاگات لێیە؟! ژیان كورتەو ئەبێ سوود لە هەموو دەقیقەیەكی وەربگرین.

## پیاهەڵدانی هاوڕێیەتی

گەڕاینەوە باخچە گشتیەكە تا لە جووتە كچانی دانیشتووی سەر كورسیەكان وردبینەوە. ئەم جووتانە گەلێ جار وا رێك ئەكەوێ ئەگەر یەكێكیان جوان بێ ئەوا ئەوی تریان ناشیرینە.بە ((مارتن)) م وت:

((ئەمە سەیرترین قانونی سروشتە. ژنی ناشیرین هەمیشە بەهیوایە لە رێی نازداریی هاوڕێ جوانەكەیەوە دەركەوێو سوود لەمە ببینێ. ئەمەی دواییشیان ئەیەوێ لەپاڵ ناقۆڵاییو ناشیرینیی ئەویتردا جوانیەكەی درەوشاوە تر بنوێنێ. هاوڕێیەتی منو ((مارتن)) بەردەوام لەبەردەم چەندین ئەزموونداییە، ئێمە شانازیی ئەكەین بەوەوە كە هەرگیز نەمان هێشتووە چ رێكەوتو چ موونافەسە لەبری خۆمان بڕیار بدەن.

مەسەلەی هەڵبژاردنیش لەنێوان ئێمەدا هەمیشە لەسنووری موجامەلەدا بووە. هەریەكێكمان جوانترین ئافرەت نیشانی ئەویترمان ئەدات. لەمەدا ئێمە، كوتو مت لەو دوو پیاوە موحافیزكارە ئەچین كاتێ رووئەكەنە ژوورێك هیچ كامیان پركێشی ئەوە ناكات پێش ئەویتریان بكەوێتو بچێتە ژوورەوە. تا رازی ئەبن بەوەی یەكێكیان یەكەم جار پێشكەوێت!)).

((مارتن)) ئەمەی بەدڵ بوو. وتی: ((بەڵێ وایە. بەراستی ئێمە هاوڕێیەكی راستەقینەین. وەرە با تۆزێ دانیشین، منیش قاچم كەمێك دێشێت.

چوین دانیشتینو بە كەماڵی ئیسراحەت پاڵمان لێدایەوەو هەتاوەكەیش لەسەرخۆ لەدەمو چاوی ئەداین. بۆ چەند دەقیقەیەك وازمان لە خەڵكو دەروبەرمان هێنا ئیتر ئاگامان لە هاتو چۆیان نەماو بەلایشمانەوە گرنگ نەبوو چی ئەكەنو چی ناكەن!.

## كیژۆڵەی كراس سپیی

لە پرێكدا ((مارتن)) قنجوقیت بۆوە ((وەك هەستی بە جوڵەی شتێكی شاراوەو نەهێنی كردبێ)) چاویشی بڕیبووە تاقە رێڕەوی باخچەكە. كچێكی بچكۆلانەی كراس سپیی بەرەو رومان ئەهات. ئێمە بەرلەوەی بە چاكیو بە وردی جوانیی لەشو لاریو شێوەی دەمو چاوی ببینین، هەستمان كرد سیحرێكی تایبەتی تێدایە. سیحرێك كە ناتوانیت بزانی چییەو چۆنە. جۆرە ساماڵو بێگەردیو نەرمو نیانیەكی تێدابوو.

وەختێ بە بەردەمماندا تێپەڕی، تێگەیشتین كیژۆڵەیەكی هەرزەكارە، نە منداڵەو نەگەنجە، دەستە كچە. ئەمە جۆرە ووروژاندنێكی تێدا بەرپاكردین.

((مارتن)) بەرزەوپێ راست بۆوەو وتی: ((خانمەكەم! من فۆرمانی دەرهێنەری

سینەمابیم، تۆ ئەو سینەماکارە ئەناسیت؟!))
ئیتر دەستی بۆ کیژۆڵەکە درێژکردو تەوقەی لەگەڵدا کرد. کچەیش تووشی سەرسورمانێك هات ئەمەیش بەروونیی لە چاوەکانیدا ئەدرەوشایەوە.

((مارتن)) ئاورێکی بەلای مندا دایەوەو وتی: ((ئەمەیش وێنەگری فلیمەکانمەو .. پێشکەشت ئەکەم.))

منیش دەستم بۆ درێژکردو وتم: ((ناوم ئۆندریسیك)) ەو ئینجا ئەویش نوشتایەوە!.

خانمەکەم! ئێمە زۆر پەشۆکاوو شڵەژاوین. من بۆ فلیمی داهاتووم. بەشوێن هەندێ دیمەنی دەرەکیدا ئەگەڕێم. ئەبوو بریکارەکەم. کە بۆ خۆی بەچاکی شارەزای ئەم ناوچەیەیە ئێستە لێرە بوایەو چاوەڕێی بکردمایە. بەڵام نەهاتووە، ئێستەیش ئەمەوێ لێت بپرسم:

لەکوێوە دەست پێبکەین؟! لەکوێوە دەست بە گەڕانی ناو شارو دەوروبەرەکەی بکەین؟!

((مارتن)) درێژەی بەقسە خۆشەکانیداو وتی: ((ئەوەتا وێنەگرەکەم لەم کتێبە ئەڵەمانییە ئەستوورەدا بەشوێن ئەو بابەتانەدا ئەگەڕێو بەڵام بەداخەوە هیچی نەدۆزیوەتەوە!.

ئەم ناوبردنی کتێبەی من کە هەفتەیەك بوو لێی بێبەش بوو بووم، پەستی کردم. لەبەرئەوە دەستم کرد بە هێرشکردنە سەر دەرهێنەر ((تۆ نازانی ئەوە چەند زیانبەخشە کە بایەخ بەم کتێبە نادەیت؟! تۆ ئەگەر بەچاکیو بەجیدی خۆت ئامادەبکردایەو مەسەلەی دۆزینەوەت بۆ وێنەگرەکان جێهێشتایە. فلیمەکانت قوڵترو پاکترو بێهەڵە تر ئەبوون)).

دوای ئەوەی داوای لێبوردنم لە کیژۆڵەکە کرد ئینجا وتم:

((خانم گیان ببوورە! حەزمان نەئەکرد بە قسەوباسی کارەکانمان سەرت بیەشێنین، ئەوەی راستی بێ ئێمە سەرقاڵی ئامادەکردنی فلیمێکی مێژووین)) لەبارەی کولتووری ئالتروسکییەکانی ((بوهیمیا)) وە.

کچە تۆزێ سەری دانەواندو وتی: ((خراپ نییە!))

- ئەمە کتێبێکی گرنگە .. تەماشاکە!

کتێبەکەم دایە دەست کچەکەو ئەویش بەترسێکەوە کە لەسامی دەست بۆ بردنی کتێبێکی ئایینی ئەچوو، کتێبەکەی لێوەرگرتم. ئەتوت من داوام لێکردووە ئا بەوجۆرە کەوتە هەڵدانەوەی لاپەڕەکانی. ئینجا پێم وت: ((وا بزانم کۆشکی _ بشاشیك _ لێرەوە زۆر دوور نییە!)) چونکە ئەوێ مەڵبەندێکی ئالتروسکییە چیکەکان بوو .. بەڵام پیاو نازانێ لەکوێوەو چۆن بۆی بچێت؟!

کیژۆڵەکە وتی: لێرەوە هەر دوو هەنگاو دوورە!

لە پڕێکدا هەستم بە جۆرە بووژانەوەیەك کرد، مادام ئەو ڕێگەی بەرەو ((بشاشیك)) شارەزایە ئەمە خۆی لەخۆیدا پەیوەندی نێوانمان گەرمو گوڕتر ئەکات، بە بەراورد لەگەڵ ساردو سڕیی سەرەتای گفتو گۆماندا.

((مارتن)) زەردەخەنەیەکی دەستکردی وای نیشاندا کە گوایە ئاسوودەیەو لێی پرسیی:

- چۆن؟! تۆ ئەزانی ئەو کۆشکە لەکوێدایە؟!

کچەکە وتی: بەڵێ بە دڵنیاییەوە. تەنها یەك سەعات لێرەوە دوورە.

((مارتن)) وتی: بەپێ؟!

کچەکە وتی: ئەی دیارە بەپێ!

من پێم وت: بەڵام ئێمە ئۆتۆمبێلمان پێیە.

((مارتن)) وتی: ببە بەڕێبەرمان. بەڵام من وام بەچاکتر زانی کە ئیتر واز لەو خووە باوە بهێنمو یاریی بە وشە نەکەم. من لای خۆمەوە لە خوێندنەوەی باری دەروونیی کەسانی تردا لە ((مارتن)) باشترم. هەستمکرد بەوەی ئەم وردە گاڵتانە زیانمان لێئەداو بەڵام قسەی جیدی باشترین یاریدەدەرمان ئەبێت.

وتم: ((خانمەکە! ئێمە نامانەوێ وەختی تۆ بەفیڕۆ بدەین، بەڵام ئەگەر بە ئەرکی نەزانیو

لەباردڵت گران نەبێ سەعاتێ دوو سەعاتێکی وەختی خۆتمان بدەیتیو ئەو شوێنانەمان نیشان بدەیت کە ئێمە لەم ناوچەیەدا حەز بە بینیان ئەکەین. دیارە زۆر سوپاسیشت ئەکەین!.

کیژۆڵەکە وەڵامی دایەوەو جارێکی تریش خۆی نوشتانەوەو وتی: بەڵێ باشە، بەلام ((ئێمە تا ئەو ساتە هەستمان بەوە نەکردبوو کیسێکی تورباسای بەدەستەوەیەو دوو کاهوویشی تێدایە)) ئەبێ‌من ئەم کاهوانە بگەیەنمە دایکم .. لێرەوە زۆر نزیکین‌و هەر ئێستە ئەگەڕێمەوە.

وتم: راستە ئەبێ کاهوەکان بگەیەنیتە دایکت.ئێمە لێرە چاوەڕێت ئەکەین.

وەڵامی دایەوە: لە دە دەقیقە زیاترم پێ‌ناچێ! دیسانەوە نوشتایەوەو ئەوسا هەنگاوی هەڵهێناو دوورکەوتەوە.

((مارتن)) وتی: دەم خۆش!

- لە نموونە هەرەجوانەکانە .. وانییە؟!
- لەگەڵتام، من ئامادەم لەپێناوی ئەمدا دەستبەرداری هەردوو سیستەرەکە ببم!

## تەڵەی ئیمانی کوێرانە

دە دەقیقەی یەکەم تێپەڕیو ئینجا چارەکێك‌و بەلام کچەکە دیار نەبوو. ((مارتن)) دڵنیای ئەکردمەوەو ئەیوت :

((مەترسە! من کە بڕوام بە شتێ کرد ئەبێت‌و ئەویش ئەگەڕێتەوە، ئێمە گفت‌وگۆکانمان ماقول‌و باش بوون‌و کیژۆڵەکەیش خەریك بوو لە خۆشیاندا باڵ بگرێ.

منیش هەر لەو بڕوایەدابووم. ئەگەرچی ئەبوو هەرچاوەڕوان بین. دەقیقە لە دوای دەقیقەیش حەزو سۆزمان بۆ ئەو کچە هەرزەکارە ئاگری زیاتریان تێبەر ئەدایەن. بەم جۆرە ئێمە لە شوێنی خۆمان نەجوڵاین. سەبارەت بەو بەڵێنەیش کە دابوومان بە کچەی _ پانتۆڵی قەیفە لەبەر _ سەعاتێکیش بەسەر ئەو بەڵێنەدا تێپەڕی. تەنانەت بیرمان لەوە نەئەکردەوە هەڵسین‌و ئەو ناوە بەجێبێڵین. خەیاڵی کیژۆڵەی کراس سپیی لە کەللەی دابووین.

وەخت تێئەپەڕی .. لە دواییدا پێم وت:

- ((مارتن))! گوێ بگرە .. لەو بڕوایەدام نایەت.
- بە چ دەلیلێك؟ ئەو بڕوای پێکردین .. وەك چۆن بڕوای بەخوای باوك هێناوە!
- بەڵێ.. بەلام نەهێنی ئەم کلۆڵییەی ئێمە لەوەدایە زیاد لەپێویست بڕوای پێکردین.
- کەواتە تۆ ئاواتەخوازبووی .. یان حەزت ئەکرد بڕوامان پێ نەکات؟!
- بێگومان باشتر بوو .. چونکە خاوەن بڕوای کوێرانە خراپترین هاوپەیمانە.

کەوتمە قسەکردن‌و ئەم بیرۆکەیە باڵی بەسەر لێکدانەوەمدا کێشا: ((ئەو کاتەی حەرف بە حەرف‌و کوت‌ومت بڕوا بە شتێك ئەکەین، ئیتر ئەو ئیمانە هەموو شتێ بەرەو ناماقول ئەبات، ئەو کەسەی دەمارگیرانە بەرگریی لە سیاسەتێك، هەر سیاسەتێك ئەکات ئەوسا بەجیدی بیر لە سەفسەتەکانی ئەو سیاسەتە ناکاتەوە، بەڵکو بەتەنها بیر لە ئامانجە کردەیەکانی دەکاتەوە کە لەپشت ئەو سەفسەتانەوە خۆیان شاردۆتەوە. ئەمەیش لەبەرئەوەی وێنە سلبیەکانی سیاسەت‌و سەفسەتە بۆ ئەوە نەخوڵقاون بڕوایان پێ‌بکەین، چاکتر وایە بڵێین بڕوبیانوون‌و لەسەریان رێکەوتووین. ئەوساکارانەی کە ئەم مەسەلەیەیان زۆر بە جیدی وەرگتووە، زوو بێ‌و درەنگ تەواوی ناکۆکییەکانیان بۆ دەرئەکەوێ ئینجا رائەچڵەکن‌و شەرمەزارانە هاوار ئەکەن ((کافرو خوا نەناسەکان!.. نەء، هیچ خێرێ لە ئیمانی کوێرانەدا نییە، نەك هەر لە رێبازەکانی ئایینی‌و سیاسەتدا تەنانەت لەو پلانەیشدا کە ئێمە بۆ راکێشانی ئەو کیژۆڵەیە بەکارمان هێنا)).

((مارتن)) وتی: من ئێستە لەتۆ ناگەم.

- مەسەلەکە روون‌و ئاشکرایە: ئێمە بەلای ئەو کیژۆڵەیەوە بریتی‌بووین لە دوو پیاوی ماقول‌و بەویقارو بەس، ئەویش وەك هەر منداڵێکی بەئەدەب چۆن مل ئەداو رازی ئەبێ بەوەی لە ترێنێکدا جێگەکەی خۆی بۆ پیرەکان چۆڵ بکات .. هەربەو جۆرەیش ملیدا بۆ ئێمە ..

- ئەی کەواتە بۆچی تا سەر ملی نەداو نەهاتەوە؟!
- رێك لەبەرئەوەی زیاد لە پێویست بڕوای پێکردین. کاهۆکانی بردۆتەوە بۆ دایکیو ئەوسا بەشەوقو پەرۆشێکی زۆرەوە هەموو شتێکی بۆ دایکی گێڕاوەتەوە)) لەبارەی فلیمە مێژووییەکەو ئەتروسکی بۆهیمیاو ئینجا دایکیشی..

لێرەدا ((مارتن)) قسەکانی پێبڕیم وتی: ((راستە! ئەوسایش ئاشکرایە سەرەنجامەکەی بەچی شکاوەتەوە)).

ئەمەی وتو هەستایە سەرپیان.

## ناپاکی

هەتاوی سەر مالانی شار بێتینو کزبوو بوو. کەمێکیش هەوا سارد بوو بوو. ئێمەش بێتاقەتو غەمبار بووین، گەڕاینەوە چایخانەکە، بەلام دەریەستی ئەوە نەبووین بزانین ئایا کچەی پانتۆلی قەیفە لەبەر لەوێ چاوەڕوانمان ئەکات یان نا؟. بێگومان لەوێش نەبوو. ئەو ساتە سەعات شەشو نیو بوو. دیسانەوە بەرەو لای ئۆتۆمبێلەکەمان داگەڕاین، هەردووکمان خۆمان وەك دوو پیاوی دوورخراوەی ناو شارێکی غەریب ئەهاتە پێش چاو. هیچ پەنایەکمان نەبوو لەوەبەولاوە دالدەبەرینە بەر ئۆتۆمبێلەکەی خۆمان. ئەو ئۆتۆمبێلەی پێ ئەچوو هەر خۆی حەسانەیپارێزگاری خۆی پێبێت!

((مارتن)) هاواریکرد ((چاکە، وا جارێکی دی هاتینەوە ناو ئۆتۆمبێلەکە. تۆیش وا کرومات دیمەنی ئەوانە دووبارە مەکەرەوە کە شوێن دارەمەیت ئەکەون. گرنگترین شت ئەوەیە کە هێشتا نەهاتوەو بەڕێوەیە بێت.

من ئەمویست پێی بلێم ((ئێمە هەمانەو نیمانەو تەنها یەك سەعاتەو هیچی تر. ئەمە بۆ ئەوشتەی کە تۆ بە ((گرنگترین)) ناوی ئەبەیت. بەلام بەهۆی جورجیتو یاری کاغەزەوە....

لێرەدا ئیتر ئەوەم پێباشتربوو بێدەنگ بم..

((مارتن)) وتی: ((بەهەرحال ئەمرۆمان رۆژێکی باش بوو. هەر لە سۆراخکردنی بوزدرانی گچکەوە تا نزیك بوونەوە لە کچەی پانتۆلی قەیفە لەبەر.. هەموو شتێ لەم شارەدا لەپێناوی ئێمەدا ئامادەکراوە .. هەر ئەوەیە جارێکی تر سەردانی بکەینەوە.

وەلامم نەدایەوە، سۆراخکردنو خۆنزیکردنەوە بەشێوەیەکی سەرکەوتوانە ئەنجامدران. بەلام کوتوپڕ ئەوەم هات بە بیردا. ئەوە ساڵێکە ((مارتن)) جگە لە سۆراخکردنو نزیك بوونەوە، ئیتر هیچی تری بەهیچ نەکردووە، لێی وردئەبوومەوە، لە چاوەکانیا وەك هەموو جارێکی دی بریسکەی، ئارەزوویەکی نەمر ئەبریسکایەوە. لەو دەقیقەیەدا هەستم بەوە کردئەم ((مارتن)) ە لای من چەند ئازیزەو ئەو ئالایەشم چەند خۆش ئەوێ کە ئەو بە درێژایی ژیانی لەژێریا رۆیشتووە: ئالا ئەزەلیەکەی مێبازیو دواکەوتنی ژنان.

کات تێئەپەڕی. ((مارتن)) وتی: ((سەعات حەوتە))

دە مەتر دوور لە حەساری ئەخۆشخانەکە ئۆتۆمبێلەکەمان راگرت. ئەمەیش بۆئەوەی لە ئاوێنەی پێشەوەی ئۆتۆمبێلەکەوە چاودێری بەردەمی خەستەخانەکە بکەم. تا ئەوساتەیش من هەر بیرم لە ئالاکە ئەکردەوە. خۆم بەخۆمم ئەوت: لەم بەشوێنکەوتنەی ژناندا _ ساڵ لە دوای ساڵ _ وەختێ ژمارەی ئافرەت کەمترو شوێن کەوتنیش زیاترو زیاتر ئەبێت. ئاوا بەمەرجێ ئەم شوێنکەوتنانە بێهودەو بێئەنجام نەبن. ئێمە ئەتوانین هەموو رۆژێ شوێن ئەوەندە ژن بکەوین کە لە ژمارە نەیەن. بەم جۆرە ئەتوانین ئەم بەدووکەوتنەی ژنان بکەین ((بە شوێنکەوتنی موتلەق)) .. بەلێ ((مارتن)) لەو کەسانەیە خۆی ئەخاتە خانەی شوێنەکەوتنی موتلەقەوە!.

پێنج دەقیقە بوو چاوەڕێ بووین. بەلام هەردوو کچە گەنجەکە دیار نەبوونو نەهاتن. من بۆخۆم ئەو نەهاتنە شپرزەو بێتاقەتی ئەکردم. چونکە هاتنو نەهاتنیان لای من گرنگ نەبوون. بابلێین وا هاتیشن. ئایا ئێمە لە ماوەی تەنها یەك سەعاتدا ئەتوانین چی بکەین؟ .. ئەبێ لەگەلیاندا

برۆین بۆ ئەو هەوارە دوورە، ئینجا دوای ئەوە وەختێکمان ئەویٚ ببینە جێی متمانەیان ئینجا وەختی تر لەگەڵیاندا بخەوین‌و دواییش زۆر بە ئەزاکەتەوە ماڵ ئاواییان لیٚبکەین‌و برۆین. ئەمە هەمووی تەنها لەیەك سەعاتدا! نەء... لەو ساتەوە کە ((مارتن)) بڕیاری ئەوەیدا سەعات هەشت هەموو شتیٚ کۆتایی پیٚ بێت لەو ساتەوە ئەم کوڕێنی‌و سەفەرەی بەرەو خانەی یارییەکی وەهمی برد!

دە دەقیقەی تر تێپەڕی‌و هەر چاوەڕوانین‌و کەسیش لەبەر دەرگای خەستەخانەکەوە دەرنەکەوت.

((مارتن)) پیشی ئەخواردەوە. وەك هاوار بکات وتی: ((تەنها دەرفەتی پێنج دەقیقەی تریان ئەدەمیٚ .. هاتن باشە نەهاتن ئەڕۆین‌و لەمەندە زیاتر چاوەڕێیان ناکەین)) .. هەر لەهەمان وەختدا بیرم لەوە ئەکردەوە کە ئیتر ((مارتن)) لە گەنجێتی تیٚپەڕاندوە! ئەو دڵسۆزانە ژنەکەی خۆی خۆش ئەویٚ ژیانێکی ژن‌ومێردی گونجاوو ڕێك‌و پێك بەسەر ئەبەن. ئەمە ڕاستی‌یە، لەسەرو ئەم ڕاستیەیشەوە، لە ئاستێکی دیکەی نێو وەهمێکی پاك‌و بیٚگوناهو کاریگەردا، گەنجێتی ((مارتن)) بەشێوەیەکی شپرزەو بە زێدڕەوی‌یەوە درێژەی هەبووەو چون گەمەیەکی ئاسان بە تەنها هەر لەسنووری یاریگاکای خۆیدا بووەو نەگەیشتۆتە ناو بەرایی ژیان خۆی‌و گەمەکەی نەکردووە بە: ڕاستیی.

هەروەها ((مارتن)) لەپێناوی پێداویستیە زەرووریەکانی خۆیدا بووە بە سوارێکی کوێر، هەموو سەرچڵی‌و ئارەزووی دڵداریەکانی کردووە بە هەندیٚ بیٚگوناهیی نێو گەمەکردن. ((بیٚئەوەی هیچ گومانێکیان لیٚبکات))بەم جۆرە هەموو گیانی ئاگرتیٚبەربووی خۆی فرێداوەتە ئەم گەمەیەوە.

لە دڵی خۆمدا وتم: ((زۆر باشە. وا ((مارتن )) کۆیلەی وەهمەکانی خۆیەتی .. ئەی من بۆ؟! لەبەرچی لەم گەمە هیچ‌و پووچەدا من پشتی ئەگرم؟! منێك کە ئەزانم .. لە فروفێڵ بەولاوە هیچی تر نین. بەمجۆرە ئایا من لەو هیچ‌و پووچتر نیم؟! لەبەرچی خۆم تووشی گەمەیەکی عاتیفیانە ئەکەم لە کاتێکدا زۆر بە چاکی لەوە گەیشتووم، ئەوا من توانیم بەهیوای سەعاتە وەختێك بژیم، کە پێشەکیش ئەزانم وەختێکی دۆڕاوەو لەگەڵ دووژنی نەناسراوی سەرەڕۆی لاوبالیدا ئەوکاتە بەسەر ئەبەم)).

لەو وەختەدا بە تەختی ئاوێنەکەوە هەردوو ژنە گەنجەکەم بینی حەساری خەستەخانەکەیان بڕی‌و هاتنە دەرەوە. تەنانەت لەم دوورەوە بریقەی ئەو سووراوو سپیاوە زۆرەی کردبوویان سەرنجی ڕانەکێشا. خۆگۆڕین‌و ڕێك پۆشییان زەوق‌و بیٚمانا بوو. بە دڵنیایی‌یەوە ئەڵێم دواکەوتنیشیان هەر لەبەر ئەوە بووە. گەلیٚ خەریکی خۆیان بوون‌و ویستویانە بەجۆرێکی شیاو خۆیان بڕازێننەوە. بەرەولای ئێمە ئەهاتن‌و ئاوڕیان لە چوار دەوری خۆیان ئەدایەوە. ((مارتن))م ئاگادار نەکردو وام نیشاندا نەمبینیون.

ئینجا وتم: ((بەداخەوە چارەکیٚ تێپەڕی‌و نەهاتن .. با برۆین!))

ئەوسا ئیتر پیٚم بە بەنزیندا نا.

## پەشیمانیی

لە شاری ((ب)) چووینە دەرەوە. دواخانویشمان لە دوای خۆمانەوە، جیٚهێشت‌و ئینجاکەوتینە ناو دیمەنەکانی کێڵگەو دارستانەوە. خۆریش لەسەر لوتکەکان لە ئاوابووندا بوو.

هەردووکمان کرو بیٚدەنگ بووین.

لەوساتەدا بیرم لە یەهودای ئەسخریوتی ئەکردەوە. ئەو پیاوەی کە ئەدیبێکی قسەخۆش دەربارەی وتبووی: بۆیە خەبەری لە یەسوع دا بوو چونکە بەدڵنیایی‌یەوە بڕوایەکی موتڵەقی پیٚی هەبوو! ئیتر ئەم ئارامی نەگرت‌و چاوەڕوانی ئەو موجیزەیەی نەکرد کە یەسوع بەهۆی توانای ئاسمانی خۆیەوە نیشانی هەموو جوولەکەی بدا. تەسلیمی پۆلیسی کرد بۆئەوەی ناچاری بکا بجووڵیٚ‌و شتیٚ بکات. خیانەتی لێکرد بۆ ئەوەی سەعاتی سەرکەوتنی پێشبخات!

لە دڵی خۆمدا وتم: بەداخەوە .. بەڵام من کە خیانەتم لە ((مارتن)) کردووە لەبەرئەوەی من

ئیمانم پێی نەماوە (ئیمانم بە دەسەڵاتی ئیلاهی ئەو، لەم بەدووکەوتنەوەی ژناندا). من دوو رەگێکی سوکو سەلیمی تێکەڵم لە یەهودای ئەسخریوتیو لە تۆماس کە بە کافر ناوزەدەیان کردبوو.

من هەستم بەوە ئەکرد کە ئەم تاوانەی من لای خۆم ئەبێتە هۆی زیادبوونی خۆشەویستی ((مارتن))و ئاڵا ئەزەلیەکەی بەدووکەوتنی ئافرەتان ((ئەو ئاڵایەی کە بەسەر سەرمانەوە هەمیشەو بەردەوام گوێمان لە دەنگی شەکاندنەوەی ئەبێ))، ئەم ئاڵایە کانیی بەزەیی تیا هەڵقوڵاندم تا ئەو ئاکامەی کە ئیتر بگریم. خۆم لۆمەو سەرزەنشتی خۆمکرد دەربارەی ئەو هەڵەو هەڵەشەییەی نواندم.

ئایا رۆژێك دێت من بە کردەوە بتوام ئەم جۆرە هەڵسوکەوتەی کە گەنجێتیی ئەدرکێنێ، وازیان لێبهێنم؟! یان ئایا ئەتوانم جۆرە کارێکی تر بکەم؟! یان هەر ئەبێ لاساییان بکەمەوەو یاخود هەوڵی ئەوە بدەم لە ژیانی عاقڵانەی خۆمدا، بەندیخانەیەك دروستکەم تا ئەو هەڵسوکەوتە بێعەقڵانەی خۆمیان تێدا بەند بکەم؟! یان ئەبێ چی ببێ ئەگەر ئەم هەموو شتە بە تەنها بریتیبێ لە گەمەیەکی بێسوودو بێهوودە)). یان چی ئەبێ ئەگەر ئەمە بزانم .. ئایا واز لەم گەمەکردنە ئەهێنم؟! چونکە زۆر بە سادەیی ئەوە ئەگەیێنێ بێکەڵکەو بێسوود.

زێڕینە سێوێك بۆ ئارەزوویەکی نەمر

((مارتن)) لە تەنیشتمەوەیەو لەسەر کورسیەکەی خۆی دانیشتووە، وردە وردە تووڕەیی خۆی خەفەئەکات. پێی وتم:

- ((گوێ بگرە! هاورێکەت .. خوێندکارەکەی کۆلێجی پزیشکی .. بەراستتە لە شێوەو جەوهەردا لە چینێکی وا بەرزە؟!)).

- پێم وتی هەر لە چینی ((جورجیت)) ە.

((مارتن)) چەند پرسیارێکی دیکەیشی لێکردم. ناچاریش بووم جارێکی تر سەرلەنوێ وەسفی خوێندکارەکەی کۆلێجی پزیشکی بۆ دووبارە بکەمەوە.

ئینجا وتی: ((لەوانەیە بتوانیت لە دواییدا بەرەو رووی منیشی بکەیتەوە!)).

ویستم عاقڵانە وەڵامی بدەمەوە وتم: ((رەنگە ئەمە گران بێت، چونکە رەنگە ئەو کارە پەستی بکات، تۆ هاورێمی. ئەو خاوەن بیروباوەڕە.

((مارتن)) بە کزۆڵەیی وەڵامی دایەوە ((خاوەن بیروباوەڕ؟))

هەستمکرد خەفەت بەوە ئەخوات. نەمویست ئازاری بدەم وتم:

- یان ئەبێ وای نیشانبدەم کە من تۆ ناناسم .. ئەوسا ئەتوانی وەك کەسێکی دیکە خۆتی پێشکەش بکەیت.

- بە راستی ئەمە بیرکردنەوەیەکی زیرەکانەیە. بۆ نموونەئەتوانم بەو جۆرە خۆمی پێشکەش بکەم کە من ((فورمان)) م .. بەو جۆرەی ئەمرۆ خۆم وا ناساند .. ها..

- ئەو ئەوەندە بایەخ بە سینەماکاران نادا. وەرزشکاران بەلای ئەوەوە پەسەندترن!.

((مارتن)) وتی: ((لەوانەیە. هەموو شتێ رێی تێئەچێ)).

دیسانەوە کەوتینەوە ناو دەمەتەقێیەکی دووروودرێژ. پلانەکانیشمان دەقیقە لەدوای دەقیقە باشتر لەبەرچاومان روون ئەبوونەوە، بەجۆرێك دوای ئەوەی تۆزێکی تر کە شەو داهات. ئیتر وەك سێوێکی گەییووی بریسکەدار لەبەردەمماندا شۆڕ ئەبێتەوەو ئەلەرێتەوە.

رێم بدەن بەتۆزێ زێدەڕەوییەوە ناوی ئەم سێوە بنێم:

زێڕینە سێوێك بۆ ئارەزوویەکی نەمر!

---

سەرچاوە: ((غرامیات مرحة)) میلان کوندیرا

ترجمة: فوزی شعبان

منشورات:دار الآداب – بیروت – ١٩٨٨. / ص (٤٩).

## ٢/ ئیزابیل لەگێژەنی گەرداودا

ڕۆژی یەکشەممە ـ ئەوکاتەی خەڵکەکە کڵێسەکەیان جێئەهێشت و ئەچوونە دەرەوە. زستانیش هات. شەوی شەممە شەوێکی کپ و هەر ئەوە نەبوو پیاو تیانەخنکێ. بەلام کەس نەبوو ئەوەی بەخەیاڵدا بێت کەسەر لەبەیانی ڕۆژی یەکشەممە بەوجۆرە دابکاتە باران. دوای تەواوبوونی قوداس و بەرلەوەی ئێمەی ژنان فریای ئەوە بکەوین چەترەکانمان هەڵبدەینەوە. گژەبایەکی توند هەڵیکردوو هەرچی خۆڵ و پاشەڕۆی دروێنەی مانگی((مایو)) هەیە هەر هەمووی بردن بەحەوادا. یەکێك لەتەنیشتمەوە وتی(( ئەمە بای بارانە)) من ئەمەم ئەزانی بەرلەوەی ئەو کەسە قسەکەی لەدەم بێتە دەرەوە. ئیتر لەوساتەوە کە رووماننکردە دەرگاکەو پێمان خستە سەر پلیکانەکانی بەردەمی کڵێسەکە. هەستی شتێ دایگرتم و لەرزاندمی کەلەقوڵایی گەدەو ناو سکما لەجۆرە لینجی و لیتاوێك ئەچوو. پیاوان چنگ لەسەرشان بەرەو ماڵە نزیکەکان رایان ئەکردو بۆ ئەوەیش کەخۆیان لەو رەشەبای خۆڵ و پڕ لەتەپ و تۆزە بپارێزن. دەستێکیان بەشەپقەکەی سەریانەوەو بەدەستەکەی تریشیان دەسەسڕەکانیان بەدەم و لوتیانەوە گرتبوو. ئەوەندەی نەبرد باران دایکردو هەر بەقەد بەرزایی گەزێ لەژوور سەرمانەوە. ئاسمان چون ماددەیەکی هیلامیی بەناڵەو وژە کەوتە شەقڕن و باڵ بەیەکدا دان.

ئیتر ئەو بەیانییە تادرەنگ، من و باوەژنەکەم ـ لەنزیك حەسارەکەوە دانیشتبووین و ئاسودەیش بووین بەوەی کەئەم بارانە گوڵە تینووەکانی ناو ئینجانەکان، دوای حەوت مانگی هاوینێکی گەرمی خۆڵ لەژێلەمۆ چوو سەرلەنوێ ئەژێنێتەوە. لەنیوەڕۆدا زەویەکە ئارام بۆوە، بۆن و بەرامەی ئەو عەردەیش کەرێژنە شیکردبۆوە لەگەڵ بۆنی تازە چەکەرە کردووی سەوزایی ناو ئینجانەکانیش تێکەڵ بەبۆنی ئەم بارانە تازەیە بووبوون.

باوکم لەوەختی نانخواردنی نیوەڕۆدا وتی:

ـ هەر کاتێ لەمانگی مایۆدا باران بباری ئەوە نیشانەی ئەوەیە کەهەڵچوونی دەریا خێری پێوەیە.

باوەژنەکەم بزەیەك گرتی و وتی:

ـ لەقسەکانی ئەمڕۆی کڵێسەیشدا هەرئەوەم گوێلێبوو. ئەوسا باوکیشم زەردەخەنەیەك گرتی و ئینجا هەر لەتەنیشت حەسارەکەوە بەبێدەنگیی و بەلام بەچاوی نوقاوەوە وەك ئەوەی خەو ببینێ و بەخەبەریش بێ ـ بەئارەزوو حەزی برسیەکەوە ـ دەستیکرد بەنانخواردن.

بەدرێژایی دوای نیوەڕۆ شەستەباران بێ وچان و بەشێوەیەکی وەرسکەرو بێڕەزا هەر ئەباری. ئاگامان لێبوایەو لێنەبوایە ئەو بەقوڵایی هەستماندا و تاسەر ئێسقان رۆئەچوو. لەبەرەبەیانی دووشەممەدا ئەو کاتەی دەرگاکەمان کڵۆمکرد بۆنەوەی بەر لەو باپوسکە ساردو تەزیوە بگرین کەلەحەوشەوە خۆی ئەکرد بەژوورەوەدا. ئەوکاتە ئیتر هەموو هەست و نەست و حەواسمان تێرئاو و شەلاڵی باران بووبوو. لەگەڵ باوەژنەکەمدا سەرێکمان لەحەوشەدایەوە. بۆئەوەی بزانین چیهەیە. وەختێ تەماشامان

کرد. ئەو خاکە زبرو درشتە خۆڵەمێشییەی پێشتر دیبوومان بووە بەلیتاوێکی لینج. هەر تەواو بەوێنەی لیتاوی سابوونی عادییو بەلێواری ئینجانەکانیشدا ئاو چۆڕاوگەیەکی باریکی بەستبوو،

باوەژنەکەم وتی:

- وابزانم شەوی رابردوو زیاد لەپێویست تێر ئاوبوون، هەستم کرد ئەمجارەیان زەردەخەنە نایگریو پێئەچوو ئەو دڵخۆشییەی دوێنێشەی لەشەوی رابوردووەوە بوویێ بەجۆرە گرژیو مۆنییەك. بۆیە پێم وت:

- تۆ راست ئەکەیت. لەبەرئەوە چاکتروایە بە ((هیندییەکان)) بڵێین بیانگوێزنەوە تارمەکە تابارانەکە خۆش ئەکاتەوە. هەر وایشیانکرد. بەلآم باران هەر لەزیادبووندابوو. بەجۆرێك گۆپاڵەو رێژنەی بارانەکە لەسەر راوە، بەوێنەی دارو بارو درەختی زەبەللاحتر لەدرەختەکانی دیکەی ناو باخچەکە ئەهاتنە پێش چاو، باوکم هەر لەهەمان جێگەی رۆژی یەکشەممەدا دانیشتبووە، بەلآم ئەمجارەیان بەهیچ جۆرێ لەبارانو باران بارین نەدوا. هەر ئەوەندەی وت:

- لەوەئەچێ دوێنێ شەو خراپ نوستبێم، چونکە وەختێ بەئاگاهاتمەوە، پشتم رەق بووبوو.

هەر لەتەنیشت حەسارەکەوەو لەهەمان شوێندا، هەردوو قاچی بەسەر کورسیەکەی بەردەمیدا درێژکردبوو، روویشی کردبووە باخچە پەژموردەکە. ورتەی لێوەنەهات. دەمەدەمی خۆرئاوابوون وتی:

- لەوەناچێ ئاووهەوا هیچ گۆڕانێکی تێبکەوێ.

لەم ساتەدا، من مانگە گەرمەکانی ساڵم بیرکەوتەوە، مانگی ئۆگستۆسو ئەو کاتە درێژو ناجۆرو ترسناکانەی کەلەقرچەی نیوەڕواندا ماندوو مردوو خۆمان ئەدا بەعەرداو جلەکانیشمان بەپێستێ لەشمانەوە نووسابوونو گوێشمان لەلێدانو دنگەدنگی ئەو سەعاتەی دەرەوە ئەبوو کەبەشێوەیەکی قورسو خاو ئەڕۆیشت، رۆیشتنێ کە وەك دوایی نەیەت وابوو، ئەو وەختەی سەرنجداو وردبوومەوە: لەو دیوارانەی کەباران سەرتاپایانی شتبۆوە، لەو لاشیپانی دارو تەختانەی کەبەپڕاوپڕی خۆیان زیاتر باراناویان هەڵمژیبوو، لەو باخچە بچکۆلانەیەی یەکەم جارە واکرو بێواز بیبینم. هەروەها لەدرەختی یاسەمینی پاڵ دیوارەکە کەتاقە یادگاری زیندووی دایکم بوو، من ئیتر ئەوسا هەستم بەجۆرە دڵگوشینو داهێزرانێکرد کەبەتەواوی چنگیان لەویژدانم گیرکردبوو.

هەر وەکرو رۆژی یەکشەممە بەدرێژایی رۆژی دوو شەممەیش باران هەر خۆشی نەکردەوە. بەلآم ئەمجارەیان چۆنیەتی بارینەکە گۆڕابوو. چونکە شتێکی دیکەی جیاوازو تاڵ تێکەڵی دڵم بووبوو. لەخۆرئاوابووندا لەنزیك کورسیەکەمەوە گوێم لەدەنگێبوو... ئەیوت:

- بارانێکی وەڕسکەرە...

زانیم ئەمە دەنگی ((مارتن))ە ئەگەرچی ئاوڕیشم لەشوێن دەنگەکە نەدابۆوە. زانیم ئەوەو لەسەر کورسیەکەی تەنیشتم دانیشتووە. دەنگی ئەوە، هەمان دەمو دووی ساردوسڕی ئەوە. ئەو دەنگەی کەلەوساوە، لەرۆژێکی دێسەمبەری گرژومۆنەوە، لەو رۆژەوە کەبوویە مێردم لەوکاتەوە تائەمڕۆ هەر هەمان دەنگی نەگریسەو نەگۆڕراوە.

ئێستەیش یەکەم منداڵمان بەڕێوەیە. ئەوەتا لەم ساتەشدا ((مارتن)) لەنزیکمەوە دانیشتووەو ئەڵێت: ئەم بارانە وەڕسیکردووە. بۆیە دەرحاڵ منیش هەڵمدایەو وتم:

- هیچ وانییە!.. بەلآم ئەوەی ئێجگار خەمباری کردووم ئەم باخچە پەژموردەو ئەم درەختە کڵۆڵانەن کەدوور لەم حەوشەیە هیچ پەناو داڵدەیەکی تریان نابێ!.

ئەو کاتەی ئاوڕیشم دایەوە بۆ ئەوەی ((مارتن)) ببینم. لەجێگەی خۆی نەمابوو. بەڵکوو تەنها گوێم لەدەنگی بوو. وەختێ وتی:

- لەوەناچێ ئەم کەشو ئاوو هەوایە بەبارێکی تردا وەرگەڕێ. ئەمجارەیش کەسەرم بۆلای شوێن

دەنگەکە وەرگێڕا لەکورسیەکی بەتاڵ زیاتر هیچیترم نەدی.

بەیانی سێشەممە ـ مانگایەکمان لەناو باخچەکەدا بەرچاوکەوت. کەهەر لەتەپۆلکەیەکی قوڕاویی ئەچوو. وەك مانی لەهەموو جووڵەیەکیش گرتبێ وابوو. سەری دانەواندبوو. هەر چوارپەلیشی بەناو قوڕەکەدا ڕۆچووبوون. ئەو بەیانییە هندییەکان بەردەوام خەریکی ئەوەبوون بەدار بەبەرد بەهاوار دەریبکەن و دووری بخەنەوە بەلاّم بێسوودبوو. مانگاکە لەشوێنی خۆیدا چەقیبوو، لەشوێنی خۆیدا رەق بووبوو. هەر چوارپەلیشی لەخمخۆرکی قوڕەکەدا نوقم بووبوون. سەرو کەللەی لەبەر بارانای قورس بووبوو. هندییەکان بێوچان لەهەوڵی ئەوەدابوون هەرچۆنێك بێ دەریپەڕێنن، تا باوکم ئارامی لەبەربڕاو بەهانای مانگا کلۆڵەکەوەچوو، وتی:

ـ وازی لێبێنن... چۆن هاتووە هەروایش ئەگەڕێتەوە !. لەخۆرنشینی ڕۆژی سێشەمەدا، باران بەتاوترو بەخوڕڕەم تر ئەباری. لەمێردەزمەی سەردڵ ئەچوو.

تەڕو پاراویی یەکەم ڕۆژ وائیستە بووە بەشێداریەکی گەرمو لینج، پلەی گەرمایش نەساردبوو نەگەرم.

چون پلەی لەرزوتا وابوو. پلو پێ لەناو پێلاّودا ئارەقی دەرئەدا. ئەوەیش گەلێ گرانو زەحمەت بوو پیاو بتوانێ بڕیاری ئەوەبدات کامیان ناخۆشترە خۆ روتکردنەوە یاخود نووسانی جلوبەرگ بەپێستی لەشەوە.

لەناو ماڵەوەیشدا هەموو جۆرە هەڵسووڕانو کارکردنێ پەکیکەوت، ئێمە لەتارمەکەدا دائەنیشتین. بەلاّم ئیتر وازمان لەوە هێنابوو وەك یەکەم ڕۆژ بزانین بارانەکە چۆن ئەبارێو چۆن نابارێ. تەنانەت وایلێهات هەستمان بەبارینی نەئەکرد. هیچیشمان نەئەبینی جگە لەتارمایی درەختەکان لەناو تەمومژداو جگەلە خۆرنشینێکی سەراسیمەی دڵتەنگی ئێوارانیش بەولاوە. زانیم کەئەمڕۆ ئەبێ سێشەممە بێ، چونکە ئەو دوو خوشکە کوێرە دووانەیەم بیرکەوتەوە کەهەموو هەفتەیەك لەم ڕۆژەدا ئەهاتن بۆماڵەوە بۆلامان تاگۆرانییە سادەکانی خۆیانمان بۆ بڵێن، ئەو گۆرانییانەی جگە لەهەناسەی پەژارەو غەمگینیو جگە لەدەنگێکی ناخۆش هیچیتریان بۆ ئێمە پێنەبوو. وەك ئەوەی بەخەیاڵ لەرێزە رێزەی بارانەکەوە دەنگیان بگاتە گوێم وابوو، وام ئەهاتنە پێش چاو هەردووکیان خۆیان کزۆڵە کردبێو چاوەڕوانی ئەوە بکەن بارانەکە خۆش بکاتەوەو ئینجا هەڵسن و بچنە دەرەوە بۆ ئەوەی گۆرانیەکانی خۆیان بچڕن. کەواتە ئەمڕۆ ئەو دووخوشکە نابینایە نایەن بۆ ئێرە. هەروەها ئەو ژنە دەروەزەکەریش دەرناکەوێ کەهەموو ڕۆژانی سێشەممەیەك. عەسران، کردبووی بەخوو ئەهاتە بەردەمی تارمەکەو داوای شتێکی تری نەئەکرد جگەلە دووسێ چل رێحانە بەولاوە.

ئەمڕۆ هەمووومان نەفسمان لەخواردن تۆرابوو. دەمەو عەسر، باوەژنەکەم شۆربایەکی لێنابوو، وردە نانو شۆربا. ئەوەی راستیش بێ ئێمە لەخواردنو شێوی ئێوارەی دووشەممەوە هیچمان لەزار نەنابوو. من پێم وایە هەر لەوکاتەوە بیرکردنەوەیشمان پەکی کەوتبوو. ئێمە بەهۆی ئەم بارانەوە تووشی جۆرە سڕبوونو شەلەلو دڵە راوکێیەك بووبووینو بێهیچ پەلەقاژێو بەرهەڵستیو ئەمسەرو ئەو سەرێك زەبوونانەو دەستە وەستان خۆمان بەم داڕمانو هەرەسو ئەو پەلامارەی سروشت سپاردبوو. بەتەنها مانگاکە ئەبێت کەلەدوای نیوەڕۆوە جووڵە جووڵێکی تێکەوت. لەپڕێکیشدا وەك هەناوی بەهەژێت لەناخەوە تووشی هەڵلەرزینێکی زۆرو لەبەرچاوهاتو ئەمجارەیان هەر چوار پەلی قوڵترو قایمتر بەناو قوڕەکەدا ڕۆچوونو ئیتر بۆماوەی نیوسەعاتێك یەك جووڵەی نەکرد، هەروەکوو مردار بووبێتەوەو بەلاّم وزەی ژیان خۆی نەهێڵی بەلادابێت، یاخود هێزی مانەوە لەبەر ئەم بارانەدا هەر بەوبارەدا رایگرێتو ئەو رادەی وزەیەیش لەلەشی گەورەتربێ. بەلاّم ئیتر ئەوەندەی نەخایاند هەر دوودەستی وردە وردە نوشتانەوەو

ئەگەر چی تائەم ساتا وەختەیش لەهەوڵی تەلاش و مانەوەدا لەسەر هەردوولاقی ڕاوەستابوو. ئینجا لمۆزی لەقوڕەکە چەقیو لەکۆتاییشدا خۆیدا بەدەست قورساییە نەگریسەکەی لەشیەوەو بەبێدەنگیی هەرەسی هێناو بەئێجگاری بەلادا هات.

لەپشتمەوە گوێم لەدەنگێ بوو، وتی:

- بەم جۆرە ئەویش کۆتایی هات!.

وەختێ ئاوڕم دایەوە، لەبەردەمی تارمەکەدا، هەمان ژنە سوالکەرەکەی ڕۆژی سێ شەممەوانم بینیەوە. لەگەڵ ئەوەیشدا گە ئەم ڕۆژە ڕۆژی زریان و باوبۆران بوو، بەلام ئەو هەر هاتبوو بۆ ئەوەی داوای چڵە ڕێحانەکانی خۆی بکات.

لەوانەبوو من ڕۆژی چوراشەممە بمتوانیایەو واملێبهاتایە کەئیتر بەناچاریش بێ لەگەڵ ئەم کەش و ئاووهەوا سەختەدا خۆم رابێنم. ئەگەر بەسەر ئەم دیمەنەی ماڵەوەدا نەکەوتمایە، ئەویش: وەختێ چوومە ژووری نان خواردن تەماشام کرد مێزەکە لەجێگەی خۆی لابراوەو خراوەتە پاڵ دیوارەکەو هەموو شت و مەك و كەل و پەلەکانیشی لەسەر کەڵەکەکراوە.

لەولای تریشەوە، مابێنە پەرژینێکی‌تر دروستکراوەو هەموو جانتاکان و سنووقی قاپ و قاچاغ و هەرچی کەرەسەی ناومالّ هەیە خراونەتە سەری)) ئەم دیمەنە کارێکی وای تێکردم، کەئیتر لەناوەوە هەست بەدارمان و تێکشکانێکی پڕ لەترس و بیمی گەورەی دەروونیی بکەم)) ماڵەکە هەر تەواو پەرش و بلاّوو شێواوو بێ‌سەروبەر بووبوو. هندێیە ((جواجیرۆ))کان.

بێ‌کراس و بەپێی پەتی و پانتۆڵەکانیشیان تائەژنۆ هەڵکردبوو شێلگیرانە خەریکی گواستنەوەی کەل‌وپەلی ناومالّ بوون بۆ ئەوەی لەمووبەقەکەدا کۆیانبکەنەوە. هەرکەسێ تەماشای رەنگ و رووی ئەوانی بکردایەو لەهەڵس‌وکەوت و چۆنیەتی کارکردنیان رابمایە، بەچاکی هەستی بەرۆژی تەنگانەو نائومێدیی ئەوان لەئاستی ئەم بارانەداو بەخودی دۆش داماوی ئەکرد، لەچاوی ئەوان و هات و چۆیاندا.

ئیتر بەبێ‌ئەوەی ویستی خۆمی تێدابێ و بزانم روو لەکوێ‌ئەکەم هەر لەخۆمەوە کەوتمە هات‌وچۆکردن. ئەوساتەی لەژووری نان خواردن بەدیار کەل‌وپەلە پەرش‌وبلاّوو لەسەر یەك هەڵچنراوەکانەوە راوەستابووم و مەلول و دۆش داماو تەماشام ئەکردن. گوێم لەدەنگی باوەژنەکەم بوو کەلە ژوورەکەی خۆیەوە هاواری لێکردم بۆ ئەوەی ((ئاگام لەخۆم بێ و لەم درمی سەرماو کۆکەو هەلامەتە نەگرم)) هەر ئەوساتەیش لەوێدا من زانیم کەئاو تاسەروپاژنەی پێم هاتووەو ماڵەکەیش رووبەرووی مەترسییەکی دیارو بەرچاو بۆتەوەو لەناو ماڵەکەیشدا گۆلاوێکی لیخن دروستبووە.

چوارشەممەبوو. نیوەڕۆبوو. کەچی وات ئەزانی تازە بەیانییەو دنیا خەریکە تۆزە روناکیەکی تێ‌بکەوێ. بەر لەسەعات سێی دوای نیوەڕۆ پێش وەخت بەری رۆژ گیراو تاریك داهات و بارانیش بەهەمان تەپ‌ونم و داڕژانی سەربەکلاّوەی بێزارکەری خۆیەوەو بێ‌وچان هەر لەبارینداب‌وو. بێدەنگیی و غەمباریی هیندیەکانیش ئەوەندەی‌تر ئەم تاریکیە پێش وەختەی چڕکردەوە. هەموویان لەسەر کورسیەکانی پاڵ دیوارەکە بەچیچکانەوە دانیشتبوون. هەموویان لەبەردەم ئەم چەمووشیی و تێکچوونی رەوتی سروشتەدا بێدەسەلات و دەستەوەستان بوون.

هەر لەوکاتەدا بەوردی هەواڵەکانی دەرەوە ئەگەیشتنە لامان. بەلام بێ‌ئەوەی کەس یان هیچ راسپێرراوو تەتەرێ بیانهێنێ. خۆیان ئەهاتن، لەرێگەی ئەو سێلاّوو لیتاوەوە کەبەشەقامەکاندا سەربەرەو خوار ئەبوونەوەو بەیەکەوە کەل‌وپەلی ناومالّ و تەنەکەی خۆڵ و ئاژەڵی تۆپیوی سەرئاو کەوتوویان لەگەڵ خۆیاندا رائەمالّی و ئەتوت پاشماوەی رووداوو کارەساتە دێرینەکانن و لەشوێنێکی ئێجگار دوورەوە هاتوون. ئەوەی لەیەك شەممەدا رویداو کاتێ باران بارین لەسەرەتای داکردنیدا بوو دوو رۆژی ویست تائێمە لەمالّەوە پێمان زانی. بەلام رۆژی چوارشەممە بەتین و تاوو هێزێکی دینامی

زریاناوییەوە گەیشتە لای ئێمە، بەم جۆرە ئەوەیشمان زانی کەلافاو کڵێسەکەی داپۆشیوەو دارمانیشی لەئان و ساتدایە. هەر ئەمشەویش یەکێك وتی:

- لەرۆژی دووشەممەوە، شەمەندەفەرەکەیش نەیتوانیوە لەپردەکە بپەڕێتەوە، پێ ئەچێ سێلاوەکە هێڵی شەمەندەفەرەکەی بردبێ.

هەروەها ئەوەیش بڵاوبۆوە کەژنێکی نەخۆش لەپێخەفەکەی خۆیدا بوەو دیارنەماوە بەلام پاش نیوەڕۆ لاشەکەیان بەسەرئاوی حەوشەکەی خۆیانەوە دیوەتەوە.

بەترس و لەرزەوەو بەچوارمشقی لەسەر کورسیە برۆزەکە دانیشتبووم. دڵم گیراوو هەستم بێئارام و چاوەکانم لەتاریکایی بڕیبوو. لەراڕەوەکەوە باوەژنەکەم دەرکەوت و چرایەکیشی بەدەستەوەبوو. تارماییەکی ئەم خێزان و خانووە بوو. لێی نەترسام، چونکە من خۆیشم هەر تارماییەکی لەو بابەتە بووم. بەناو ئاوەکەدا رێی ئەکرد تالێم نزیك بۆوەو سەرێکی هەڵبڕی و چراکەی دەستیشی بڵندتر کردەوەو وتی:

ئینجا ئیتر پێویستە نوێژ بکەین! تەماشای روخسارە رەنگ پەڕیوو کرژیەکەم کرد ئەتوت هەر ئێستا لەقەبرەوە هاتۆتە دەرێ و ئەتوت ئەم لەو گۆشت و ئێسقانە نییە کەخەڵکی تری لێدروستبووە. پاش قەیرێ هاتە بەردەمم و تەزبیحێك بەدەستەوەو دیسانەوە وتی:

- بەڵێ... ئەبێ ئیتر نوێژبکەین... لافاوەکە هەموو قەبرەکانی گۆڕستانەکەی تێك و پێك داوەو هەموو مردووە کڵۆڵەکانیش کەوتوونەتە سەرئاو.

ئەمشەو خەو بردمیەوەو چاوم لێك نا، بەلام ئەوەندەی نەبرد بەهۆی بۆنێکی ناخۆشەوە کەلەبۆگەنی لاشەی مردوو ئەچوو داچڵەکیم و خەبەرم بۆوە ((مارتن)) نوستبوو. بەلام من چەند جارێك لەسەریەك بەتوندی راموەشان و پێم وت:

- بۆن ناکەیت؟!

- بۆنی چی؟!

- بۆنی ئەو مردووانەی سەرئاو کەوتوون:

هەستکردن بەو کارەساتە هەر تەواو تۆقاندمی. بەلام ((مارتن)) لەسەرلا خۆی هەڵگێڕایەوەو بەدەنگێکی گیرو خەواڵوانە وتی:

- ئەمەی تۆ ئەیڵێی خەیاڵە خەیاڵ! ژنی دووگیان هەمیشە ئەم خەیاڵانەیان هەیە!.

لەبەرەبەیانی رۆژی پێنج شەممەدا لوتاوێژی بۆگەنەکە نەماو حسی هەست کردنیشمان بەکات و شوێن لەدەست دا. لەرۆژی پێنج شەممە نەئەچوو - بەڵکوو لەشتێکی هیلامیی ئەچوو کەپیاو کەلێنێکی تێبکاو لەوێوە بڕوانێتە رۆژی هەینی. هەرچی ژن و پیاویشە لەژن وپیاو نەئەچوون باوەژنەکەم و باوکم و هندیەکان هەر هەموویان لەکۆمەڵێ پەیکەری پیو ئەچوون کەلەنێو زەلکاوێکدا بجووڵێنەوە. گوێم لێبوو باوکم وتی:

- لەم ناوە دوورمەکەوەرەوە... تاپێت نەڵێن چیبکەیت و چینەکەیت..

دەنگی باوکم وەك لەدوور راوە بێت وابوو. یان وەك ئەوەی بەگوێ نەیبیسی بەلام دەستی تێوەبدەی، چونکە حاسەی دەست تێوەدان تەنها حاسەیەکی زیندووبوو کەلەگۆڕێدا مابێت.

بەلام ئیتر باوکم دیارنەماو لەقوڕگی زریانەکەدا بزربوو!. بەم جۆرە وەختێ بووبەشەو، باوەژنەکەم بانگکرد بۆ ئەوەی لەگەڵ خۆیدا بمباتە ژووری نوستنەکەم دواتر بەدرێژایی شەو ئەو نوستنە قوڵ و خۆشەی لێی نوستم تابەیانیی خەبەرم نەبۆوە. بۆ رۆژی دواییش کەش و ئاووهەوا هەروەکوو خۆی وابوو، بێرەنگ، بێبۆن، تەنانەت بێپلەی گەرماو سەرمایش. کەهەستام یەکسەر بازمدایە سەر کورسیەك و بێجووڵە دانیشتم. هەستیشم وای پێوتم: کەهێشتا جۆرە ئاگاییەکم تێداماوەو بەتەواوی خەبەری نەبۆتەوە. هێندەی نەخایاند گوێم لەفیشکەی شەمەندەفەرەکە بوو ئەم فیشکە فیشکە غەمگین و یەك لەدوای یەکە نیشانەی ئەوەبوو کەشەمەندەفەرەکە بەنێو زریانەکەدا تێپەڕیوەو دەربازبووە. وای بۆچووم لەشوێنێکەوە ئەم ئاسمانە روناکیەکی تێکەوتبێ. لەناکاو یەکێ لەپشتەوە وەك وەڵامی

زریاناوییەوە گەیشتە لای ئێمە، بەم جۆرە ئەوەیشمان زانی کەلافاو کلێسەکەی داپۆشیوەو دارمانیشی لەئانو ساتدایە. هەر ئەمشەویش یەکێك وتی:

- لەرۆژی دووشەممەوە، شەمەندەفەرەکەیش نەیتوانیوە لەپردەکە بپەڕێتەوە، پێ ئەچێ سێلاوەکە هێڵی شەمەندەفەرەکەی بردبێ. هەروەها ئەوەیش بلاویوەوە کەژنێکی نەخۆش لەپێخەفەکەی خۆیدا بوەو دیارنەماوە بەلام پاش نیوەرۆ لاشەکەیان بەسەرئاوی حەوشەکەی خۆیانەوە دیوەتەوە.

بەترس و لەرزەوەو بەچوارمشقی لەسەر کورسیە برۆزەکە دانیشتبووم. دلم گیراوو هەستم بێئارام و چاوەکانم لەتاریکایی بڕیبوو. لەراڕەوەکەوە باوەژنەکەم دەرکەوت و چرایەکیشی بەدەستەوەبوو. تارماییەکی ئەم خێزان و خانووە بوو. لێینەترسام، چونکە من خۆیشم هەر تارماییەکی لەو بابەتە بووم. بەناو ئاوەکەدا ڕێی ئەکرد تالێم نزیك بۆوەو سەرێکی هەلبڕی و چراکەی دەستیشی بلندتر کردەوەو وتی:

ئینجا ئیتر پێویستە نوێژ بکەین! تەماشای روخسارە رەنگ پەڕیوو کرژیەکەم کرد ئەتوت هەر ئێستا لەقەبرەوە هاتۆتە دەرێ و ئەتوت ئەم لەو گۆشت و ئێسقانە نییە کەخەلکی تری لێدروستبووە. پاش قەیرێ هاتە بەردەمم و تەزبیحێك بەدەستەوەو دیسانەوە وتی:

- بەلێ... ئەبێ ئیتر نوێژبکەین... لافاوەکە هەموو قەبرەکانی گۆڕستانەکەی تێك و پێك داوەو هەموو مردووە کلۆلەکانیش کەوتوونەتە سەرئاو.

ئەمشەو خەو بردمیەوەو چاوم لێك نا، بەلام ئەوەندەی نەبرد بەهۆی بۆنێکی ناخۆشەوە کەلەبۆگەنی لاشەی مردوو ئەچوو داچلەکیم و خەبەرم بۆوە ((مارتن)) نوستبوو. بەلام من چەند جارێك لەسەریەك بەتوندی راموەشان و پێم وت:

- بۆن ناکەیت؟!

- بۆنی چی؟!

- بۆنی ئەو مردووانەی سەرئاو کەوتوون:

هەستکردن بەو کارەساتە هەر تەواو تۆقاندمی. بەلام ((مارتن)) لەسەرلا خۆی هەلگێرایەوەو بەدەنگێکی گیرو خەوالوانە وتی:

- ئەمەی تۆ ئەیلێی خەیالە خەیالێ! ژنی دووگیان هەمیشە ئەم خەیالانەیان هەیە!.

لەبەرەبەیانی رۆژی پێنج شەممەدا لوتاوێژی بۆگەنەکە ئەماو حسی هەست کردنیشمان بەکات و شوێن لەدەست دا. لەرۆژی پێنج شەممە نەئەچوو - بەلکوو لەشتێکی هیلامیی ئەچوو کەپیاو کەلێنێکی تێبکاو لەوێوە بڕوانێتە رۆژی هەینی. هەرچی ژن و پیاویشە لەژن وپیاو نەئەچوون باوەژنەکەم و باوکم و هندیەکان هەر هەموویان لەکۆمەلێ پەیکەری پیو ئەچوون کەلەنێو زەلکاوێکدا بجوولێنەوە. گوێم لێبوو باوکم وتی:

- لەم ناوە دوورمەکەوەرەوە... تاپێت نەلێن چیبکەیت و چینەکەیت..

دەنگی باوکم وەك لەدوور راوە بێت وابوو. یان وەك ئەوەی بەگوێ نەیبیسی بەلام دەستی تێوەبدەی، چونکە حاسەی دەست تێوەدان تەنها حاسەیەکی زیندووبوو کەلەگۆڕێدا مابێت.

بەلام ئیتر باوکم دیارنەماو لەقورگی زریانەکەدا بزربوو!. بەم جۆرە وەختێ بووبەشەو، باوەژنەکەم بانگکرد بۆ ئەوەی لەگەل خۆیدا بمباتە ژووری نوستنەکەم دواتر بەدرێژایی شەو ئەو نوستنە قول و خۆشەی لێی نوستم تابەیانیی خەبەرم نەبۆوە. بۆ رۆژی دواییش کەش و ئاووهەوا هەروەکوو خۆی وابوو، بێرەنگ، بێبۆن، تەنانەت بێپلەی گەرماو سەرمایش. کەهەستام یەکسەر بازمدایە سەر کورسیەك و بێجوولە دانیشتم. هەستیشم وای پێوتم: کەهێشتا جۆرە ئاگاییەکم تێداماوەو بەتەواوی خەبەری نەبۆتەوە. هێندەی نەخایاند گوێم لەفیشکەی شەمەندەفەرەکە بوو ئەم فیشکە فیشکە غەمگین و یەك لەدوای یەکە نیشانەی ئەوەبوو کەشەمەندەفەرەکە بەنێو زریانەکەدا تێپەڕیوەو دەربازبووە. وای بۆچووم لەشوێنێکەوە ئەم ئاسمانە روناکیەکی تێکەوتبێ. لەناکاو یەکێ لەپشتەوە وەك وەلامی

ئەگەر شۆڕشێکیش روویداوە، لە پلەی یەکەمدا ئەنجامی دەسکەوتی ئاگایی بەرەبێك لە نوسەرانە لە رۆڵی فۆرمە کەلامیەکانو شێوە راگەیاندنەکان، کە هێزی "ئافراندنی" نوسراوەو زمانی هەموو ئافرێندراوە چیرۆکیەکانە.

گومان لەوەدا نیە کە ئەم ئاگاییانە دژی ئەگزیستانسیالیزم بووە کە لە ئەدەبیاتدا مافی لە پێشتر بوونی بە "پەیام" دابوو و جۆری لە گفتی پابەندی پەسەند ئەکرد کە لە پەنجاکاندا بە تواناییێکی لاوازەوە پێی نابووە گۆڕەپانی کارتێکردن لە مێژوودا. (رۆمانی نوێ هاوکات بوو لەگەڵ شەڕی جەزایرو گەڕانەوەی ژنراڵ دۆگۆڵ بۆ دەسەلات). پاشەکشێی ئەگزیستانسیالیزم شتێکی بەرچاو بوو، و هەر چەن کە شێوازی نوسینی سارتەرو کامۆ مایەی پەندو ئامۆژگاری بوون، (سەرەرأی ئەمەش "رۆب گرێ" هەر رەخنەی لێ ئەگرتن" و نوسەران لەدرێژدادڕێو "باوەڕەکان" و فرەوێژی دوور ئەکەوتنەوە: پەنابردنە بەر شتەکانو دیمەنە وەسفیەکان دەرمانی ئەم نەخۆشیەو دەربڕینی جۆری بێ متمانەیی بەئەوانە بوو. هەروەها وایان بەباشتر ئەزانی کە لەوە بەدوا، پشت بە بەرهەمە گەورە ئەدەبیەکانی جیهانێك ببەستن کە نوسەرەکانی لەنیوەی یەکەمی سەدەدا. لە بونیادو فۆرمی بەرهەمدا گەلێ بەرزەفڕییان لە خۆیان پیشان دا، و لە هەمان حاڵدا، واتایێکی نوێیان بە پێکهاتەو دیدی چیرۆکی بەخشی بوو: جۆیس، ڤاکنەر/ کافکا/ ویرجینیا وولفو ئەختێك دواتر بورخسو لەرەوتی فەرەنسایشدا پرۆست.

نوسەرانی رۆمانی نوێ لەیەك لایەندا هاوبەشن ئەویش ئەوەیە کە ئەم کاریگەرییانەیان زۆر بە خەستی کرد بە شتێکی دەروونی. پێویستە ئەمەیش بڵێم کە، سینەما، ئەم هونەرە سەرەسەدەی بیستەمیش –هەروەها کە هەندێك لەدەقە سەرەتاییەکانی تیۆریەکانیان پیشانیداوە– لەسەر نوسراوەو بۆچوونەکانیان لەمەڕ چیرۆك کاریگەریی هەبووە.

کۆی ئەم هەلومەرجانەو ئەم کارتێکردنانە جۆری لێکۆڵینەوەی لێ کەوتەوەو هەر زۆر خێرا بوو بەکۆششێ بۆ جێگیرکردنی زمانێکی حەکایەت خوانانە– کە لە پلەی یەکەمدا لە ئاستێکی رووکاریدا "کاری ئەکرد" لە بری رۆمانی کۆن.

"رۆلاند بارسیس Roland Barthes" (١٩٨٠– ١٩١٥) لە گوتارە بەناوبانگەکانیدا کە هاوکات بوون لەگەڵ یەکەم کتێبەکانی ئالان رۆب گرێ (لە ساڵەکانی ٥٥– ١٩٥٤دا) و راڤە رەخنەییەکانی بۆ ئەم جۆرە ئەدەبە ساوایە گرنگێکی دیاریکەریان هەبوو، ئەوانەی بە ئەدەبیاتی بەرجەستە (Objective) یان ئەدەبیاتی سەرزمانی (Litterate) ناوئەبردو لەوەی کە ئەیدی ئەم جۆرە ئەدەبە ئەیەوێ "تەنانەت فۆرمی چیرۆکیش پاکژی بکا" و رەنگە بتوانێ هەلومەرجی "مەرجی نەبوونی خوێنەر لەبەرامبەر هونەری ماهیەتگەرای بورژوایی‌دا دەستەبەر بکا" گەلێ خۆشحاڵ بوو.

## ٢– رێگاکان، بەدگومانیەکان، توێژینەوەکان.

بەراستی ئەم ئەزموونە لە بۆشاییەوە سەری هەڵنەدابوو. لە دەساڵ لەوەو پێشەوە رێگا گەلێکی تازەکرابۆوەو گەلێ زەمینەی نەناسراو دۆزرابوویەوە.

بەبێ ئەوەی بەرهەمەکانی "بیکیتو ناتالی ساروت" کە لە چلەکاندا ئافرێندرانو رێگایان بۆ لێکۆڵینەوەکانی داهاتوو کردەوە بێنینەوەیاد، ناتوانین لەسەر رۆمانی نوێ بدوێین. سامۆیل بیکیت نوسینی وات (Watt) ی لەساڵی ١٩٤٥ دا تەواو کردو مۆرفی (Murphy) شی ساڵی ١٩٤٧ بڵاوکردەوە، ئەو کە بەرهەمەکانی بەدو زمانی فەرەنسیو ئینگلیزی ئەنووسی، لە هەردو زماندا جۆرێ زمانی چیرۆکی داهێناوە کە تێیدا تەوسی ئەیرلەندایی‌و گاڵتەجاڕی بە خێرایی لەکەنار جۆری زمانی تراژیدیکی نوسراودا، جێگای خۆی ئەکاتەوە. بەلام ئەبێ چاوەڕێی بڵاوبوونەوەی مۆلۆی (Molloy) لە ١٩٥١ دا بکەین تا رەهەندە راستەقینەکانی بەرهەمەکانی ئەومان بۆ دەرکەوێ. ئەم کتێبە خوێنەر ئەخاتە سەرسوڕمانەوە، رایەچڵەکێنێ. و پەرێشانی ئەکا، بەلام وەك دیاردەیەکی نوێو بێ پێشینە خۆی ئەسەپێنێ. بەرنارد پینگۆد (Bernard Pinggaud) کە ئەم مەسەلەی بەجوانی هەست کردووە ئەڵێ: ((لە ساڵی ١٩٥٠ وە مەسەلەی بنەرەتیی ئەدەبیات، مەسەلەی "پوچی" یە، ئەمە شتێکە، کە یەکەم خوێنەرانی مۆلۆی بەتەواوی دەرکیان کردووەو ئینسان مەگەر کوێرێ، ئەم رەتکردنەوە بنچینەییە کە کاربەدەستی ئەم رۆمانەیە نەبینێ. یەکێك ناوی "ئۆدیسەی هیچ گەرایی" لێ ئەنێ، یەکێکی تر ناوی ئەنێ "رواداوە نوسینی گەندەڵی‌و هەوڵ"[٣] سێیەمیان بەناڕەزاییەوە باس لە "هەوڵێك بۆ بێمتمانەکردنی ئینسان" ئەکا (......) بیکیت هەڵناچێ (یاخی نابێ) پێشکەش ئەکا. ئەو بۆ ئەوەی دادوەری لەسەر پوچی بکا، لەدەرەوەی راناوەستێ، لەناخی پوچیدا ماڵ ئەکاتەوە، بە مەیلی خۆی نوقمی بێهودەیێك ئەبێ کە پاڵەوانەکانی ناتوانن لێی رزگارین. بەلام چونکە وشەکان، لەهەر حاڵدا، دەلالەت لەسەر شتێك ئەکەن، لێرەدا ئەگەڕێنەوە بۆ خودی زمان. بۆیەکم جار، لە مۆلۆیدا، ئەدەبیات هەوڵ ئەدا کە تەنها خۆی پیشان بدا، و کاتێ کە ماکس پۆل فۆچە (Max. Pol, Fouchet) باسی "قەواری شاعیرانە" ی

بەرهەم ئەکا، بەکردەوە بایەخ بە نوێیەتی حەقیقیو غەریب بوونی بەرهەم ئەدا. واتە ئەم داستانە گاڵتە ئامێز"ە لە پلەی یەکەمدا داستانی زمانو بەسەرهاتی وشەکانە."

بیکیت لە کتێبەکانی دواتریدا: مالۆن ئەمرێ (Malone Meurt) (١٩٥١) ناوهەڵنەگر (innommable) (١٩٥٣) و چۆن چۆنیە؟ (Commentcest?) (١٩٦١) لەوێنەکردنی چەشنێك "مرۆڤ داشکاندن" دا زێدەڕۆیی ئەکاو ژمارەی کەسایەتیە (کاراکتەر) خزۆکەو پەك کەوتوو و پەژۆەند (سخیف) کە نوقمی قسەبی سەروبەرەکانی خۆیانن، زیاتر ئەکات. لەهەمان حاڵدا، بیکیت لەشانۆکەی خۆیدا جۆری ژیانو بوونی نمایشی یان پێ ئەبەخشێ، بۆ نموونە لە "چاوەڕوانی گۆدۆ" (١٩٥٢).

بەڵام لەم ناوەدا کاری کەلام کارێکە دیاریکەرە: کەلام بەرەو وێرانیو بێدەنگیو مەرگ ڕێبەراتی ئەکا، بەڵام تەقریبەن بناغەی چیرۆکەکەو هەوێنە چیرۆکی بنەڕەتی کتێبەکە پێك ئەهێنێ. بەم شێوەیە قۆناغێك تێپەڕیوە.

جۆرێکی تازەو نوێ لە ڕۆمان-هەرچەن کە بەشێوەیێکی خەمناکانە مەنتیقێکی گاڵتەئامێزی هەبێ- کە ناتوانێ دوو ڕۆڵە "کارکرد" ی زمانو بونیاد حیکایەتخوانانە وجودی هەبێت.

ناتالی سارۆت (١٩٠٣)یش زۆر زووتر، بیری لەمەسەلەی ڕۆمانی نوێ کردوەتەوە. هەر لە ساڵی ١٩٣٩ وە کە ناونیشانی "ترۆپیزم" Tropism (کاردانەوە) ی بۆیەکێك لە بەرهەمە سەرەتاییەکانی خۆی هەڵبژارد، بەم کارە وشەیێکی داهێنا کە بۆ وەسفی جۆرێ لە سوسەوگەڕانی "ڕەوانی- نوسراوەیی" - بە نوسینێکی ناسکو جموجوڵی بێ هەستی ویژدان کە نوسەر خۆی ئەدا بەدەمیەوە- بڵاوبوویەوەو پەرەی سەند بێجگە لەوەیش، سارتر کە لە ١٩٤٩ دا پێشەکیێکی بۆ یەکەم ڕۆمانی سارۆت بەناوی "وێنەی نەناسراوێك" نوسی، لەحاڵێکدا کە ناونیشانی دژە ڕۆمان- ی پێدابوو (ناونیشانێك کە ئەیتوانی، بەواتایەك، ڕۆمانی نوێ لەقەڵەم بدرێ) سەرەنجی خوێنەری بۆ ئەو ناڕەزاییانە ڕاکێشا کە لەم ڕۆمانەدا هەبوو. هەروەها خودی ناتالی سارۆتیش لەکۆمەڵە گوتارێکدا کە بەناونیشانی "سەردەمی بەدگومانی" ئامادەی کردبوو، بە ڕوونی مەبەستو یان باشتر بڵێین "پرسیارەکانی" خۆی خستبووە ڕوو. ئەی وت کە "بەدگومانی" دۆزینەوەی جۆرێ گومانی خراپی دولایەنەیە لەنێوان نوسەرو خوێنەردا، لەمەڕ ڕاستییا متمانەی هەندی لە چەمکەکان (بە تایبەت چەمکی "کەسێتی") کە جاران زۆر بە باشی کارامە بوون کەچی ئێستا داوەشاون.

کەواتە هەست بەو پێویستیە ئەکرا کە شێوەیێك فۆرمی نوێ لە چیرۆکدا جێگیر بکرێ کە هەمان فۆرمی "ڕۆمانی بالزاك" نەبێ. سارۆت بەبەشی خۆی جۆرە بەکاربردنێکی برگەبرگەو پوختەو کوتو مت زمانی حکایەتخوانێکی پێشنیاز ئەکرد کە توێی داڕشتەی پتەوی گفتوگۆکانو "پەیڤە شاراوەکان" دا (کە ئێڤی کامپتن بۆرنت Ivy Compton Burnett "١٨٦٤-١٩٦٩" نوسەری بەریتانی ئەو هەستەی تێدا درووست کردبوو) ڕووبەڕووبوونەوەیێکی بەترەف (لەرادەبەدەر) و زبریو توندێکی بەردەوام کە گەوهەری ژیانی ویژدانی مرۆڤن، دووبارە سازی بکاتەوە. سارۆت بەژەکفەری (صبر) وتاقەتو زۆر بە چاکی، لە ڕشتەیێك کتێبدا لە بازنەی سەرکەشی بێهودەکانی بورژوایيو خێزانیدا، کۆمەڵێك لە ترۆپیزمەکانو (قاڵب) ە کورتو لێك ئاڵاوەکان فەراهەم ئەکا: مارترێو Marterau (١٩٥٣)، ئاسمانی نوێن Leplanetarium (١٩٥٩)، میوە زێڕینەکان Les, Fruits dor (١٩٦٣)، لە ساڵانی دواییدا گوێت لە دەنگیانە؟ Vous Les Entendez? (١٩٧٢) و منالی Enfance (١٩٨٢) ئەمانە ڕۆمانگەلێکن کە بەشێوازی تایبەت بە خۆیان، بەڵگەیێکی کۆمەڵایەتی دەربارەی جیهانێکی سنوریەند کراوەوە بەدەستەوە ئەدەن کە ناتالی سارۆت ئەوانە زۆر باش ئەناسێ. -(هەروەها کە پرۆست جیهانی خۆی ئەناسی)-

بەڵام بە تایبەت، ئەو هەلە بۆ زبریو تووڕەیی شاراوە لە هەموو زمانێکدا کە بە پلەیێکی دیایکراوی پێگەیشتن گەیشتبێ ئەرەخسێنێ کە لە چوارچێوەی "خانە" کانی چیرۆکدا بەشێوەیەکی نوێ بەیان بکرێ. کەواتە باسی جۆرێ ڕۆمانی توێژینەوەیی لەئارادایە، بەڵام نەك لە جۆری لابراتۆرییەکەی، کە لەو جۆرانەدا ڕیالیزمی کۆمەڵایەتیو سایکۆلۆژی لەبەرامبەر ڕووداوە ئازادەکانی هێزی خەیاڵ لە چیرۆکەکەدا لەناو ناچن. بەڵکو توێژینەوەیێك کە کۆششێکە بۆ تەقاندنەوەی بینای تەقلیدو گومان لەو شێوازی چیرۆك نوسینە کە بەشتێکی بەڵێن لەسەردراو لەقەڵەم دراوە.

## ٣- وەسفکردنی دیدەیی

ئالان ڕوب گرێ (Alin. Robbe, grillet) (١٩٢٢) دیسان ئەم گومانو بێ متمانەسازیەی بەشێوەیێکی کاریگەرتر بەکاربرد، ئەگەر ناوی ئەو بەشێوەیێکی گشتی پەیوەندیێکی توندوتۆڵی لەگەڵ ئەندێشەی ڕۆمانی نوێدا هەیە، لەم ڕووەوەیە کە هیچ کەس لەویاشتر هەستی بەنوسینێکی نوێو ئەو دابڕانەی کە ئەم نوسینە قبوڵ ئەکا، نەکردووە. ئەو، ئەم مەسەلەی لە گوتارە تیۆرێکە سەرەتاییەکانیدا بەڕوونی لایکداوەتەوە. ئەم گوتارانە



بۆکیۆ میشیما

**ڕۆژی** بیستو هەشتی شوباتی ١٩٣٦ (واتە لەڕۆژی سێیەمی دوای ڕووداوی بیستو شەشی شوباتدا) مولازم شینجی تاکەیاما کەسەر بەسریەی گواستنەوەی کۆنۆ بوو بێ ئەندازە پەریشان بوو کەبۆی دەرکەوتبوو هاوڕێ نزیکەکانی هەر لەسەرەتاوە لەڕیزی یاخیبووەکاندا بوون. بۆیە بەگیانێکی پڕ لەتووڕەییەوە لەو دیمەنەی کەدەبووایە بەو نزیکانە ڕوویبدایەو سەربازەکانی ئیمپراتۆر بکەوتنایەتە گیانی یەکدی؛ شمشێرەکەی دەرهێناو لەژوورە هەشت ڕاخەریەکەیداو لەماڵی خۆی کەکەوتبووە کۆڵانی شەشەمی ئۆبۆچۆ لەشاری یۆتسۆیاو لەکەشێکی تایبەتیدا کردی بەسکی خۆیدا. ریکۆی هاوسەریشی دوای ئەو بەخەنجەرێك خۆی کوشت. نامەی ماڵئاواییەکەی مولازم تەنها یەك دێڕبوو ((بژی هێزەکانی ئیمپراتۆری.)) ژنەکەشی لەنامەکەی خۆیدا پاش داوای لێبوردنی باوكو دایکی لەبەرئەوەی ڕەفتارێکی نابەجێی کردووەو بەرلەوان مەرگی هەڵبژاردووە بەمجۆرە کۆتایی بەنامەکەی هێنابوو: ((وا ئەو ڕۆژە هات کەلەڕێی ژنی ئەفسەردایە...)) دوا ساتەکانی ژیانی ئەم ژنو مێردە قارەمانو گیانبازە بەجۆرێك بوو کەتەنانەت خواوەندەکانیشی دەخستە گریان. ئەوەی شایانی وتنە ئەوەیە کەمولازمەکە تەمەنی سیویەك ساڵ بوو، ژنەکەشی بیستو سێ ساڵان بوو، بەهەمووی شەش مانگیش بەسەر ژیانی ژنو مێردایەتیاندا تێپەڕیبوو.

سەرسامیی ئەو کەسانەی شەنگیی ئەم دووانەیان لەو وێنەی بووكو زاوایەتیەدا دیبوو

کەبۆ یادگار گرتبوویان هیچی لەسەر سامیی ئەوانە کەمتر نەبوو کەلەئاهەنگی ژنهێنانەکەدا ئامادەببوون.

مولازم بەسەنگینییەکەوە لەجلوبەرگی سەربازیدا لای بووکەکەیەوە وەستابوو، دەتوت بەرگریی لێدەکات. بەدەستی راستی دەسکی شمشێرەکەی گرتبوو، کڵاوە سەربازیەکەش بەدەستی چەپیەوە بوو. سەروسیمایەکی جیددیی هەبوو. برۆ رەشەکانیو چاوە گەورەکانی نیشانەی هەرەتی لاویی بوون. جوانیی بووکەکەش لەو جلوبەرگە سپییەیدا وەسف ناکرێ، چاوە خڕەکانی کەکەوتبوونە ژێر دوو برۆی باریکەوە، لووتێکی رێک، دوولێوی گۆشتن، ئەمانە هەم نیشانەی ئارەزووی پەنهانی جەستەو هەم نیشانەی پاکیو بێگەردی بوون. بەشەرمەوە لەقۆڵێکی جلی بووکێنیەکەیەوە دەستێکی دەرهێنابوو، باوەشێنێکی بەدەستەوەگرتبوو، سەرپەنجەکانیشی کەبەناسکیەوە کۆی کردبوونەوە؛ دەتوت خونچەی گوڵی شەستپەڕن.

دوای خۆکوشتنەکەیان، خەڵکی ئەم وێنەیە دەردەهێننو بەوردی لێی دەڕواننو بەخەمباریەوە دەڵێن ئەوە چ بەڵاو نەفرینێك بوو تەمەنی ئەو ژیانی ژنومێردایەتیەی واکورت کردەوە! لەوانەشە ئەمە هەر خەیاڵاتێك بێت، بەڵام دوای ئەم مەرگەساتە وەختێ یەکێك سەیری ئەم وێنەیەی بکردایە؛ وادەهاتە بەرچاوی کەئەم دوولاوە بەرامبەر پەردەیەکی ئالتوونی وەستاونو زۆر بەڕوونی روانیویانەتە ئەو مەرگەی کەلەپێشیان بووە.

بەهۆی هاوکاریی (نێوەند)ەکەیانەوە کەسەرتیپ ئۆزکی بوو توانیبوویان لەئۆبۆچۆ لەیۆتسۆیا خانوویەکی تازەیان دەست بکەوێ. کەدەشڵێن خانووی ((تازە)) دەشێ ئەمە دەربڕینێکی سەر لێشێوێن بێت، چونکە خانووەکە سێژووری هەبووو بەکرێ گرتبوویانو کەوتبووە پشتی باخێکی بچووکەوە. هەتاویش نەدەکەوتە ژوورە شەش راخەرییو ژوورە چوار راخەرو نیوییەکەی خوارەوە، بۆیە ژوورە هەشت راخەرییەکەی نهۆمی سەرەوەیان کردبوو بەژووری نووستنو ژووری میوانیش. کارەکەریان نەبوو، لەبەرئەوە وەختێ مێردەکەی لەدەرەوە دەبوو ریکۆ خۆی بۆ چاودێریی خانووەکە لەماڵەوە دەمایەوە.

لەبەریاری نائاسایی وڵات مانگی هەنگوینیان نەکرد. یەکەمین شەوی بووکو زاوایەتیان لەم خانووەدا بردەسەر.

بەرلەوەی بچنە ناو پێخەفەوە شینجی رێکو راست لەسەر زەوییەکە دانیشتو شمشێرەکەی لەبەردەمی خۆیدا داناو وانەیەکی سەربازیانەی بەژنەکەی وتەوە. ئەو ئافرەتەی شوو بەسەرباز دەکات دەبێ ئەوەی لەبەرچاوبێت کەدەشێ لەهەر ساتێکدا مەرگ مێردەکەی راپێچ بکاتو ئەبێ بەئازایەتیەوە رووبەڕووی ئەمەش ببێتەوە. دەشێ سبەی یادووسبەی ئەمە رووبدات. ئیدی گرنگ نییە کەی مەرگ دێ ـ لێرەدا لێی پرسی: ئایا لەقووڵایی ناختەوە بۆ بڕیارێکی لەمجۆرە ئامادەیت؟ ریکۆ هەڵسا، چوو چەکمەجەیەکی کردەوەو یەکێك لەبەنرخترین شتە تازەکانی خۆی دەرهێنا کەئەویش خەنجەرێك بوو دایکی بەدیاری پێیدابوو. گەڕایەوە بۆ شوێنەکەی خۆیو، مێردەکەی شمشێرەکەی چۆن دانابوو ئاوەها ئەمیش بەبێ ئەوەی ورتەبکات خەنجەرەکەی لەسەر بەڕەکە بەرامبەری خۆی داناو تێگەیشتنێکی بێدەنگ باڵی بەسەر هەردووکیاندا کێشاو، ئیدی مولازمەکە هەرگیز هەوڵی نەدا بۆ جارێکیدی ژنەکەی تاقی بکاتەوە.

هەر پاش چەند مانگێك لەدەستپێکردنی ژیانی ژنو مێردایەتییان ریکۆ رۆژ دوای رۆژ جوانتر دەبوو، لەدرەوشانەوەیدا دەتوت مانگی پاش بارانە.

لەبەرئەوەی هەردووکیان سەرشاربوون لەلاویتیو گڕوتین، پەیوەندیشیان لێواو لێوبوو لەجۆشو خرۆش. ئەمە تەنها حاڵی شەویان نەبوو، بەڵکو چەندەها جار روویداوە کەمولازم

بەرۆژو دوای مانۆری سەربازی یەکراست گەڕاوەتەوە بۆ ماڵەوەو، هەر بەگەیشتنەوەی بۆ ماڵەوە یەکسەر پەلی ژنەکەی گرتووە بۆ ناو پێخەفو تەنانەت ئەو وەختەشی بەزۆر زانیوە کەتیایدا جلوبەرگە سەربازیە خۆلاویەکەی داکەندووە. ریکۆش بەهەمان شێوە کاردانەوەیەکی گەرمو گوڕی هەبووە. هەمووی مانگێك بەسەر یەکەمین شەوی بووكو زاوایاندا تێنەپەڕیبوو کەریکۆ هەستی بەبەختەوەری دەکردو مولازمیش کەژنەکەی بەبەختەوەری دەبینی دەبووە مایەی خۆشحاڵیو کامەرانی.

ریکۆ لەشێکی سپیو مەرمەڕیی هەبوو، مەمکە قوتەکانیشی گوزارشتیان لەرافزیەکی بێگەردانە دەکرد. بەڵام بەرامبەر مێردەکەی، ئەم مەمکانە زیاد لەپێویست بەخشندە بوونو بەگەرمیەوە پێشوازییان لەبەرامبەرەکەیان دەکرد. ئەم ژنو مێردە تەنانەت لەناو پێخەفیشدا سەنگینو ترسناك بوون. لەترۆپکی جۆشو خرۆشی مەستانەو دێوانە ئاسایاندا دڵیان هەر هوشیارو بەویقاربوو.

بەرۆژو لەکاتی پشووە کورتەکانی نێوان سەعاتەکانی مەشقکردندا مولازم هەر بیرو خەیاڵی لای هاوسەرەکەی بوو، ریکۆش بەدرێژایی رۆژ لەماڵەوە وێنەی مێردەکەی دەهێنایە بەرچاوی خۆی. تەنانەت ئەوکاتانەی لەیەك دووربوون ئەوەندەیان بەس بووە سەیری وێنەی بووكو زاوایەتیەکەیان بکەن تائەو خۆشیو کامەرانیەیان سەرلەنوێ زیندوو بێتەوە. ریکۆ هیچ سەری لەوە سوڕنەمابوو کەئەو پیاوەی تاچەند مانگێك لەمەوبەر پێی بێگانەبوو، ئێستا ئەو خۆرەیە کەدونیاکەی ئەم بەدەوریا دەسووڕێتەوە.

هەموو ئەم شتانە بنەمایەکی ئەخلاقییان هەبوو و پەیرەویکردنێکی کەلتوری ئیمپراتۆری بوو: (پێویستە ژنومێرد لەگەڵ یەکدا کۆك بن.) بۆ تاقە جارێکیش چیە نەریکۆ دڵی مێردەکەی ئێشاندووەو نەمولازمیش سەرپێچییەکی لێدیوە تاسەرزەنشتیی هاوسەرەکەی بکات. لەسەر رەفەی گەورەی شتەکانو لەژێر پێپلیکانەکانداو لەتەنیشت تابلۆی مەزاری ئیزەی گەورە (Great Ise Shrine)وە وێنەی ئیمپراتۆرو هاوسەرەکەی دانرابوونو مولازم هەموو رۆژێك بەیانیان بەرلەچوونی بۆ کارەکەی لەگەڵ ژنەکەیدا لەو شوێنە پیرۆزەدا دەوەستانو پێکەوە سەری رێزیان بۆ دادەنەواندن. هەموو بەیانیەك رێو رەسمی پێشکەشکردنی ئاو تازە دەبۆوەو لقی پیرۆزی ساساکیە کەهەمیشە سەوزو تەڕو پاراو بوو. ئەم دووانە تەواوی ژیانیان لەسای پارێزگاریی سەنگینو پڕ هەیبەتی خواوەندەکاندا بەسەربردبووو گیانیان سەرشاربوو لەبەختەوەریەك کەتانو پۆی جەستەیانی تەنیبۆوە.



گەرچی ماڵی لۆرد پریڤی سیل سایتۆ دراوسێیان بوون، بەڵام کەسیان گوێیان لەدەنگی ئەو تۆپە نەبوو کەدەمەو سەحەری رۆژی بیستو شەشی شوبات تەقێنرا. دەنگی شەپورێك بەدە دەقیقە دوای کۆتاییهاتنی کارەساتەکە لەو سپێدە تاریکەدا کەبەفری تیا دەباری خەوی لەمولازم هەراسان کردو خەبەری کردەوە. یەکسەر لەناو پێخەفەکەی هەڵساو بەبێ ئەوەی وشەیەك لەزاری بێتە دەرەوە جلوبەرگە سەربازیەکەی لەبەرکردو شمشێرەکەی کەژنەکەی بەدەستیەوە بۆی راگرتبوو لەکەمەری بەستو بەپرتاو بەو بەیانیە بەرەو ئەو شەقامانە ملینا کەبەفر پۆشیبوونیو، تا ئێوارەی رۆژی بیستو هەشتی مانگ بۆ ماڵەوە نەگەڕایەوە.

دواتر ریکۆ بەهۆی هەواڵەکانی رادیۆوە پەی بەمەترسیی ئەو ئاشوبو یاخیبوونەبرد. دووڕۆژی ئایندەی بەتاقی تەنیاو بەئاسوودەییو بێدەنگی لەپشت دەرگا داخراوەکانەوە بەسەربرد.

لەو بەیانیە پڕ بەفرەدا کەمولازم بەهەڵەداوانو بێورتە ماڵەوەی بەجێهێشت؛ ریکۆ بریاری مردنی لەسیمایدا خوێندەوە. ئەگەر

(Maintien de Lordre) (١٩٦٢)، و شکستی نۆلان (Echec de Nolan)، هەمان شێوازی ڕۆب گریێ ڕەچاو ئەکەین، هەڵبەت بە نەختێك کاریگەریی (بورخس) ەوە لە هەڵبژاردنی جۆری چیرۆکو هەروەها مەیلی سەرنجدان بەکارەساتی وڵاتانی تر، یان دارشتەی پۆلیسی وێڕای لە بەرچاوگرتنی جیاوازیی (دەق).

سەرەنجام بەرهەمەکانی ژان ریکاردۆ، وەك ڕەسەدخانەی کان (observatoire de canne) (١٩٦١)، و سەرکەوتنی کونستانتەین (La Prise de Constantinople) (١٩٦٥)، و شۆڕشە بچوکەکان (Revolutions Minuscules) کە لەوانیشدا یەکیەتی شانبەشانی نێوان کار لەسەر نوسراوەو لێکدانەوەی تیۆرێك بەرچاو ئەکەوێ. لە بەرهەمە تیۆریکەکانی ریکاردۆیشدا کە لە ناساندنی ڕۆمانی نوێدا بایەخێکی گرنگی هەیە، ئەم یەکیەتیە ئەبینین: وەك کێشەکانی ڕۆمانی نوێ (Probleme de Nouveau Roman) (١٩٦٧). و دەرگایێك بۆ تیۆریی ڕۆمانی نوێ (Pour une Theorie da Nouveau Roman) پێویستە ڕێبازەکانی تریش بەم ڕێبازانەی لە پیشاندەری کاریگەریی ڕۆمانی نوێن لەسەر شێوازە جۆراوجۆرەکانی نوسین، زیاد بکەین. لەبەرهەمگەلێکی تەواو جیاوازدا وەك بەرهەمەکانی ژان کرۆڵ (٠٠٠-١٩١١) بە تایبەت لەم ساڵانەی دواییدا، و کلەودمۆریاك (Claude Moriac) کە لە ماوەیێك لەمەو پێشەوە بەلای قوتابخانەی (نیگا) دا چووەو شێوازی ئەو قوتابخانەی گرتوەتە بەر، نانی ئێوارە لەشار (Lediner en Ville) و ئەگرەندسیمەنت (Agrandissement)، بەرهەمەکانی مارگریت دۆراس (Marguerite Durase) (١٩١٤-١٩٩٦) کە بە تایبەت لە ڕۆمانی شەیدایی لول ڤنستین (La Revissemnt de Lol,V. Stein) (١٩٦٤) ەوە هەتا نەخۆشی-ی مەرگ (La Maladie dela Mort) ١٩٨٢ بایەخێکی یەکجار زۆری پەیدا کردووە.

بەرهەمەکانی ژی. م. ژلی کلێزیۆ (J. M.G. Le Clezio) (٠٠٠- ١٩٤٠) هەر لە شایەتنامچە (Proce Verbal) (١٩٦٣) ەوە هەتا بیابان (Desert) (١٩٨١) سەرەنجام جۆرج پەرەك (Georges Perec) (١٩٣٦-١٩٨٢) کە بەرهەمەکانی بەناونیشانی ژیان، ڕێگەی بەکارهێنان (Lavie Mode D. Emploi) (١٩٧٨) یەکێکە لەسەرسوڕهێنەرترین نمونەکانی توانای جۆراوجۆری ڕۆمانی نوێن.

هەروەها شایانی وەبیرهێنانەوەیە کە هەموو جۆرەکانی ئەدەبیاتی پێشڕەو لەشەستەکاندا پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆیان (ئەگەر بەشێوەی دژایەتیش بێ) لەگەڵ ئەزموونی ڕۆمانی نوێدا بووە.

چ لە ڕێبازی کارکردن لەسەر (فۆرم) و چ لە ڕێبازی لێکۆڵینەوە گەلێك لەکاری (دەق) دا کە گروپی گۆڤاری (telQuel) بە تایبەت خەریکی ئەوەبوون.

لەم ناوەدا بەرهەمەکانی فلیپ سۆلەرز (Philippe Solars) (٠٠٠- ١٩٣٦):
(پارك "Leparc" (١٩٦١) دراما "Drame" (١٩٦٥)، ژمارەکان "Nombers" (١٩٦٨)، یاسا "Lois" (١٩٧٢))، جین ثیبودۆ (Jean Thibaudeu) ، ژان لویی بۆدری (J. L. Baudry)، ژان پییەر فای (J. P. Faye) (٠٠٠- ١٩٢٥): (شکاوی (La Cassure) ترپە (Bottement)، لەمپەر (Ecluse) (١٩٦٤) ترۆیایەکان (Les troyens) (١٩٦٩))، موریس ڕۆش (٠٠٠- ١٩٢٤): (پەستێندراو (Compact) (١٩٦٦)، مەیدان (Ciscus) (١٩٧٢) گرنگیێکی شایانی سەرنجیان هەیە. بەڵام ئەگەر هەموو ئەم بەرهەمانە ببینە خانەی ڕۆمانی نوێوە، لام وانیە کارێکی ڕاست بێ، چونکە ئەم بەرهەمانە چ لەزەمینەی برواو بۆچوونەوە چ لە بابەت توێژینەوە لەمەڕ شێوازی نوسینەوە، زۆر لەوە زیاتر چوونەتە پێشەوە. بەم حاڵەیشەوە، هێشتا بەرهەمگەلێك هەن کە لەسەر هەمان ڕێبازی پەنجاکانە، وەك بەرهەمەکانی مونیك ویتیگە (M. Wittig) ، (ئۆپۆپۆناکس، ژنانی خەباتگێڕ (Opopnax. Les Guerilleres) )کە ئەوەمان بۆ ئەسەلمێنن، هێشتا ئەم ڕێبازە وەلا نەنراوەو بە فۆرمی نوێوە خۆی ئەنوێنێ. بە گشتی بەرگرتنی پرۆسەی ڕۆمانی نوێ لەو شتانەدا کە باسمان کردن روون ئەبێتەوە.

ئەتوانین بڵێین، ئەو بەرهەمانەی بەم ناونیشانەوە پێشکەش کراون، سەختگیرو خۆویست بوونو خوێنەرانی نوێگەرایشیان بووە. ئەو جۆرەی کە ئەم بەرهەمانە سەرنجی خەڵکییان لە فەرەنساو هەروەها وڵاتانی تر وروژاندووە، لێکۆڵینەوەو لێکدانەوەیەکە کە ئیلهامی پێ بەخشیون، (ڕاچەنین)ێکی مەزنی تیۆرێکو زمان ناسانە کە بە دوای ئەم پرۆسەدا پەیدا بووە، و ئەو کارە بەرجەستانەی کە لەسەر (دەق) کراوە، و سەرەنجام بوونە هۆی پچڕانێك لە زەمینەی ئایدۆلۆژیدا، دەری ئەخەن کە ئەم بەرهەمانە لە سەرەتای نیوەی دووهەمی سەدەی بیستەمدا ئەدەبیاتی فەرەنسایان بە تەواوەتی خستووەتە ژێر کاریگەرییەوە.

ئەم گوتارە وەرگێڕاوی بەشی F بابەتی (ڕۆمان) لە دوایین چاپی ئەنسکلۆپیدیا یونیڤێرسال، چاپی پاریس ١٩٩٢ە.

پاراستنی ئابڕووی میللی لەقەڵەم دراو دواتر شێوەی یاخیبوونێکی بەدناوی بەخۆیەوە گرت، پەیوەندیەك نەبوو بەفەوجەوە. وادەهاتە بەرچاو کەدەشێ هەرساتێك شەڕ لەشەقامەکانی شاردا کەهێشتا بەفرەکەی سەریان تەواو نەتواوەتەوە، دەست پێبکات.

دەمەو ئێوارەی رۆژی بیستو هەشتی مانگ چەند جارێك بەتوندی لەدەرگای دەرەوە درا، ریکۆ لەجێی خۆی راپەڕی، بەهەڵەداوان چووە خوارەوە. وەختێ ویستی بەدەستە لەرزۆکەکەی کێلونی دەرگاکە بکاتەوە، تارماییەك لەودیو شووشە بەفر گرتووەکەوە کەهیچ دەنگێکی لێوە نەدەهات دەرکەوت، بەڵام ریکۆ زانیی کەئەوە مێردەکەیەتی، ریکۆ بەبیردا نەدەهات کێلونی دەرگاکە ئاوەها گیربووبێت. بەرەنگاریی دەکردو دەتوت نیازی نییە بکرێتەوە.

ئەوەندەی نەبردو بەبێ ئەوەی بزانێ کەتوانیویەتی دەرگاکە بکاتەوە، مولازم لەسەر راڕەوە کۆنکرێتیەکەو لەناو بانیژەکەدا بەرامبەری وەستا، قاپووتێکی خاکیی لەبەردابوو، قوڕاوی ئەو شەقامانەش کەپیایاندا هاتبۆوە جزمەکانی قورس کردبوو. لەدوای خۆیەوە دەرگاکەی بەکێلونەکە داخستەوەو ریکۆ تێنەگەیشت بۆ وایکرد.

((بەخێربێیتەوە بۆ ماڵەکەت.))

ریکۆ وەکو نیشانەی رێز بۆی نوشتایەوە. بەڵام مێردەکەی هیچ وەڵامێکی نەدایەوە. مولازم قایشی شمشێرەکەی کردەوەو خەریکبوو قاپووتەکەشی دابکەنێ، ریکۆ خێرا چووە دوایەوە تالەداکەندنیدا یارمەتیی بدات. قاپووتەکەی ساردو شێداربوو، وەك ئەو کاتانەی دەدرایە بەرخۆر بۆنی پەینی لێنەدەهات.

ریکۆ هەستی بەقورسایی قاپووتەکە کرد لەسەر قۆڵی. بەعەللاگەیەکدا هەڵیواسیو شمشێرو قایشەکەشی بەدەستەوە گرتو چاوەڕێی کرد تامێردەکەی جزمە درێژەکانی لەپێداکەندو پاشان بەدوایدا بۆ ژووری دانیشتن رۆی، ئەو ژوورەی کەشەش راخەری تیاراخراوەو کەوتۆتە نهۆمی خوارەوە.

لەبەر رووناکیی چراکەدا دەموچاوی مێردەکەی بینی کەمووی چڕ پۆشیبووی. بەرادەیەك بێرەنگو لاواز بووبوو کەنەدەناسرایەوە.

روومەتەکانی بەقووڵاچووبوونو باقوبریقو تەروبڕیەکەی جارانیان نەمابوو. ئەگەر کەیفی هەبووایە وەکو رۆژانی پێشوو هەر بەگەیشتنەوەی بۆ ماڵەوە یەکسەر جلەکانی دەگۆڕیو پەلەی لەریکۆ دەکرد تاخێرا شێوی بۆ ئامادەبکات. بەڵام ئەوەتانێ ئێستا هەر بەجلە سەربازیەکانی بەریەوە لەبەردەم مێزەکەدا دانیشتووەو بەغەمباریەوە سەری بۆ خوارەوە شۆڕکردۆتەوە. ریکۆ ویستی لێی بپرسێت ئایا شێو ئامادە بکات، بەڵام نەیپرسی.

پاش ماوەیەك بێدەنگی مولازم هاتەقسە.

((من ئاگام لەهیچ نەبوو. داوایان لەمن نەکردبوو لەگەڵیاندابم. لەوانەیە رەچاوی ئەوەیان کردبێت کەمن ئەوەندە نابێ ژنم هێناوە. کانۆو هۆماو هەروەها یاما گۆچیش)).

ریکۆ بۆ ساتێکی کورت دەموچاوی ئەو ئەفسەرە لاوە ئازایانەی هێنایە بەرچاوی خۆی کەهاوڕێی مێردەکەیبوونو جارجارە بەمیوانی دەهاتن بۆ ماڵیان.

((لەوانەیە سبەینێ فەرمانێکی ئیمپراتۆری دەربچێتو وای بۆ دەچم ئەوانە بەیاخی لەقەڵەم بدرێن. منیش فەرماندەی وەحدەیەکم کەفەرمانی هێرشکردنە سەریانی پێدراوە... من ناتوانم شتی وابکەم. ئەستەمە ئیشی لەمجۆرە بکەم)).

دوای بێدەنگیەك سەرلەنوێ دەستی بەقسەکردەوە.

((منیان لەئێشکی شەوانە کێشاوەتەوەو مۆڵەتیان داومەتێ بۆ تەنها شەوێك بێمەوە ماڵەوە. سبەی بەیانیش دەبێ بێسێو دوو بچمە

پاڵ هێرشبەرانەوە. ریکۆ... من ناتوانم شتی وابکەم)).

ریکۆ ڕێك دانیشتبوو و چاوەکانی بۆ خوارەوە داگرتبوو. زۆرباش تێگەیشت کەمێردەکەی باس لەمەرگی خۆی دەکات.

مولازم بڕیاری خۆیدابوو. هەر وشەیەك کەڕیشەی لەمەرگدا بوو بەشێوەیەکی توندو بایەخێکی زۆرەوە بەرامبەر ئەم زەمینە تاریك و وەستاوە لەزاری دەهاتە دەرەوە. مولازم گەرچی باسی لەتیامانی سەختو دژواری خۆی دەکرد، بەڵام لەهەمان کاتدا لەزەینیدا جێیەك بۆ دوودڵی نەمابۆوە.

بەهەر حاڵ، لەو بێدەنگیەدا کەباڵی بەسەریاندا کێشابوو ڕوونیەك هەبوو دەشوبهایە سەر ڕوونی ئەو جۆگەلە ئاوەی لەتوانەوەی بەفرەکانەوە سەرچاوە دەگرێ. مولازم کەدوای ئەو ئەزموونە سەختەو ئەو دوو ڕۆژە درێژە ئێستا لەماڵەوە دانیشتبوو و دەیڕوانییە ڕوخساری جوانی هاوسەرەکەی، بۆ یەکەمجار هەستی بەئارامی و ئاسوودەیی کرد. چونکە گەرچی هێشتا ژنەکەی زمانی هەڵنەهێنابۆوە، بەڵام دەیزانی کەئەو بڕیارەی لەپشتی قسەکانی مێردەکەیەوە پەنهانە ئەو تێیدەگات و ڕێزی دەگرێت.

چاوەکانی مولازم هەراوبوون. وێڕای ماندوێتی زۆری، بەڵام چاوەکانی ڕۆشن و بەهێزبوون و بۆیەکەمین جار لەچاوەکانی ژنەکەی دەڕوانی.

((باشە، کەواتە... ئەمشەو بەشمشێر سکی خۆم ئەدڕم)).

ریکۆ ڕانەچڵەکی.

لەچاوە خڕەکانیدا گرژییەك پەیدابوو لەزرنگەی زەنگ دەچوو.

ریکۆ وتی: ((من ئامادەم، تکا دەکەم ڕێم بدە منیش لەگەڵتا بێم)).

مولازم هەستیکرد کەوتۆتە ژێر سیحری ئەو چاوانەوە، بۆیە وشەکان زۆر بەنەرمی لەدەمی دەهاتنە دەرەوە، لەقسەی کابرایەك دەچوون وڕێنەبکات. نەیدەتوانی لەوە تێبگات چۆن بۆ مەسەلەیەکی واسەختو قورس ئاوەها سەر پێبیانە داوای ڕێپێدان دەکرێ.

((زۆر چاکە... پێکەوە دەبین، بەڵام ئەمەوێ یەکەمجار تۆ خۆ کوشتنەکەی من ببینیت. ڕێك کەوتین؟))

وەختێ قسەکەی تەواوبوو، سێڵاوێکی ناگەهان لەشادی دڵیانی نوقم کرد. ئەو متمانەیەی مێردەکەی پێی هەبوو تەواو کاری لەریکۆکرد. بەلای مولازمەوە ئەو مەسەلەیە گرنگ بوو کەلەمردنەکەیدا هیچ شتێکی نائاسایی ڕوونەدات. هەربۆیە دەبووایە شایەتێك هەبووایە. ئەو ڕاستیەش کەهاوسەرەکەی بۆ ئەو مەبەستە هەڵبژاردبوو بەیەکەمین نیشانەی متمانەی دەژمێردرا.

دووەم نیشانەی گەورەتریش بۆ ئەو متمانەیە ئەوەیە کەگەرچی پێشتر گفتی بەهاوسەرەکەی دابوو پێکەوە بمرن بەڵام بیری لەوە نەکردەوە لەپێشدا ژنەکەی بکوژێ، مەرگی ژنەکەی دابووە دەست کاتێك کەخۆی نەماوە تابەچاوی خۆی بیبینێت.

بۆیە ئەگەر ئەم مێردێکی بەدگومان بووایە ئەوا هەروەکو چۆن لەپەیمانو بەڵێنە باوەکانی خۆکوشتن دا هەیە لەپێشدا ئەوی دەکوشت ئینجا خۆی.

وەختێ ریکۆ وتی ((تکا دەکەم ڕێم بدە منیش لەگەڵتا بم))

مولازم هەستی کرد ئەمانە دوا وشەی بەری ئەو تۆوی پەروەردەیەن کەهەر لەیەکەم شەوی ژن و مێردایەتیەوە ئەم خۆی لەهاوسەرەکەیدا چاندبووی. هاوسەرەکەی وا ڕاهێنابوو هەرکاتێك ویستی شتێك بڵێ بەبێ دوو دڵی بیڵێت. ئەمەش لای مولازم ببووە مایەی متمانە بەخۆکردن. کابرایەکی ئەوەندە ڕۆمانسی یاخۆشباوەڕ نەبوو تاوابزانێت کەئەو قسانە تەنها لەخۆشەویستی

ئەوەوە بۆ مێردەکەی و لەو ساتانەدا بەسەر زمانیدا هاتوون.

بەدڵێکی پڕ لەشادمانیەوە زەردەخەنە کەوتبووە سەرلێویان و ریکۆ وایهەستدەکرد گەڕاوەتەوە بۆ یەکەم شەوی بووک و زاوایەتیان. لەبەرچاویدا ئازارو مەرگی نەدەبینی، بەڵکو دەتوت ئاسۆیەکی فراوان و بێکۆتایی لەبەردەمیدا ئاوەڵایە.

ریکۆ وتی ((ئاوەکە گەرمە، خۆت ناشۆیت؟))

((با... بێگومان)).

((ئەی شێو...؟))

ئەم وشانە بەنەغمەیەکی وەها ئاشنایانە لەزاری هاتنەدەر کەمولازمەکە بۆ ساتێك وابەبیریدا هات هەموو شتەکان وڕێنەیەك بوون و هیچی دی.

((بڕوا ناکەم پێویستمان بەشێو هەبێ. بەڵام رەنگە واباشتر بێت کەمێك شەرابی برنج بکوڵێنیت)).

((بەکەیفی خۆت)).

کاتێ ریکۆ هەڵساو کراسێکی درێژی لەکانتۆرەکە دەرهێنا تادوای خۆشتن لەبەریبکات؛ بەئەنقەست سەرنجی مێردەکەی بۆ چەکمەجە کراوەکە راکێشا. مولازم هەڵساو بەرەو لای کانتۆرەکە رۆیشت و چاوێکی بەناوەوەیدا خشاند. نووسراوی سەر ئەو دیارییە لەسەر یەك کەڵەکە کراوانەی خوێندەوە کەبۆ یادگار بۆیان هێنابوون. لەکاردانەوەی مولازمدا هیچ نیشانەیەکی خەم و کەسەر نەدەبینرا بۆ ئەو بڕیارە قارەمانانەیەی دابووی، بەڵکو دڵی لێواو لێو بوو لەسۆز، وەکو هەر مێردێك کەژنە لاوەکەی بەشانازیەوە شتە منداڵانەکانی پیشان ئەدا دڵی نوقمی خۆشەویستی بوو، بەمیهرەوە لەپشتەوە باوەشی کرد بەژنەکەیداو گەردنی ماچ کرد.

[..]زم کرد لەستی بەزبریی ریشە نەتاشراوەکەی موتەنها[..] لەسەر گەردنی. ئەم هەستە بەلایەوە نە[..]نها بەشێك بوو لەجیهان، بەڵکو هەر بۆ خۆی جیهانێك بوو. بەڵام ئەم هەستەی ئێستای لەهەموو ئەوانەی پێشووی تەڕو تازەتر بوو، چونکە بیری کردەوە کەئیدی بۆ هەمیشە لەدەستی دەدات. هەرساتەو هێزی فرەی خۆی هەبوو، تەواوی کونج و کەلەبەرەکانی جەستەی بەئاگا هاتبوونەوە. بۆئەوەی باشتر خۆی بداتە دەست مێردەکەی لەسەر نووکی پێیەکانی وەستاو جڵەوی شل کرد تاموچڕك سەراپای جەستەی بتەنێتەوە.

(( لەپێشدا خۆمان دەشۆین، پاشان شەرابی برنجەکە ئەخۆینەوە... پێخەفەکە لەنهۆمی سەرەوە راخە... باشە؟))

مولازم ئەم قسانەی بەگوێی ریکۆدا چرپاندو ئەویش بەبێدەنگی سەری قایلبوونی بۆ راوەشاند.

مولازم جلە سەربازیەکەی داکەندو چووە حەمامەکەوە. لەکاتێکا خوشەی ئاوی حەمامەکە دەهات، ریکۆ مقەڵی‌یەکی خەڵووزی بردە ژووری دانیشتن و دەستی بەگەرمکردنی شەرابی برنجەکە کرد.

دەستی دایە کراسێکی درێژو سەرشانێك و چەند پارچەیەك جلی ژێرەوەو بەرەو حەمامەکە چوو تالەمێردەکەی بپرسێ ئاوی حەمامەکە چۆنە. مولازم لەناو تەمومژی چڕی هەڵمدا. لەسەر ئەرزی حەمامەکە هەڵتروشکابوو ریشی دەتاشی. ریکۆ لەمیانی هەڵمەکەوە دەیتوانی ببینێت چۆن ماسولکەکانی پشتە تەڕو پتەوەکەی هاوئاهەنگ لەگەڵ جووڵەی قۆڵەکانیدا دەبزوێن.

هیچ شتێك نەبووە نیشانەی ئەوەی کەئەو ساتانە وەختێکی گرنگ و تایبەتین. ریکۆ گەڕایەوە تاسەرگەرمی ئامادەکردنی خۆراك و ئەو قاپ و وردەواڵانە بێت کەلەولاوە دانابوون. دەستەکانی نەدەلەرزین، بگرە لەچاو جاراندا رێکوپێکترو نەرمتر دەجووڵانەوە. راستە ناوبەناو لەقووڵایی سینەیدا هەستی بەخورپەیەکی نامۆ دەکرد

کەدەتوت بروسکەیەکی دوورە، لەپڕێکا پەیدادەبوو و پاشان بێهیچ ئاسەوارێك ون دەبۆوە. جگە لەمە هیچ شتێکی تری نائاسایی لەئارادا نەبوو.

مولازم کەلەحەمامەکەدا خەریکی تاشینی ریشیبوو هەستیکرد بەدەنی گەرمی بەشێوەیەکی پەرجووئاسا لەو ماندوێتیە رزگاریبووە کەهۆیەکەی نیگەرانیی رۆژانی پێشوو بوو. سەرباری ئەوەی کەمەرگیش لەپێش بوو، سەرشاربوو لەچاوەڕوانیەکی ئۆخژنبەخش. دەنگی ژنەکەی کەسەرگەرمی کاری خۆیبوو بەسووکی دەهاتە گوێی، ئەو شەوق و تامەزرۆییە جەستەییە ساغە کە لەدوو رۆژی پێشوودا پەنهان ببوو وادووبارە سەری هەڵدایەوە.

مولازم دڵنیابوو کەئەوە چێژو شادیەکی راستەقینە بوو هەستیان پێکرد وەختێ بڕیاری مەرگیان دا. هەردووکیان لەو ساتانەدا هەستیانکرد ـ هەڵبەتە نەك بەشێوەیەکی روون و بەئاگایانە ـ کەئەو خۆشیە رێپێدراوەی بەنهێنی تامیان دەکرد هەمدیسان هەر لەژێر چاودێریی دادپەروەری و هێزی یەزدانیدا بوو و، لەسروشتێکی ئاکاریی پەتیەوە سەرچاوەی دەگرت. کاتێ دەیانڕوانیە چاوی یەکترو مەرگێکی لەخۆباییان تیا دەخوێندەوە، دیسانەوە هەستیاندەکرد کەلەشوێنێکدان دەستی کەسیان ناگاتێ و لەپشت کۆمەڵێك دیواری ئاسنینەوەن کەلەتوانای هیچ شتێکدا نییە بیانڕووخێنێت و زرێیەکی قایم لەجوانی و حەقیقەت پەناو پۆشاکیانەکە بەهیچ شتێك نابڕێ. بۆیە مولازم هەستی نەدەکرد ناکۆکیەك لەنێوان شەپۆلەکانی جەستەی و دڵسۆزی و راستگۆیی لەئەوینیدا بۆ نیشتمان هەبێ و، بەڵکو دەیتوانی کەهەردووکیان بەدووبەشی شتێك لەقەڵەم بدات.

لەکاتێکا مولازم دەموچاوی خۆی لەوئاوێنە دیوارییە شکاوەوە نزیك کردبۆوە کەتەم گرتبووی و تاریك دەینواند، زۆر بەوردی ریشی دەتاشی. ئەمە روخساری مەرگی دەبێ. نابێ هیچ پەڵەیەکی ناشرین لەدەموچاویدا هەبێ. دەموچاوە پاکەکەی سەرلەنوێ بەبریسکەی لاوێتی گەشایەوە، دەتوت تاریکیی ئاوێنەکە رووناك دەکاتەوە. هەستیکرد جۆرە جوانیەکی پەنهان لەبەستنەوەی ئەم روخسارە تەڕوبڕو گەشاوەیەدا هەیە بەمەرگەوە. هەربەم روخسارەی ئێستایەوە مەرگ لەئامێز دەگرێ! لەراستیدا ئیدی ئەم روخسارە موڵکی تایبەتیی ئەو نییەو بووە بەنیوەپەیکەری سەربازێکی مردوو لەسەر سەکۆیەکی یادگار. هەربۆ تاقیکردنەوە چاوی نووقاند. هەموو شتەکان لەتاریکیدا نوقم بوون. تەواو ئیدی نەبوونەوەرێکی زیندووەو نەهیچ دەبینێ.

لەحەمامەکە هاتەدەرێ، ئاسەواری تاشینەکە لەژێر روومەتە سافەکانیدا شین دەینواند. لای مقەڵیەکەوە کەپشکۆکانی باش گەشابوونەوە دانیشت. سەرنجیدا کەریکۆ وێڕای سەر گەرمیەکەی فریای ئەوەش کەوتووە دەستێك بەخۆیدا بهێنێ. روومەتەکانی ئاڵ و لێوەکانی تەڕ بوون. سێبەری خەمیان پێوە نەدەبینرا. مولازم بەبینینی نیشانەکانی سروشتی سۆز ئامێزی ژنەکەی، هەستیکرد هەر بەڕاستی هاوسەرێکی هەڵبژاردووە کەشایستەی خۆیەتی.

مولازم هەرکە پێکی شەرابی برنجەکەی هەڵدا، ئینجا دای بەریکۆ کەپێشتر دەمی لێنەدابوو. بەڵام بێسێ و دوو لێی وەرگرت و بەسڵەوە قومێکی لێدا.

مولازم پێی وت ((وەرە ئێرە)).

ریکۆ هاتە لایەوەو خۆی فڕێدایە باوەشیەوە، مولازمیش توند لەئامێزی گرت... لەسینەیدا جۆش و خرۆشێکی بێئەندازە پەیدا بووبوو، پێدەچوو خەم و شادی و کاریگەریی شەرابی برنجەکە لەگەڵ یەکدا ئامێتەبووبن و ئەو جۆشەیان لەدەروونیدا دروستکردبێت. مولازم لەروخساری ژنەکەی وردبۆوە. ئەمە دوا روخسارە کەلەم دونیایەدا دەیبینێت.

تەنانەت دوانیگای روخساری ژنەکەشیەتی.
مولازم زۆر بەوردی لەدەموچاوی هاوسەرەکەی راما. وەك رامانی موسافیرێك لەو دەڤەرە دڵڕفێنەی کەجێی دێڵێت و چیدی نایبینێتەوە. ئەمە روخسارێك بوو کەلەتەماشاکردنی ماندوونەدەبوو. خەتەکانی رێك بوون بەڵام ساردو سڕ نەبوو، لێوەکانی توندو بەنەرمی نووقابوون.

مولازم بێبیرکردنەوە ماچێکی لێوەکانی کرد. ناکاو سەیری کرد لەژێر برژانگە درێژەکانی ئەو دووچاوە نووقاوەوە دڵۆپە فرمێسکێك لەشێوەی جۆگەلەیەکی درەوشاوەدا دێتە خوارو بەبێ ئەوەی ئەم گریانە گۆڕانێکی ناشرین لەسیمایدا دروستبکات.

پاش تۆزێك، کاتێ مولازم داوای لەژنەکەی کرد کەبچنە ژووری نووستن لەنهۆمی سەرەوە، ریکۆ وتی دوای ئەوەی خۆی شت یەکسەر دێتە لای. مولازم بەتەنیا بەسەر پێپلیکانەکاندا چووە سەرەوە، سۆپایەکی گازی هەوای ژووری نووستنەکەی گەرمکردبوو، خۆی هەڵدایە ناو پێخەفەکەوە، دەست و قاچی کراوە بوون.

ئەو وەختەی لەچاوەڕوانیکردنی ژنەکەشیدا بردیە سەر نەلەجاران زووترو نەدرەنگتربوو.

دەستەکانی خستە ژێر سەری و چاوی بڕییە ئەو رایەڵە تاریکانەی ساپیتەکە کەکەوتبوونە ناو بازنەی تاریکی ئەودیو چراکەوە. ئایا ئەمە مەرگە چاوەڕێی دەکات؟ یان نەشئەیەکی جۆشسەندووی هەڵچوونی ژیانە؟ لەوە دەچوو هەردووکیان بەناویەکدا چووبن. دەتوت مەبەست و مرازی ئەم مەیلە جەستەییە مەرگ خۆیەتی. بەڵام بەهەرحاڵ هەرچیەك بێت، مولازم لەشتێك دڵنیابوو:

هەرگیز پێشتر بەمجۆرەی ئێستا ئازادیی کامڵ و تەواوی تاقی نەکردۆتەوە.

لەودیو پەنجەرەکەوە دەنگی ئۆتۆمۆبێلێك دەهاتەگوێ، تایەکانی لەو بەفرەدا دەخولانەوە کەلەقەراغی شەقامەکەدا تۆپەڵ کرابوو. دەنگی هۆڕنەکەشی لەودیو دیوارە نزیکەکانەوە دەنگی ئەدایەوە. بەگوێگرتنی بۆ ئەم دەنگانە وایهەستدەکرد خانووەکەی دوورگەیەکی تەریکی ناو ئۆقیانووسی کۆمەڵگایەکە کەهەمیشەو بێهوودە بەدوا بەرژەوەندیەکانی خۆیدا هەڵپەدەکات. بەدەوریداو لەهەموو لایەکەوە وڵاتەکەی بەنارێکی پەرش و بڵاوبۆوە. ئەو وڵاتەی کەئەم خەمی بۆ دەخواردو ژیانی خۆی پێدەبەخشی. بەڵام ئەم وڵاتەی کەئەم ژیانی خۆی ئەکاتە قوربانی و تائەو رادەیەی لەپێناویدا خۆی دەکوژێت، ئاخۆ هیچ بایەخێك بەمردنەکەی ئەدات؟ نازانێ، بەڵکو بەلایەوە گرنگیش نییە. مەیدانی شەڕی ئەم مەیدانێکە بۆ شانازی نییە، مەیدانی شەڕێك نییە بۆ پیشاندانی ئازایەتی، بەڵکو سەنگەری پێشەوەی رۆحە.

دەنگی پێی ریکۆ دەهات کەبەپێپلیکانەکاندا سەردەکەوت، پێپلیکانە پێچاوپێچەکانی ئەم خانووە کۆنە لەژێر پێیدا تەق وتۆقی دەکرد.

ئای... ئەم تەق و تۆقە چ یادگارێکی شیرینیان لای مولازم هەیە، چەندەهاجار ئەو کاتانەی ئەم لەناو پێخەفدا چاوەڕێی ریکۆ بووە گوێی بۆ ئەو دەنگە دڵنیشینە شل کردووە. کەبیری لەوەش کردەوە ئەمە دواجارە گوێی لەو دەنگەبێت، زۆر بەوردی گوێ قوڵاخ بوو. بەشەوقەوە خوازیاری ئەوەبوو دەنگی پێیەکانی ئەو تەواوی ساتەکانی ئەو کاتە گرانبەهایە بتەنێتەوە. ئەو ساتانەی لابیوون بەکۆمەڵێك گەرهەر کەتیشکێك لەناوەوەیانەوە دەیدرەوشاندنەوە.

ریکۆ رەفتەیەکی ناگۆیایی لەسەر کەمەری ((یوکاتا)) کەبەستبوو. کاتێ مولازم دەستی درێژکرد تارەفتەکە بکاتەوە، رەنگی کراسەکەی سوورتر دەرکەوت چونکە بەری رووناکیی چراکەی لێ گیرا، ریکۆ دەستیبرد تایارمەتیی بدات، رەفتەکە کرایەوەو کەوتەسەر ئەرزی ژوورەکە. ریکۆ هێشتا یوکاتاکەی لەبەردابوو

کەلەبەردەم مولازمدا بەپێوە وەستابوو. مولازم هەردوو دەستی لەهەردوو قلیشی قۆڵەکانیەوە بردو ویستی هەر بەپێوە باوەشی پیابکات، بەڵام هەر ئەوەندە سەری پەنجەکانی بەر لەشە گەرمو رووتەکەی کەوتو هەردوو بنباڵی بەئارامی لەسەر دەستەکانی جووت بوون، ئیدی لەپڕێکا تەواوی جەستەی بوو بەپشکۆ.

هەمووی چەند ساتێکی نەبرد هەردووکیان بەرووتی لەبەردەم سۆپا گازیەکەدا کەئاگرەکەی گەش بوو بوو، راکشان.

هیچیان ئەوەیان نەئەدرکاند کەبەبیریاندا گوزەری دەکرد، بەڵام دڵو جەستەو سینەیان کەدەیانزانی ئەمە دواجارە، جۆشیان سەندبوو. دەتوت بەکۆمەڵێك پیتی پرشنگدار لەسەر هەر جووڵەو بزاوتێکی سەراپای جەستەیان نوسرابوو ((دواجار)). مولازم ریکۆی بۆلای خۆی راکێشاو بەگەرمی کەوتە ماچکردنی. وەختێ زمانیان خستە ناودەمی یەکترەوە هەستیانکرد گیانەڵای سەرەمەرگ وەك ئاسنی سوور هەڵگەڕاو هەستەکانیانی تیژکردۆتەوە. هێشتا هەستیان بەو گیانەڵایە نەکردبوو، بەڵام ئازاری مەرگ کەڵێیانەوە دووربوو هەستو سۆزیانی بەشادمانی پاکژکردبۆوە.

مولازم بەژنەکەی وت: ((ئەمە دواجارە جەستەتی تیا ببینم، بهێڵە بالەنزیکەوە لێی ورد ببمەوە)).

ئینجا ئاراستەی کڵاوەی چراکەی گۆڕی بەجۆرێك کەتیشکی چراکە سەراپای جەستەی ریکۆی رووناك کردەوە. ریکۆ هەر راکشابوو وچاوی نووقاندبوو، رووناکیی چراکە تەواوی ئەندامە سپیو سۆڵەکەی خستبووە روو. مولازم لەخۆشیانا نەشئەگرتی لەوەی کەفریاناکەوێ ببینێ چۆن مەرگ ئەم جوانییە هەڵدەوەرێنێ، لەمەشدا هیچ نیشانەیەکی خۆپەرستی نەبوو.

مولازم جڵەوی بۆخۆی شل کرد تائەو دیمەنە کەلەبیرناچێتەوە لەزەینیدا بچەسپێ، بەدەستێکی یاریی بەقژی دەکردو دەستەکەی تریشی بەنەرمی بەسەر ئەو روخسارە ئەفسووناویەدا دەهێنا. چاوی بەر هەر کوێی دەکەوت ماچی بەسەردا ئەباراند... نێوچەوانی بەرزی کەساردبوو، چاوانی نووقاوی بەبرژانگە درێژەکانیەوە لەژێر برۆ تەنکەکانیەوە کە ماکیاژێکی کاڵ کرابوون. لووتە رێکو جوانەکەی، بریقەی دانەکانی کەلەبەینی لێوە گۆشتنو ناسکەکانیدا دەبریسکانەوە، کوڵمە نەرمەکانیو چەناگەی بچکۆلەی... هەموو ئەمانە لەزەینی مولازمدا وێنەی روخسارێکی درەوشاوەی بەرجەستە ئەکرد کەمەرگی لەپێشە. ئینجا لێوەکانی خۆی توند نووساند بەگەردنە سپییەکەیەوە ـ ئەو شوێنەی کەدواتر ریکۆ بەخەنجەر ئەیبڕێ ـ هێندە ماچیکرد گەردنی سوور هەڵگەڕا. ئینجا بەهێواشی لێوەکانی خستە سەر لێوەکانی ریکۆو بەوپەڕی نەرمییەوەو بەریتمێکی تایبەتیو لەرینەوەیەکەوە کەلەلەرینەوەی بەلەمێکی بچکۆلە ئەچوو لێوی دەهێناو دەبرد، گەر چاوانی بنووقاندایە جیهان لەلای بێشکەیەك بوو.

چاوەکانی مولازم روویان لەکوێ بووایە لێوەکانیشی بەدوایدا گوێڕایەڵانە روویان لەوێ دەکرد. مەمکە قوتەکانیشی کەگۆکانیان دەتوت گێلاسی کێویلەیە، وەختێ لێوەکانی مێردەکەیان پێگەیشت توندبوون. قۆڵەکانی ریکۆ لەملاولای سنگیەوە بەهێمنی شۆڕببوونەوە، ئەو قۆڵانەی کەتا دەگەیشتنە مەچەکی وردە وردە باریك ئەبوونەوە، گەرچی هەر خڕوڕێك بوونو بەپەنجە شمشاڵیەکانیشی کۆتاییان دەهات. هەمان ئەو پەنجانەی کەلەئاهەنگی بووکێنیدا باوەشێنەکەیان گرتبوو. دوای ئەوەی مولازم پەنجەکانی ماچ دەکرد یەك یەك دەکشانەوە دواوە دەتگوت شەرم دەکەن.

چەمانەوەی سروشتیی نێوان سینەو سکی چەند خەتێکی دروست کردبوو کەتەنها نیشانەی

# ناتالی ساڕۆت‌و ڕۆمانی نویێ

● و: سەهەند

(خانم ناتالی ساڕۆت (Nathalie Sarraute) بە یەکێك لە پێشڕەوانی ڕۆمانی نویێ دەژمێردرێ. ساڵی ١٩٠٢ لە شاری ئیڤانۆڤۆ کە دەکەوێتە باکووری خۆرهەڵاتی مۆسکۆوە لە دایك بووە، هەر بە منالی دەچێتە فەرەنساو لە پاریس نیشتەجێ دەبێ‌و هەر لەوێ خوێندن تەواو دەکات‌و لە ئەدەب‌و لە حقوقدا لیسانس وەردەگرێ. جگە لە ڕووسی‌و فەرەنسی‌و زمانی ئەڵمانی‌و ئینگلیزیش فێردەبێ. ساڵی ١٩٣٨ یەکەمین کاری خۆی چاپ دەکات کە ئەویش (هەڵچوونەکان)ە، پاش ئەو کارەی چوار ڕۆمانی دی دەنوسێ کە یەکەمیان (وێنەی نەناسێك)ە کە لە ساڵی ١٩٤٨دا لە چاپی دەدات‌و فەیلەسوفی فەرەنسایی (ژان پۆڵ سارتەر) پێشەکی بۆ دەنوسێ، ئینجا ڕۆمانی (مارتیرۆ) ١٩٥٣، ڕۆمانی (هەسارە) ١٩٥٩، (میوەی ئاڵتوونین) ١٩٦٣ کە خەلاتێکی ئەدەبی جیهانیی پێ وەردەگرێ‌و پێشتر هەمان خەلاتیش دراوە بە سامۆییل بیکیت. جگە لەمانە ساروت کتێبێکی تیۆری لە بواری تیۆری ڕۆمانی نویێدا هەیە کە بەناوی (چاخی بەدگومانی) یەوەیەو دەکرێ بە یەکەمین ناسێنەری تیۆری ڕۆمانی نویێ لە قەڵەم بدەین‌و کاریگەرییەکی قووڵی کردە سەر نووسەرە ئەوروپاییە لاوەکان، ئەم گفتوگۆیەش ساڵی ١٩٩٤ لە لایەن (ڕامین جهانبگلو)ەوە لەگەڵیدا ئەنجام دراوە – و–)

* بەلای کەسانێکی زۆرەوە ئێوە هەمیشە یەکێك بوون لە نوێنەرانی ڕۆمانی نویێ، چۆن دەڕواننە بەسەرهاتی ڕۆمانی نویێ؟ ئایا بەلای ئێوەوە ڕۆمانی نویێ بووە بە بەسەرهاتێکی کۆن یان لەو باوەڕەدان کە هێشتا زیندوێتی خۆی لە دەست نەداوە؟

– من لەو بڕوایەدام کە بزاڤی ڕۆمانی نویێ گەلێ سوود بەخش بوو، بەڵام گەلێ پەرەوازە بوو. بەڕای من بزاڤی ڕۆمانی نویێ ساڵی ١٩٥٧ بە کتێبەکەی من (چاخی بەدگومانی) دەستی پێ کرد. بەڵام دەبێ ئەوەش بگوترێ کە کۆمەڵێك نووسەر لە فۆرمۆلە کردنی ئەم بزاڤەدا بەشدار بوون‌و هەر یەکێك لەم نوسەرانە ڕێگایەکی جیاوازی بۆ خۆی گرتبووە بەر، هیچ خاڵێکی هاوبەش لە نێوان ئەم نووسەرانەدا نەبوو تەنها ئەوە نەبێ کە دەبێ ڕۆمان وەك هەر شێوەیەك لە شێوەکانی تری هونەر بەردەوام نویێ بێت.

● ئێستا لە ڕۆمانی نویێ چی ماوەتەوە؟

– لە ڕۆمانی نویێ جگە لە نوسەرەکانی هیچی تر نەماوەتەوە، واتە کەسانێکی وەك کلۆد سیمۆن یان ئالان ڕۆب گرێ‌و یاخود خۆم کە تا ئێستا لە نوسیندا بەردەوامم.

* میشێل بۆتۆر دەیوت: ڕۆمانی نویێ قوتابخانەیەك نی‌یە، بەڵکو بزاڤێکی مێژوویی‌یە، تۆ لەم بارەیەوە ڕات چی‌یە؟

– من لەگەڵ میشێل بۆتۆردا هاوڕام، ڕۆمانی نویێ قوتابخانەیەك نی‌یە بەڵکو هەروەکو وەکو دەڵێت لە کۆمەڵێك نووسەر پێك هاتووە کە بە ڕای من لە چاخی بەدگومانی‌دا بۆچوونەکانیان وەك یەك بووەو دەیانویست ڕۆمان نویێ بێتەوە؛ ئەو نوێیەتیەی کە لە هەر شێوەیەکی‌تری هونەردا هەیە. لە ڕاستی‌دا ئالان ڕۆب گرێ یەکەمین کەس بوو بیری لە پێکهێنانی بزاڤێك بۆ بەرەنگاری ئەدەبیاتی تەقلیدی کردەوە. وەختێ ((چاخی

ئەواوی ئەندامی جەستەیان وەها جووت بیوون کەدەتگوت ئەو دووانە هەرگیز لەیەکتر جیانابنەوە. ریکۆ ئاهێکی لێبەرزبۆوە، لەترۆپکەوە بۆ نشێو شۆڕبوونەوەو لەنشێوەوەو بەدووبالّی سیحرییەوە بەرەو لوتکەو قوللەکان فڕین. مولازم وەك ئالاّ هەلگری تیمێکی سەربازی کەوتبووە هەناسەبڕکێ... وەختێ دەگەیشتنە نەشئە شەپۆلێکی نوێی بەدوادا دەهاتو دیسانەوەو بێهیچ نیشانەیەکی بێزاریو بەجوولەیەکی هاوئاهەنگ پێکەوە بەرەو بەرزاییەکان لەشەقەی بالّیان ئەدایەوە.



وەختێ سەرەنجام مولازم کشایەوەو چووە لاوە، لەبەرماندوێتی نەبوو، بەلّکو لەبەرئەوەبوو لەو هێزو توانایەی کەم نەبێتەوە کەبۆ خۆکوشتن پێویستی پێبوو. هەروەها لەبەرئەوەش کەحەزی نەدەکرد لەچێژی جەستەییدا زێدەڕۆیی بکاتو بەوە شیرینیو جوانیی ئەم دوا یادەوەریانە بلەوتێنێت.

کەمولازم کشایەوە؛ ریکۆش پەیرەویی لەمێردەکەی کردو هەردووکیان بەرووتی لەسەر پشت درێژبوونو لەکاتێکا پەنجەکانیان لەیەك ئالاّبوو چاویان بڕیبووە ساپیتە تاریکەکە. سۆپاکە هەوای ژوورەکەی گەرمکردبوو و تەنانەت کەئارەقەکەی لەشیشیان وشك بۆوە، هەستیان بەسەرما نەکرد. بێدەنگی بالّی بەسەر شەوی دەرەوەشدا کێشابوو، دەنگی هاتوچۆی ئۆتۆمۆبێلەکان نەدەبیسترا. تەنانەت دەنگی شەمەندەفەرو ترامواکانی ئێستگای یۆتسۆیاش نەدەهاتە گوێ. پێشتر دەنگیان لەودیو ئەو شوێنەوە دەهات کەمەتەرێزی تیاهەلّچنرابوو ئینجا، لەو سەیرانگا جەنگەلّیە چڕەدا ون دەبوو کەبەرامبەر ئەو جادە پانەبوو کەبەئاکاسا پالاّسدا ئەیڕوانی.

ئەو پێکدادانانەی ئەم ناوەی گرتبۆوە جێی باوەڕنەبوو، ئەم شوێنەی کەتیایدا دوو گرووپی جیابۆوە لەسوپای ئیمپراتۆر زۆر دلّڕەقانە بەرامبەریان لەیەك گرتبوو وئامادەی شەڕبوون.

هەردووکیان راکشابوونو پڕبوون لەلەزەتی ئەو گەرمیەی ناخیانی تەنیبۆوە، ئەو نەشئانەیان دەهاتەوە یاد کەتۆزێك لەمەوبەر چێژیان کردبوو. هەر ساتێك لەساتەکانی ئەو لەزەتە لەلایان رۆحی دەهاتەوە بەبەردا. بیریان لەتامی ئەو ماچانە دەکردەوە کەهەرگیز لێی تێر نەبوون، لەبەریەك کەوتنەکانی لەشیان. دیمەن دوای دیمەن لێواو لێو بوو لەخۆشیو بەختەوەری. بەلاّم لەهەمان کاتدا تارمایی مەرگ لەنێوان رایەلّەکانی ساپیتە تاریکەکەوە چاوی تێبڕیبوون. ئەو لەزەتو خۆشییانە دوالەزەتو خۆشیبوونو جارێکیدی جەستەیان پیایدا تێناپەڕێتەوە.

هەردووکیان بیریان لەوە دەکردەوە تازە ئەگەر تاپیریش بژین ئەستەمە چێژی خۆشیی لەزەتێکی تری وەها بکەنەوە.

پاش تۆزێکی دی تەنانەت لەهەستی پەنجە لێکئالاّوەکانیشیان بێبەش دەبن. هەروەها لەرەگی سەر رووی ئەو دارە رایانەی ساپیتە تاریکەکە کەئێستا چاویان تێبڕیوە. هەستیان دەکرد تادێ مەرگ زیاتر لێیان نزیك دەبێتەوە. ئیدی دوودلّیەك لەئارادا نەماوە. دەبووایە خۆیان ئازایانە دەستیان بۆ مەرگ درێژ بکردایە وە چنگیان لێ گیر بکردایە.

مولازم وتی: ((چاکە... ئینجا باخۆمان ئامادە بکەین)) نەغمەی پێگیری بەم وشانەیەوە دیاربوون، بەلاّم لەهەمان کاتدا ریکۆ هەستیکرد هیچ وەختێ دەنگی مێردەکەی ئاوەها گەرمو بەسۆز نەبووە.

دوای ئەوەی لەجێگەکەیان هەلّسان، کۆمەلێك کاری جیاجیا لەبەردەمیاندا بوو. مولازم کەپێشتر هەرگیز دەستی بۆ دۆشەکەکان نەبردووە ئەمجارە بەوپەڕی شادمانیەوە دەستی دانیو کۆیکردنەوە، دەرگای کانتۆرەکەی کردەوەو هەلّیگرتن.

تەواوی ئەندامی جەستەیان وەها جووت ببوون کەدەتگوت ئەو دووانە هەرگیز لەیەکتر جیانابنەوە. ریکۆ ئاهێکی لێبەرزبۆوە، لەترۆپکەوە بۆ نشێو شۆڕبوونەوەو لەنشێوەوەو بەدووبالّی سیحرییەوە بەرەو لوتکەو قوللەکان فڕین. مولازم وەك ئالآ هەلگری تیمێکی سەربازی کەوتبووە هەناسەبڕکێ... وەختێ دەگەیشتنە نەشئە شەپۆلێکی نوێی بەدوادا دەهاتەو دیسانەوەو بێهیچ نیشانەیەکی بێزاریو بەجوولەیەکی هاوئاهەنگ پێکەوە بەرەو بەرزاییەکان لەشەقەی بالّیان ئەدایەوە.



وەختێ سەرەنجام مولازم کشایەوەو چووە لاوە، لەبەرماندوێتی نەبوو، بەلّکو لەبەرئەوەبوو لەو هێزو توانایەی کەم نەبێتەوە کەبۆ خۆکوشتن پێویستی پێبوو. هەروەها لەبەرئەوەش کەحەزی نەدەکرد لەچێژی جەستەییدا زێدەڕۆیی بکاتو بەوە شیرینیو جوانیی ئەم دوا یادەوەریانە بلەوتێنێت.

کەمولازم کشایەوە؛ ریکۆش پەیڕەویی لەمێردەکەی کردو هەردووکیان بەرووتی لەسەر پشت درێژبوونو لەکاتێکا پەنجەکانیان لەیەك ئالآبوو چاویان بڕیبووە ساپیتە تاریکەکە. سۆپاکە هەوای ژوورەکەی گەرمکردبوو و تەنانەت کەئارەقەکەی لەشیشیان وشك بۆوە، هەستیان بەسەرما نەکرد. بێدەنگی بالّی بەسەر شەوی دەرەوەشدا کێشابوو، دەنگی هاتوچۆی ئۆتۆمۆبێلەکان نەدەبیسترا. تەنانەت دەنگی شەمەندەفەرو تراموا‌کانی ئێستگای یۆتسۆیاش نەدەهاتە گوێ. پێشتر دەنگیان لەودیو ئەو شوێنەوە دەهات کەمەتەرێزی تیاهەلّچنرابوو ئینجا، لەو سەیرانگا جەنگەلّیە چڕەدا ون دەبوو کەبەرامبەر ئەو جادە پانەبوو کەبەئاکاسا پالآسدا ئەیڕوانی.

ئەو پێکدادانانەی ئەم ناوەی گرتبۆوە جێی باوەڕنەبوو، ئەم شوێنەی کەتیایدا دوو گرووپی جیابۆوە لەسوپای ئمپراتۆر زۆر دلّڕەقانە بەرامبەریان لەیەك گرتبوو وئامادەی شەڕبوون.

هەردووکیان راکشابوونو پڕبوون لەلەزەتی ئەو گەرمیەی ناخیانی تەنیبۆوە، ئەو نەشئانەیان دەهاتەوە یاد کەتۆزێك لەمەوبەر چێژیان کردبوو. هەر ساتێك لەساتەکانی ئەو لەزەتە لەلایان رۆحی دەهانەوە بەبەردا. بیریان لەتامی ئەو ماچانە دەکردەوە کەهەرگیز لێی تێر نەبوون، لەبەریەك کەوتنەکانی لەشیان. دیمەن دوای دیمەن لێواو لێو بوو لەخۆشیو بەختەوەری. بەلآم لەهەمان کاتدا تارمایی مەرگ لەنێوان رایەلّەکانی ساپیتە تاریکەکەوە چاوی تێبڕیبوون. ئەو لەزەتو خۆشییانە دوالەزەتو خۆشیبوونو جارێکیدی جەستەیان پیایدا تێناپەڕێتەوە.

هەردووکیان بیریان لەوە دەکردەوە تازە ئەگەر تاپیریش بژین ئەستەمە چێژی خۆشیو لەزەتێکی تری وەها بکەنەوە.

پاش تۆزێکی دی تەنانەت لەهەستی پەنجە لێکئالآوەکانیشیان بێبەش دەبن. هەروەها لەرەگی سەر رووی ئەو دارە رایانەی ساپیتە تاریکەکە کەئێستا چاویان تێبڕیوە. هەستیان دەکرد تادێ مەرگ زیاتر لێیان نزیك دەبێتەوە. ئیدی دوودلّیەك لەئارادا نەماوە. دەبووایە خۆیان ئازایانە دەستیان بۆ مەرگ درێژ بکردایە وە چنگیان لێ گیر بکردایە.

مولازم وتی: ((چاکە... ئینجا باخۆمان ئامادە بکەین)) نەغمەی پێگیری بەم وشانەیەوە دیاربوون، بەلآم لەهەمان کاتدا ریکۆ هەستیکرد هیچ وەختێ دەنگی مێردەکەی ئاوەها گەرمو بەسۆز نەبووە.

دوای ئەوەی لەجێگەکەیان هەلّسان، کۆمەلّێك کاری جیا لەبەردەمیاندا بوو. مولازم کەپێشتر هەرگیز دەستی بۆ دۆشەکەکان نەبردووە ئەمجارە بەوپەڕی شادمانیەوە دەستی دانیو کۆیکردنەوە، دەرگای کانتۆرەکەی کردەوەو هەلّیگرتن.

ریکۆ سۆپا گازیەکەی کوژاندەوەو کڵاوەی چراکەی وەکو خۆی لێکردەوەو لەجێی خۆی دایناپەوە. ریکۆ لەودوو رۆژەی پێشوودا بەوردی ژوورەکەی رێكو پاکو تەمیز کردبوو، چی تەپو تۆزی سەر شتەکانە سڕیبوونی. ئەگەر کەسێك لەو مێزەی بڕوانیایە کەلەداری (زمانە وەنەوشە) دروستکرابوو و لەگۆشەیەکی ژوورەکەدا دانرابوو؛ ژوورە هەشت راخەریەکەی وادەهاتە بەرچاو کەژوورێکی پێشوازییەو بۆ میوانێکی بەشانو شەوکەت ئامادەکراوە.

((لەم ژوورەدا لەگەڵ کانۆو هۆماو یاماگۆچیدا خواردوومانەتەوە... وانییە؟))

((بەڵێ... هەمووشیان زۆریان دەخواردەوە.))

((بەم زووانە لەو دنیا دەیانبینین، بەڵام واهەست دەکەم وەختێ دەبینن تۆشم لەگەڵ خۆمدا بردووە؛ سەرزەنشتیم دەکەن)).

مولازم کەبەپێپلیکانەکاندا چووە خوارەوە، هەڵوێستەیەکی کردو ئاورێکی دایەوە تاسەیرێکی ژوورە ئارامو پاکو تەمیزەکە بکات، کە لەرووناکیی چرای ساپیتەکەدا نوقم بووبوو. دیمەنی ئەفسەرە لاوەکانی هاوڕێی دەهاتە بەرچاو کەمەست بوونو داویانەتە قاقای پێکەنینو قسەو گاڵتەی دڵپاکانە. ئەو دەمانە هەرگیز بەبیریدا نەدەهات کەرۆژێ دێ لەهەمان ژووردا بەشمشێر سکی خۆی ئەدڕێ.

پاشان لەهەردوو ژوورەکەی نهۆمی خوارەوە مولازم و ژنەکەی بەکاوەخۆ کەوتنەخۆ ئامادەکردن. مولازم سەرەتا چوو بۆ دەستشۆریو پاشان بۆ حەمام تا خۆی بشوات. لەو کاتەدا ریکۆ فانیلەیەکی قەدکردو لەگەڵ چاکەتو پانتۆڵە سەربازیەکەیو هەروەها پەشتەماڵێك کەتازە چنرابوو، خستنیە شوێنی جلوبەرگەوە لەحەمامەکە. پاشان هەندێ کاغەزی هێناو لەسەر مێزی ژووری دانیشتنەکەی دانا تا دوانامەی ماڵئاوایی خۆیانی تیابنووسن. ئینجا

چەکمەجەی مێزەکەی راکێشاو شووشەی مەرەکەبەکەی دەرهێنا. پێشتر بڕیاری دابوو لەنامەی ماڵئاواییەکەیدا چی بنووسێ.

ریکۆ توند پەنجەکانی نابەسەر پیتە ئاڵتوونیەکانی شووشەی مەرەکەبەکەداو یەکسەر ئاوەکەی رەش بوو، دەتگوت پەڵە هەورێکی رەش بەسەریەوە. بیری کردەوە کەئەم کارە دووبارەکراوەی، واتە گوشار خستنەسەر شووشەکە بەپەنجەکانیو، بەرزبوونەوەو نزم بوونەوەی ئەو دەنگە کزە، ئەمانە هەموو بۆ خۆگەیاندنە مەرگ بوو. وەستا، ئەمە ئەرکێکی رۆتینیی ماڵەوەو بەسەربردنی کات بوو بۆ گەیشتن بەمەرگ کەدواجار لەبەردەمیدا قوت دەبێتەوە. بەڵام جۆرە تاریکیەکی چڕ خۆی لەو جووڵەیەدا پەنهان کردبوو کەمەرەکەبەکەی لەبەردەکە ئەسوو و هەروەها لەبۆنی مەرەکەبە خەستەکە. مولازم بەپاکو تەمیزیو لەجلە سەربازیەکەیدا کەبەلەشیەوە چەسپ بووبوو لەحەمامەکە هاتەدەرێ. بەبێ ئەوەی ورتە بکات رێك بەرەو لای مێزەکە چوو و پێنووسێکی بەدەستەوەگرتو بەدوو دڵیەوە روانییە کاغەزەکەی بەردەمی.

ریکۆش کیمۆنۆیەکی سپیی ئاوریشمی هەڵگرتو چووە حەمامەکەوە. کاتێ هەمدیسان هاتەوە ژووری دانیشتنەکە، کیمۆنۆ سپییەکەی لەبەردابوو وسووکە ئارایشتێکی کردبوو. نامەی ماڵئاواییەکەی بینی کەلەژێر رووناکیی چراکەدا دانرابوو و ئەم نووسینەش بەخەتێکی رەش سەرنجی راکێشا:

((بژی هێزەکانی ئیمپراتۆری - مولازم تاکایاما، شینجی))

کاتێ ریکۆ بەرامبەری دانیشتو دەستی بەنووسینی نامەی ماڵئاواییەکەی خۆیکرد، مولازم بەئارامیو بەجیدیەوە سەیری جووڵەی پەنجە رەنگ پەڕیوو لەرزۆکەکانی ژنەکەی کرد کەبەکارامەیی پێنووسەکەی بەکاردەهێنا.

هەردووکیان چوون بۆلای ڕەفە گەورەکە، مولازم شمشێرەکەی لەکەمەر بەستبوو، هەروەها خەنجەرەکەی ریکۆش بەکەمەربەندی کیمۆنۆ سپیەکەیەوە بوو، بەبێدەنگی دەستیان بەنوێژکرد. ئینجا تەواوی چراکانی نهۆمی خوارەوەیان کوژاندەوە. مولازم بەدەم سەرکەوتنەوە بەسەر پێپلیکانەکاندا ئاوڕێکی لەهاوسەرەکەی دایەوەو سەیرێکی ئەندامە دڵڕفێنەکەی کرد کە کیمۆنۆیەکی سپی پۆشیبوو وچاوەکانی داگرتبوون و لەو تاریکیەدا بەدوا مێردەکەیدا بەسەر پێپلیکانەکاندا سەردەکەوت.

نامەکانیان لای یەکەوەو لەتاقی ژوورەکەی سەرەوە دانا. بیریان لەوە کردەوە ئایا پێویست دەکات بەڵگەنامە هەڵواسراوەکەیان هەڵگرن یان نە، بەڵام لەبەرئەوەی بەڵگەنامەکەیان لەلایەن نێوەندەکەیانەوە کەسەرتیپ ئۆزکی‌یە نووسراوە، هەروەها دووپیتی چینیی لەسەرە کەڕەمزن بۆ ((ئەوینی نیشتمان))، دەستیان تیێ نەدا. خۆئەگەر خوێناویش بێت ئەوا سەرتیپ لەوە تێدەگات.

مولازم پشتی کردە ئەو شوێنەی نامەکانی تیادانراوەو لەسەر زەوی‌یەکە دانیشت و شمشێرەکەی رێك لەبەردەمی خۆیدا دانا. ریکۆش بەپانایی راخەرێك دوور لەو بەرامبەری دانیشت. لەبەرئەوەی سەراپای جەستەی سپی‌بوو سووراوەکەی لێوی دڵڕفێن ئەینواند. بەتامەزرۆییەوە روانیانە چاوی یەکدی. شمشێرەکەی مولازم لەبەردەم ئەژنۆکانیدا بوو. وەختێ ریکۆ چاوی چووە سەر شمشێرەکە یەکەم شەوی بووکێنیی خۆی هاتەوەیادو خەمێکی قووڵ دایگرت.

مولازم بەئاوازێکی گڕەوە کەوتەقسە:

((لەبەرئەوەی کەسێ یارمەتیم نادات، توند شمشێرەکە لەسکم دەوەشێنم. لەوانەیە دیمەنێکی ناخۆش بێت. بەڵام تکات لێدەکەم مەترسە. بینینی مەرگ بەهەموو جۆرەکانیەوە ترسناکە. لەبەرئەوە نابێ ئازایەتی‌و چاوقایمی‌ی خۆت لەدەست بدەیت. هەموو ئەمانەت پێ‌قبووڵە؟))

((بەڵێ)).

ریکۆ بەدەم سەردانەواندنەوە قبووڵکردنی خۆی پێڕاگەیاند. کەتەماشای ئەندامی شۆخ‌و ناسکی هاوسەرەکەی کرد لەو کیمۆنۆ سپی‌یەیدا؛ دەروونی جۆشی سەند. ئەوکارەی خەریکبوو ئەنجامی ئەدا تائێستا بەژنەکەی نەوتووە کەئەوە بەشێکە لەئەرکە نیشتمانیەکەی. کارێکە پێویستی بەهەمان ئازایەتیی چوونە ناو بەرەی شەڕەوە هەیە.

مردنێکە هیچی لەمردنی سەنگەری پێشەوەی شەڕ کەمتر نی‌یە.

ئەبێ ئێستا هەمان رەفتار بنوێنێ کەلەمەیدانی شەڕیشدا دەینواند. بیرکردنەوە مولازمی بۆ چەند ساتێك بەرەو زیندەخەوێکی سەیر راپێچ کرد. بەرەو مردنێکی تەنیاو غەریبانە لەمەیدانی شەڕدا، مردنێك لەبەرچاوی هاوسەرە قەشەنگەکەیدا... ئەو هەستەی کەدەبووایە بەو دوو ئاراستەیە بمرێ وایلێکرد دڵنیابێت لەوەی پەیوەندی‌یەك لەنێوان ئەو دوو ئاراستەیەدا نی‌یە، ئەمەش خۆی لەخۆیدا جۆرە چێژو دڵنەواییەکی تیابوو. بیری کردەوە کەدەبێ ئەمە بەترۆپکی بەختەوەریی خۆی لەقەڵەم بدا، مادامەکی ئەو چاوانە شایەتی سات بەساتی مردنەکەین وەك ئەوە وایە سەرلەنوێ لەمەرگێکدا لەدایك بێتەوە کەبەنەسیمێکی فێنك‌و دڵنشین دەست پێدەکات.

ئەمە هەنگاونانێکی تایبەتی‌یە، نەیدەزانی سەد دەرسەد چی‌ی تێدا پەنهانە، بەڵام دەیزانی کەئەمە بوارێکە ئەوانی‌دی نەیانناسیوەو تاقیان نەکردۆتەوە.

ئەمە قەدەرو خواستێکی یەزدانی‌یەو بەهیچ کەس نەبەخشراوە بەم نەبێ. پێدەچوو مولازم لەئەندامی درەخشان‌و بووکئاسای هاوسەرەکەیدا

تـەواوی ئـەو شـتانە ببینێتـەوە کەعاشقانە دڵـی خۆی پێسپاردبوون‌و لەپێناوی ئەواندایە کەئێستا خەریکە ژیانی خۆی قوربانی دەکات: بنەماڵـەی ئیمپراتۆری، میللەت، ئاڵا، سـوپا. هـەموو ئەمانـە بەچاوێکی زیت‌و وریایانەوە ئامـادەبوون‌و لـەویان دەڕوانی‌و، هیچیان لەهاوسەرەکەی کـەمتر نـەبوو کەبەرامبەری دانیشتبوو.

ریکۆش بەتامەزرۆییەوە سەیری مێردەکەی دەکرد کەهێندەی نەماوە بمرێ‌و بیری‌کردەوە هەرگیز لەم دونیایەدا شتێکی نەدیوە هێندەی ئەو شەنگ بێ. مولازم هەمیشە بەجلوبەرگی سەربازیەوە شەنگ بووە، بەڵام ئێستا کەبەدووبرۆی گرژو دوو لێوی نووقاوەوە لەمەرگ رادەمێنێ، لەپرشکۆترین شێوەیدا جوانیەکی پیاوانەی پێبەخشیوە.

سەرەنجام مولازم وتی ((کاتی رۆیشتن هاتووە)).

ریکۆ تەواو نوشتایەوەو سەری دانەواند. نەیدەتوانی سەری بەرزبکاتەوە لەبەرئەوەی نەیدەویست ئارایشتەکەی دەموچاوی تێکبچێت. بەڵام نەیدەتوانی رێ لەفرمێسکەکانی بگرێت.

ئاخریەکەی کاتێ ریکۆ سەری بەرزکردەوە لەودیو فرمێسکەکانیەوە مێردەکەی بینی کەدەتگوت لەناو تەمومژدایە. قردێلەیەکی سپی لەدەمی شمشێرەکەیەوە پێچابوو کەلەکیفەکەی دەریهێنابوو، تەنها دەپانزە سانتیمەتری نووکی شمشێرەکە نەبێ بەرووتی مابۆوە.

مولازم شمشێرەکەی لەبەردەمی خۆیدا لەسەر راخەرەکە دانایەوەو کەوتە سەر ئەژنۆو پاشان سەر لەنوێ بەچوار مشقی دانیشتەوە. گیرەکانی ئێخەی جلە سەربازیەکەی کردەوە. ئیدی چاوی لەژنەکەیەوە نەبوو. بەکاوەخۆ یەکەیەکە قۆپچە پان‌و مسینەکانی چاکەتەکەی کردەوە. سەرەتا سنگە ئەسمەرەکەی‌و ئینجا سکی دەرکەوت. قایشەکەی پشتی کردەوەو دواتریش قۆپچەکانی پانتۆڵەکەی، سپێتی ئەو کەمەر ـ بەندە دەرکەوت کەلەپشتیەوە ئاڵاندبوو. بەهەردوو دەستی کەمەر بەندەکەی بردەخوارەوە تازۆرترین بەشی سکی بەدەرەوە بێت.

پاشان دەستی بۆ دەمی شمشێرەکەی برد کەبەقردێلە سپیەکە پێچرابوو. لەکاتێکا چاوی لەخوارەوە بڕیبوو؛ دەستی چەپی بەسکیدا هێنا. بۆ ئەوەی لەتیژیی دەمی شمشێرەکە دڵنیابێت، داوێنی چەپی پانتۆڵەکەی هەڵکرد. بەشێك لەڕانی دەرکەوت، بەهێواشی دەمی شمشێرەکەی پیاهێنا، یەکسەر خوێن بۆ دەرەوە فیچقەی کردو قردێلەکە خوێناوی بوو، چەند دڵۆپێك کەلەبەر تیشکی چراکەدا دەبریسکانەوە؛ تنۆك تنۆك کەوتنەخوارەوە.

ئەمە یەکەم جار بوو ریکۆ خوێنی مێردەکەی ببینێت. هەستیکرد دڵی لەسینەیدا کەوتۆتە پەلەپەل. تەماشای دەموچاوی مێردەکەی کرد. مولازم هێمنانە سەیری خوێنەکەی خۆی دەکرد. ریکۆ بۆ ساتێك هەستی بەتەسەللایەك کرد، گەرچی لەهەمان کاتدا دەیزانی کەتەسەللایەکی هیچو فریودەرە. مولازم بەنیگایەکی برندەی هەڵۆ ئاسا سەیرێکی ژنەکەی کرد. ئینجا شمشێرەکەی بەرزکردەوەو لەبەردەمیدا رایگرت، کەمێك خۆی بەرزکردەوەو سەرەوەی لەشی بەسەر نووکی شمشێرەکەدا نوشتاندەوە، بەگرژبوونی فرەی سەر شانەکانیدا دیاربوو کەهەموو توانای خۆی کۆکردۆتەوە. مولازم تاهێزی تیابوو شمشێرەکەی چەقاندە بەشی چەپی سکی‌و هاوارە بەرزەکەی دڕی بەبێدەنگیی ژوورەکەدا.

وێڕای ئەوەی خۆی ئەو شمشێرەی لەخۆی وەشاند، کەچی هەستێکی وای لادروستبوو دەتگوت کەسێکی‌دی شیشێکی ئاسنی ئەستووری کردووە بەسکیدا. بۆ چەند ساتێك سەری گێژبوو و نەیدەزانی چی روودەدات. ئەو دەپانزدە سانتیمەترەی دەمی شمشێرەکە کەرووت بوو تەواو رۆچووبووە ناو سکیەوە،

بەدەستی شوێنە پێچراوەکەی دەمی شمشێرەکەی گرتبوو و توند بۆ ناو سکی پاڵی پێوەدەنا. مولازم بۆ جارێکی دی هۆشی هاتەوە، بیریکردەوە کەدەمی شمشێرەکە حەتمەن ناو پەنچکی بڕیوە. بەزەحمەت هەناسەی بۆنەدرا. سنگی بەرزو نزم دەبۆوەو لەشوێنێکی قووڵایی ناخیدا، کەباوەڕی نەدەکرد بەشێك بێت لەبەدەنی خۆی، ژانێکی بەئازارو ترسناك بۆ سەرەوە قوڵپی ئەدا. دەتگوت زەوی قلیشی بردووەو دەمی کردۆتەوە تافوارەی بەردی تواوە بۆ سەرەوە بهێنێ، ناکاو ژانەکە بەخێراییەکی سامناك نزیکبۆوە. مولازم گازێکی لەلێوی خوارەوەی گرتو ناڵەیەکی خۆنەویستانەی لێوەهات.

بیریکردەوە ـ ئائەمەیە سپۆکۆ؟ هەستی سەرشاربوو لەئاشوبو بێسەروبەرییەکی تەواو، دەتگوت ئاسمان بەسەریدا رووخاوەو دونیاش هەستانە دەلەنگێ. هێزی ئیرادەو ئازایەتیی کەبەر لەدڕینی سکی خۆی بێوێنەبوو، ئێستا کێ هێند بچووك بووبۆوە هەردەتگوت تاڵە موویەکەو لەپۆلایەك ماوەتەوە. هەستی نیگەرانی شالاوی بۆهێنا کەبیریکردەوە دەبێ بەم تاڵە مووەوە بەرەو پێشەوە بچێتو نائومێدانە دەستی پێوەی بێت. مستی کەبەشمشێرەکەوە بوو تەڕبوو بوو. تەماشای خوارەوەی کردو سەیریکرد هەردوو دەستیو قردێلەکەش لەخوێندا نوقم بوون. کەمەربەندەکەشی لەخوێندا گەوزابوو. بڕوای نەدەکرد کەبەو ژانو دەردو ئازارە سامناکەشەوە هێشتا ئەو شتانەی کەدەبینرێن دەیانبینێو ئەو شتانەش کەهەبوون هێشتا هەرهەن.

لەو ساتەدا کەمولازم شمشێرەکەی کرد بەلای چەپی سکیداو ریکۆ رەنگی مەرگی بینی کەچۆن وەك پەردەیەك خێراو بەیەك جوولە روخساری پۆشی؛ ناچاربوو دان بەخۆیدا بگرێو بەرەو رووی مێردەکەی نەچێت. هەرچیەك روویدات ئەبێ ئەم تەنها تەماشابکات. تەنها ئەبێ شایەت بێو هیچیدی. ئەمە ئەو ئەرکە بوو کەمێردەکەی پێی سپاردبوو.

رێك بەدووریی پانیی بەڕەیەك لەبەرامبەریدا مێردەکەی دەبینی چۆن بۆ شاردنەوەی ژانو ئازارەکەی گاز لەلێوی خۆی دەگرێت. ژانەکە لەوێبوو، بەدڵنیاییەوە ئازارەکە لەبەرچاویدابوو. ریکۆش هیچ چارەیەکی نەبوو تا ئەو لەدەست ئەو ئازارە رزگاربکات.

ئارەق بەتەوێڵی مێردەکەیەوە دەبریسکایەوە. مولازم چاوەکانی نووقاندو دیسانەوە کردنیەوە، دەتگوت تاقییان دەکاتەوە. چاوەکان گەشێتیی خۆیان لەدەست دابوو، وەکو چاوی گیانەوەرێکی بچووك پاكو بێگەرد دەیاننواند.

ئازارو ژانەکە لەچاوی ریکۆدا بەرادەیەك توندو بەهێزبوو کەدەتگوت خۆرەتاوی چلەی هاوینەو دوور بوو لەو خەمو ئازارەوەی کەپێدەچوو لەدەروونەوە ریکۆ لەتوپەت بکات. ژانەکە پەی دەرپەی بەرەو ژوور دەچوو. ریکۆ هەستیکرد مێردەکەی ئێستا پیاوێکی سەر بەدونیایەکی دیکەیە، پیاوێك کەسەراپای بوونی ژانێکی پەتییە، زیندانیی قەفەسێکە کەتانو پۆی لەئازار چنراوەو کەسێك نییە دەستی پێبگات. بەڵام ریکۆ هەستی بەئازار نەدەکرد. لەخەمو کەسەریدا ئازار نەبوو. بەڵکو کەبیری لێکردەوە هەستیکرد دەڵێی کەسێك دیوارێکی بلوورینی لەنێوان خۆیو مێردەکەیدا هەڵچنیوە.

لەیەکەم رۆژی ژیانی ژنو مێردایەتیانەوە هەستیکردووە بوونیان یەك بوونەو هەر هەناسەیەکی مێردەکەی، هەناسەیەکی ئەم بووە، بەڵام ئەوەتانێ کەئێستا دەبینێ مێردەکەی لەناو ژانێکی راستەقینەدا پەلوپۆ دەهاوێ؛ لەو خەمو کەسەرەیدا هیچ نیشانەو بەڵگەیەکی روونی بۆ بوونی خۆی نەدەبینیەوە.

مولازم کەتەنها بەدەستی راستی شمشێرەکەی گرتبوو، لەلای کەمەریەوە هەر

خەریکی دڕینی سکی خۆی بوو. وەختێ دەمی شمشێرەکە لەریخۆڵەکانی گیربوو؛ لەبەرئەوەی شمشێرەکە دەگەڕایەوە دواوە سەرنجیدا کەدەبێ هەردوو دەستی بەکاربهێنێت تابتوانێ بەگوشارێکی زیاترەوە نووکی شمشێرەکە رۆبچەقێنێتە ناو سکیەوە.

دەمی شمشێرەکەی بۆلای سکیەوە هێنایەوە. بەلام بەو ئاسانیە نەبوو کەئەو چاوەڕێی دەکرد. تەواوی هێزی خۆی لەدەستی راستیدا کۆکردەوەو بۆ جارێکیدی دەمی شمشێرەکەی بەسەر سکیدا هێنایەوەو ئەمجارە دەدوانزدە سانتیمەتری لەسکی خۆی دڕی.

بەکاوەخۆ ئازار لەقووڵایی دەروونیەوە بەرەو دەرەوە تەشەنەیکردو تەواوی سکی تەنیەوە. ئازارەکە لەدەنگدانەوەی زەنگێکی دڕندانە دەچوو، یان دەتگوت دەنگی هەزاران زەنگە کەپێکەوە لەگەڵ هەر هەناسەیەکیو هەر لێدانێکی دڵیدا لێئەدەنو سەراپای بوونی رادەژەنن. مولازم ئیدی نەیدەتوانی بەر لەنالینی خۆی بگرێ. شمشێرەکەش تاژێر ناوکی بڕیبوو، کەئەمەی زانی هەستی بەلەخۆڕازیبوونێك کردو دیسانەوە ئازایەتیەکەی خۆی وەچنگ هێنایەوە.

خوێن پەیدەرپەی دەڕژاو لەزامەکەوە فیچقەی دەکردو دەتوت لێدانی دڵی پاڵەپەستۆی لەسەردەکات. ئەو راخەرەی مولازمی لەهاوسەرەکەی جیاکردبۆوە لەخوێندا سوور هەڵگەڕابوو و تادەهات لەلۆچەکانی پانتۆڵە سەربازیەکەشیەوە خوێن دەڕژایە سەر راخەرەکە.

پەڵە خوێنێك وەك باڵندەیەك باڵەفڕێی کردو بەسەر داوێنی کیمۆنۆ سپیەکە ئاوریشمەکەی ریکۆوە نیشتەوە.

مولازم کەشمشێرەکەی دەرهێنایەوە دەمە رووتەکەی لەخوێنو بەزەوە گەوزابوو و وەختێ چەقاندیە لاکەمەری راستی ئەوەندە بەقووڵانەچوو. لەپڕێکا دڵی بەیەکداهاتو بەدەنگێکی گڕەوە هاواری لێبەرزبۆوە. رشانەوە ئەوەندەیتر ئەم ئازارەی سەخت کردو سکی کەتا ئەوساتە رێکوپێکیی خۆی پاراستبوو لەژێر گوشاری ئەو رشانەوەیەدا دەمی کردەوەو ناوسکی بەدەرکەوتو دەتگوت هەناویشی دەڕشێتەوە. ریخۆڵەکانی ساغو زیندووبوونو پێدەچوو ئاگایان لەئازاری خاوەنەکەیان نەبێ. بەمجۆرە خزانە دەرەوەو رژانە بەینی هەردوو رانەکانیەوە. مولازم.. سەری شل بوو، شانەکانی دەلەرزین و چاوەکانی وەك دوو درزی دەمباریکیان لێهات. رستێکی ورد لەناوی دەمی دڵۆپ دڵۆپ چۆڕایە خوارەوە.

خوێن ئەو ناوەی گرتەوە، مولازم تائەژنۆی لەخوێندابوو.

بەجۆرێك دانیشتو دەستێکی خستە سەر زەوییەکە، کەمایەی بەزەییبوو. بۆنێکی تەڕو سارد ژوورەکەی پڕکردەوە. بەسەری شلیەوە هێشتا هەر ئێقی ئەداو جووڵەی شانەکانی بەروونی ئەوەیان پیشان ئەدا. دەمی شمشێرەکە کەریخۆڵەکان پاڵیان پێوە نابۆوە بۆ دەرەوەو نووکەکەی دیاربوو؛ هێشتا هەر بەدەستی راستی مولازمەوە بوو.

شتێکی ئاسان نییە ئەو دیمەنە قارەمانانەیە بهێنینە پێشچاوی خۆمان کەلەم ساتەدا مولازم پیشانیدا، کاتێ هێزی دایە بەرخۆیو بەتوندی سەری خۆی بەرزکردەوە... بەرادەیەك ئەو جووڵەیەی کتوپڕو خێرابوو کەپشتی سەری بەر ستوونی تاقەکە کەوت.

ریکۆ تائەو ساتە سەری دانەواندبووو بەواقو ورمانەوە چاوی بڕیبووە ئەو سێڵی خوێنەی بەرەو لای ئەژنۆکانی دەهات. بەلام ئەو دەنگە حەپەساندیو سەری هەڵبڕی.

روخساری مولازم روخساری پیاوێکی زیندوونەبوو. چاوەکانی دەرپۆقیبوون. پێستەکەی وشك و بێرەنگ ببوو. رووومەتو لێوی کەپێشتر تەروبڕو بریقەداربوون، ئێستا دەتوت

قوڕی وشکەوەبوون. بەتەنها دەستی ڕاستی دەجوولایەوە. بەزەحمەت شمشێرەکەی گرتبوو، دەستی دەلەرزیو دەهاتو دەچوو، دەتوت بووکە شووشەیەکە بەپەت یاریی پێدەکەن. ئەو دەستە دەیویست دەمی شمشێرەکە بگەیەنێتە ژێر ملی مولازم.

ڕیکۆ سەیری دوا جوولەی بێهوودەی مێردەکەی دەکرد کەحاڵەتێکی ترسناکو ئازار بەخشی بەخۆوە گرتبوو. چەند جارێك نووکی شمشێرە لەخوێنو بەزدا گەوزاوەکەی برد بۆ قوڕگی، بەڵام ئامانجی نەدەپێکا، هێزی ڕێنوێن لەگۆڕێ نەمابوو. نووکی سەرگەردانی شمشێر لەئێخەو نیشانەکانی گیربوو، گەرچی قۆپچەکانیشی کردبۆوە، بەڵام ئێخە سەربازیە سەرسەختەکەی دوبارە تەسك بوبۆوەو قوڕگی لەبەلا دەپاراست.

ڕیکۆ نەیدەتوانی لەوەزیاتر بەرگەی ئەو دیمەنە بگرێ. هەوڵیدا بچێتو یارمەتیی مێردەکەی بدات، بەڵام نەیتوانی لەشوێنی خۆی هەڵسێت. بەناو خوێنەکەداو لەسەر ئەژنۆ بەرەو لای ئەوچوو. داوێنە سپیەکەی سەراپا بوویەخوێن. خۆی گەیاندە پشت سەری مێردەکەی، وەلێ هیچی بۆنەکرا تەنها ئەوە نەبێ کەئێخەکەی بۆ شل کردەوە، دواجار دەمی شمشێرە لەرزۆکەکە بەر گۆشتی ملی کەوت.

لەو ساتەدا ڕیکۆ وایهەستکرد پاڵی بەمێردەکەیەوە ناوە بۆ پێشەوە، بەڵام وانەبوو. بەڵکو ئەمە جووڵەیەك بوو کەمولازم خۆی نەخشەی بۆ کێشابوو. ئەوەش دوا هێزو برستی بوو. لەپڕێکا خۆیدا بەسەر دەمی شمشێرەکەدا. بەمجۆرە شمشێرەکە چەقییە قوڕگیو لەپشتی ملیەوە نووکەکەی دەرچوو. خوێن فوارەی کردو مولازمیش بێبزاوت لەشوێنی خۆیدا مایەوەو پۆڵایەکی ساردی شینباویش لەپشت ملیەوە هاتبووە دەرێ.



ڕیکۆ بەگۆرەوییە خوێناویەکانیەوە زۆر لەسەرخۆ بەپێپلیکانەکاندا چووە خوارەوە. بەمجۆرە ژووری نهۆمی سەرەوە تەراو خامۆش بوو. چراکانی خوارەوەی داگیرساند. لوولەی گازەکەو بەلووعەی گازەکەی توندکردەوەو پاشان ئاوی کرد بەسەر ئەو خەڵووزە خۆڵەمێش لێنیشتووەی کەبەحاڵێ تینی تیامابوو لەناو مقەلیەکەدا. لەژوورە بچووکە چوارراخەرو نیویەکەدا چووە بەردەم ئاوێنە درێژەکەو داوێنی کراسەکەی بەرزکردەوە. پەڵە خوێنەکان دەتوت نەخشونیگارێکی زیندوویان لەسەر داوێنی کیمۆنۆکەی کێشاوە. کاتێ لەبەردەم ئاوێنەکەدا دانیشت هەستی بەتەڕیو ساردیی خوێنی مێردەکەی کرد کەبەر ڕانەکانی کەوتبوو. لەرزێك دایگرت، ئینجا کاتێکی زۆری بەئارایشتەوە بردەسەر. سوورێکی تۆخی لەگۆناکانیداو هەروەها سووراوێکی تۆخیشیکرد. ئەمە چیدی ئارایشتێك نەبوو بۆ بەختەوەرکردنی مێردەکەی. بەڵکو بۆ دنیایەك بوو کەپاش تۆزێکیدی دوای خۆی جێی دەهێشت.

هەربۆیە نیشانەی دڵڕفێنیو ورۆژان لەئارایشتەکەیدا بەدیدەکرا. وەختێ هەڵسا، ڕاخەرەکەی ژێرپێی بەخوێن تەڕبووبوو، ڕیکۆ بایەخی بەوەنەدا.

کەلەئارایشتەکەی بۆوە، دواجار چووە داڵانە کۆنکرێتییەکە. کاتێ مێردەکەی لەوێدا وەستاو دەرگاکەی داخست؛ ئەوە خۆ ئامادەکردنێك بوو بۆ مەرگ. لێرەدا وەستاو لەمەسەلەیەکی سادە تیامابوو؛ ئایا دەرگاکە بەداخراوی جێبهێڵێت؟ لەوانەیە دراوسێکان بۆچەند ڕۆژێك بەخۆ کوشتنەکەیان نەزانن. ڕیکۆ پێی خۆش نەبوو بەر لەدۆزینەوەیان بۆگەنی لاشەکانیان بڵاوبێتەوە، ئاخریەکەی وای بەباش زانی کەدەرگاکە بکاتەوە... کێلونەکەی کردەوە، هەروەها دەرگا شووشەییەکەشی لامێلکرد کەبەفر پۆشیبووی... لەپڕێکا بایەکی سارد هورووژمی بۆ ژوورەوە هێنا. شەقامەکانی دوای نیوەشەو خامۆش بوون، لەودیو درەختەکانی خانووە گەورەکەی بەرامبەریشیانەوە ئەستێرە سەهۆڵئاساکان ئەدرەوشانەوە.

ریکۆ دەرگاکەی بەو شێوەیە جێهێشتو بەپێپلیکانەکاندا چووە نهۆمی سەرەوە. چونکە کەمێك هاتوچۆی کردبوو گۆرەویەکانی مەیلەو وشك بووبوونەوە. کەگەیشتە نیوەی پێپلیکانەکان بۆنێکی تایبەتی شالاوی بۆکونە لووتەکانی هێنا.

مولازم لەناو دەریایەك خوێندا بەدەمدا کەوتبوو، نووکی شمشێرەکە زیاتر لەپشتی ملیەوە هاتبووە دەرێ. ریکۆ بێباکانە بەناو خوێنەکەدا رۆیشتو لای لاشەی مێردەکەیەوە دانیشتو بەشەوقەوە روانییە ئەو دەموچاوەی کەرووومەتێکی بەرایەخەکەوە نووسابوو. چاوەکانی ئەبلەق بوون، دەتگوت شتێك سەرنجی راکێشاوە. بەهەردوو دەستی سەری بەرزکردەوە، بەقۆڵی کراسەکەی خوێنی لێوەکانی سڕیو بۆ دواجار ماچیکردن.

ئینجا هەڵساو پەتۆیەکی سپی تازەو قایشێکی لەدۆلابەکە دەرهێنا. پەتۆکەی لەکەمەریەوە پێچاو پاشان توند قایشەکەی بەسەریدا بەست تاکیمۆنۆکەی تێکنەچێت. بەدووریی پێیەك لەلاشەی مولازمەوە دانیشتو خەنجەرەکەی لەکێلانەکەی دەرهێناو بەوردیەوە تەماشای بریقە کزەکەی دەمی خەنجەرەکەی کرد. ئینجا بردی بۆزمانی، تامی ئەم پۆڵا پەتیيە کەمێك شیرین بوو.

ریکۆ کاتی بەفیرۆنەدا. کاتێ بیریکردەوە چۆن ئەو ئازارەی کەنداوێکی لەنێوان ئەوو مێردە مردووەکەیدا دروستکرد ئێستا دەبێتە بەشێك لەئەزموونی ئەمیش، جگە لەشادییەك کەئەمیش پێدەخاتە نێو دونیایەکەوە کەپێشتر مێردەکەی پێی تێناوە هیچیتری نەدەبینی. لەسیمای پڕ ئێشو ئەشکەنجەی مێردەکەیدا بۆ یەکەمجار شتێکی پەنهانی بەدیکرد. ئێستا خەریکە نهێنیی ئەو مەتەڵە هەڵدەهێنێ، ریکۆ هەستیکرد دواجار ئەمیش لەتوانایدایە تامی ئەو پرنسیپە ئەخلاقیە بکات کەمێردەکەی باوەڕی پێهەبوو. ئەوەی کەتائێستا بەشێوەیەکی کاڵ لەرێی مێردەکەیەوە تامیکردبوو، خەریکبوو خۆی راستەوخۆ تامی دەکرد.

ریکۆ نووکی خەنجەرەکەی خستەسەر ملیو بەتوندی چەقاندییە قورگی. بەتەنها برینێکی سووکی دوای خۆی جێهێشت، سەری بۆ خوارەوە شۆڕبۆوە. دەستەکانی بێویستی خۆی پەلەکوتێیان بوو. بەهەموو هێزیەوە لەلاوە خەنجەرەکەی هێنا بەملی خۆیدا.

شلەیەکی گەرم رژایە دەمیەوەو هەموو شتێك لەبەرچاویدا سوور هەڵگەراو گۆڕا بۆ خوێنێکی فوارەئاسا. پاشان هەموو توانای خۆی کۆکردەوەو تاقوولایی خەنجەرەکەی رۆچەقاند. *

* شەرابی برنج کە بەژاپۆنی پێی دەڵێن (ساکی) جۆرە شەرابێکە لەبرنجی خومرەکراو دروست دەکرێو دەکولێنرێو بەگەرمی پێشکەش دەکرێو بۆ سەرمەستی دەخورێتەوە.

سەرچاوە: (مرگ درنیمه‌ء تابستان و داستانهای دیگر ـ یوکیومیشیما ـ ترجمه‌ء: هرمز عبداللهی ـ انتشارات معین ـ تهران ١٣٦٩)

# شیعری فارسیی هاوچەرخ

## - سەید عەلی سالْحی -

● و: محەمەد ئەحمەدی- سامال/ بۆکان

### خولیاکانی ئەو باویلکە خەمگینەی

### لە باشوورەوە هاتبوو

((١))

ئەوە سالانێکە دەڵێن:

مانگ لە ژێر هەوری تازیەباری بێگریاندا نامێنێ

دەڵێن: ئاخرەکەی - با - دێو ... بێجگە لە مانگ

تاریکی ... هۆش و گۆشی وەکۆ دەکا

تاریکی ئەچێتە پشتەوەی پشتی کێو

دیسان دەمەوئێوارەی شەوی هەمیشە دێ...

دێ هەتاکوو ئێمە بزانین..

چەند چرا بۆ یەک ئەستێرە

چەند ئەستێرە بۆ یەک مانگ

چەند مانگیش بۆ هەتاوێکی روون.. ئەوەندەی دەست هەڵێنی

بەرز!

هێی نەرمە نەرمەی لەسەرەخۆ!
من تەنیا ئەم ئەستێرە کوژراوانەم هەیە
تۆش بڕۆو چەند چرایەکی شکاو بێنە
خولیاکانمان تێکەڵ دەکەین
کازیوە ڕێ دەکەوین..
بەرەو گۆرانی.. خەو.. هەوای خۆشو تامی ماچو بارانی بەگوڕ...

ئەگەر بەدڵو گیان گەرەکت بێ ڕۆژ بێتەوە
دەبێتەوە...... دڵنیابە!

ڕۆژی یەکەم کە هێشتا شەو
سامی ئەم هەموو ترسو تاریکیەی نەبوو
زۆر بوون ئەوانەی دەیانگوت...
ئیتر چراو ئەستێرە بەسەرچوون
کەچی بینیت هێور
هێور، هێور ڕاهاتن:
دڵمان بەبێ کەسی
دەنگمان بەبێ دەنگی
چاومان بە تاریکی.

ئێستاش دەکرێ
لەتاریکانەوە ڕێ کەوی‌و
بەگژەگژی هەوادا بزانی
کە ڕووبارێکی گەورە
لە تەنیشت تینوویەتیمانەوە دەخزێ
ئێمە دەبێ پەرداخەکانمان لەیەك دەین
هێنەو کە چرا ببێتە ئەستێرەو
ئەستێرە... مانگ‌و

مانگیش هەتاوێکی روون... ئەوەندەی دەست هەڵێنی بەرز!

/((٢))/

هەرچۆنێك بێ
زۆر ئاستەم... زۆر سادە تێدەگەی
ئێستا لەودیوی ئەو دیوارە بەرزانەوە
شوێنێك هەیە
کە دەکرێ حاڵو باڵی سەرەکی خەڵکی لێوە ببیستی
دەنا دەکرێ هەر لەو – با – بێ هەواڵەوە تەنانەت
بۆنی چای تازەو بۆنی رووناکی چرات بەسەردا چێ،
تۆ جگەرەیەکت گەرەکە
هەندێك ئارامی یان کتێبێك
هیچ نەبێ نووکی قەڵەمە شکاوێك
هەتا کارێك.. وشەیەك.. بەسەرکردنەوەی‌بیرەوەریەك.. رەنگە!

خۆزگە هیچ نەبێ لەودیوی ئەو رۆچنە ئاخنراوەرا
دەنگی کەسێك لە کۆڵانەوە دەهات...
دەهاتو دەیپرسی:
بۆ دڵت پڕو دەستت خاڵی‌و
دواین جگەرەت... کوژانەوە!

تۆش تەنیا لێت دەڕوانی
پاشان لە توێی ئەو کتێبە کۆنەدا
ڕستەیەکی دژواری سادەت دەبینیەوەو
ڕاست ڕووەو شەوی تینو ئەتنووسی: ئاوا!
ئەتنووسی خۆزگە دەستێك دەهاتو
پاڵی دەنا بەم دیوارە ماندووانەوە
دەیخستنە ئەوبەری ئەو قوفڵە کۆنەوە

دەخۆ ڕۆیشتن... فاڵ گرتنەوەی ناوێ!

ئێستا هەر وەرەو بچۆ
هەنگاو.. هەنگاو
بە قەرای ئەو گۆڕە بێ کێڵو بێ ناوە
بەرد لەسەر بەردی بیرەوەری هەڵچنە
با بزانین ئەو – با – بێ هەواڵە
لەگەڵ خۆیو ئەم خەونە ماندوە، کەنگێ دیسان...
بۆنی چای تازەو بۆنی ڕووناکایی چرا – دێنێ!

هەر بە ڕاست ئێستا
بۆ دیتنی نم نمەیەکی باران
دڵت چەند کانی.. چەند ڕووبار.. چەند زەریا.. گریانی تێدایە!؟

لەسەرەخۆبە شالووری خەم لێدراوی بێ باخو ئاسمان
ئاخری شەوێك
ئەم کلیلە ژەنگ هەڵێناوش بیری دێتەوە
کە لەودیوی ئەم قوفڵە بێ بەڵێنی ماندووەشەوە
درگایەك هەیە... دیوارێك هەیە
بەخوا...... زەریایەك هەیە!

((٣))
سەرەتاو کۆتاییم
هەر ئەو شەوەی دوایی بوو
کە خۆم دا بە سیمی پچڕاوی بارانا
گوتم خووساوی گریان تابەر درگای زەریا دەچم
چووم.. لە درگام دا..
گوتم: هاوڕێ، هاوڕێ!
دێی بچینە ئەوبەری کێوی قاف

گیای چاك بوونەوە بێنین؟
هاوڕێ لەودیوی درگای داخراو ڕاكوتی:
((هەی كۆسپی كەوتووم
باوكی منالّەكانم ڕۆیوە،
یانی بردوویانە شوێن پێی – با – بدۆزێتەوە!))
زستان بوو
بۆنی سووتانی كتێبو
ترسو هەڵلەرزینی وشە دەهات،
گوتم: پەرتووك.. وشە.. گیا.. ئاوێنە.. شەفا!
كەسێك هێور لە كۆڵانەوە دەڕۆیی،
من دەمناسی،
بۆنی نانو زللەو زەریای لێدەهات.
ملی ڕێی گرتبوو
دەچوو بەرەو سیمی پچڕاوی باران.
ئێمە گەیبووینە كۆتایی خەونی گریان
بەڵام وەك شتێك هێشتا
ئاوازی كەسێك لەودیو پەردەكانی بێدەنگی زەریاوە دەهات.
خەماویو ماندوو.. بەسۆز دەیچڕی:
((تۆ چیو ئەم كێوی قافە
سەد زستانو یەك لێفە!))

((٤))
ئەگەر دەلوێ
پەرداخەكانی ئێمەش پڕكەن
ڕۆژیش بە تەواوی باشە
ئێمە هەر سەرەتای دڵ دان بە عەتری نوور
بە نم نمەی هێوری – با – ی باكووردا زانیبوومان
كە مانگی چڕی ئەم شەوە درێژە
ئاخرەكەی لە پشت پەردەی زەریاوە هەڵدێ،

بەڵام چیمان بەسەرهات تاکوو ئەم کتێبە بێ وشەیە هەڵدراوە!
چەند هاوینمان بێگۆرانی
لە تینوویەتیدا ڕابرد
تانەی بەردو بێدەنگی ئەستێرەمان وەخۆ گرت
تاکوو ئاخری شەو شەرمی ئەم هەموو بێ چرایانە گرتیو
بسکی بە رووی رووناکی ماچدا کردەوە!

ئێستا بە دڵێکی بێگرێوە دەگەرێینەوە خەونی ماڵ
کراسی تازیەی کۆن لەبەر کۆڵان دادەکەنین
خەنە لە پەنجە ماندووەکانی زەریا ئەگرینو
بەدەم — با — وە
دیسانەوە گۆرانیمان... ماڵی مانگو
عەشقی رووتی مرۆڤ دەبێ!
ئەمە دابی رەنگینترین خولیای نێرگزە
کە بە ڕانی لە روخساری خۆی لە خەونی ئاودا
بانگمان دەکات
هێی رێبوارانی بێ هەواری ئەورۆی دوورە!
ئایا دەتانەوێت تەنیا شەوێکی ئاسوودە
لە چنگ خەمی تینوویەتی
پێکەوە میوانی بارانو ماچ بین؟

ئێمە لە زەمزەمی شاراوەی زەنگۆڵەی — با — و ئەستێرەدا
رووت دەبینەوە
بەناو دواخۆشی ئاوێنەدا تێدەپەرینو
لە هەستی شلەتێنو گەرمی گۆنا و لیمۆدا
لێو لەسەر ئاونگی دڵنشینی ماچ هەڵناگرین.

ئەم — با — سیخورە چووزانێ
لەناخی بێ چرای ئەم شەوە درێژەدا

چی بەسەر خەونی گوڵو خەیاڵی پەپوولەدا هاتووە!

ئێستا پەرداخەکانمان
پڕن لە خەونی ئاو و
لێوو لیمۆی مانگو... تامی سەیری گۆرانی...
دواییش... متی ماتلق من تهوی، دع الدنیا واهملها!!

((٥))
من باسی ئیشتیای نوور دەکەم
تۆ لەگریمانی چرا......!
شەوی تاریک
خۆی لە خومی گریان گرتوە

هۆن هۆنی ڕۆیشتنو خولیای هاتن
مەقامێکی سەیرە لە پەردەیەکی ترا
کە لە لانکەی هیچ – با – یەکی بێنیشاندا نایبیستێت

سوور دەمێنم
چ پێوەندییەکە لەنێوانی کۆچی خولیاو
هۆن هۆنی هاتندا
کە من لە شینو شەپۆڕی هەزاران ساڵەی قومریاندا
دەگەڕێمەوە سەر تازەترین هەواری گۆرانی
بە ڕاستی سەبرێکی زۆری گەرەکە
کەوا ئاسان
لە پەنا کۆنترین وشەکانی بێهودەدا تێپەڕیو
چیرۆکی عیشقو نەغمەی ژیان نوێ کەیەوە
بێیە کۆڵانو دیسانەکە باران
هەر باسی شەڕابی گریانت بۆ بکا!
چ بیرەوەریەکی خۆشە مەقامی مرۆڤ

کاتێ کە هیوای ئاوێنە
رسکابێ لەترسی شکان!

لەبیرت بێ..
هەتاوی چەماوە بەسەر کەوانەی خۆرنشینا
هەمیشە رووەو خۆرهەڵاتی ئاشنایەکی نوێ دەمرێ
تا مێژێك لەو نامۆیانە تێبگەن
کە عاشقانی رووناکی بە شانازی کام مۆگرییەوە
باسی ئەستێرەی نیوەسووتاوو هومێدی ئاوێنە دەکەن!

دەڵێن خۆشترین رۆژی بەڵێنی ئێمەیان
لە چاڵاوی قووڵی زەریایەکدا دیوە
کە لە ئاسانەی گۆرانی یەکەم چرا — دا
لەنێوچاوانی تێشکاوی ئێوارانی دواییرا هەڵدێ:

دەبینی..!؟

بێهۆ نیە ئێمە.. لە نوێژی نوورا
هێشتا لەگەڵ دایکانی داغ لەدڵی زەریا دەگرین!

((٦))
راستە کە جاروبارە هێشتا
دەستم بە داوێنی مانگەو
چڵووکەکانی رووناکی ئەستێرە رادەگا
یان جاروبارە پێم وایە
خەڵکی هەوای ماچو بزەی ئاوێنەم
بەڵام بیرم ناچێ
کە چۆن لە تێکشانی ئەو هەموو رقە بێ پرسیارەوە

گەیشتمە نمەنمی ئەم گریانەی کە گەرووی تاساندوە

باش دەزانم
کەنگێ دەکرێ
بچینە سەرچڵووکی رووناکی ئەستێرە
بگەیە باخەکانی جووت بوونی ئاوێنەو
لە تامی سەیری میوەی تووبا ... گۆرانی بچنی،

رەنگە هەرا لەبەر ئەمە بێ کە مانگ
لە خۆڕا نایەتە خەونی هەرکەسێکی ئەم کۆڵانەوە

دەڵێن هەر کەسێ خەون نەبینێ
(با) دێو بەشێوەیەك
ناوەی کوێر دەکاتەوە
خەونەکانیشی دەکووژێنێتەوە
پێشی ناڵێ کە بۆ دیتنەوەی خەڵکی هەوای ماچ
کوێ بگەڕێ.

دەڵێن ئەو ئەستێرەیەی جاروبار
دێتە سەربانی ماڵەکەمان
رۆحی غەمگینی ئەو باویلکەیەیە
کە شەوێك لەترسی – با –
پشتی کردە باشوورو رووەو شوێنێکی نادیار
لێیدا رۆیی و ئیتر
نەهاتەوە خەونی هیچ بنچکێك!

ئێستا هەموو شەوێکی خوا
لە هەر کوێیەکی ئەم ماڵە بێمانگە
ئەم کۆڵانە بێ ئەستێرەیە بم

دیسان وەبریم دێتەوە
کە – با – چی کرد بە خەونی مانگ و ئەستێرەو
هەمیشە لەبەر ئەم چرا شکاوەدا دەگریم
گۆرانی دەڵێم
خەون دەبینم
درۆ دەکەم.
بە درۆ دەڵێم:
کە هەوای ئەوێ بە جۆرێکی دی خۆشتر بوو
یان شەوێ چەندە مۆگرتر،
چەندە بەتاسەو.. سەیری سەیران!

چ مۆگرییەک، چ تاسەیەک، کامە سەیران!؟

منی تیٚهەڵدراوی خەون دیتوو، زەریا نووسی لاڵ!
جا بەتۆ چی خەونی مانگ کامەیەو
ناوی ئەستێرە چییە؟

تۆ کەنگێ دەستت بە مانگ و ئەستێرە گەییوە
کە ئێستا لەبەر ئەم چرا شکاوانە خەوت نایە؟
باشە زەریا چی هەیە کە هێشتا ......!

ئێستا برۆ، چرکەیەک لەبەردەم – با – دا بوێستە
گوێ بگرە... بزانە کەی دەبارێ.

((٧))
من دەڵێم ناکرێ شەوێک بنووی و
بەیانی زوو
کەسێک بێ و بڵێ..
هەر هەمووشتێک بە خوا کۆتایی هات..!؟

تۆ هەمیشە لەم بەیانیە
لەم یەك دوو ساتە بێخولیایەی لە پێشتە ئەترسی
لە ڕۆیشتن... لەنەهاتن
ئەترسی لەم هەوا بێ دەنگی بێ مەبەستە.
ئەترسی لەپڕدا چەپۆکێك
بدرێ بە سنگی باراناو
قاپە خاڵیەکانی دانیشتووی ئەم ماڵە بشکێنێ.

تۆ هەر لە تێشکانی بێهۆی زەریا دەترسی!

توخوا مەترسە
لە پرسیار
لەوەی لێت بپرسن ئەرێ تۆ چ کارەی،
ئێرە بۆ هاتووی..
بۆچی بێچراو بۆچی.. بۆ..؟
دەبێژە ناکرێ شەوێك بنووی و
بەیانی زوو...
ئەگەر بەدەستی بەتاڵ گەڕایتەوە ماڵ
بڵێ کۆپێنی بەتاڵ بوەکان لە — با — دا ناکرێن
هەموو ئەمرۆکە هەر — با — بوو
بڵێ هەندێك لە ڕوودانی کارەسات ئەترسن.

بۆ ئەم زستانە ڕەشە
نایلوون گیر نەکەوت
بۆخۆم لە پەنای پەنجەرەوە دەنووم.

خۆزگە ئاسپرینێکی هەرزانت کڕیبا!

لەبیرم نەبوو
لە سنگمیان دا
ئێستا بنوو!

دەڵێم ناكرێ شەوێك بنووی و......

((٨))
لێرەوە هەموو شەوێك
پۆلە پەری دەربەندی هەنار
بەپیاڵەكانیانەوە پڕ لە خەونی ئاو و
خۆشی ئاسمان دێن.. دەچنە لووتكەی كێو
دەچنە لووتكەو سێ تار لێدەدەن، دەگرین
پاشان هێور، هێور بەرانبەر بەمانگی زەریا نەدیوو
شتێكی وەك گۆرانی دەڵێن:
((بارانی گریان،. زەریا
زەریاكە نوقمی كردین
ئەمەش هێشتا تۆزێكە لە چیرۆكی تاڵی ژین!))

ئێمە چی دەكەین؟
ئێمە لە پشت ئەم دیوارانەوە
شاراوەو داپۆشراو لە خەمی تینوویەتیدا لەدایك دەبین
دەمرین و دیسان
لە باسی خۆشویستنی مرۆڤا.. گۆرانی دەڵێین
ئاسمانەو ئاسمان دەگەڕێین
وشە لە پێ كەوتووەكانی داوێنی زەریا
هەڵدەگرینەوە
دەچین بە نینۆكی شكاو
لەسەر پێستی شەوو حەوشەو حەوانەوە دەنووسین:
((چیرۆكی هەپروون هەپروون، حەقایەتی زۆر ماندوو

لەو هەزارویەک شەوە
تازە شەوێک تێپەڕ بوو!))

پەریەکان، پەریەکانی دەربەندی هەنار!
توخوا وەرنەوە بۆماڵێ!
ئەوە تەنیا دڵی ئێمەیە
کە بە دەنگی سێ تارەکەتان دەڕووخێ
دەنا ئەو دیوارانە بەرزن
ئەو ڕۆچنانە ئاخنراون
ئەو سێبەرانە قورسن!

((٩))
باشە ئارەزووەکانت
لەکوێی ئەم کۆڵانە جێ‌هێشتووە
کە هێشتا کاشی ئەم هەموو ماڵە شکاو و
ڕۆچنەی ئەم هەموو دیوارە... بەسراو و
دیواری ئەم هەموو دڵە ماندووە... ڕووخاوە!

هەر ئەوەیە پایز
لەپێشدا شنەشن –با– ی دێ
پاشان گەڵاو پۆپەی بێ‌خولیا بەدەم باوە!
کە لە بڵواری حەزرەتی (زارا) تێپەڕیت
بێشکەیەک لەم بەری خەون و
ئاوێنەیەک لەوبەری ئاو...!

هەر ئەوەیە پایز
ڕۆژێک دەبینی کە ئیتر مانگ
گوڵاو نشینی ئەلحەمدو ئاوێنەیە
ڕۆژێک دەبینی کە ئاوێنە ... ئەلحەمدی خشت!

ئێستا بنوو

ئاسوودە بنوو

ئێمەیش بێ دەنگ و ماندوو لە تێگەیشتنی - فاتیحا

دێینەوە ماڵ،

دێینەوەو دیسان

نۆرەی بێدەنگی و نۆرەی نان و

هەر ئەو شتە سواوانەی ژیان..!

ژیان؟!

مردوویەتیمان لێرەیەو زیندووبوونمان شوێنێکی دوور...

چ ناکرێ

دەبێ دیسان خۆ لە زەریا دەی

هۆگری بکەی ... عاشقی و

پاشانیش لە پرتەو بۆڵەی پایزی ماندوو ڕا تێپەڕی!

((١٠))

سەد هێندە شاراوەو سەر لەبەر

هێدی و بێدەنگ

بێدەنگ و بێ پرسیار

بگەڕێیەوە بەرەو ماڵ

دیسان دەبینی کەنابێ

دەبینی دیسانەکە نابێ

ئەم دەرکەو ئەو قوفڵە کۆنە...!

ئەم دەرکەو ئەو قوفڵە کۆنەیان

بە ڕازی کام کلیلی بێ دۆعا داخستووە

کە لێکدانەوەی ئەم گۆرانیە دیسان

دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای گریانەکانی ڕابردوو!؟

بگەڕێوە!

یەك چرکە لە چپە چپی شاراوەی – با – و
سنەوبەری ماندوو تیّ بگە
کە کۆتایی دوورترین خولیای مرۆڤ
هەر ئەو ماڵە ئارامەی لە هەموو شتێك دەست بەردانە!

جیاوازی لە چیایە ئیتر
ئەم درگا داخراوە بە کردنەوەی کامە دۆعا...
ئەم قوفڵە کۆنە بە ئارەزووی کامە کلیل..!؟
درەنگ یان زوو...
(با ) لە بیّدەنگی ئەو سنەوبەرە ماندوو ڕاهەڵدەکا
لە بنچکە ترساوەکانی ئەستێرەدا گڤەی دیّو
مانگیش لەترسی ئاوێنە شکاوەکان هەڵنایە!

دەبینی کە لە دووری حەزرەتی ((گولان))
چی بەسەر خەونی نێرگزو
بێداری بەیبووندا هات.

دەڵێن هێشتا دەکریّ
لەنادیار ترین حەشارگەی گۆرانیەکانی ئەم خەڵکە بیّ دەنگەدا
بۆ هۆگرییەکی غەمگین بگەڕێی
هێشتا دەکریّ هەندێك بڕوانیە خەوی کۆترو زەریاو
کازیوەی دووری ئاسمانت بێتەوە یاد
هێشتا دەکریّ لە شوکرانەی بزەیەکی سادەڕا
تەواوی تاریکایی ئەم کۆلانە پێشکەشی شەوی ناشارەزا بکەی
هێشتا بۆی هەیە جار نەجار
بۆچوونی ساکاری ماچ
لەیەك دوو هاوسێی موسوڵمان بپرسی
هێشتا دەلویّ
هێور لەکۆلانی چۆڵی پایزەوە تیّپەڕیو

یادی شلەژانی دووری ((گولان)) بکەی
سەرخۆشی مانگ و سنەوبەری ناهومێدت بێتەوە یاد،
وەبیر خۆتی بێنەوە، گۆرانیەك..
هۆگرییەكی غەمگین
چرایەك و بزەیەك
کۆترێك و کۆلانێك... ڕەنگە!
یان کازیوەی دووری ئاسمان کە بەرێوەیە!

جیاوازی لە چیایە ئیتر
ئەم درگا داخراوە بە کردنەوەی کامە دۆعا..
ئەم قوفڵە کۆنە بە ئارەزووی کامە کلیل...!!

لێرە هەر گەمیەیەكی شکاو تەنانەت
ناچارە لەبیستنی ئەم چیرۆکەڕا
هەتا خەونی ئەو هەزارو یەك شەوەی زەریا.. گوێ بگرێ!

((١١))
لەوەتەی بووە
(با) ی بێ نسێ لە شوێنێکی دیارەوە هاتوە
چوە لە هەموو کۆلانێکی بێچراوە تێپەڕیوە
وا کە نە ئەم پەنجەرە دڵ تەنگانە
ڕۆژێك بەپەردە پۆشراون
نە ئەم چاکەتە کۆنەش هی ئەو ڕێبوارەیە شەوێك
بەرە بەیانیەکی نەهاتوو ڕێ کەوت!

جیاوازی لە چیایە ئیتر
کە ئاسمانی چ شوێنێکی ئەم وڵاتە... لێوڕێژی ئەستێرەیە!
ئێستا لە هەرکوێ کە چرای ماڵێك بابیسێ
بێگومان پۆلە ئەستێرەیەك لەوێ

هێشتا شەونخوونی دەکەن
چاوەڕوانی ماچ‌ومووچێکی بارانن

ئێمە گەلێ جار
پیاڵە خاڵیەکانی خەڵکی خەواڵووی ئەم کۆڵانەمان
لە چنکە چنکی تینوویەتی — بی — و
نم نمەی ئاو و ئێوارانی بە نسێ داپۆشراودا دیوە
بەڵام بێجگە لەم دوو چاوە زەریانشینە
چیمان بوە، چیمان کردوە، چیمان گوتوە!؟
غەمگین‌و بێ دەنگ
هەمیشە لەم کەمە زۆرەی ئێمە ڕابوە کە — با —
بەبێ سۆڵەی چرایەك تەنانەت
لە خەوی ئەم هەموو کۆڵانە بێ دەنگە تێ پەڕیوە.

لەوەتای بوە، وابوە
تۆ بێ نیشان‌و ئێمە بێ نسێ!

ئێستا لە ژێر هەر دار — بی — یەك
نم نمەی هەر جێییەك‌و
لە ژێر سێبەری هەر ئێوارێیەك دابی
شەوێکی خۆش
خەیاڵێکی سەرەخۆو
خەوێکی ئارامت بۆ دەخوازم.

((١٢))
ئەگەر دیسانەوە بکرێ
(با) ی بێ‌و بۆنی کراسەکەتم بەسەردا بچێتەوە
بەخوا من
لە تەختی ئەستێرە و تاجی گۆرانی دەبوورم

جارێك بۆ لای چەپی دەڕوات. بە بڕوای من ئەوەی لێرەدا گرنگە کەوتنە شوێن ئەو پێشنیارانەیە کە زمان بۆت فەراهەم دەکات.

کەواتە ڕۆمانەکە تەواو دەبێ بەڵام وەك چۆن من خوڵقاندوومە ئەویش منی خوڵقاندووە، چونکە کاتێك کە خەریکی نوسینی ڕۆمانەکەم دەبم تەنانەت لە کاتی تەواوکردنیشیا زۆر شتی لێدەگۆڕم، سەلماندنێکی ئاشکرایە کە ئەم ڕۆمانە وەك ڕۆمانەکانی پێشووتر نییە. بۆم دەرکەوت زۆر شتم لێ وون کردووە کە دەکرا ئەوشتانە زۆر جوان بن، واتە ڕۆمانیش من دەگۆڕێت. پێم وایە نوسین مانای دۆزینەوە دەدات، واتای دۆزینەوەی شتێکە، دۆزینەوەی خودی ئەو شتەیە.. هەروەها ڕووت بوونەوەی ئەو شتەیە لەبەردەم ئەوانی دیدا.

* زۆر جار لە ڕۆمانەکانتا هەندێك هەڵقەی دەربارەی جەنگ تیایەو چەند دەربڕینێکیشی تێ کەوتووە لە زمانە بێگانەکانەوە خواستراون. ئایا هاوبەشی جەنگت کردووە؟

- بەڵێ هەروەك چۆن کەسایەتییە سەرەکییەکانی ڕۆمانی ((ڕێگای فلاندەر)) دەجەنگێن منیش لە تیپی سوارەدا جەنگاوم. سەرهەنگە سەربازییەکانی فەرەنسا بە گەلۆری و دڵڕەقیان دا دەناسرێنەوە، بە سواری ئەسپەوە ڕەوانەی شەڕی زرێپۆش و فڕۆکەکانیان کردین.

* بێ لە زمانی فەرەنسی بە چەند زمانی دیکە قسە ئەکەی؟

- زمانی ئینگلیزی بەڵام بە شێوەیەکی خراپ.. لە منداڵیمدا باشتر قسەم پێ دەکرد.. بۆ نەگبەتی زۆر قسەی پێ ناکەم.

* ئەی زمانی ئیسپانی؟

- بە ئیسپانی دەخوێنمەوە.. بەو زمانە ئینگلیزییە خراپەم تا ڕادەیەك دەتوانم کارەکانی لە لەندەن و ئەمریکاو هند پێ ڕایی بکەم.

* پرسیارێکی گرنگ هەیە خەریك بوو لە یادم بچێ: یادەوەری چ ڕۆڵێکی لە ڕۆمانەکانتا هەیە؟ چونکە ئێستا ڕەخنەگرەکان لە بارەی یادەوەرییەوە دەدوێن..

- من خۆم لە بارەیەوە دواوم و بۆم دەرکەوت شتی بێکەڵکم گوتوە ... لە کۆتاییدا تێگەیشتم ئێمە شتێك نانوسین یاوەخود باسی شتێك ناکەین کە لە ڕابردوودا ڕوویدابێ. ئێمە لە بارەی ئێستاوە دەنووسین.. بە مانایەکی تر لە بارەی ئەو پاشماوانەوە کە شتەکان لە ئێمەدا جێیان هێشتووەو ئیدراکیش بە ئارەزووی خۆی شێواندویەتی. ئیدراکمان بە تەواوی پێنەگەیشتووە چ لە ڕووی دەروونییەوە بێ یان لە ڕووی جەستەییەوە. چاوەکانیشمان بێ لە چەند شتێکی کەم ڕێگەی بینینمان پێ نادەن - ئەمە بێ لە تواناکانی دی- لە دواییدا یادەوەری دۆشدائەمێنێت. کەواتە شتێکی ئێستایی دەمێنێتەوەو دەست دەکەین بە نووسینی.. هەموو ئەمانەش جارێکی تر دەبنەوە بە ((خواستەکانی بیناکردن)) هەروەك تیناتۆف ناوی لێناوە.

* کەواتە مەسەلەکە پەیوەندی بە گەڕانەوەی ساختومانی ڕابردووەوە نییە؟

- ئاه نەخێر.. هەتاوەکو بڕۆستیش لە ((گەڕان بە دوای زەمەنی وون بوودا)) نەیدۆزیوەتەوە.. هۆکەشی زۆر ئاسانە.. چونکە ئەوە مەحاڵە، بەڵام لە بەرامبەری ئەوەدا بڕۆست شتێکی کەی دۆزییەوە

* چۆن دەڕوانیتە ئەو لێکۆڵینەوانەی کە گروپی ((تیل کێل))[4] ئێستا بۆ ڕۆمانی دەکەن؟

- زۆر باشن بەڵام بە تێڕوانینی من تیئۆرییە.. واتە تا ڕادەیەك پشتیان بە تیۆریزەکردن بەستووەو زۆر بایەخیان بە پراکتیك نەداوە ((ئەمە ڕایەکی ڕووتی منە)) ئەگەرچی تیاشیا سەرکەوتوو نەبن.. ئەمە لە هەندێ جۆری سەرکەوتن سەرنج ڕاکێشەرترە.

* ئایا پەیوەندییەك لە نێوان ڕۆمانی نوێ و لێکۆڵینەوەکانیاندا دەبینیتەوە؟

- بەڵێ.. لەو ڕووەوە هەموو ئەو بایەخانەیان لەبەر چاو گرتووە کە زمان لە خۆی گرتووە..

* بە بێ هوەیی هەوڵمدا ((ئوتێلە گەورەکە))و ((ڕێگای فلاندەر)) بە دەنگێکی بەرز بخوێنمەوە: هەندێك ڕستە هەبوون تەواو بوونیان بۆ نەبوو، لێرەوە چ ئامۆژگارییەکت بۆ خوێنەری ڕۆمانەکانت هەیە؟

- چی بڵێم ... زۆر بە سادەیی ئەڵێم با بیخوێننەوە. ئەوەی لێ دڵنیام ئەوەیە کە ناکرێ لاپەڕەکان هەڵبدەینەوە چونکە ڕۆمان بە گشتی بە شێوەیەکی باش داڕێژراوە، ئەگەر پارچەیەکی ڕۆمانەکەشمان وون کرد ئەوە ناتوانین ڕووداوەکان یەك لە دوای یەك بە باشی بخوێنینەوە. سەرباری ئەوە ((هەروەکو فرانسوا گۆست ئاماژەی بۆ کردووە)) کاتێك باسی ڕۆمانەکانم دەکرێ لە (نەخشەوانی شارەکان) بۆ نموونە: بابەت لە لاپەڕە ٣٦دا هیچ دەنگدانەوە یەکیت یاوەخود پاڵنەرێکیت بەدەست ناکەوێ ئەگەر لە خوێندنەوەی بەردەوام نەبی.. واتە لە دوای ٨٠ یان ١٢٠ لاپەڕە ئەمجا دەگەیتە شتێك.. بەڵام کە خوێنەر لەبەردەم ڕەخنەیەکی خودی دا ڕائەوەستێت ئەوکاتە بە بڕوای من خوێندنەوەکە ئاسانتر دەبێ بەڵام - بە مەرجێ لەناو ڕۆمانەکەدا بە دوای شتێکی نەبوودا نەگەڕێت، مەبەستم گەڕانە لە دوای ڕۆمانی کۆن.

پەراوێزەکان:

١- لە ڕۆژنامەی (الجمهوریە) دا لە ١٧ی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٨٦دا بە بۆنەی بەخشینی پاداشتی ((نۆبڵ)) ەوە بە کلۆد سیمۆن دیمانەیەکی لەگەڵ سازکراوە.. بۆ زیاتر شارەزا بوون لە ڕۆمانی نوێ و ناسینی کلۆد سیمۆن دەتوانیت بڕوانیتە ئەو ڕۆژنامەیە.

٢- قۆناغی زێڕینی ڕۆمانی نوێ دەکەوێتە نێوان ساڵانی (١٩٥٤-١٩٦٤) و پێنج نوێنەرە ناسراوەکەی بریتین لە ((میشێل بیتۆر - ڕۆبێرت بنجیە - ئالان رۆب گرێ - ناتالی ساروت - کلۆد سیمۆن)) دەربارەی ناتالی ساروت و ڕۆمانی نوێ بڕوانە ڕۆژنامەی ((ژیانەوە)) ژمارە ((٢٤))ی ١٩٩٨/٩/٥.

٣- بێ لە نوسەرانی ڕۆمانی نوێ ئەم ناوانەشیان دوا خراوە کە هەندێکیان زیاتر بۆ ناو زراندنیان بووە.. وەك ((نوسەرانی دژە ڕۆمان - ئەو نوسەرانەی بایەخ بە شتە بۆگەنەکان ئەدەن - ڕۆمان نوسەکانی قوتابخانەی بۆگەنی.. هتد)).

٤- تیل کێل - گۆڤارێکی ئەدەبییە - بە عەرەبی مانای (کما هو) دەگەیەنێ.

سەرچاوەکان:


١- ((حوار فی الروایة الجدیدة)) نوسینی ((ریمون ئالامو)) - وەرگێڕانی بۆ عەرەبی ((د. نزار صبری)) دار الشؤون الثقافیة العامة - بغداد ص٦١-٧٢.

٢- ((کلود سیمون)) گۆڤاری ((الثقافة الاجنبیة)) ژمارە ((٣)) ساڵی ١٩٨٧.

گۆرانیەك لە نوێژی نوور بچڕمەو
کۆتایی بێنم بە شەو!
هەتا کەنگێ لە پەنا ئەو چرا شکاوەرا
هەرباسی دەستی بەسراوو بن بەستی ماڵو
بێخەوی ئەم لانکەیە دەکەی!؟
چی دی من بەرگەی ئەم ئاسمانە بێ بەیان و ئەستێرانە ناگرم
بەخوا منیش
رەنگدانەوەی ئاو و گۆرانی مرۆڤم پێ خۆشە
بەڵام ماندوو یان کردووم ماندوو!
وەرە لەلایەکەوە
لەسوێی گۆرانی بمرە بمرە
لەلایەکی تریشەوە بڵێ
کە –با– لە بێ دەنگی ئەستێرە دڵ خۆشە..!
ئەدی چارەی شەوی ئەم کووچەو
هیوای ئەم چرا شکاوە... چی لێدێ؟!
هێی ژنەی زەریانشینی شەوی عەلی!

((١٤))
نەگوتراو.. نە پرسراو.. بەبێ هۆ
ئێوە بۆ..
لەم شەوە ناچاری ئاسیاوەدا
دەست بە چراوە بە شوێن هەر هەوایەکا
بۆ سۆراخی ئەستێرەی سەرلێ شێواوی من هاتوون!؟

ئەمە درۆیەکی روونە
کە لە خەمی نان و
تەمای هەراو هوریادا مردووم

من هەرگیز تینوویەتی

خامۆشانی ئەم ماڵەم بەسەر نەهاتوە

گۆرانیە تاریکەکانی ئەم کۆڵانەم نەچریوە

خەونی نان و

چاوە چاوەڕێ ماوەکانی دایکانم نەدیوە.

من لەسەر تەختی حەزرەتی سولەیمان لەدایك بووم

دایەنەکانی من

مەلاییکە ناسراوەکانی عەرش و ئاوێنە بوون.

من لە نازی شەونم و

نم نمەی ماچدا هەڵچووم

من لەگەڵ شازادەکانی هەزارویەك شەوی ئەم چیرۆکە

بە قسەو وتەو گۆرانی گەیشتوم.

نەگوتراو، نە پرسراو، بەبێ هۆ

ئێستا بەهەڵە

شتێکمان لەو شەوە شکاوە کەوتەوە یاد

ئێوە بۆ

دەست بە چراوە بە شوێن هەر هەوایەکا

بۆ سۆراخی ئەستێرەی سەرلێشێواوی من هاتوون؟

ئەوەی راست بێ

من شین گێڕی غەمگینی ئاسمان و

گۆرانی بێژی غەمگینی دانیشتوانی ماندووی ئەم ماڵە بووم.

گۆرانیە تاریکەکانی ئێوە، من دامناون

منیش هەر وەك ئێوە

شەوێك وەك ئەمشەوی ئێستا

لە خەفەتی غەمگین ترین دایەنەکانی زەریاوە هاتووم

مەلاییکە ناسراوەکانی من لێرەیە

ئاوارە بێ ناوەکانی ئاسمان و

ئەستێرە وێڵ گەڕەکانی پاییزو گریان بوون.

سەفدرە رەش، عەلۆمەلۆ، عۆلام کەلۆ

خاڵوو بەلا، لیلۆ سێ قاپ، سەید سەلا..!
چ عەرشێ.. کام ئاوێنە
کێیە وتە.. کام گۆرانی؟

نەگوتراو.. نەپرسراو.. بێ هۆ..
ئێوە بۆ..!؟

((١٥))
چەندە باشە
ئێمەش فێر بووین
جار جارە بۆ نامۆترین خەڵکی هەر کوێیەک تەنانەت
خەونی نوورو سڵاوو ماچ دەبینین
جاری وایە دەچینە زۆر شوێن
دەربەندگەلێکی دووری ئێوارەو ئەستێرە
دەربەندگەلی مەقامی نوورو تاریک‌و روونی خیزەڵا ن
لە رۆخی ئاو دادەنیشین
لێوی ئاو دەمژین
رێحانە دەچنین
گۆرانی دەڵێین
خۆمان لە — مەودا — گێل دەکەین
دەمدەمانی دوورترین خولیاکان
بۆنی خۆشی ڕووناکایی رۆژ دەبیستین
ئێمە دەبێ وەقسە بێین
پەیڤین بکەین بئاخڤین
ژیانمان خۆش بوێ
بەبێ ترس‌و بێ چاوەڕوانی. تۆزقاڵێک دڵداری بکەین.
ئێمە لەدانیشتن‌و خۆبە دەستەوەدانی — با — و خەونی شەو
بێزارین.
ئێمە دڵمان لەگەڵ وەدواکەوتنی خۆڕایی مردن

ئاسیاو نەبوە.. نیەو نابێ.

چ خۆشە خۆشویستنی بێهۆ
وەك ئەو بارانە بێ پرسیارەی بەخوڕەم دەبارێ
کە لە پڕتاو .. هێور و دەنکە دەنکەش دەبارێ.

بوینە شاعیر هەر بۆیە بەختەوەرین
بەختەوەرین لەبەر ئەوەی هێندە شاعیرین

خوڵقاندن.. گۆرانی خوایە کە ئێمە دەیڵێینەوە
پێمان دەڵێن مانگ... دەچین ئاو بۆ گوڵدانی تینوو بێنین
بۆ ماڵەوە .. بۆ چرا و بۆ ئێوەش
هەڵێك تاکو تێگەیشتنی هەموو شتێك
وەکو باران باشە کە ناپرسێ لێرە
ئەم پەرداخە خاڵیانە هی کامتانە
بەم بنچکە چاوەڕوانی ئاوە دەڵێن چی
یان جیاوازی لە مێژینەی شەوو چراو ئەستێرە چیە!
ئێمە گەلێك ناومان هەیە
ناوەنمان
لە خەتێکی هاوبەشی سەیرەوە هاتوون
وێك چوونی گشت رووخسارەکان
لە یەکەم خەونی ئاسمان نزیکن
ئێمە لە ئەوپەڕی نوورو بزەو ماچەوە
دەگەڕێینەوە سەر خولیای خاك

ئێستا کەهەل تێگەیشتنی هۆگریمان کەمە
دەبێ فێر بین
بەخۆ بواردن لە هەموو شتێك
لەگەڵ خەونی رابواردن و بۆنی یارو دەوای ئاوێنە

تێکەڵ بین.
هەر چۆنێک بێ
زەحمەتی – ناو – و ئیستیعارە – بزرکەین
لە ئاو و لە هەتاو بدوێین
تاکوو رووتتر و روووتتر باوەڕ بکەین..
بە ئەوین، بە مانگ، بە ژیان...!

بەخوا دەرفەتی تێپەڕین لەپێچی ئەم کۆڵانەش کەمە
دەبێ بەرەو نادیار بڕۆین
بەرەو دەربەندگەلێکی دوور
ئێوارەو ئەستێرەم مەنزوورە
گۆرانی نوورو تاریک و رِوونی خیزەڵان...
دیتنی ئاو و ... بۆنی ئەم هەموو ریحانەیە چەند خۆشە!

((١٦))
منیش وەک ئێوە
ناسکتر لە گوڵ و
بێدەنگتر لە بێدەنگیم
زۆر تێکشکاوم

(پیاو کە زۆر بە تەنیا بێ
لەبەرا چپە چپ لەگەڵ خۆی ئەدوێ
دوایی بێ ئەوەی هاوسێیەک بزانێ
دەچریکێنێتە گۆرانەیەکی زۆر دوور،
خۆی دەزانێ کە ئەم وتە مەیلەو تووڕانەی زەریا
رەنگە بۆ لەنتەری شکاوی کەنار
ببێتە هۆی دژواری و داپۆشرانی مانا
بەڵام دیسان دەچریکێنێ.. دەچریکێنێ و زۆر بەرزیش.)

من چەندە بێچرا
بەم کۆڵانە بێ دەنگ و نامۆیانەدا تێپەڕیم و

حەڵاڵ زادەیەك نەبوو
لە خەوی گریاندا ناوی بچووکی خۆم بێنیٚ‌و
بانگم کا هۆ لانکە لە کۆڵی بیٚ‌ماڵ
تۆش دەڵێی شتێکت بەسەر هاتووە
کە مێندە لە دووپات کردنەوەی زەریا.. نابێزرێی!
خوایە بۆ پەپوولەی بیٚ‌پەنای ئەم ئێوارە بیٚ‌گوڵاڵەیە
شەوێك تەنیا شەوی ئەمشەو
خەیاڵی بیٚ بڕوای بنچکە دڕوپەك کوا؟
ئەدی بۆچی ئەم پەنجەرانە لە ترسی – با – کراونەتەوەو
مەواڵی هیچ پەردەیەکی تاریك ... ناجووڵیٚ!؟

من دەترسم!
ترسی من لە زانینی نرخی راستیەکە
کە ئەم هەموو ژاکانی گوڵ‌و
داخرانی بیٚ دەنگی بیٚ ئەستێرەیە... نایەنیٚ!

من لام ڕوونە
ئەم هەورە تازیە بارەی ئاسمان
بەبەرتەنگی ئەم خۆرنشینەی زەریا... کردوویەتە بەر
چیها لە پەردەی ناتەواوی ئەم گۆڕانیەدا دەچڕیٚ!

لەبیرتان بیٚ
پێڵووی چاوی ئێوەشیان
بە باڵای زەریا نەبڕیوە
منی تینووش ئیتر
کە هیچ کەسێك تەنانەت
چاوەڕوانی باران کە هیچ
داوای پیاڵەیەکی شکاویشم
لە خەونی زەریا نیە!

((١٧))

نەی بە بیستنی ناڵەناڵی من شکابوو
کە شەوێک رووی کردە زەریاو
رۆحی رووناکی ماچی
بەبەرئاوێنە تینووەکاندا کرد
زۆربوون ئەوانەی لەو چرکە زانایەدا دیتیان
کە شاعیرانی گەورە
لە خۆشی بیستنی ئەم گۆرانیە چوونەتە خەوی تووباوە
مانگیش لەودیوی حەوت بەندی ئاسمانەوە هەڵات
ئاوێنەی لە — با — ی ناشارەزا ساند
منیشی فێری ئەو وشانە کرد
کە رووناکترلە چرای ئەستێرەو
شەیداترلە خەمی مەولەوی بوون

خۆزگەشاعیر نەبوومایە!

ئەمە چ رەنجێکی بێهودەیە
کە غەمگین ترین وشەکانی ئاسمانیش تەنانەت
نەبنە شەفا نووسی ئەم گۆرانیە تینووە؟!

هەتا ماوی ئیتر
لەگەڵ هەر رێبوارێکی بێ مانگ و بێمەنزڵ
رازی شاراوەی کۆچەریەکانی زەریا نەدرکێنی!
گوتم دەبێ چی کردبێ ئەم بێ چرا شکاوە
کە ئەم سەربان نشینە خەماویانە
وەها لەداخی نەی
دەهۆڵ دەکوتن لە تازیەی مرۆڤا؟
من هەر لەبەر خەوی ئارامی ئەم خەڵکە سادەیەبوو
شەوێک لە شیفای کامڵی ئاسمانەوە هاتم
ئاوێنەم لە — با — ی ناشارەزا ساندو
تەنیا بۆ کۆچەریەکانی شەوی زەریا ... گریام.

گرنگ نیە!
من دڵ خۆشم کە شاعیرم
ئاکامێکی ترم ناوێ
وشەکانم متمانەی رازدارانی ئاوێنەو زەریان
من تەنیا لەبەر هۆگری‌بەئازادی مرۆڤەوەیە
کە رۆحی رووناکی ماچم
بەبەر ئاوازی تینووەکاندا کرد
لە ناڵەی نەی ...
هەر ئەوەندە بۆ منی تێشکاو بەسە!

((١٨))
هێشتا
لە خۆوە چاوەڕێی ئەو کۆچەریە بێ‌شوێنە
دیسانیش چیرۆکێکی هیوای مرۆڤ بۆ دیداری مرۆڤە... باسی من.
من دەڵێم
ئێوە لە هەر رێیەکەوە کە بووە نەچوون تا بزانن
بە دڵ شکاوی لە شەوی گریان تێپەڕبوون... یانی چی!
یانی چی ئەم چرایە
هەر لە کۆڵانێکی بێدەنگی بە هەراو هوریا دانەپۆشیوە!

ئێوە تا کۆتایی ئەم کۆڵانە نەچوون
تاببینن –با–
ئەو –با– یە بە بن بەست گەیوە چۆن
سەر لە هەر دیوارێکی بێ‌دەرگاو بێ رۆچنە دەکوتێ!

ئەدی ئەمەچ پرسیارێکە
کە بۆ کەویی ئەم خەوە قورسە نابم؟
من نوێژی نیوەڕۆ
دەست بەسراو و دڵ شکاو.. گریانم پێواوە

دەی بۆچی هێشتا

چاوەڕوانی ئەو بێ سەرو شوێنە گەورەیە
گوێ قوڵاغی هیوای مرۆڤ
بۆ دیداری مرۆڤ نەبم؟!

((١٩))
گوێم لێبوو... لە درگایان دا
ئابەم نیوەشەوە ... کێیە؟!

دەرکە واڵابوو
لە کەلێنەوە تیشکێ هاتبوە ژوور
بۆنی گوڵی لێدەهات ئەو تیشکە
تامی گۆرانی ئەدا
خەریك بوو دەهات
هاتبوو
وەك هەست پێکرندی هێوری تینوویەتی ئەچوو
هاتە پەنای چوار چێوەی خاڵی زەریا
چرکەیەك روانیە مانگ لەو دیوی پەنجەرەوە
گوتی: دەستێ کەواو و پانتۆڵم بۆت هێناوە
لەلای دانیشتوانی ئاسمانی خۆشمانەوە راسپاردەم پێیە
دەست لە خەمی چەند ساڵەت هەڵگرەو
هۆگری ژیان بەوە
من هیچم نەگوت
لە مانگی بێ دەنگی ئەو دیوی پەنجەرە دڕدۆنگ بووم
گوتی: ماڵێکم لە خشتی نوورو
باخی هەنارو خەونی هەورو بۆ کڕیوی
وەرەو لەم سووچە غەمگینە بێچرایەوە
بەرەو رووناکایی کۆڵان ... شتێك بڵێ!
بۆ وێنە بڵێ:
مانگ تریفە ئەدات
ژیان خۆشە
هەوا بۆنی ڕێحانەو عەتری ئاو و شەرابی مانگەشەوی لێدێ.

من هیچم نەگوت.. بێ دەنگی –با– نەبێ
ئەویش هەر –با –ی نەدەهات
وشەکان پەپوولە پەپوولە دەبوون
شەو وەکوو سەر سوورمانی ئەستێرە
بۆنی بانگ‌و ئاوێنەی لێدەهات.
ژن.. تەواو نووری ئاسمانی حەوتەم بوو،
گوتی ئەمشەو لە ئاوازی مەلاییکانم بیستوە
ئەگەر تۆ بەرەو گۆرانی هۆگری بگەڕێیەوە
بەهەشتی بێ پایانت خەڵات دەکەن!
مانگ.. لەودیوی پەنجەرەوە دەیڕوانی
هەر تەنیا ڕوانین‌و بەس
من هیچ دڵم بە ئاوازە ئەمڕۆییەکانی مرۆڤ خۆش نەبوو.
ژن بوو
دەڵێم ژن بوو
ڕووی کردە چوارچێوەی وێنەکەی ((ڕێڕا))
کتێبێکی لە وشە پیرۆزەکان کردەوە
گوتی: نێونیشانی ئەم بەرەو زەریا ڕۆیوە
بە باران‌و گریانەکانی تۆ دەڵێم
دیسانیش گۆرانی مرۆڤان نابیستی
هۆگری ژیان نابێ
زۆر شتی تریش ماوە...!

مانگ ڕۆیی بوو
دەرگا واڵابوو
بۆنی خۆشی خوا دەهات.

زستانی ١٣٧٧ ی کۆچی هەتاوی.

# - بیژەنی جەلالی -

● و: نەجیبە ئەحمەد

**لەژمارەی پێشووی گۆڤاری -سەردەم-دا شیعرێکی وەرگێڕدراوی فارسیمان بڵاوکردەوە کە خوشکی شاعیرو نووسەرمان (نەجیبە ئەحمەد) کردبووی بەکوردی. بەداخەوە بەهۆی هەڵەیەکی کۆمپیوتەرەوە گەلێك هەڵەی چاپی تێکەوتبوو. بۆیە وادیسان شیعرەکەمان لەم ژمارەیەدا بڵاوکردەوە. لەگەڵ لێبوردن لەخوێنەرانی ئازیزو خوشکە نەجیبەی بەڕێز.**

**گۆڤاری سەردەم**



بیژەنی جەلالی لەساڵی (١٩٢٧ ز) لە تاران لە دایکبووە. قۆناغەکانی خوێندنی سەرەتایی و ئامادەیی لەتاران بەسەر بردووە. پاش تەواوکردنی قۆناغی ئامادەیی و وەرگرتنی دیپلۆم رووی کردە فەرەنساو بۆ ماوەی پێنج ساڵ لەوێ خەریکی خوێندنی "زانستی سروشتناسی" بوو. کە گەڕاشەوە بۆ ئێران لەزانکۆی ئەدەبیات بەکالۆریۆسی لەزمان و ئەدەبیاتی فەرەنسی وەرگرت. یەکەمین کتێبی لە ساڵی ١٩٤١ دا چاپ کرد. روزانەها پێنجەمین کتێبێتی کە بریتیە لە هەشت بەش بەم ناوانە:

١- خەمی رۆژانە.
٢- ئاسمانی وشەکان.
٣- پردێك ئەبینم.
٤- هەر شیعرێکی چاك .
٥- دووپات بوونەوەی لقەکانی درەخت.
٦- وەرزێکی نوێ لە شیعردا بکەینەوە.
٧- پارچە جیاجیاکان.
٨- دوایین دەست.

ئەوەی شایانی وتنە شاعیری جوانەمەرگ خانمی ژیلای حوسەینی چەند مانگێك بەر لە مەرگی هەندێ لە شیعرەکانی بەشی یەکەمی ئەم کتێبەی وەرگێڕا بووە سەر کوردی. ئەوەش لەم کتێبەدا لەبەرچاوە، ئەوەیە کەتێکڕای کتێبەکە هیچ نیشانەیەکی پرسیارو سەرسوڕمان و خاڵ و وێرگولێکی نەگرتووەتە خۆی.

دەفتەری یەکەم

## خەمی رۆژانە

چما دەڵێن وتەکان
لێک دەترازێن‌و
بە نیگا لەناو دەگەین‌و
بە قامك
تیشك نیشان دەدەین

□

چۆن دەشت
بە ئاوازی ئاوابوون
[illegible]ام ئەبێ‌و
شەو ئەخاتە سەر
شانە رووتەکانی خۆی
ئاوا منیش وەڵامی
ئاوازی مەرگ ئەدەمەوەو
لەماڵی جەستەی خۆمدا
جێی ئەکەمەوە.

□

لە ئاوێنەی مەرگدا
جارێکی دی لەخۆمان بڕوانین
بەر لەوەی مەرگ
بماندۆزێتەوەو
لەگەڵ وێنەی ناو ئاوێنەکەدا
ببین بەیەك

□

تەقدیر بارتەقای
قورسایی جیهانە
ئەوەندەی لە فڕینا بەسەر باڵی باڵندەکانەوە
قورسە
لە خەویشدا بە کوڵی ئێمەوە

□

بەسەر کام خاکدا ئەڕوێن
پشتمان چەماوەو
سەرمان قورس
بە کامەزمان
دوعایەك ئەخوێنین
بۆ بانگهێشتنی بە هەشت‌و
دەرکردنی دۆزەخ

□

جیهان چۆن ئەبینن
خەریکە ئەخنکێ
جیهان بەچی ئەزانن
ئەویش ئەمرێت و
لەنێوان تاریکی‌و نووردا
دەست‌و پەل ئەکوتێ

□

بە پەلە
لە سەعات‌و لەساتەکان
رائەکەین
کەچی سەعات‌و ساتەکان
بازنەیی ئەخولێنەوە

□

کامە دەستە
کە نەردی چارەنوس
لەگەڵ مندا ئەدۆڕێنێ‌و
من شەشدەرم
بەڵام ئەمجارەیان دۆڕاو ئەوە
چونکە منی وەها ئەوێ
براوەبم
لە ئاسۆدا
مردوەکانن
کە نەزمانێکیان هەیەو
نەقسەیەك
بەڵام بە سیحری بێدەنگی‌و تاریکی

من بۆ لای خۆیان
بانگهێشت ئەکەن
□
هەندێ جار لە خۆمان
قوڵتر دائەچینو
بێهودە بانگ لە خۆمان ئەکەینو
بە سەختی بە لێواری
تیژی خەمدا دێینە سەرێ
کە بەخۆشمان گەیشتین
سەرەگێژەی گێژاویش
بۆلای خۆیمان بانگ ئەکا
□
هەرچی رۆژە
تۆزێ مردنو
جاری واشە زۆر مردن
بۆ وەی زیندوو بین
□
هەرکاتێ
دەستم بە زانستێك گەیشتووە
مەزنتر لە شادیو
لە خەم
بەڵام قەت قەت هیچم نەزانیوە
چونکە زانین کاری من نەبووە
□
ئاوێتەی خەونو خولیای جیهان
ببین
بێئەوەی بزانین
کێیە کە خەو بە دنیاوە ئەبینێ
□
رۆژان
مێشکمیان گسك داوەو
رووبارەکان
لە دەنگی خۆیانیان پرکردووە
شەوەکانیش
بۆ جێگایەکی دوور دەستیان بردووە
کە خۆشم نازانم کوێیە
□
پامان چەند قورسە
ئەڵێی لە خۆڵ یان
لە خشتە
چەند لەسەر خۆ ئەڕۆین
ئەڵێی بە نیازین
ببینە خۆڵ
□
من ئیدی
لەو دوورە دەستانەوە
نزیکەکانیش لە دوورەوە
ئەبینم
□
دەست لە هەموو شتێك
بسوین
بەڵکو ببینین
بەڵکو بزانین
لە تاریکی رۆحی خۆماندا
هەموو شتێك بچێژین
بەڵکو هەرگیز جیهان
فەرامۆش نەکەین
□
ژیان مۆڵەتێکی دوایی هاتو، و
یاریەکی دۆڕاو بوو
ئەوەشی رابورد
دڵەراوکەو چاوەڕوانییەك بوو
خەریکە بنەبڕ ئەبێت
□

مەرگ لە جەستەمدا/
شپرزەو بێقەرار
هەڵات هەڵاتێتیو
من لەو خەمو
شپرزەییەدا
خۆم بەهاوبەشی ئەزانم
□
بە مەرگ
کۆتایی بە وەهمەکانمان
ئەهێنین
وەك وەهمێکیش
پێ بەپێی مەرگ ڕێ ئەکەوینو
ڕەنگە بشگەڕێینەوە
بۆ دنیای وەهمەکانمان
□
ڕۆشتنو نوستن
لەژێر خاکی وشکو
تینوو
ڕەگەکان بۆلای خۆ
بانگکردن
بەو دڵۆپە ئاوانەی
کە لە لەشماندایە
ئێمە ئەبین بە بەردو
ڕێگایەکی دووریش نییە
بەڵام تا دوبارە دیتن
تا دوبارە وتن
چ ڕێگایەکی دوورە
□
ئەگەر ڕۆیشتویەك
ئەهاتەوەو
باسی مەرگی بۆ ئەکردین
ئیدی ئەو ڕۆیشتوو نەبوو
چونکە بە زمانی زیندوان
دوابوو
□
لەولایەوە
کەدێو
سەیری ئەولایە ئەکەین
یان بەرەو ئەولایە ئەڕۆین
کە لەوێوە دێت
لەکام لاوەیە
مەرگ کەدێت
□
ڕۆژەکانو
کارەکان بەدوای یەکدا دێن
هەروەکو دانە تیژەکانی مشار
یان دانە وردەکانی بڕبەند
ئێمەش هەر کەم ئەکەینو
ئەسوێین
□
لەگەڵ مردن
دوبارە لە خاکدا ئەوەستینو
هەڵایژێین
لەسەر ڕاستە ڕێی خاکیشدا
دەیئاژوین
هەر لەو شوێنەدا کە هەین
هەر لەوێدا کە خەوتوین
□
پێکەوە تا تخوبی گریان
ئەڕۆین
وەلێ ناگرینو
دوبارە تا مەرزی خەم
ئەگەڕێینەوەو
دوبارە ئاوات بەگریان ئەخوازین

□

هەموو شتێك
لە بێدەنگیدا ئەمرێ
گڕکانی "با"
ئاگادار کەن

□

خەم چ قوڵاییەکی لەبن نەهاتووی
هەیە
ئەڵێی زەریایەکە
شەپۆل ئەداتو
تاشە بەردێك بۆ تێکشکاندنی خۆی
نادۆزێتەوە

□

بەکوڵ بگرین
بەسەر ئەوەیدا کە هەیە
چونکە بێجگە لە بوون
چارەیەکی تر نەبووەو
بێجگە لە ڕۆشتن
چارەیەکی نییە

□

مەرگ
وەك بەردە
بێئەوەی بزانین بۆچی
بێدەنگو سادە
بێئەوەی چاکی بناسین

□

بیرو هزرم
چیتر نافڕێ
بەڵکو دائەکەوێ
ئیدی باڵندە نییە
بەردێکە دائەکەوێ

□

دەستی خاك
چەند درێژە
بۆ هێنانو بردنمان

□

ئەوی شادیو خەم بێ
با هەمووی ئەبا
هەروەکو پووشو پەڵاش
دەستی ڕۆژگار
بیرەوەریەکانم گسك ئەداتو
منیش یادێك لەخۆم
خۆم بە فەرامۆشی ئەسپێرم

## دەفتەری دووەم

## (ئاسمانی وشەکان)

تۆ بەسەر ئاوەکانەوە
ئەڕۆشتی
وەکو گوڵێ کە دوایی هاتبێ
یان ئارەزوویەکی ناتەواو

□

لە ساتەکانی خەمو
تەنیاییدا
لەگەڵ ڕۆحی خۆمدا
بووم بەیەك
ئیدی بوار نەما
تا لە ساتەکانی عەشقو بێخەیاڵیدا
لەگەڵ جەستەمدا ببم بەیەك

□

بە پلیکانەکانی بیرەوەریدا
سەرکەوین
تا قوڵایی خەم
وەك فوارەکان
کە هەڵئەچنو سەرنگون

ئەبنەوە

□

جگە لە نور ڕێگایەکی ترمان
نییەو
دەبێ بەهەمان خێرایی بڕۆین و
باکمان نەبێت
لەوەی ئەوسەری
کاکێشانەکان تاریکن

□

شیعر ئیقلیمگیرە
وەکو مژی بەیانیان
هەموو شتێکیش تا ئاستانەی
خەون ئەباو پاشان
شنەیەک ئەیرەوێنێتەوە

□

چاوەڕوانییەکین
وەکو سێبەرێک لەئاودا
ئاوات بە شنەیەک ئەخوازین
بمانفرێنێ و بمانداتەوە
بەئاو و بە ڕوناکی

□

فڕکردنی شیعر
لە ڕۆخی جیهاندا
وەکو ڕێبوارێک
لە ڕێیەکی دوورەوە هاتوەو
لەکەنار دێیەکدا
کانییەکی دۆزیوەتەوە

□

لەسەر وشەکان ئەخزێم
وەکو لەسەر پانتایی
ئاوێک
یان ڕوناکیو
خۆم لە وشەکان جیا ناکەمەوە

□

هاتبوم
تا گوڵێ بچێنم
یان درەختێ بڕوێنم
بەڵام وەرزی بەهارو خەزان
رابوردن و
دەستەکانی منیش لە
نوسینی ناوی درەخت و گوڵ
سواوە

□

هەرگیز دیدار سانا نابێت
چونکە وێنەکان لە
ئاوێنەکاندا زۆرن و
دەبێ زۆر بڕۆین
بۆ نەگەیشتن
بە دوایین وێنە

□

لە هەر نیگایەکدا
ئەڵێی جیهان بەخەو
ئەبینین و
لەگەڵ هەر هەناسەیەکیشدا
قوڵتر دائەچین لە خەودا

□

وتەیەک وەکو ڕۆح
دوو باڵی لە وشە
وتەیەک وەک شیعر
دوو باڵی لەهیوا
بێ برانەوە
هەڵفڕین

□

دەرفەتی جیهان

هەر ئەوەندەیە
پەپوولەیەك لەسەر گوڵێكەوە
بچێتە سەر گوڵێكی تر
وەلێ تەمەنی جیهان چەند درێژەو
دەرد چەند بێ بڕانەوە
ئەنوێنێت

□

ئەگەر بۆ درەختەكان
بنوسم
كێ قسەكانمیان پێئەگەیێنێ
كەواتە چاكترە
هەروەكو درەختەكان
بێدەنگ بمو
جلی سەوز بپۆشم

□

كاتی ئەوە هاتووە
لە بێدەنگیدا
سەیری سەمای لقەكان كەمو
تەماشای فڕینی گەڵاكان
كاتی ئەوە هاتووە
ئەوی ئەیبینم بیزانم

□

ئاوەكان چەند بە ئەسپایی
ئەخوێنن
ئەڵێی لە خەودان
یان پێ لەشوێن پێی
ئاوازەكانی دوێنێ
دائەنێن

□

ئەم ئاوانە
بەژێر كام پردا دەڕۆنو
ئەم پردانە دەستی كامە ڕۆخ
لە دەستی ڕۆخی دی دەنێن
ئەی ئەم خەمە چۆن وا ئەڕوا
كە دەنگی نییە

□

هەموو ساتێك
خەڵاتێكە
پڕە لە دنیا
كە دەبێتە هیچ
دیسان ساتێكی ترە
پڕ لە دنیاو
خەڵاتێكە

□

ئەوەی كە دنیا هەیەو
دوای منیش هەر ئەبێ
چ شادیەكی مەزنەو
چ خەمێكی بێ كۆتایی

□

ئێمەش بۆ ساتێك
وەك دڵۆپە ئاوێ
كە تیشكی خۆری بەركەوتووە
ئەدرەوشێینەوەو
پاشان تەواو ئەبین

□

لە شیعر ورد ببینەوە
ئەڵێی ئاسمانێكە
پڕ لە ئەستێرە
باسی ئاسمانو ئەستێرەش بكەین
ئەڵێی شیعرێكی جوانە

□

ئیشراق
كە بە كۆتایی خۆمان ئەگەینو
وەك ڕۆژ ئەسوتێین

لە ئاستانەی خۆردا
کامە پەردە لادراوە
وا ئەم هەموو نیگاو دەنگو
رەنگو گفتوگۆیانە
دەرکەوتون
کام خۆرەتاو
نیگاو دەنگەکانی رووناك کردوەتەوەو
رەنگەکانی دەرخستووە

□

لە چاوی شیعرەوە
بروانینە شیعر
یانی ئاوێنەیەك
لە بەرانبەریدا راگرین
بۆ وەی لە رووناکی ئاوێنەو
تیشکی هەتاودا بیناسینەوە

□

ئێمە لە گوڵێ زیاتر
چ نین
ئەو دەمەی لێو هەڵئەهێنینو
ئەدوێین
ئاسمانیش بزەی گوڵو
قسەکەی ئێمە
وەك یەك ئەبینێ

□

وشەکان
لە خاکی دڵدا ئەچێنین
بۆ وەی لە خاکا
یان لە ئاسمانا
گوڵێکی لێ بپشکوێ

□

جیهان هەیە
بەڵام ئێمە
جارێکی دی دەیڵێینەوە
بۆ وەی جیهان
زۆرتر لەوەی هەیە ببێو
ئێمەش ببین
زۆرتر لەوەی کە هەین

□

دوو باڵمان لە وشەگەرەکە
بۆ هەڵفرینو
ئاسمانێ لەوتن
بۆ بوونی خۆمانو دنیاش
دەبێ قسەمان هەبێ

□

کەناریەکەم
لەرکەی زەماندا دەخوێنێ
کاتی منیش باڵندەیەکی باڵ رەنگینە
کە دەخوێنێ

□

ئێمە ناوئەبەینو
جگە لە ناو
هیچی تر نامێنێتەوە
لەوەی کە هەیە

## دەفتەری سێیەم

(پردێك ئەبینم)

ئەو ئاوانەی کە ئەڕۆن
باسی تۆ ئەکەن
چونکە شوێن تۆ کەوتونو
ئەگرین
ئاخ ناوی تۆ لە زمانی
ئەوانەوە ئەبیستم
ئەو ئاوانەی کە ئەڕۆنو
ئیتر ناگەڕێنەوە

□

هەمووم چاو بوو
هیچم بۆ وتن نەبوو
بۆیە بەبا
لەسەر ئاو ئەمنوسی‌و
سەیر ی ئاسمانم ئەکرد

□

سێڵاوە نهێنیەکانی
عەشق
کە ئەستێرەو پەڕەی گوڵەکان
ئەبەن
سێڵاوە بە هاریەکانی
عەشق
کە بێقەرارانە گۆرانی
ئەڵێن

□

دەستەکانم ئاوەڵە کردبوو
نەمئەزانی
ئۆقیانوس هاتبوو
لە ئامێزی مندا پلی ئەدا
ئێمە لە گۆرانیەکدا
دەستمان دابووە دەستی یەکترو
بە ئاوازێ ئەڕۆیشتین
ڕێگای بیر بردبوینەوەو
چاڵاوی دوریش

□

ئەگەر پێی ڕۆشتنم بوایە
لەگەڵ هەر هەنگاوێکدا
بە رووی دنیادا ئەکەنیم
ئەگەر دەرفەتی مانەوەشم بوایە
جێگایەکم بۆ خەمی خۆم
ئەدۆزییەوە

□

ئەڕۆم
چاو لە ڕێگاو
پێشم بە شوێنی دڵمدا
ئەڕوا
ئەو دڵەی ئەیەوێ
لە هەموو ڕێگاکاندا ون بێ

□

نەمئەزانی
لەشوێن پێتدا
سەوزایی شین ئەبێ‌و
گوڵ دەرئەکات
گەر ئەمزانی
تۆم سەرگەردانتر ئەویست
ئەی ئاوی ڕەوان
ئەگەر ناوی خۆت بردبوو
شیعرێکت بە زمانی ئێمە
وتبوو
ئەگەر ناوی ئێمەشت بردبوو
خواوەندێك بووی‌و
شوێنت کەوتبوین

□

ریشەکانم
لەگەڵ ڕەگی گشت گیاکان
لە خاکدایەو
دەستەکانیشم
لەگەڵ دەستی هەموو گیاکان
لەبەر بایە

□

ڕووناکیەکان
بۆلای خۆیانم کێش ئەکەن
چما منیش پەپولەیەکم

یان روناکیەکان وەکو ئاو
لەشم سوک ئەکەن

□

درەختەکان
ئەڵێی کراسێکی فرمێسکینیان
لەبەردایەو
بێدەنگ ئەگرین
ئەو کاتەی خاکی پاییزی
بەگەڵاکانیان ئەڕەنگێ
دڵی من سەما ئەکاو
لەبادا ئەڕوا
هەروەکو گەڵایەك
یان گەردیلەیەك
کە لەتیشکی خۆردا
دەستو پێی گوم کردبێ

□

درەختەکان بێننەوە
ئەوکاتەی با
لە دەستمانی ئەفڕێنێ
هەورەکانیش بگێڕنەوە
ئەو دەمەی کە زریان
بەرەو ئاسۆیان
رادەدا

□

رۆژ
دەست لەناو دەستی بادا
لەسەر هەموو گەڵایەك سەمای ئەکرد
دەنگی پاییز ئەهاتو
گریانی هەور نزیك بوو
رۆژێکی پاییزی بوو
وەك ئاوی رونی کانییەك

□

سیمات هەورینە
خەمێکی دێرینەی لەگەڵدایە

منیش خوڕەی باران
لەو دیو نیگاتەوە ئەبیسم

□

من چوزانم
تۆ لێرەوە رۆیشتوی
من چوزانم
تۆ بە ناوێك
بانگت کردوم
من میوانێکی غەریبو ناوەخت بووم

□

چاوم بڕیوەتە سپێتی کاغەز
لەچاوەڕوانی هەڵقوڵێنی
کانییەك
یان فڕینی باڵندەیەك
هەر لە سپێتی ئەویشەوە
چاوەڕوانی موعجیزەیەکم

□

دەستی ئەستێرەیەکی
دوور بوو
کەوشەی لە دەمی تۆ فڕاند
یان با بوو
بەسەماوە هات
تا گوڵێ لەزارت بکاتەوە

□

ئەی رۆژ
تۆ بۆ ساتێ
چاوەکانت نوقاندو
ئێمەت لە خەودا بینی
بەڵام ئێمە هاتینو
خێرا رۆشتین

□

* لە دیوانی (روزا نەها) وە وەرگیراوە

# گفتوگۆ

- فەلسەفەی سیاسی لای ئایزایا بێرلین

- فەلسەفە چی یە؟



- هۆنگ ینگ و ڕۆمانی (هاوینی خیانەت)

فەلسەفەی سیاسی :

# گفتوگۆیەك لەگەڵ: ئایزایا بێرلین

# Isaiah Berlin

▪ دیمانەی: رامین جهانبەگلو

• و: رەووف بێگەرد

□ تەمەنت لە (٨٤)ساڵی تێپەڕیوەو، دەڵێیت لە سەدەیەکی ئەمەندەخراپدا ژیاوم کە ئەوروپا بە خۆیەوە نەدیوە، ئایا ئەم قسەیەتان زیادەڕۆیی تیا نیە؟ چونکە سەردەمانێکی تری هەر بەو خراپیە هەبوون.

□ سەیرە! کامە؟

□ پەلاماری بەربەریەکان، شەڕە سەدساڵیەکان، شەڕە ئاینیەکان، سەردەمی دادگایی کردنی بیروباوەڕ.

□ ئاه... نەخێر، نا.. نا هیچ سەدەیەك کوشتو بڕی وای بەخۆیەوە نەدیوە. بۆ نموونە شەڕە ئاینیەکان یان شۆڕشی فەڕەنسا بێننە بەرچاو کە دەیان هەزاریان تیا کوژرا. رەنگە جەنگیزخان چەند ملیون کەسێکی کوشتبێت، سەرژمێرێکمان نیە، بەڵام لێرەدا قسە لە دەیان ملیون کوژراوە، ٤٠ تا ٥٠ ملیۆن لە روسیا، ١٥ تا ١٦ ملیۆن لە وڵاتانی تری ئەوروپا، لە ئەڵمانیا، ئیسپانیا، ئیتالیا، ئازاردان، بێسەرو شوێن کردن، سەرکوت کردن، هیچ کات ئەوروپا بەم ئەندازەیە خوێن ڕێژی تاقی نەکردۆتەوە.

□ ئایا ئومێدێك هەیە کە ئایندە چاکتربێت؟

□ کێ چوزانێت؟ هیوادارم وابێت، تۆ وا مەزانە زۆر ترساوم، تەنانەت کە ئەم نازیە نوێیانەو ئەم سەرتاسانە (Skinheads) بەراورد دەکەم لەگەڵ ئەوانەدا کە پێشتر بینیومن هەست دەکەم هیچ نین، بەم حاڵەو

بەم ناوە بچووکەی خۆمەوە پێغەمبەری نازانم.

- تۆ بەناوبانگیت، نازناوی (سێر) ت دراوەتیو چوویتەتە ریزی خانەدانەکانەوە، دەڵێن گەلێك رەفتارت ئوروستوکراتانەیە، لەوە دەچێت تەواو لە کۆمەڵگای بەریتانیدا توابیتەوە.
- مەرج نیە وا بێت.
- لە چ روویەکەوە؟
- من ئازاد دەژیم، لە هیچ بوارێکدا هەست بە گوشار ناکەم، بەڵام بوون بە یەکێکی ناو کۆمەڵ جیاوازە لەگەڵ توانەوەدا، ئەمیان بەو مانایەیە کە مرۆڤ بە تەواوی وەك ئەوانی دی هەست بە خۆی بکات، بەڵام بە نیسبەت منەوە چەند جیاوازیەك هەیە. من جوولەکەیەکی رووسیم، کە لێم دەپرسن کێم، ناڵێم ئینگلیزم، من شەیدای ئینگلیزمو ئینگلستان دەپەرستم، بەڵام لە شوێنی تر لەدایك بووم، زمانی ئینگلیزی زمانی دایکم نیە، من تەواو نەتواومەتەوە، پاشان بۆ دەبێت بتوێمەوە؟
- تۆ تەنیا دە ساڵ لە رووسیادا ژیاویت، ئایا چەند هەست بە رووسیەتی خۆت دەکەیت؟
- وەڵامەکەی بەگرفتە، روسی زمانی دایکمە، ئەو شاعیرانەم زیاتر خۆش دەوێت کە روسین، شەیدای شاعیرانی ئینگلیزم، بەڵام نەك بە ئەندازەی پوشکین، لیرمانتۆف، باسترناکو ئاخماتوفا، شیعر هەمیشە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی منداڵی شاعیر، بۆیە دەچێتەوە سەر زمانی دایك. کە لەگەڵ رووسەکاندا دەئاخڤم هەست بە ئاسوودەییەکی تەواو دەکەم، بێجگە لەوەی هەندێك یادوەریم هەن، من ئاگام لە یەکەم شۆڕشە، ئەوسا تەمەنم هەشت ساڵان بوو، ئەمە شتێکە لە بیرناچێتەوە، کۆبوونەوە، نووسینی دروشمی سەرقوماش، ئاپوورەی خەڵکی لەسەر شەقامەکان، خرۆشانی خەڵك، بەڵام ئێستا ئەوەتان بۆ باس دەکەم کە چ شتێك زیاد لە هەموو کاری تێکردووم. مانگی مارتی ١٩١٧ پێش سەرکەوتنی شۆڕشی کۆمۆنیستی. لە دیمەنگای نوسکی لە (پترزبورگ) لەگەڵ دایكو باوکما دەگەڕاین، لە پڕا چاوم بە کۆمەڵێك کەوت نزیکەی (٢٠-٣٠) کەس دەبوون، ئەیان ویست شتێك بتەپێننە دەمی پیاوێکەوە کە رەنگی شین داگەڕابوو، لە قەفرتێی پێکەوتبوو، بە زۆر بەرەوچارەنووسێکی ناخۆشیان دەبرد، وەسف کردنی دیمەنێکی وا لە کتێبەکانی مێژوودا نابینین. لە لەلەکەمم پرسی ئەمانە چی دەکەن؟ وتی دەیبەن بیکوژن، بێ دادگاییکردنو بە ناوڕاست خەڵکیدا بۆ مەرگیان دەبرد، یەکێك بوولەو پۆلیسانەی کە لەسەربانەکان کەمینیان گرتبوو، بۆ ئەوەی تەقە لە خۆپیشاندەرە شۆڕشگێڕەکان بکەن. من هەرگیز ئەم توانیوە دیمەنی راپێچ کردنی ئەو پیاوە بۆ کوشتن لەیاد بکەم، لەوساوە ناتوانم لەبەردەم هیچ جۆرە لەش ئازاردانێکدا خۆم بگرم.
- کەواتە هیچ کات تەماشای تەلەفزیون ناکەیت؟
- هەر ئەوەندەی توندوتیژی دەست پێبکات چاوم دەنوقێنم،ناتوانم تەماشای بۆکسێن بکەم، تەنیا گەمەی شمشێربازیم پێ تەماشا دەکرێت.
- بۆ باوکت رووسیای بەجێهێشت؟
- باوکم بازرگانی داروتەختەی دەکرد، خێزانەکەمان لە شاری (ریگا) لە لیتوانیا دەژیان، ئێمە لە رووسیادا خاوەن دارستانێکی زۆر بووین، دارەکان لەوێوە بەڕێی روبباردا دەگەیشتنە رێگاو پاشان

رەوانەی رۆژاوا دەکران. کە ساڵی ١٩١٤ سەربازەکانی ئەڵمانیا بە فەرماندەیی هیندنبورگ لەشکری روسیان لە دەریاچەکانی مازور لە پروسیای خۆرهەڵات (پۆڵەندای ئێستا) لەناوبرد، دایکو باوکم لەوەترسان نەکا لە رێگا گەمارۆ بدرێنو پەیوەندیان لەگەڵ سەرچاوەی دەرامەتەکەیاندا نەمێنێت، بۆیە لە ساڵی ١٩١٥ دا بڕیاریاندا لە (پترزبورگ) نیشتەجێبن بۆئەوەی نزیکی دارستانەکان بن، باوکم چ پێش حکوومەتی شوراییو چ دوای ئەویش، ئەودارانەی بۆ لەشکری روسی دابین دەکرد کە پێویستیان پێی بوو، ئەگەرچی وەك هەموو چینە بۆرژوازییەکان رقی لە کۆمۆنیزم بوو، بەتایبەت کاتێك کە دەستیان دایە رەشە کوژی، سەرەتای ئەم تیرۆرکردنە لە ستالینەوە دەست پێناکات، بەڵکوو لە نۆڤەمبەری ساڵی ١٩١٧ ەوە لە خودی لینینەوە دەست پێدەکات. بۆرژوازیو جوولەکە پێشوازیەکی باشیان لە شۆڕشی لیبرالی (یەکەم) کردبوو، بەلام لینین هەر زوو بە روویەکی دەمارگیرو سامناکەوە هاتە مەیدان. ساڵی ١٩٢٠ باوکم گەڕایەوە بۆ ریگا کە شوێنی لەدایك بوونی بوو، لەوێ وەك لیتوانیەك مایەوە، ئێمە دوو مانگ لە ریگا ماینەوەو پاشان روومان لە ئینگلستان کرد، باوکم کە هەمیشە دۆستی ئینگلستان بوو حەزی کرد هەر لەوێ بەردەوامی بەخوێندنم بدەم، ریگا شارێکی زیاد لە ئەندازە دێهاتی بوو.

□ وتت جوولەکەیەکی روسیت، جوولەکایەتی لای تۆ چی دەگەیەنێت؟

□ هیچ، وەك چۆن دووپێمان هەیە، سەرێك، دووچاو، گەدەیەك.

□ ئایا هیچ کاتێك شەڕی دژە جولەکایەتیت لەگەڵدا نەکراوە؟

□ هەرگیز ناتوانین بڵێین هیچ کاتێك، بۆ نموونە رۆژێك بێئاگاداری خۆم یەکێك بۆ ئەندامیەتی یانەیەك ناوزەدی کردبووم، ئەو یانەیە جوولەکەی بە ئەندام وەرنەدەگرت، ئەمە گێژاوێکی وای نایەوە کە دە کەس واز لە ئەندامێتی بهێنن، بەلام من هەمیشە بەسەلامەتی لێی دەرچووم، هیچ کاتێکیش هیچ کەس لە رووی مندا توانجی لە جوولەکە نەگرتوە. مانای وایە بەریتانیا ولاتێکی دژ بە جولەکە نیە، ئینگلیزێکی ئاساییو سروشتی بهێنە بەرچاوی خۆت کە لە ناتینگهام دەژیو دەست درێژی دەکاتە سەر جولەکەیەك، ئەمە مەسەلەیەك نیە، بەلام لە فەرەنسادا، لەبەرئەوەی کڵێسە هەیە، لەبەر بەسەرهاتەکەی ((دریفوس)) ئەمە دەبێتە مەسەلەیەك، فەرەنساییەکان دەربارەی ئەوەی کێ جولەکەیەو کێ جولەکە نیە خاوەن ویژدانێکی زۆر زیندون.

□ ئایا بنەماڵەکەتان رێورەسمی ئاینییان بەجێ دەهێنا؟

□ بەڵێ، بەلام زۆر بورژوازیانە، نەك توندڕەوانە. من جار جار دەچمە کەنیشتە، لەوێدا هەست بە نەریتی سێ هەزار ساڵ دەکەم. لەگەڵ گەلێکدا کە خۆشم دەوێت هەست بە هاوسۆزی دەکەم، بەلام باوەڕم نیە، کەچی خوا نەناس نیم، لە منداڵێك دەکەم کە هەستی مۆسیقای نەبێت، کەسانی دی دەبینێت گوێ لە مۆسیقا دەگرنو بایەخی پێئەدەن، بەلام خۆی ناتوانێت نۆتەیەك لە نۆتەیەکی دی جیابکاتەوە، لەخۆی دەپرسێت بۆ کەسانی دی ئەوەندە باخو بیتهۆڤنیان خۆش دەوێت، منیش هەمان هەستم بۆ ئاین هەیە. من کەڕم، گوێم قورسە. بەلام رێزم بۆ ئەوانە هەیە کە بروایان بەخوایە، هەندێك جار لەکاتی رێورەسمی ئاینیدا جۆشو خرۆشێك دام

دەگرێت، بەتایبەت لە کەنیشتە یان مزگەوت، بەڵام کەمتر هەست بە رێبازی کاسۆلیك دەکەم، من عارف نیم، ئەتوانم لە چەمکی پەرجو (معجزە) تێبگەم، ئاسانە، ئاو دەگۆڕدرێت بۆ شەراب. (لە سەدەی هەژدەدا فەیلەسوفێك بەناوی کریستیان وولف وتوویەتی: (مەسیح مەوجودێکی نائاسایی نەبووە، بەڵکوو کیمیازانێکی خودایی بووە) بەڵام مانای شت گەلێکی وەك سێکوچکەی پیرۆزو (روح القدس) م بۆ قووت ناچێت. لەبارەی چەمکی عیرفانەوە زەینم سستە.

- ئایا بۆ تۆ وەك جولەکەیەك کە لە روسیاوە کۆچی کردووە، لەقەبی (سێر) کە شاژنی ئینگلیزی پێی بەخشیت چ بایەخێکی هەبوو؟
- ئاه .. بەڵێ، رووداوێکی زۆر تایبەتی بوو، هەڵبەت جولەکەی کۆچ کردوی تر هەن ئەم شانازیەیان پێبراوە، بەڵام ژمارەیان زۆر کەمە.
- ئایا ئەمە شتێکی لە ژیانی ئێوەدا گۆڕیوە؟
- نا، تا ماوەیەکی زۆریش خۆم پێ قایل نەدەکرا کە بتوانم کەڵك لەم ناونیشانە وەربگرم، ئەمەندەم پێکەنین پێدەهات وەك ئەوەی یەکێك رۆژی ٣١ دیسامبەر (کۆتایی ساڵ) کڵاوێکی نوك تیژی کردبێتە سەر، لەوەیش دەترسام نەك هەندێك لەو دانیشگاییانەی ئەم خەڵاتەیان پێ نەبراوە ئیرەییم پێببەن. لەراستیا، ئەگەرچی کەس بڕوا بەم قسەیەم ناکات، بەڵام وەرگرتنی ئەم لەقەبەو پاشان میداڵی لیاقەت زیاتر بۆ دڵخۆش کردنی دایکم بوو، دایکم لەوکاتەدا تەمەنی (٧٦-٧٧) ساڵ بوو، پیرێژنێکی جولەکەی کۆچ کردوو ئەمانەی زۆر لاگەورەبوو. ئەم توانی دایکم لەو خۆشیە بێبەری بکەم، بۆیە بە پێچەوانەی ئارەزووی خۆمەوە وەرم گرت.
- چۆن بوویت بە فەیلەسوف؟ هۆیەکەی حەزو بەهرەبوو؟
- ئاه .. زۆر ئاساییە، لە ئۆکسفۆرد دووبەش هەبوو، یەکێکیان مێژووی دێرینو ئەوی تر فەلسەفە، من زیاتر حەزم لە مێژووی یۆنانو رۆم بوو، بەڵام بەشی فەلسەفە لە ئۆکسفۆرد پلەیەکی باڵاتری هەبوو لە بەشەکانی دی، من هیچم لە فەلسەفە نەدەزانی، تا ئەوسا سێ کتێبی فەلسەفەم خوێندبووەوە، مامۆستاکەم داوای لێکردم باسێك بنووسم، باسەکەم زۆر باش نەبوو، بۆیە رەخنەی لێگرتم، یەکێکی ترم نووسیو دیسان رەخنەی لێگرتم، من دلگیربوویوومو بیرم بۆئەوە ئەچوو کە ئەو هەڵەیەو من لەسەرهەقم، داوای باسی سێیەمی لێکردم، فێرکردن لە زانکۆی ئۆکسفۆردا زۆر شەخسیە، دیسان رەخنەی گرتەوە. پاشان تێگەیشتم کە هەق بەوە، لەوێوە پەیوەندی راستەقینەی من بە فەلسەفەوە دەستی پێکرد، خواردن ئیشتیها بە مرۆڤ پەیدادەکات.
- بە گشتی دەتوانین بڵێین تۆ بە رێکەوت بوویتە فەیلەسوف؟
- وەك هەموو فەیلەسووفەکان. برتراندراسل لە کیمبرج فەلسەفەی دەخوێند کە جۆرج ئەدوارد مور (Moore) لەوێ فەلسەفەی دەوتەوە، من بۆ ئەوە نەبوومە فەیلەسوف کە بمەوێت وەڵامی پرسیارە گەورەکانی وەك: ((لەکوێوە دێین؟)) ((کێین؟)) ((چاکە چیە؟)) ((خراپە کامەیە؟)) و شتی ترم دەست بکەوێت، هەڵبەت پێم خۆشبوو وەڵامی ئەم پرسیارانەم لابێت، بەڵام بوونم بە فەیلەسوف تەنیا لەبەر پێگەی زانکۆیم بوو.

□ دەربارەی ئەوەی کە فەڕەنساییەکان هێند حەزیان بە کاری تۆ نیە خۆت چی دەڵێیت؟

□ هیچ.

□ بڵێی لەبەرئەوە نەبێت کە تۆ هیچ کات نەچوویتە نێو باس و خواسی مارکسیستی و دژەمارکسیستیەوە؟

□ رەنگە، لە فەڕەنسادا، لە تەواوی قۆناغی دوای جەنگدا، هەموو رووناکبیرانی ئەوسا چەپ بوون، لە ئەندامانی پارتی کۆمۆنیستەوە بیگرە تا هاوڕێ و لایەنگران و هەوادارانی پێشوویان، باشە، من هەرگیز نە لەگەڵ ئەو بیروباوەڕانەدا بووم و نە دژیان وەستاوم، بەڵام هەمیشە دژی مارکسیست بووم، بێ ئەوەی نەریت پارێز بم. من بەردەوام چەپەکان بەوەیان تاوانبار کردووم کە لە نەریت پارێزیدا توندڕەوم، لای راستەکانیش گوناهم ئەوە بوە کە توندڕەوم لە ئازادیخوازیدا.

□ بەم حاڵەوە هاوڕێی (رمون ئارون) بوویت؟

□ بەڵێ، بەڵام بە ئەندازەی ئەو راست رەونیم، رمون ئارون توێژەرەوەیەکی گەورە بوو؟ چاکترە بڵێم نووسەرێکی سیاسی – کۆمەڵایەتی دانسقە بوو. کەمێك باڵاتر لە رۆژنامە نووس و کەمێکیش خوارتر لە فەیلەسوفێك، شتێك لە نێوان ئەو دوانەدا، بەڵام بڕوای وابوو کە من هەست بەوە ناکەم چەپەکانی فەڕەنسا چ گوشارێکیان لەسەرە. هەر ئەوەیشە بۆتە هۆی ئەوەی من لەو وڵاتەدا نەناسرێم.

□ پێچەوانەکەیشی، ئینگلیزەکان هەرگیز حەزیان بە بیرمەندە فەڕەنساییەکان نەکردووە، ئەمان بایەخیان بە مارکسیزم نەداوە، تۆ دەڵێی چی؟

□ فەیلەسوفانی ئینگلیز هەرگیز دۆستایەتیان لەگەڵ ئایدۆلۆژیادا نەبوە، ئینگلیزەکان بەرانبەر بە بیری پەتی و سیستمە فیکریەکان هیچ کات هەست بە ئاسوودەیی ناکەن، هەڵبەت ئەوانیش خاوەنی بیروباوەڕن. بەڵام زیاتر لە شێوەی راو عەقیدەدا. لە فەڕەنسادا کتێب گەلێکی لەم جۆرە هەن: ((لە بودنەوە تا مونتسیکو)) لە ((مونتسکیووە تا رۆسۆ)) ((لە رۆسۆوە تا ١٨٤٨)) ((لە سوسیالیستەکانەوە تا لیونی بورژوا)) ((لە لیونی بۆرژواوە تا سارتەر)) و لەم بابەتانە، رەنگە بتوانین ئەمە بە مێژووی فیکری یەك Geistgeschichte (مێژووی زەین) ناوبەرین، بەڵام لە ئینگلتەرادا ئەوە نیە کە مێژووی فیکر لە تەنیا کتێبێکدا بخرێتە روو. پیرۆییەکی هەڵکەوتو بێنە بەرچاو کە لەسەدەی نۆزدەدا، با بڵێین لە ساڵی ١٨٥٠ دا هاتبێتە ئینگلتەراوە، دیارە ئەو قسەو باسێك لەبارەی جان استیورات میل، چارلزداروین، هربرت اسپنسر، جرمی بنتام و... دەبیستێ و، کەم و زۆرێك دەربارەی ژیانیشیان دەخوێنێتەوە، دەبینێت هیچ لێکۆڵینەوەیەکی گشتی و هیچ کورتە مێژوویەك لەبارەی فیکری ئەوانەوە نیە.

□ کەواتە تۆ وەك مێژوو نووسی بیروباوەڕەکان دەبوو زۆر هەست بە گۆشەگیری بکەیت.

□ بەڵێ، دیارە کەسانێکی بلیمەت هەن کە دەتوانم لێکۆڵینەوەیان لەگەڵدا بکەم، فەیلەسوفانێك کە پەیوەندیان بە هزرەوە هەیە، بەڵام ئەمجۆرە لێکۆڵینەوانە ناکرێنە پیشە.

□ بەم پێیە بۆشاییەکی زۆر لەنێوان بیرمەندانی فەڕەنسایی و فەیلەسوفانی ئانگلوساکسونیدا هەیە.

□ راستە، تا سەرەتای سەدەی بیستەم فەلسەفە لە ئەورووپادا سروشتێکی نیونەتەوەیی هەبوو، بەڵام لە دەست پێکردنی ئەم سەدەیەوە درزێکی سەرەکی کەوتە نێوان فەلسەفەی ئانگلۆساکسونیو وڵاتانی تری ئەورووپاوە، لەلایەکەوە ئەمریکاییەکان، نەرویژیەکان، کەنەداییەکان، هۆڵەندیەکان هەنو، لەلایەکی ترەوە فەرەنساییەکان، ئیتالیەکان، ئیسپانیەکانو ئەڵمانیەکان هەن کە هیگڵ، مارکسو هایدگەر زۆری کارلێکردوون. لە ئینگلتەرادا کێ بەرهەمی هایدگەرو سارتەری خوێندۆتەوە؟

بۆشایی نێوان ئەم دوو سیستەمە زۆر قووڵە، ئێستا هەندێك هەوڵ ئەدەن بە بڵاوکردنەوەی گۆڤارێکی فەلسەفی ئەورووپایی پردێك بۆ نزیك کردنەوەی ئەم دوو تەوژمە فیکریە دروست بکەن، هیوای سەرکەوتنیان بۆ دەخوازم، لە دیدی فەرەنساییەکانەوە فەیلەسووفەکانی ئینگلیز زیاتر تەکنیك ناسنو سۆزێك ناجوڵێنن، ئینگلیزەکانیش زۆربەی فەیلەسوفە فەرەنساییەکان بە ئاڵۆزو هەراو هوریاکەر دادەنێن، ئەوان بە زمانی جیاواز قسە دەکەن.

□ سەرچاوەی ئەم درزە چیە؟

□ وای بۆدەچم سەرچاوەکەی ئینگلیزەکان بن، لەسەرەتای ئەم سەدەیەدا لە کیمبورج مامۆستایەکی هەرە ناودار هەبوو بەناوی جورج ئەدوارمور، کاریگەریەکی زۆری لەسەر کینز، راسڵ، بلومزبیریو هەموو فەلسەفەی کیمبورج هەبوو، پیاوێکی زۆر هوشیارو شەریفو خاوەن تێڕوانینی روون بوو، لەگەڵ سیستەمە فیکریەکانی لە بابەتی فەلسەفەی کانت، فەلسەفەی هیگڵو هەندێکی تردا نەدەگونجا، لە دیدی ئەوەوە پێش بیناکردنی سیستمی گەورەی فیکری دەبێت پرسیارگەلێکی سادە لەبارەی کەرەسەکانی بیناکەو، ئەو خشتەی دەمانەوێت بیناکەی پێ دروست بکەین بخەینە روو، خۆی بە وردی کەوتە هەڵسەنگاندنی وشەکان بەو مەبەستە کە پێناسەیەك بۆ مانای وردی زاراوە فەلسەفیەکانی وەك (انظمامی) (هەمەکی) (دیالکتیك) ... و هەموو ئەو واژانەی کە ئەندامانی (یانەی هیگڵی) کەڵکیان لێدەبینی بخاتە روو، ئەم کارەی کاریگەریەکی دیاری بۆسەر برتراندراسڵو قوتابخانەی پوزتیڤزمی لوژیکی هەبوو، کارێکی زۆری کردە سەر فەلسەفەی ئانگلوساکسون کە دژی تەمو مژ بێت، بە گشتی فەلسەفە سەردەمی تەمو مژو سەردەمی روونی هەیە.

□ ئایا ئێوە لە فەلسەفەدا دروست کردنی تیوریە ئەبستراکتەکان بە زمانی تەمو مژو داخراو (تورم) ناو دەبەن؟

□ لە سەدەی هەڤدەدا گەلێك سیستەمی فیکری مەزن هەبوون کە کەمو زۆر وا بەستە بوون بە کڵێسەی کاسۆلیکی رومیو زۆریش تەمو مژاوی بوون.پاشان فەلسەفەی دژی تەمومژ هاتە پێشێ. دیکارت کە پرسیارە سادەکانی وەك: ((من کێم؟)) ((دەربارەی حەقیقەتی گوتار چی دەزانین؟)) ی خستە روو، ئەو لەو شتەی بە وردی دەکۆڵیەوە کە دەیتوانی لە بارەیەوە دڵنیابێت. (کڵێسە، کە سیستەمە فەلسەفیە گەورەکانی هەڵبژاردبوو، نەی دەتوانی بەم کارانەی ئەو قایل بێت) دوای دیکارت اسپینوزامان هەیە کە ئەویش دژی تەمومژەو بەترسو وریاییەوە دەست بۆ شتەکان دەبات. بێجگە لەوە دەگەینە لای لایبنتیز کە ئەویش یەکجار روونو زۆر وردبینە، دیارە ئەو زۆر تیوری پەتی خستە روو، بەڵام مەبەستەکەی زۆر بە وردی روون دەکردەوە، هەر مرۆڤێکی ئاسایی لە لایبنتیز تێدەگات.

لە سەدەی هەژدەدا لەگەڵ بیرمەندانێکی وەك هوبز، برکلی، لاك، هیوم، هولباخ، دیدرو و هەموو هاورێیانی ئەنسکلوپیدیا، کە توێژینەوەکانیان تەمومژی لەسەر نیە، هێشتا لەناوجەرگەی سەردەمی دژە تەمومژی فەلسەفیدان.

ئەو فەیلەسوفەی کە بەهاتنی ئەو قۆناغی تەمومژاوی فەلسەفە دەست پێدەکات – ئیمانوئیل کانت– ە، هەموو ئەو بابەتانەی کە کانت پێش کتێبی رەخنە لە عەقڵی پەتی، واتا پێش ساڵی ١٧٨١ نوسیبووی هەموو رونو ئاشکران، بۆ نموونە ئەو بەرهەمانەی دەربارەی ئەستێرەناسی، فیزیك.. و، بە راستی کانت بیری فەلسەفی گۆڕیو بیری تەواو رەسەنی هەبوو، ئەو دۆزینەوەی سەرسوڕهێنەری هێنایەکایە، بەلام ناچار بوو بۆ روون کردنەوەی ((بنەمای بابەتەکان)) ی خۆی کۆمەڵێك زاراوەی تایبەت بەخۆ دابهێنێت. بۆیە خوێندنەوەی رەخنە لە عەقڵی پەتی ئەوەندە گرانە کە ئەوەی دەیلێت دەشێ بەشێوەی جیاواز لێك بدرێتەوە، مانا هەمیشە روون نیە.

- ئایا ئەم سەردەمی پەرەسەندنی تەمومژیەتا هایدگەر دەخایەنێت؟
- بەڵێ، بێجگە لە کەسانێکی وەك شوپنهاوەر کە فەیلەسوفێکی درەوشاوەبوو، یان نیچە کە بە ئەڵمانیەکی زۆر روون دەینووسی، بەلام دوای کانت بیرو بۆچوونەکانیان ئەوەندە کاریگەری نەما، هیگڵیش بەشێکە لەو زنجیرە فەیلەسوفانەی کە تەمومژاوین، ئەو کۆمەڵێك زاراوە بەکار دێنێت کە تێیان ناگەیت، وێنەیەك لەم جیاوازیە گەورەیەی نێوان ئەو دوانە دەخەمە روو، شوبنهاوەرو هیگڵ رقیان لە یەکدی بوو، هاوکات لەگەڵ یەکتردا لە دانشگایەك دەرسیان دەوتەوە، هەموو خوێندکارانی زانکۆ زیاتر حەزیان لە وانەکانی هیگڵ دەکرد کە شوپنهاوەر بە فێڵ بازی ناودەبرد.
- تۆ دەربارەی هیگڵ چ بۆچونێکت هەیە؟
- ئێستا پێت دەڵێم هەستم بەرانبەر بە هیگڵ چۆنە، کتێبی ئۆدیسەی هومیرتان لە یادە؟ لەو داستانەدا پەرەگرافێکی بەناوبانگ هەیە کە باس لە پێکدادانی ئولیسە لەگەڵ پولوفموسدا کە دێوێکی پیاوخۆرو لە سیکلوپەکانە دەکات، ئولیس دەڕواتە ئەشکەوتەکەی پولوفموسەوە، ئەوەی نیگەرانی دەکات ئەوەیە گوێی لە دەنگی پێی ئەو کەسانەیە کە دەچنە کەوێڵی دێوەکەوە، کەچی هەرگیز دەنگی چوونە دەرەوەیان نابیستێت. ئەمە تا ئەندازەیەك لە بارەی هیگڵەوە راستە، ئەوانەی پێ دەنێنە ناو فەلسەفەکەیەوە ئیتر پێی هەڵاتنیان نامێنێت.
- ئالکساندر هرتزن (١٨١٢– ١٨٧٠) باوکی رادیکاڵیزمی روسی کە تۆ زۆری ستایش دەکەیتو زۆر جار قسەی دەکەیتە نموونە، لەبارەی فەڕەنسیەکانەوە دەی وت: ((لە هیچ جێگایەك، بێجگە لە دوالیزم، ئەبستراکت، چاکە خوازی بە زۆر، رەوشت خوازیو مەیلی رەوان بێژی چی تر ناکەوێتە بەرچاو، بێئەوەی هیچ یەکێکیان پەیوەندی بە ژیانی واقیعیەوە هەبێت)).
- ئەم قسەیە تەواو راستە.
- پێت وایە ئێستایش هەر راست بێت؟
- ئەشێ، بەلام فەیلەسوفەکانی ئێستای فەرەنسا کێن؟ ناوم بدەرێ.
- دریدا، برنارهانریلوی، گلوکزمان، دلوز.
- من هەرگیز لە نووسینی دریدا ناگەم، ئەزانم لە فەرەنسادا جێگای ستایشە، لویوگلوکزمانیش راڤەکاری مارکسین، بەلام مرلوبونتی فەیلەسوفێکی راستەقینەبوو، بیری رەسەنی هەبوو.

- ئایا لە فەرەنسای ئەمڕۆدا فەیلەسوفی گەورە نیە؟
- ئەمە خۆتان وتتان ..! بۆنا، کاڤالیس (Cavailles) هەبوو کە ساڵی ١٩٤٣ نازیەکان کوشتیان، لۆژیک زان بوو، قوتابخانەی – پوزیتیڤیزم – ی لە ئەڵمان لای کارناپ خوێندبوو. کارناپ ئەندامی (ئەڵقەی ڤیەننا) بوو، ئەو شارەی کە فەلسەفەی دژی ئەمڕۆی ئینگلستانی تا ئەندازەیەك تیا بڵاو بوەوە، وتنی ترسناکە، من بڕواناکەم لە دنیای ئەمڕۆدا فەیلەسوفی گەورە هەبێت، بەڵام ئەمە شتێکە ناتوانیت بیڵێیت. هەندێك هاوڕێم هەن خۆیان بە فەیلەسوفیگەورە دەزانن، بەهەرحاڵ من نە لە فەرەنساو نە لە بەریتانیادا شتی وا نابینم، ڕەنگە یەك دوانێك لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا هەبن.
- جون ڕالز؟
- هاوڕێمەو فەیلەسوفێکی گەورەیە، بەڵام خۆی دان بەوەدا نانێت، زۆر خاکیە.
- کێی تر؟
- ناتوانین پیرستێك بخەینە ڕوو، چونکە مەترسی ئەوە هەیە کەسانێکمان لەبیربچێت. هەندێك فەیلەسوفی چاك هەن خەریکی فەلسەفەی زانستن، هەموویان ئەمریکین.
- بە ڕاست فەیلەسوف بە کەڵکی چی دێت؟
- خولیایان، فەلسەفاندنو تێفکرینە. ئەگەر لێم بپرسیت ئامانجی هونەر چیە، پێت دەڵێم هونەر ئامانجی نیە، ئامانجی هونەر هونەرە، ئامانجی عەشق عەشقە، ئامانجی فەلسەفە گەڕانە بەدوای حەقیقەتی فەلسەفیدا،وەڵامی پرسیارگەلێکە کە منداڵان دەیکەن، بۆ دەبێت فلانەکار بکەم؟ بۆ دەبێت یەکێك گوێڕایەڵی ئەوی تر بێت؟
- بۆ لە دنیای ئەمڕۆدا ئیتر ئەم پرسیارانە ناخرێنە ڕوو؟
- ئێمە دەیانخەینە ڕوو، لە هارفارد، ئۆکسفورد یان ستوکهوڵم. لە فەرەنسا ئەم پرسیارانە ناکەن، چونکە زۆربەی فەیلەسوفە فەرەنسیەکان وای بۆ دەچن کە ئەو پرسیارانەی ڕاستەوخۆ پەیوەندیان بە مەسەلە بنەڕەتیەکانی ژیانی کۆمەڵگاوە نەبێت جێی گاڵتە پێکردنە.
- پرسیاری سەرەکی مرۆڤ، واتا ئازادی، هێشتا بێوەڵام ماوەتەوە.
- لە یۆناندا دوو قوتابخانە هەبوو، ڕەواقیەکان کە بڕوایان بە قەدەر بوو، لایەنگرانی فەلسەفەی ئەبیکور کە بڕوایان بە ئازادی هەبوو، لەو ساتەوە تا ئێستا چ کەسێك لەو زەمینەیەدا هیچ قسەیەکی بایەخداری نەکردووە، ئەمە مەسەلەیەکی بێچارەسەرە.

کانت زۆر جوانی قسەکردوە، ویلیام جیمزیش، هیگڵیش وەك هەموو، هەموو فەیلەسوفەکان لەم بارەیەوە بڕوایەکیان هەیە، بەڵام لەگەڵ یەکتردا ناکۆکن، ڕێك ناکەونو نایش بێت ڕێك بکەون، زۆر گرفتە بە مرۆڤ بڵێین وابەستەی پێویستیەکانەو کەچی ئازادە هەرکارێك بکات.

- تۆ بە مامۆستای بیکردنەوەی لیبرال دەزانن، چ پێناسەیەکت بۆ لیبرالیزم هەیە؟
- ئەی خوا! جۆرەکانی لیبرالیزم زۆرن، سەرچاوەی ئەم وشەیە ئیسپانیە ((لوس لیبرالس)) (Los liberales) لە سەدەی نۆزدەدا بە کەسانێکیان دەوت کە دژ بە پاشایەتیو دژی کڵێسە بوون، لیبرالەکان ئەوانەن بڕوایان بە ئازادی تاکەکەس هەیە، هەر ئەوەندە!
- ئاخۆ بە ڕای ئێوە دیموکراسیو لیبرالیزم دوو وتەزای جیاوازن؟

□ دیموکراسی دەشێ سەرکوت کەر بێتو مرۆڤ لە ئازادی بکات. تاقە بەڵگەیەك کە دەبێتە هۆی پاڵپشتی کردنی لیبراڵەکان لە دیموکراسی ئەوەیە کە ئەمان لەباری دیموکراسیدا لانی کەم دەتوانن بۆ ئازادی بجەنگن، بەڵام ئەمە لە رژێمێکی دیکتاتۆریدا نایەتەدی.

□ ئایا دەبێت لیبرالیزمیش سەرکوت کەربێت؟

□ نا .. بڕوا ناکەم، کە بڕوا بە ئازادی تاکە کەس لە ئارادا بێت، کەم رووداوەدات منداڵ لە کانەکاندا کرێکاریان پێبکرێت. لیبرالیزم ((لێگەڕێ چ دەبێت با ببێت)) نیە، سیستمێکی ئابووریش نیە، لیبرالیزم سیسمتێکە ناهێڵێت دەست درێژی بکرێتە سەر ئازادیە بنەڕەتیەکان.

□ راستە ڤالری ژیکار دستان بۆ بینینت هاتبوە لەندەن؟

□ بەڵێ، دووجار، لەوە دەچوو کتێبێکی منی خوێندبێتەوە، هاتبوو لەبارەی فەرەنساو مارکسیزمەوە قسەم لەگەڵدا بکات، وا بزانم ساڵی ١٩٨١ بوو، تەواو دوای لێکەوتنی لە پلەی سەرۆك کۆماری، ئەوەی بۆ روون کردمەوە کە لێکدانەوەی مارکسیستی بۆ فەرەنسا بەکار ناخوات، چونکە چینێکی دەسەڵاتدارو زۆر دەست رۆیشتوو لە تەکنیکارو تەکنوکرات لەو وڵاتەدا هەیە کە نە کارمەندنو نە کرێکار، لە ئەنجامدا، ئەو تیورانەی پەیوەندیان بە جیابوونەوەی نێوان سەرمایەو کارو، نێوان چەوساوەو چەوسێنەرەوە هەیە بۆئەوێ راست دەرناچێت، من پێم وت: هیچ شتێك لەبارەی فەرەنساوە نازانم، بەڵام پێم خۆشە ئەوەی دەیڵێت وابێت. پاشان لێی پرسیم کە بە رای من ئێستا چ شتێك لە مارکسیزما ((زیندووەو)) شایانی باسو بابەتی ئەمڕۆیە، پێم وت: مێژوو هەموو پێش بینیەکانی مارکسی رەت کردەوە، بەڵام خودی مارکس بلیمەت بوە، مارکس هەموو بیروڕاکانی بێجگە لە دوان سیانێکیان نەبێت لە کەسانی دی وەرگرتوە، بەڵام لەو بیرانە پێکهاتەیەکی ئەوەندە درەوشاوەی دروستکردوە کە ڕات دەچڵەکێنێت. ململانێی چینایەتی بیری سان سیمونە، زێدەبایی هی هاجسکێنە، دژایەتی ناو سەرمایەداری پەیوەندی بە فۆریەوە هەیە، بەڵام گرنگی کارتێکردنی هەلو مەرجی تەکنەلۆژی لە کلتور بیری مەزنی خودی مارکسە، سان سیمونیش ئاماژەی پێکردوە، بەڵام کەمتر لەسەری وەستاوە، بۆیە لەگەڵ ژیسکاردستاندا لەسەر ئەوە قسەمان کرد کە لێکدانەوەکانی مارکس هێشتا دەوریان هەیە تیایدا، واتا دەربارەی کاریگەری ئابووری لەسەر سیاسەت، چینەکانی کۆمەڵ، سەرمایەی گەورە.. هەموو ئەمانە هێشتا ماون، ئەوەی نەماوە سەرجەم تێزەکانیەتی.

□ بەڵام هێشتا پارتە سوسالیستو کۆمۆنیستەکان ماون..

□ رەنگە ئەمە بۆ ئەمریکای باشوور مانایەکی هەبێت، وەلێ لە ئەوروپادا نا، لێرە کارەساتی ئەوەندە سەیر روی داوە کە پێشینەی نیە، بەهەرحاڵ، دوای ٢١٥ ساڵ، ئەوەی پێی دەوترا بیری چەپ لەناو چوو، ئەزانیت لای فەرەنسیەکان ((چەپ)) چ مانایەکی هەیە ! ((بزووتنەوەی چەپ)) وەك بەرەنگاریکردنی دەوڵەتو کلێسە لە فەرەنسادا لەدایك بوو، ڤۆلتێر بەشێوەیەك یەکەمین چەپڕەوە، دوای ڤۆلتێر هاوڕێیانی ئەنسکلۆپیدیا، دیدرو، رۆسۆ مان هەیە. ئەمانە لەگەڵ یەکتردا ناگونجێن، بەڵام هەموویان دژی کلێسەو پاشایەتی بوون. ئەم نەریتە لەگەڵ روبسپیرو شۆڕشی گەورەی

فەڕەنسادا بەردەوامە، پاشان ناپلیۆن دێت کە ئەویش لە دیدی تەواوی زنجیرەی پاشایانی ئەوروپادا بە ((چەپ)) دەناسرێت.

□ ناپلیۆن ((چەپڕەو)) بووە؟

□ بەو مانایەی کە دوژمنی بنەماڵە گیریو پاشاکانی ئەوروپابووە، بەڵێ لای نەمساویو ئەڵمانەکان، ناپلیون ئامرازێکی چەپە دژی راست ڕەوەکان، ئەوە بوو جارێکی تر ئالای سێ رەنگی هەڵکرد، دژی کلێسەو گالتەپێکەری پاپابوو، بۆنا پارتیزم بەشێوەیەك لە شێوەکان بەردەوامی دانە بە ئامانجەکانی شۆڕش، بنەماکانی چەپ، هەڵبەتە بەشێوەیەکی دی لە دەزگای ناپلیونیدا بەردەوامی هەیە، پاشان سەردەمی گەڕانەوەی پاشایەتی دەست پێدەکاتەوە، بەلام لە پاریسو لە ساڵی ١٨٢٠ دا، رووبەڕوی بزاوتی زۆری شۆڕشگێڕانە دەبینەوە.

کەسانێکی وەك بیونارتیمان هەیە. فەڕەنسا وڵاتی شۆڕشگێڕانە، بڕوانە لە ساڵی ١٨٤٠ دا کێ لەپاریسدا ژیاوە، باکۆنین، مارکس، ماتزینی، پرودون، لوییبلان، هرتزن، بلانکی، لورو، ... هەمووشۆڕشگێڕو هەموویش هاوڕێی جۆرج ساند بوون، پاریس کابەی چەپەکانە، هەموو نارازیەکانی ئەڵمانیو روسی لەوێ یەك دەگرنەوە، ئەم بارە لەگەڵ رووداوەکانی ساڵی ١٨٤٨ و کۆماری دووەمدا هەر بەردەوامە، هەمیشە باڵی چەپ بەشێوەیەك لە ئارادا بووە. پاشان سەردەمی ناپلیۆنی سێیەمو کۆنەپەرستی دێتە گۆڕێ، وەلێ هێشتا ناپلیۆنی سێیەم راست ڕەو نییە. ئەو بوو کرێکارانی ((ئەنتەرناسیونالیزمی یەکەم)) کە مارکس سەرۆکایەتی دەکردن گەیاندنیە لەندەن، ئەو بۆ ئارام کردنی کرێکاران بودجەی سەندیکای دابین کرد. دوای ئەمە دەگەینە کۆمۆنەی پاریس، پاشان هاتنی سێحیزبی سوسیالیست لە فەڕەنسادا، ئەنجا دوای جەنگی یەکەمی جیهانی حیزبی کۆمۆنیستی فەڕەنسا دادەنرێت، کە دەسەڵاتێکی زۆر پەیدا دەکات.. شاری پاریس دوو سەدە لەمەوبەر مەڵبەندێکی گەورەی بیروباوەڕی چەپ بووە، پاشان ئیتر هیچ، ڕێگام بدەمنیش بە نۆرەی خۆم پرسیارێك بکەم: ناوی کۆمۆنیستێکی ناوداری فەڕەنسا بڵێ، هەڵبەت بێجگە لە ... ناوی چیە؟

□ جورج مارشە ((رابەری حیزبی کۆمۆنیستی فەڕەنسا)).

□ بەڵێ. جەنابی مارشە، دەتوانین هەر ئەم پرسیارە رووبەڕووی روناکبیرە چەپەکانیش بکەینەوە، رابەرانی چەپی ئێستا چ کەسانێکن؟ من گەنجێکم، خاوەنی مەسەلەیەکم، لایەنگری هەژارو چەوساوەم. رقم لە سەرمایەداریە، خوازیاری دادپەروەریو یەکسانیم، ئازادیو برایەتیم دەوێت، دەتوانم دوای چ رابەرێك بکەوم؟

□ ئێمەیش دەڵێین رابەری نەماوە. بەلام بیری چەپ وجودی هەیە..

□ هیوادارم: هێشتا هەستێکی دژ بە راست ماوە. بەلام لەمڕۆدا لاوازە. تەماشای روسیای ئەمڕۆ بکە، زۆر کەس هەن هێشتا تارادەیەك بڕوایان بە کۆمۆنیزم هەیە، کەسانێك ئابووری بازاڕیان دەوێت، بەلام سەرمایەدارییان ناوێت، دنیای سەرمایەدارییان خۆش ناوێت، ئەزانیت مەبەستیان چیە؟

□ دەربارەی تای ناسوینالیستی کە وڵاتانی ئەوروپای ناوەندی گرتۆتەوەو پێکیاندا دەدات چ رایەکت هەیە؟

□ ئەمە مەترسیەکی گەورەی دوا ساڵانی ئەم سەدەیەیە، گەلانی جیاواز بۆ بەدەست هێنانی فرەچەشنی کلتور ماوەیەکی گەلێك زۆر ستەمیان چەشتوە. کلتورە خۆماڵیەکان نەیان توانیوە چاوبکەنەوە، ناسیونالیزم

هەمیشە بەرئەنجامی جۆرێکە لە سوکایەتی، بەرهەمی برینە. سەیری یوگسلافیا بکەن. سەرەتا لەژێر دیکتاتۆریەتی سوڵتان ئالکساندەردا بوو، پاشان کەوتە ژێر ستەمی تیتۆوە، بە گشتی لە مێژودا، دوای هەردەورێکی عەقلانی، جۆرێك لە گەڕانەوەی هەستەکان، کاردانەوەیەکی بەهێزو رەنگدانەوەیەکی سۆزگەرایی هاتۆتە ئاراوە، خەڵکی لەگەڵ یەکتردا دەکەونە شەڕەوە، زۆر کەس دەمرن، بەڵام ئیتر لە سیستمی گەورەی دەسەڵاتی چەسپاوو لە پێغەمبەری مەزنی هەواڵێك نامێنێت.

- تۆ دەڵێیت ئیدی دەنگو باسی پێغەمبەران نامێنێت، بەڵام بێ (یوتوپیا) دەتوانین بژین؟
- لەو باوەڕەدانیم پێویستیمان بە یوتوپیا هەبێت، مرۆڤ پێویستی بە ئامانج گەلێکە، پێویستی بە ئومێدە، ئومێد نرخێك بە مرۆڤ دەبەخشێت، مرۆڤ پێویستی بە ئایندە بینیە نەك یوتوپیا، زۆر کەڕەت یوتوپیا بەو مانایەیە کە مرۆڤ ئامادەیە ئێستا بکاتە قوربانی ئایندە.
- روانینی تۆ بۆ ئایندە چیە؟
- رەنگە رۆژانێکی وا بێن کە گەلێك لە کۆمەڵگاکان بگەنە بەشێك لە پلەی شایستەگیخۆیان، دەبێت هیوای ئەوەمان هەبێت کە دەسەڵاتی کەسانی هوشیارو رەوشت بەرز رۆژ بە رۆژ لە زیادیایە، بەڵگەیەك بۆ ئەوە نیە کە وابزانین ئەمە نایەتەدی، دەبێت بۆ مەبەستێکی وا کار بکەین، هەر لە ساڵی ١٩١٧ دا لینین بە کرێکارانی دەوت کە شۆڕشی روسیا تا پێش کۆتاییهاتنی ئەم سەدەیە سەرناکەوێت، بەڵام دەبێت بەردەوام بین لە کارداو چرکە ساتێك لەبیری نەکەین.. منیش هەر ئەمە بەئێوە دەڵێم.

سەرچاوە:
(نقد عقل مدرن)

ئوکتوبەری (١٩٩٢)

# فەلسەفە چی‌یە؟

## گفتوگۆ لەگەڵ (برتراند راسل)

• و: ڕێکپۆش عەزیز

فەیلەسوفی بەناوبانگی ئینگلیز برتراند راسل Bertrand Rassell لە ١٨ی ئایاری ساڵی ١٨٧٢دا لەبەریتانیا هاتۆتە دونیاوە. لەمناڵیەوە خولیای ماتماتیك بوو و لەم بوارەدا زیرەکی پیشاندا. لەساڵی ١٨٩٥دا کتێبێکی بەناونیشانی (لێکۆڵینەوەیەك دەربارەی پرنسیپەکانی ئەندازە) نووسی.

پاش ئەوەی خوێندنی ماتماتیکی تەواوکرد، کەڵکەڵەی فەلسەفەی کەوتە سەرو بەخوێندنەوەی (هیگل) دەستی پێ کردو بەڵام دوای ئەوەی (لۆجیك)ی ئەوی بەوردی خوێندەوە بۆ هەمیشە لەفەلسەفەی هیگلی دوور کەوتەوە.

لەساڵی ١٩٠٠دا لەگەڵ (وایتهید)دا لە کۆنگرەیەکی ماتماتیکیدا بەشداریی کردو لەو کۆنگرەیەدا (پینۆ)ی ناسی و بەبیرو باوەڕەکانی ئاشنا بوو. تیۆرە لۆجیکی و ماتماتیکیەکانی پینۆ کارێکی فرەیان کردە سەر راسل.

راسل دواتر خۆی لەو پۆلبەندییە باوەی فەلسەفە (ئایدیالیزم و ریالیزم قوتار کردو رووی لە ئەتۆمیزمی لۆجیکی Logical Atomisim) کرد.

لەکتێبە بەناوبانگەکانی برتراند راسل: (پرنسیپە ماتماتیکیەکان) ساڵی ١٩١٠-١٩١٣ کە بەهاوکاری لەگەڵ وایتهیددا نووسییان. (هێڵە سەرەکیەکانی فەلسەفە) ساڵی ١٩٢٨، (تەسەووف و لۆجیك) ساڵی ١٩٢٩، (دەوڵەت: شیکردنەوەیەکی کۆمەڵایەتی نوێ) ١٩٣٨، (مێژووی فەلسەفەی خۆرئاوا)و دواجار (قەڵەمڕەوی زانینی مرۆیی) ساڵی ١٩٤٨. لەساڵی ١٩٥٠یشدا خەڵاتی نۆبڵی وەرگرت.

دەرەوە ئەوا لە مەیدانی زانستو زانیاریدا خۆی دەبینێتەوە.

پ: کەواتە، بە باوەڕی تۆ ئەگەر مەسەلەیەك بە بەڵگەوە سەلماو پەیمان بە نهێنییەکانی برد، ئیتر ئەو مەسەلەیە لایەنی فەلسەفی لەدەست دەداتو دەچێتە قالبی زانستەوە؟

و: بەڵێ .. زۆر مەسەلە هەبوون کە رەهەندێکی فەلسەفییان هەبووە، بەلام ئەمڕۆ رەهەندە فەلسەفیەکەی خۆیان لەدەست داوەو چوونەتە خانەی زانیاریەکانی جیهانی زانستەوە.

پ: سوودی فەلسەفە چییە؟

و: لەڕاستیدا، بەلای منەوە فەلسەفە دوو رۆڵی سەرەکی



پ: لۆرد راسل، بفەرموون بزانین فەلسەفە چییە؟

برتراند راسل: ئەم مەسەلەیە تەواو ئالۆزەو جیاوازیی بیروڕا لەسەری زۆرە. باوەڕناکەم دوو فەیلەسوف هەبن بۆ ئەم پرسیارە یەك وەلامیان هەبێ. بەلام بەپێی بۆچوونی من، فەلسەفە بریتییە لە: هەڵسەنگاندنو لێکۆڵینەوە لەو شتانەی کە هێشتا بە وردیو راستینەزانراون هەڵبەت لەم بارەیەوە من تەنها دەتوانم بۆچوونی تایبەتی خۆم دەربڕم.

پ: ئایا جیاوازییەك لە نێوان زانستو فەلسەفەدا دەبینیت؟

و: بەشێوەیەکی گشتی دەتوانین بڵێین کە زانست بریتییە لەو شتەی کە لەبارەیەوە زانیاری تەواومان هەیە. بەلام فەلسەفە ئەو شتەیە کە لە بارەیەوە شتێ نازانین.

ئەم دوو پێناسەیە زۆر روونو ئاشکرایەو بەهۆیەوە پەیوەندییەك دەبینین کە ئەگەر فەلسەفە لە بوارە فەلسەفییەکەی خۆی بچێتە

هەیە:

یەکەم هەڵسەنگاندنو لێکۆڵینەوە دەربارەی چەند مەسەلەیەك کە چارەیان لە رێی زانستەوە ناکرێ: چونکە بەڕاستی دەتوانین بڵێین کە زانیاریی زانستی توانای روونکردنەوەی بەشێکی کەمی ئەو مەسەلانەی هەیە کە پەیوەندییان بە مرۆڤەوە هەیەو یان لەوانەیە بۆی سوودمەند بێ.ئێستا گەلێ شت هەن، کە زانست لانی کەم زانستی ئەمڕۆی ئادەمیزاد زانیارییەکی زۆر دیاریکراوی لە بارەیانەوە خستۆتە بەردەستی ئێمە، بە باوەڕی من، سنووردارکردنی بیروبۆچونەکانی مرۆڤ لە چوارچێوەی زانیاریی دیاریکراودا جێی داخە، بەم شێوەیە، یەکێك لەبەکارهێنانو سوودەکانی فەلسەفە بریتییە لەوەی کە لە جیهانی ((بوون)) دەکۆڵێتەوەو لە رێی گریمانەکانەوە پەرە بە بواری ئەم لێکۆڵینەوەیە دەدات. سوودو بەکارهێنانێکی تری فەلسەفە کە گرنگی پێدانی جێی سەرنجە، بریتییە لە سەلماندنی ئەم شتە: ئێمە وامانزانیوە

مەسەلەمان دۆزیوەتەوەو روونکردۆتەوە، لەکاتێکدا کە حەقیقەتی ئەوانە بۆئێمە تا ئێستا بە نادیاریو نەناسراوی ماوەتەوە. فەلسەفە لەلایەکەوە، وزەو هێزمان پێ دەدات تا بتوانین زۆر بەقوڵی بیر بکەینەوەو لە لایەکی ترەوە ئێمە لە چنگی لەخۆباییبوون ئازاد دەکات. لەگەڵ ئەوەشدا ئەبێ ئەم حەقیقەتە بزانین کە: مەرج نیە ئەوەی کە ئێمە وەك زانینو زانیاری لە هەموو بوارەکاندا قبوڵمان کردوە زانستی راستەقینە بێ.

پ: ئەکرێ چەند نموونەیەکمان لەو هزرە مرۆییە بۆ بهێنیتەوە کە بە کۆمەڵێك ئەنجامی مادیو عەینی گەیشتووە؟

و: بێگومان، بۆ نموونە: فەلسەفەی یۆنان پڕ بوو لە ئەگەرو گریمانە کە لەسەرەتادا هەریە ئەقڵیشدا نەدەچوون، کەچی ئێستا سەلماوە کە ئەگەرەکان راستو پڕ بایەخن، یا ئەگەری ئەتۆمی لەبەرچاو بگرە ((دیموکریتس)) (١) باوەڕی وابوو کە مادە لە پێکەوە نووسانی ئەتۆمی ورد پێك هاتووە. ئێستا دوو هەزار ساڵ بەسەر ئەم قسەیەی دیموکریتسدا تێپەڕیوەو راستی بۆچوونەکەی سەلماوە _ هەرچەند ئەوکاتانە جێی شكو گومان بوو _ نموونەیەکی تر ((ئەریستارك)) (٢) لەبەرچاو بگرە، ئەم ئەستێرەناسە یەکەمین کەس بوو کە پێی لەسەر ئەوەداگرت کە خۆر بەدەوری زەویدا ناسوڕێتەوە، بەڵکو بە پێچەوانەوە زەوی بەدەوری خۆردا دەسوڕێتەوە، ((ئەریستارك)) دەیوت:جوڵەی رۆژانەی هەسارە ئاسمانیەکان، تەنیا روکارێکی دەرەکی هەیە وە ئەم شێوە دەرەکی‌یە، هۆی سوڕانەوەی زەوییە بەدەوری خۆردا. ئەم گریمانەیەی ((ئەریستارك)) بۆ ماوەی دوو هەزار ساڵ واتە تا سەردەمی ((کۆپەرنیکۆس)) چووە خانەی فەرامۆشی‌یەوە. بەلام بەپرکێشی‌یەوە دەبێ بڵێین: ((ئەریستارك)) لەم پرۆژەیەیدا نەچووە پێش، لەوانەیە ئەم بۆچونە بەبیرو ئەقڵی ((کۆپەرنیکۆس)) دا نەهاتبێ.

پ: ئایا ئەم پێش بینییەی ((ئەریستارك)) بە(خنورەی دڵ) دەزانیت؟

و: هەرگیز، کەسانێك کە یەکەم جار داهێنانێکی گومرا دادەهێنن، هیچ کاتێ ناتوانن بڵێین کە: ((ئەگەرەکانیان بێهەڵەیە))، بەڵکو تەنها ئەتوانین بڵێین: لەوانەیە راست بێت. بۆ هەموو مەسەلەیەك کە لایەنی حەقیقیو راستی هەبێ، ئەتوانی بیری لێبکەیتەوەو هەڵیسەنگێنیتەوە، گەوهەری زانست لەم خاڵەدا خۆی حەشار دەدا، کە تۆ سەرگەرمی بیرکردنەوەی مەسەلەیەکیت. دواتر هەوڵ دەدەیت تا سەرنج بدەیت کە ئەم مەسەلەیە راستە یان نا، کەچی! زۆریەی جار وا رێك دەکەوێت کە ئەومەسەلەیەی کە تۆ لێی دەکۆڵیتەوە لەگەڵ حەقیقەتدا پێك نایەتەوە.

پ: کەواتە ئەمە وای لێ دێت کە تیۆرە ئەتۆمییەکەی ((دیموکریتس)) بەلای ((ئەفلاتون)) ەوە هیچ بایەخی نەبوو؟

و: ئەفلاتون! ئەو دیموکرێتسی خۆش نەدەویست، ئەفلاتون دەیوت: ئەبێ هەرچی کتێبێ ئەم پیاوە نوسیویەتی بسوتێنرێ. هۆیەکەشی ئەوە بوو کە: ئەفلاتون حەزی لەزانست نەبوو، ئەفلاتون حەزی لەماتماتیك بوو، بەلام زانستەکانی تری بەدڵ نەبوو.

پ: بە بۆچوونی تۆ ئایا فەلسەفە بە جۆرێك لە جۆرەکان دەتوانێ لە خزمەتی زانستدا بێ؟

و: بەڵێ، تا رادەیەك، بە دڵنیاییەوە ئەتوانین بڵێین کە فەلسەفە لە خزمەتی زانستدا دەبێ، بەلام کۆمەڵێ بابەت هەن کە لە دەرەوەی زانستدان. بۆ نموونە ئەتوانین ناوی تەواوی ئەو مەسلانە بهێنین کە لەلای مرۆڤ نرخیان هەیە. زانست ناتوانێ شتێ دەربارەی چاکەو خراپە

بلێت. لێرەدا مەبەستم نرخی ڕەهای خێروشەڕە. نەك سوودە مادییەکەیان.

پ: ئایا لە دەورانی رابوردوودا، گۆڕانت لە بیروباوەڕی فەلسەفیانەی خەڵکو فەلسەفەدا بەدی کردوە؟

و: ئەم مەسەلەیە پەیوەندی تەواوی بە ڕێبازی فەلسەفیی تۆوە هەیە، ئەوەی بەلای ئەفلاتونو ئەریستۆوە گرنگ بوو، ناسینی جیهان بوو ((من خۆم باوەڕم وایە کە ئامانجی فەیلەسوف ناسینی جیهانە)) لەگەڵ ئەوەشدا پەیڕەویکارانی فەلسەفەی (زینۆنو رواقیەکان) زیاتر پێیان لەسەر مەسەلەی ئاکار دادەگرت ((خۆڕاگر بن لەکاتی تەنگانەداو بەرگەی چەرمەسەرییەکان بگرن)) ئەوکاتە بە قسەی خۆیان مرۆڤ دەبێت بە فەیلەسوف.

پ: ئایا مارکس وەك فەیلەسوفێك دەناسیت؟

و: بێگومان، مارکس یەکێکە لە فەیلەسوفەکان، بەڵام فەیلەسوف تا فەیلەسوف جیاوازی هەیە. هەندێك لە فەیلەسوفان لایەنگرو پارێزەری ئەوبارەن کە لە ئارادایەو هەندێکی تریان لەسەر ئەو باوەڕەن کە: ئەبێ بارودۆخی ئێستاو ئەو بنەمایانەی کە تیایدا بالادەستن تێكو پێك بدرێ. مارکس سەربەم کۆمەڵەی دواییانە، بەڵام من هیچ کام لەم دوو کۆمەڵەیە پەسەند ناکەم چونکە ئەرکی راستەقینەی فەیلەسوف گۆڕینی جیهان نیە، بەڵکو ئەرکی بنەڕەتی فەیلەسوف بریتی‌یە لە دەركو ناسینی جیهان، ئەمەش لەگەڵ وتەکانی مارکسدا ناگونجێ.

پ: ئایا تۆ سەر بە هیچ ڕێبازێکی فەلسەفی نیت؟

و: من تا ئێستا یەك دروشمم هەیە ئەویش ((ئەتۆمیستی مەنتیقە)) من لەگەڵ دروشمی چوارچێوەییدا نیمو نێوانی باشم نیە. بە باوەڕی من مرۆڤ ئەبێ خۆی لە قەیدو قالب رزگار بکات.

پ: ئەتۆمیستی مەنتیق چی‌یە؟

و: من باوەڕم وایە، بۆ ناسینی تایبەتمەندییەکانی بابەتێك کە دەچێتە بواری تۆژینەوەو تاقیکردنەوەوە. ئەبێ سوود لەشێوازی شیکردنەوە وەربگیرێ، ئەم شیکردنەوەیەو دابەشکردنی بابەتە کە بەسەر بەشی بچوکتردا، ئەبێ تا ئەو رادەیە بچێ: کە ئیتر دابەش نابێو بەئەتۆمی منطق دەگەین.

هەڵبەت هۆی داهێنانی ئەم ناونانە کە بریتی‌یە لە ئەتۆمی ناوهێنراوی ئێمە بەهۆی گەردیلەی وردی مادەوە دروست نەبووە، بەڵکو چاکی دروستبوونەکەی لەکۆمەڵی ئایدیای هەمە جۆرەوەیە.

پ: باو ترین ڕێگەی فەلسەفیی سەردەمی ئێستا چی‌یە؟

و: لێرەدا ئەبێ شتێك لەبارەی وڵاتانی ئینگلیزو باقی وڵاتانی ئەوروپاوە بڵێین. لە هەلومەرجی ئێستادا شەپۆلە فیکرییەکان لە رابوردوو زیاتر لەگەڵ ئەم بەشبوونو دابەشبوونەدا. کە بەراستی ناتوانین بە سەردەمی رابوردووی بەراورد بکەین. لە وڵاتانی ئینگلیزداو بەتایبەتیش بەریتانیا لەم دواییانەدا جۆرێك فەلسەفەی تازە هاتۆتە ئاراوە، کە من باوەڕم وایە کە هۆی پەیدابوونی ئەم فەلسەفەیە: خوو و ئارەزوویەکە بۆ دیاریکردنی ئەرکی تایبەتیی فلەسەفە. لەپاڵ ئەوەی کە لە پێشەوە وتمان، وای دەبینین کە هێشتا فەلسەفەش بەزانیارییەکی ناتەواو دێتە ئاژمار، بەڵام ئەم تەرزە ئایدیاو بیرکردنەوەیە لای زۆر کەس پەسەند نیە. ئەم کۆمەڵە هەوڵ دەدەن تایەك مەیدانی کاملو سەربەخۆ بۆ فەلسەفە دابین بکەن، بەڵام، ئەنجامی کاری ئەمان بە زمان بازیو رەوانبێژی دەگۆڕدرێ بۆ ئەم فەلسەفەیە وەڵامی رەخنەیی و وەڵامی قەناعەت پێکەر بۆ فەیلەسوف گرنگ نی‌یە بە پێچەوانەوە. بابەتێك کە بۆ ئەم فەلسەفەیە جێی سەرنجە ئەمەیە کە _ فەیلەسوف تا ئەو جێیەی کە بتوانێ بۆ

ڕوونکردنەوەی پرسیارەکان هەوڵ دەدات. من خۆم ئەم جۆرە سەردان و چاوپێکەوتنانە پەسەند ناکەم. لێرەدا نموونەیەکت بۆ دەهێنمەوە.

ڕۆژێکیان بە پاسکیل بە (وین چستەر Winchester) (شارێکە لە بەریتانیا) دا دەڕۆیشتم و لە پڕێکا ڕێگام ون کرد کاتێ گەیشتمە ئاوەدانیەک. چوومە دوکانێکەوە و پرسیم:

تکایە نزیکترین ڕێگام نیشان بدەن کە لێرەوە بمگەیەنێتە وین چستەر؟ یەکێك کە لە پشتەوەی دوکانەکەدا بوو کە من ئەوم نەدەبینی، پرسیی: ((یەکێك کورتترین ڕێگەی دەوێ کە لێرەوە بیگەیەنێ بە وین چستەر؟! هەر لەناوەوەی دوکانەکەوە یەکێك وەڵامی دایەوە: وین چستەر؟! سەیرە!! کورتترین ڕێ!!! ئای کە سەیرە!!! من چوزانم؟! سەرەنجام ناچار بووم. بەبێ ئەوەی ئەنجامێ بەدەست بێنم ڕێی خۆم بگرمەبەر. بەڵێ، ئەو فەلسەفەیەی کە لە ئۆکسفۆرد دەخوێندرێ لەم جۆرەیە.

پ: کەواتە ئەو فەلسەفەیەی ئێمە لەبارەیەوە ئەدوێین. مانای دەرك کردنێکی قووڵی پرسیارە بەبێ ئەوەی بایەخ بە وەڵامەکان بدەین؟

و: ئەمە کرۆکی مەبەستمانە. ئەم مەسەلەیەی کە کێ ئەبێ وەڵامی پرسیار بداتەوە. ئەرکی فەیلەسوف نیە، بەڵکو پەیوەندیی بەیەکێکی ترەوە هەیە.

پ: ئایا فەیلەسوفەکانی تری وڵاتانی ئەوروپا. مەسەلەکان بەشێوەیەکی تر دەرك دەکەن؟

و: فەلسەفەی وڵاتانی ئەوروپا بە ئەندازەی فەلسەفەی ئۆکسفۆرد مردوو و بێگیان نییە، من لایەنگری ئەوان نیم، بەڵام پێم وایە کە فەلسەفەی وڵاتانی ئەوروپی لە فەلسەفەی ئۆکسفۆرد زیندووترە، فەلسەفەی ئەوروپاییەکان بە پێچەوانەی فەلسەفەی ئۆکسفۆردەوە کە بە فەلسەفەی کۆنەوە پەیوەندییەکی قووڵ و نزیکی هەیە.

هەڵبەتە جۆرەها فەلسەفەی تری جیاوازمان هەیە، کە سەرچاوەیان فەلسەفەکەی ((کێرکیگارد)) ە کە نوێنەری ((ئەگزستانسیالیزم)) ە وە هەندێ فەلسەفەی تر هەن کە ئامانجیان دابینکردنی زەمینەیەکە بەمەبەستی زیادکردنی کێشەی فەلسەفی و ناکۆکی بە پاشماوەی مەزهەبی، بە باوەڕی من هیچ کام لەم فەلسەفانە خاوەنی گرنگی نین.

پ: سوودی کردەیی فلەسەفەی خۆت. بۆ کەسێ بیەوێ شێوەیەکی ئاوەزانە (ئاقڵانە) لە ژیاندا هەڵبژێرێت چییە؟

و: من نامەی زۆرم پێ دەگات لە لایەن کەسانێکەوە کە دوچاری پشێوی دەروونی بوون. ئەمانە دەگەڕێن بۆ شێوەو ڕێکارێکی کردەیی، ئەمانە دەستیان کێشاوەتەوە لەو داب و نەریت و بیروباوەڕانەی کە پێی ڕاهاتوون و ئێستا سەریان لێ شێواوە و نازانن چ ڕێگایەك بگرنە بەر فەلسەفەیەك کە من پێشنیاری دەکەم خاوەنی ئەم ئەدگارەیە کە:

سەرەڕای بەخشینی توانا لە بڕیارداندا، هەمیشە مرۆڤ ئاگادار دەکاتەوە کە بەکارو کردەوەکانی خۆی باوەڕو قەناعەتی تەواوی نەبێ. مرۆڤ نابێ دەربارەی هیچ شتێ بۆچوونی ڕەهای هەبێ. چونکە ئەگەر بەشێوەیەکی ڕەها باس لە شتێ بکەیت یا باوەڕی پێ بێنیت، بێگومان هەڵەیت. چونکە هیچ شتێ جێی باوەڕی تەواو نیە، مرۆڤ دەبێ هەمیشە لە بۆچوونەکانیدا گۆشەیەك بۆ گومان بهێڵێتەوە، بەڵام لەگەڵ بوونی ئەم گۆشەیەشدا ئەبێ بە وزەو هێزەوە کار بکات. ئایا فەرماندەی عەسکەری _ لەکاتی جەنگدا _ هەمان کار ناکات و ئەم فەلسەفە پەیڕەو ناکات؟

گومان لەوەدا نیە کە فەرماندەی ناوبراو بەڕاستی نازانێ دوژمن چ پیلانێك دژ بەو دادەڕێژێ. بەڵام ئەگەر فەرماندە کەسێکی زیرەك بێ ئەوا بە شك و گومان دەتوانێ دەرك بە

پیلانەکەی دوژمن بکا. بەڵام ئەگەر زیرەك نەبێ ئەوا ناتوانێ لەرووی گومانەوە ئۆپراسیونە عەسکەرییەکان پێشبینی بکات. مرۆڤ دەبێ لە ژیانی رۆژانەیدا پەیرەوی لە یاساکانی گریمانکاری بکات. من وا چاوەڕوان دەکەم لە فەلسەفە کە: لە مرۆڤدا تامەزرۆیی و ئازادییەك پەیدا بکات کە وای لێبکات بتوانێ بەبێ هەبوونی دڵنیایی و وێڕای هەبوونی خەم و گومان بە سووربوونەوە کار بکات.

پ: راستە. بەڵام لێرەوە کێشەیەکی تازە دێتە ئاراوە. ئەم کێشەیە لێرەوە سەرچاوە دەگرێ، کە ئەوشتانەی جێی باوەڕی مرۆڤن، لێی زەوت دەکرێت، ئایا ئەم کارە نابێتە هۆی پەیدابوونی شك و گومان و ڕاڕایی ئەوان؟

و: لە هەلو مەرجەکانی ئێستادا، بێگومان، بارەکە بەم شێوەیەیە، باوەڕم وایە بۆ بەهێزبوونی ئەقڵییەتی خەڵك، ئەم گومان و ڕاڕاییە تارادەیەك پێویستە. هەڵبەت بۆ پاراستنی هاوسەنگی و هەستکردنیان بە ئاسایشی رۆحی، هەبوونی هەندێ زانیاریی زانستی بەکەڵکە.

پ: پێشبینی تۆ بۆ ئایندەی فەلسەفە چییە؟

و: لەو بڕوایەدا نیم کە فەلسەفە، لە داهاتوودا، ئەو گرنگییە پەیدا بکاتەوە کە لای یۆنانییەکان، یان، لە سەدەکانی ناوەڕاستدا هەیبوو. رواڵەتی مەسەلەکە بەم جۆرەیە، کە بەرەو پێشچوونی زانست بە پێویست لە گرنگیی فەلسەفە کەم دەکاتەوە.

پ: ئایا ژمارەی فەیلەسوفەکانمان زۆرن؟

و: مەسەلەکە ئەمەیە، کە باوەڕ ناکەم یەك فەیلەسوف بتوانێ وەڵامی ئەم پرسیارەبداتەوە. لەم بارەیەوە زۆر جار وەڵام لە ئەستۆی کەسانێکدایە کە فەیلەسوف نین.

پ: ئەکرێ، بەکورتی ئەو بەهایەمان بۆ بخەیتە روو کە چ لە دونیای ئەمڕۆداو چ لە دونیای داهاتوودا لای ئێوە بۆ فەلسەفە هەیە؟

و: زۆرباشە. من باوەڕم وایە کە فەلسەفە لە هەلو مەرجی ئێستادا خاوەن گرنگییەکی زۆرە. لەبەرئەوەی کە فەلسەفە هۆی هۆشیارکەرەوەی ئێمەیەو کۆمەڵێ مەسەلەی تازە دەخاتە بەرچاومان کە چارەیان لەلایەن زانستەوە نەکراوە، یان ئەمڕۆ لە توانای زانستدا نییە چارەسەریان بۆ بدۆزێتەوەو ئێمە دەخاتە سەرئەو رایەی کە بڵێین، زانست ناتوانێ چارەی هەموو کێشەکان بکات. دووەم: فەلسەفە وا لە مرۆڤ دەکات وردبێت و رابمێنێت و گیانی لەخۆبایی نەبوون و خاکەڕایی ((تواضـع)) ی ئەقڵی لا دروست دەکات. مرۆڤ لە سایەی فەلسەفەدا سەرنج لەم مەسەلەیە دەدات، کە زۆر لەوبابەت و مەسەلانەی کە پێشتر راست و دروست خۆیان نواندووە. ئەمڕۆ ئاشکرابووە کە ناڕاست و هەڵەن.

هەروەها کە رێی درێژی مەعریفە بەشەوێك نابڕدرێ، دواجار فەلسەفە مرۆڤ لەو حەقیقەتە ئاگادار دەکاتەوە کە بۆ کاتێکی دوورو درێژ کە مەبەستی هەر فەیلەسوفێکە، هزری لە قاڵب نەدراوو ئازاد پێویستە.

پەراوێز:

١. دیموکریتس، نزیکەی ساڵی (٤٦٠ ق.م) لە شاری ئەبدەری یونان لەدایك بووە. یەکەم کەس بوو وتویەتی مادده دابەش دەبێ بۆ بەشی بچوك تر.

٢. ئەریستارك، لەساڵی (٢٨٠_٢٦٤) لەدایك بووە ئەریستارك یەکەم کەس بوو کە وتی: خۆر مەرکەزی هەموو جیهانەو زەوی بەدەوریدا دەسوڕێتەوە.

٣. کیرکیگارد: فەیلەسوفی دانیمارکی لە ساڵی (١٨١٣) لە (کۆپنهاگن) لەدایك بووەو لە ساڵی (١٨٥٥) دا لەهەمان شاردا کۆچی دوایی کردوە. کیرکیگاردو پاسکال لەو فەیلەسوفانەن کە لە مەسەلە دەروونیی و مانەوییەکان دەکۆڵنەوە.

# هۆنگ ینگو هاوینی خیانەت

▪ ئانا گوستاڤسۆن شێن
• و: زۆراب

**سێکس و سیاسەت.**
**ژن کە بەشی خۆی ئەبات.**
**کەش و هەوای راپەڕین**
**لە مەیدانی تیامەنان (١٩٨٩).**

رۆمانی (هاوینی خیانەت) ی هۆنگ ینگ باسی ئەمانە ئەکات، و تازە بە زمانی سویدی بڵاوکراوەتەوە. کتێبەکە لە چین قەدەغەکراوەو ئێستا هۆنگ ینگ لە تاراوگە ئەژی.بەڵام هەرگیز وازی لە نوسین نەهێناوە. لەبەرئەوەی لە گەڕەکە میللی‌یەکاندا (کەلاوەکان) گەروە بووە ئەیەوێت چیرۆکی ژنان و هەژاران بە خەڵکی بگەیەنێت.

(ئانا گوستاڤسۆن شێن Anna Gustafsson C.) هۆنگ ینگ کە بەسەردان لە سویدە ئەبینێت.

هۆنگ ینگ لە ستۆکهۆڵم: ژنێکی باریک و بچکۆلە، کاتێك بە قاپ قاپەکانیەوە بەسەر رێگا چەوڕێژ کراوەکەی لای (Djurgards Brunnsivken) دا ئەڕوات.. لەنجەولارێتی. وێنەگرەکەی (Aktuellt) [٢] چەند وێنەیەکی جوانی پێویستە بۆ دەنگوباسی شەو. بەڵام ئەو ئینتباعە لاوازە، خەڵەتێنەرە، لەراستیدا هۆنگ ینگ کەسێکی زۆر بەبڕیارو ئازایە.. کە سوورە لەسەر نووسین و دەبڕینی بیروڕاکانی، هەرچەند نووسەرێتی‌یەکەی ناچاری تاراوگە گرتنەبەری کردووەو بەشێکی زۆریش لە هاوڕێکانی وایلێ کردووە پشتی تێبکەن.

هۆی سەردانەکەی هۆنگ ینگ چاپ کردنی وەرگێڕانە سویدی‌یەکەی یەکەم رۆمانەکەی (هاوینی خیانەت) ە، کە تیایدا کاتی راستەخۆ دوای کۆمەلْ کوژی‌یەکەی پەکین لە ١٩٨٩/٦/٤ دا وەسف ئەکات. تێما سیاسیەکە وای کردووە رۆمانەکە لە چین قەدەغە بکرێت، بەڵام (هۆنگ ینگ) ئەڵێت: پێدەچێت هۆیەکی بەهێزتری قەدەغەکردنەکە وەسف کردنی بێداربوونەوەی

سێكسی ژنێكی گەنجە لەگەڵ دیمەنە سێكسی‌یە بوێرەكانی كتێبەكەدا.

- هۆنگ ینگ ئەڵێت: ڕۆمانی چینی تر نەنوسراوە تیایاندا سێكسوالیتی‌و چێژبینینی ژنان بەو شێوازە باشە باس بكرێت. لە چیرۆكی جنسی تردا، بۆ نموونە وەكو لە كتێبە باش فرۆشراوەكەی (جیا پینگوا)، (پایتەختی بەجێ هێڵراو) دا، پیاوانن بەشی خۆیان ئەبەن‌و ژنان گوێڕایەڵ‌و سستن. ئەمە ئەو ئەخلاقە كۆمەڵایەتی‌یە دەر ئەخات كە لە چین لەماوەی چەند هەزار ساڵێكدا لەماوەی بووە. پیاوی بووە، پیاوێك بۆی هەیە ژنە دۆست‌و ژنی لاوەكی هەبێت‌و سەردانی سۆزانیش بكات بێ ئەوەی ناوبانگی زیانی پێ بگات. گەر ژنێك خۆی



دەست پێشخەری بكات بۆ پەیوەندی‌یەكی سێكسی یان لەهەمان كاتدا لەگەڵ چەند پیاوێكدا بێت، جێی بیر لێكردنەوە نی‌یە.

**دوو ڕوویی ڕژێم تووڕەی ئەكات**

- ئەووترێت ژن‌و پیاو لە چینی نوێدا یەكسان بوون، كە ((ژنان نیوەی ئاسمان هەڵئەگرن)). بەڵام ئەوە درۆیە. ئەو ژمارە كەمە لە ژنان كە ئەندامی پەرلەمانن‌و .. لێكۆڵەرەوە سەركەوتووەكان كە نیشان ئەدرێن، تەنها بەشێكن لەو رووكەشە دەست كردە. لە ڕاستیدا كاریەدەستان زەندۆقیان چووە لەوەی ئێمە دەست بكەین بەوەی بەشی خۆمان ببەین. ئەو ژنە چینی‌یەی كە ئەیەوێت بەدوای هەستەكانی خۆیدا بڕوات‌و ڕێگا نادات خووڕەوشت‌و نەریتی باو بڕیاری بۆ بدات ئەبێت نرخێكی زۆر بدات.

هۆنگ ینگ لە تاقیكردنەوەی خۆیەوە ئەدوێت. وەكو منداڵی دەرەوەی هاوسەرێتی (زۆڵ) ژنێكی هەژار ناچار كراوە واز لە بەختیاری

خۆی بهێنێ‌و هەروەها دووچاری رق‌و بێزاری دەورووپشت بووە، بۆیە هەمیشە بیری کردۆتەوە لەجێگای خۆشەویستی‌و سێکسوالیتیێ لە ژیاندا.

هۆنگ ینگ سالی (١٩٦٢) لە (Chogqing) لەدایك بووە، شارێکە لە خوارووی خۆرئاوای چین‌و ئەوکاتە چوار ملیۆن دانیشتوانی هەبوو. لە گەڕەکێکی کەلاوە ئاسادا گەورە بوو، لەوێ مرۆڤەکان چڕ لە نزیك یەکەوە ئەژیان‌و چێشتخانەو ئاودەستی تایبەتی‌یان نەبوو، نەخۆشی خەڵکی دروێنە ئەکرد.

هەژاری رۆژانی ئاسایی کردبوو بە خەباتێك بۆ دەربازکردنی ژیان، وە بۆ زۆریەی دانیشتوان بیرکردنەوە لە خوێندنی بالآ هەرگیز لە خەونێك تێ نەئەپەڕی.

لە هەموو ئەو سەدان مرۆڤانەی لە کەلاوەکانی بناری شاخەکەدا ئەژیان تەنها (هۆنگ ینگ) بووە بە نووسەر، وە کاتێك ژمارەیەکی زۆر شیعری بلاوکردەوە هەلی درایە لە ئەکادیمیەی نوسەران (Lu Xun) لە پەکین بخوێنێ.

ئێستا یەکێك لە بەهێزترین هاندەرەکانی ئەو ئاواتەیە داواکاریەکانی هەژاران بخاتە روو و چیرۆکەکانیان بۆ دنیای دەرەوە بگێڕێتەوە... بەلام ئەم ئەرکەی هەمیشە بۆ جێبەجێ نەکراوە.

- پێش کۆمەلکوژیەکەی (تیامەنان سکوێر) من بە هیچ جۆرێك ئارەزوومەند نەبووم ئەدەبێك بنووسم لە فۆرمێکدا پەیامی کۆمەلایەتی هەبێت.

من زیاتر شیعرم ئەنووسی‌و خۆم خەریك ئەکرد بە ((شێوە Det Stilistiska)) وە، ئەم ویست پێشەنگ بم. بەلام ئەو تاقیکردنەوانەی هاوینی (١٩٨٩) پیایدا رۆیشتم هەلوێستی گۆڕیم. هەستم کرد پێویستە باسی ئەوە بکەم کە بەسەرم هاتووە، پێویستە تاقیکردنەوەکانی خۆم بگەیەنم تا مێژوو هەرگیز ئەوەی روویداوە لە یاد نەکات.

بە تەواوی وەکو کەسی سەرەکی ناو (هاوینی خیانەت)، هۆنگ ینگ پەناگەی کاتی لەلایەن هاورێکانیەوە لە پەکین پێدراو چەند مانگێك دوای کۆمەلکوژیەکە گواستیەوە بۆ شانگهای (Shanghai) و لەوێ ناوی خۆی بۆ دانیشگا نووسی. بەردەوام بوو لە نووسین لەبارەی خۆشەویستی، ئایین‌و زۆر شتی ترەوە، بەلام تێگەیشت هیچ شتێك لەوەی بەرهەمی ئەهێنا بلاو ناکرێتەوە. لە کۆتاییدا سالی ١٩٩١ (چین) ی بۆ دواجار بەهۆی ڤیزەی خوێندنەوە بەجێهێشت‌و سەفەری کرد بۆ لەندەن، ئێستا لەوێ لەگەل مێردەکەیدا ئەژین.

- تەنها سێ مانگم پێویست بوو بۆ نووسینی (هاوینی خیانەت). وەکو بیرەوەری رۆژانەیە، وە هەموو ئەو رووداوانەی لە رۆمانەکەدا وەسف ئەکرێن لەخۆم یان لە هاورێکانم روویان داوە. تاکە شتێك کە من پێی هەلساوم گۆڕینی ناوی کەسەکان‌و شوێنەکان بووە.

پێشوازی لە رۆمانەکە جۆراوجۆر بوو. ((چاپخانە)) کەی تایوان زۆری لەسەر کتێبەکە نەنووسی چونکە لە هەمان کاتدا چالاکی تری لە چین هەبوو. زۆر لەوانەی کە خوێندیانەوە، تەنانەت هاورێکانی (هۆنگ ینگ) یش، بەهۆی ناوەرۆکە جنسیەکەیەوە زۆر تووڕە بوون.

- بە رای ئەوان کتێبەکە پیس بوو.. لایان وا بوو ئەبێت من مرۆڤێکی خراپ بم. هەندێك لە نووسەرە چینیەکان لە خۆرئاوا رایان وا بوو من بە شێوازێکی لەبار باسی ژنە چینیەکانم نەکردووە.

بەلام ئەو کەسانەی لە کتێبەکەدا وەسف ئەکرێن هەلوێستیان باشەو پێیان وایە کەش‌و هەوای کاتی راستەوخۆ دوای کۆمەلکوژیەکە بە تەواوی راستە.

ئێستا ((هاوینی خیانەت)) بە دوانزە زمان وەرگێڕدراوەو دوای نزیکەی مانگێکی تر (هۆنگ

ینگ) هەڵمەتێکی پڕوپاگەندە (PR) دەست پێ ئەکات، ئەم جارەیان بەهۆی ڕۆمانە بایۆگرافیەکەی ((کچی برسێتی)). {ساڵی ئایندە بە سویدی ئەکەوێتە بازارەوە}.

هۆنگ ینگ تا ئێستا دوو ڕۆمان، هەشت بەرگ نۆڤێل، چوار نامیلکە شیعروکتێبێك لە پەخشان (essa) ی بە چاپ گەیاندووە.

ئایا ئەتوانیت بگەڕێیتەوە بۆ چین؟ ئەمە پرسیارێکە زۆر جار لە ماوەی سەردانەکەیدا ئاراستەی ئەکرێت.. کە دوا جار تەنها بۆ پرسیارەکە پێئەکەنێت . خۆی پێی وایە ئەبێت بتوانێت دوبارە لە چین نیشتەجێ بێتەوە چونکە پاسپۆرتە ئینگلیزیەکەیو ناوبانگە تا رادەیەك زۆرەکەی لە خۆرئاوا وەکو قەڵغانێك وایە دژی راونانی سیاسی ئەو. بەڵام لەلایەکی ترەوە لە توانایدا نابێت ئەوەی ئەینووسێت بە چاپی بگەیەنێت لە هەندەران نەبێت.

- من هەموو ڕۆژێكو هەموو چرکەیەك بیری وڵات ئەکەم. هەندێك جار وا هەست ئەکەم لە رووی ڕۆحیەوە لە چین ماومەتەوە، چونکە من بە چینی ئەنووسم، بە چینی ئەدوێمو بە چینی خەون ئەبینم.. لە چینە من خوێنەرم هەیە، ئەوانەی من روویان تێ ئەکەمو سەرباری هەموو هەڵو مەرجێك لەوەی ئەینووسم بە شێوەیەکی قوڵتر تێئەگەن وەکو لە تێگەیشتنی خەڵکی خۆرئاوا لێیان. لە چین ئەتوانم بەشداری بکەم لە ژیانی کۆمەڵایەتیو کلتوریداو لە نزیکی ئەوانەوە بژیم کە لە بارەیانەوە ئەنووسم.

- هۆنگ ینگ پێت وایە ئێمە لە خۆرئاوا هەڵوێستێکی زۆر نارەخنەگرانەمان هەیە کاتێك ئەو گێڕانەوە بایۆگرافیە زۆرانە ئەخوێنینەوە کە چینیە پەناهەندەکان لەم ساڵانەی دواییدا نووسیویانە.

- کاتێك (یونگ شانگ Jung Chang) باسی برسێتیەکەی نێوان ساڵانی (١٩٥٩-١٩٦٢) ئەکات، لە کتێبەکەیدا قازوقوڵنگی کێوی (Vilda Svanar)، بە تەواوی لە بیری ئەچێت باسی ئەوە بکات کە دایكو باوکی خۆی، کە کادری پایەبەرزی سیجوان (Sichuan) بوون، لە راستیدا بەشدار بوون لە سەپاندنی ئەو سیاسەتەی کە بووە هۆی کارەساتەکە.

هەموو ئەم ژنە نووسەرە چینیانە تارادەیەك لە خێزانی خاوەن بەرژەوەندیەوە هاتوون، هەرچەندە لە ماوەی هەڵمەتە سیاسیە جۆراوجۆرەکاندا تاقیکردنەوەی تاڵو ترشیان بینیوە کەچی ژیانیان لە ژیانی هەژارەکان زۆر ئاسانتر بووە. لە ماوەی برسێتیە گەورەکەدا (٧) ملیۆن مرۆڤی ئاسایی تەنها لە پرۆڤینسی سیجوان لە برسا مردن، بەڵام تاقە یەکێکیش لەوانە کادر نەبوو لە پارتی کۆمۆنیستدا. کاتێك هۆنگ ینگ لە خانووی (A B F) لە (ڕۆژی جیهانی کتێب) دا دێتە قسە هانی گوێگرەکان ئەدات کە کۆمەڵ کوژیەکەی (تیامەنان سکوێر) لەبیر نەکەنو نەخەڵەتێن بە قسەوباسی ڕژێمی چین لەسەر مافەکانی مرۆڤ.

ئەم سەرکردانەی ئێستا زۆر فێڵبازترن لە (ماو) .. لایەنی کەم لەوەدا کە هەڵسوکەوت لەگەڵ رەخنەکانی جیهانی خۆرئاوادا بکەن. بێگومان ئێستا ئەوان (وە جینس هێنگ) و (وانگ دان) یان ئازاد کردووە بەڵام هەزاران زیندانی کراوی نەناسراوی تر هێشتا دەرگایان لەسەر داخراوەو گیروگرفتە کۆمەڵایەتیەکانیش ڕۆژ بە ڕۆژ خراپتر ئەبن لەگەڵ گەورەتربوونی بۆشایی نێوان هەژارانو زەنگینەکان.

کاتێك هونگ ینگ هۆڵەکە جێ دێڵێ هەناسەی سارد هەڵئەکێشێ.

- خۆ من وام نیاز بوو کەمێك وریا تریم کاتێك ئەدوێم، تاکو لەسەردانەوەمدا بۆ وڵات کێشەم بۆ دروست نەبێت. بەڵام بێسوودە _ بەراستی ناتوانم بیروڕای خۆم دەر نەبڕم...

## لێکۆڵینەوە لەسەر (هاوینی خیانەت)ی هۆنگ ینگ

### تۆماس لوێفستروێم

لین ینگ، کەسی سەرەکی لەیەکەم رۆمانی هۆنگ ینگ دا، (هاوینی خیانەت کە ساڵی ١٩٩٢ نووسیویەتی‌و ئێستا بە وەرگێڕانێکی نایاب بۆ سویدی لەلایەن ((ئانا گوستافسۆن)) ەوە کەوتۆتە بەردەستی خوێنەر)، ژنە شاعیرێکی گەنجە، لە بنەچەدا کارکەرێکی دێهاتی‌ی کارگەیەو لە قوتابخانەی نووسەران لە پەکین ئەخوێنێت.

کاتێك بزووتنەوەی دیموکراتی خوازان لە ئایاری (١٩٨٩) دا گەشە ئەکات، (لین) سۆزدار ئەبێت بۆ راپەڕینەکەو خولیای ئازادی داگیری ئەکات.




بەرەبەیانی دوای کۆمەڵکوژی‌یەکە لە (تیامەنان سکوێر) لە (٤) ی مانگی شەشدا، بە هەڵتەك هەڵتەك خۆی ئەگەیەنێتە ماڵەوە... بە ناو شەقامە لە مرۆڤ چۆڵەکان‌و پڕ لە تانکی سوتاوو بەربەستە دوکەڵ لێهەڵساوەکاندا، وەکو ئەندامێکی نوێی (یانەی ئەوانەی بە هەزار حاڵێك دەربازبوون). تەنها بۆ ئەوەی کوڕە هاوڕێکەی لە جێگادا لەگەڵ ژنێکی تردا ببینێتەوە.

ئەو وێنەیەی ئێمە هەمانە لەبارەی راپەڕینەکەی پەکین کە دە ساڵ لەمەوبەر بوو ئەوەندە ((سیاسی)) یە کە مرۆڤ بە ئاسانی لەبیری ئەچێتەوە کە ئەو راپەڕینە لایەنی تریشی هەبوو: خۆشەویستی، هونەر، شیعر، مۆسیقاو فەلسەفە.

بەهارەکەی پەکین لە ساڵی (١٩٨٩) دا بەهەمان شێوەی بەهارەکەی پاریسی (١٩٦٨) یاخی‌بوونی شێوازی ژیان بوو. {لین ینگ ئەنووسێت: ((من کاتم نی‌یە بۆ گفتوگۆ))، دێڕە شیعرێکی لەم جۆرەم بیر دێتەوە کە لە بەیاننامەدا لە پاریس بڵاوکرایەوە}. هەروەها لەخوار مەیدانی تیامەناندا رۆخێکی لم هەبوو کە لەخوێن دا نوقم کرا.

هاوینی خیانەت، بێجگە لە هەندێك حاڵەتی کتوپڕی شاعیرانەو پەند، لە رووی ئەدەبی‌یەوە سەرنج راکێش نی‌یە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا شایەنی خوێندنەوەیە وەکو بەڵگەیەکی خوێن گەرمی ((نەوە)) کان: ئەڵماسێکی پاك نەکراوەیە کە عەشق‌و غەم‌و پەژارە تیشك ئەداتەوە.

لە خزمەتە بەنرخەکانی تری ئەوەیە رەگەزە ((ناسیاسی‌یە)) پشت گوێ خراوەکان لە بزووتنەوەی دیموکراتی خوازی چینی‌دا بەرز ئەکاتەوە: ئەڤانتگاردی (پێشەنگ: **avantgard**) هونەریی لەژێر کاریگەری خۆرئاوادا، کە عادەتەن لە منداڵی کادرەکانی حیزبدا پێناسە ئەکرێت، ئەوانەی یاخی‌بوونەکە لەلایان پێك هاتبوو لەوەی تابلۆی ئەبستراکت

无
人
安
全

کەس ژیانی نەپارێزراوە!

وێنە بکەن، سەیری فلیمی رووتی ڤیدیۆ بکەن‌و سێکسی بەکۆمەڵ ئەنجام بدەن.

((ئەو بەپێی دوا مۆدێل بەرگی پۆشیبوو))، بەم جۆرە باسی شاو لیولیو ئەکرێت، ((لە تەنورەیەکی جێنسی کورتی تەسکداو بەکراسێکی لۆکەی بێقۆڵەوە کە نووسابوو بەلەشی‌یەوە.

زنجیرێکی ئاڵتون کە لەملیدا ئەدرەوشایەوە. کەس لەوانەی ئەیان بینی لەوباوەڕەدا نەبوون ئەو لە مۆسیقای کلاسیکی‌دا تایبەتمەند بێت)).

کۆپیە کردنی ئایدیالی وجودیەت‌و بیتنیك[1] یان جۆری مۆدێلەکانی جل‌و بەرگی ناو فلیمە فەرەنسی‌یەکانی شەستەکان پێ دەچێت جێگای بەزەیی پێداهاتنەوە بێت.. بەڵام ئەو دەربڕینانەی سەر بە مۆدەرنیزم بوون .. راپەڕینێکی ئازاد بوون لە دژی ریالیزمی کۆمەڵایەتی‌و (زي الموحد) ئەگەیەنێت، دژی چەوساندنەوەی دەروونی کۆمەڵگا دیکتاتۆریەکە، ئەوەی لە (جیهانێکی نوێی ئازا **Brave New World**) ی (هەکسلی **Huxley**) دا بەم وشانەدا ئەناسرایەوە: ((من داوای مافی ئەوە ئەکەم بەختەوەر نەبم!)) دەست نیشان کرابوو.

لین ینگ لافیتەیەکی پێبوو ئەم نووسینەی لەسەر بوو ((هەر بژی لەیەك تێگەیشتن!)) بەڵام لەناخی‌دا دروشمی تر دەنگی ئەدایەوە: ((باشتر وایە خراپ لێم تێبگەیت! من لە خراپ لێك تێگەیشتن دروست بووم!)).

هەفتەکانی دوای چواری شەش ((ناخۆشترین کاتە تەنهاکانن بۆ شاعیر)). بێگومان پیاو لە ریزدا وەستاون تا جێگایەکی هاوبەشی تەختی خەوتن بدەن بە لین ینگ کە لە زۆر لایەنەوە بێ ماڵ‌و حاڵە. بەڵام ئەو ئەیەوێت ئازاد بێت‌و ئەوانەی خۆش بوێت خۆی ئەیەوێت‌و ئەو کاتەی خۆی ئەیەوێت، وە ئەمەش مانای گیروگرفتە. لەشەپۆلە بەرزو نزمەکانی دوای یاخی‌بوونەکەدا خەبەر لێدان، لێکۆڵینەوە، راستکردنەوەی سیاسی، و پاککردنەوەی ئایدیۆلۆژی‌و ئەخلاقی روو ئەدات. ((هەمووان چاوەڕێ بوون کە مێژوو هەموو شتێك چاك بکات، بەڵام مێژوو نەفەس درێژەو زۆر لە ئێمە باشترە لە چاوەڕێ کردندا))

گرنگ ئەوەیە سەرکز راگیرێت، وێنەکان بسووتێنرێن‌و شیعرە چاونەترسەکان بشاردرێنەوە. چونکە پۆلیس لە دەرگا ئەدات‌و، بەتێپەڕبوونی کاتیش منداڵی کادرەکانی حیزب توانایان نی‌یە پەنا بەرنە بەر باوکەکانیان. ئەوان لین ینگ ئەکەن بە قوربانی بۆ ئەوەی کات ببەنەوە، یان لەوانەیە ئەو خۆی خۆی بکات بە

قوربانیی..بەڵام بەهەرحاڵ هیوا کەمە بۆ ((یانەی ئەوانەی بە هەزار حاڵێك دەرباز بوون))، ئەم دوا (نەوە) لە دەست چووەی چین.

((ئێمە لە سەرەتای شەستەکاندا لەدایك بووین کاتێك ملیۆنەها مرۆڤ لە برسێتییەکەدا مردن. ئێمە میوەی زەوقێك نەبووین بەڵکو بەری غەریزەی سروشتیی مرۆڤ بووین بۆ خۆ زۆرکردن لەدوای کارەساتێك. پاشان دە ساڵ لە شۆڕشی کلتووری هات. کاتێك خۆرە سوورەکە تیشکە سوتێنەرەکەی خۆی پەرشو بڵاو کردەوەو ئێمە خۆمان لە گۆشەیەکی سێبەراویدا شاردەوەو گەورە بووینو بووین بە مەخلوقاتی لاوازی بێڕەنگ. هەموو لاوێتی خۆمان لەو بۆشاییەدا بەسەر برد کە کاتێك باوەڕمان لە دەست دا پەیدا بوو. ئێمە چاوبرسیانە هەموو ریشاڵێك لە هیوامان بۆ خۆمان هەڵمژی، بەڵام هەر جارێك هەوڵماندا هیواکەمان بکەین بە واقیع بۆمان ئاشکرا بوو کە هیوا بەس نییە بۆ بنیات نانی جیهانێك. گەر هێشتا کاتمان ماوە بژین لەوە زیاتر ناگەیەنێت کە ئێمە بە سنگەخشکێ ڕۆژ بە ڕۆژ بەرەو پێش ئەچینو پەلەمانە بێتوانایی خۆمان دەر بخەین)).

- چاوپێکەوتنەکە لەلایەن وەرگێڕە (ئانا گوستافسۆن شێن) (Anna Gustafsson Chen) ەوە ئەنجام دراوە.
- لە گۆڤاری (HVL) ی سویدیەوە وەرگیراوە.

(١) Beatniks : وشەیەکی ئەمەریکییە بۆ لاوانی بێڕەگورپیشەی دوای جەنگ ... (B .S.O).

(٢) دەنگوباسی کەناڵی (١) ی تەلەفزیۆنی سویدە.

# هونەر



- ڕوحانیەت لەهونەردا (بەتایبەت لەنیگارکێشاندا)

- بیزەنتیەکان لەباکوور بوار بۆ ئیمپراتۆریەتی ئیسلام دەلوێنن لەباشوور

# روحانیەت لە هونەردا و

## (بەتایبەت لە نیگارکێشیدا)

■ کاندنسکی

● و: د. فەرهاد پیر باڵ و سمایل دەروێش

**دەسپێك**

هەر کارێکی هونەری زادەی سەردەمی خۆیەتی. زۆر جارانیش دایکی هەستەکانمانە.

بەم شێوەیە لە هەر قۆناغێکی رۆشنبیریدا هونەرێکی تایبەتمەند بەو قۆناغە لەدایك دەبێت و ناتوانرێت دووپات بکرێتەوە. هەوڵدان بۆ ژیاندنەوەی بنەماکانی هونەری کۆن. ئەوپەڕی، دەمانگەیەنێتە ئافراندنی بەرهەمە مردووە کۆنەکان ئێمە ناتوانین، بۆ نموونە، هەمان هەستناسکی یان ژیانی یۆنانیە کۆنەکانمان هەبێت. هەروەها هەوڵدان بۆ پیادەکردنی بنەماکانی نیگارکێشی ئەوان تەنیا ئافراندنی چەند فۆرمێکی هاوشێوەی فۆرمەکانی ئەوانە. بەڵام تا هەتایە بێگیان. ئەم لاسایی کردنەوەیە بە هی مەیموونان دەچێ. بە رووکەش، جووڵانەوەکانی مەیموون زۆر بەهی مرۆڤ دەچێ. مەیموون دادەنیشێ، پەرتووك دەگرێتە دەست، لاپەڕەکانی هەڵدەداتەوە خۆی بەهرەمەند دەنوێنێ، بەڵام بێئەوەی ئەم لاسایی کردنەوەیە هیچ واتایەکی ناوەوەی هەبێت.

لەگەڵ ئەوەش فۆرمێکی دیکەی لێکچوواندن (analogie) هەیە، کە لەسەر پێداویستییەکی قووڵ دامەزراوە و نزیکە لە فۆرمە هونەرییەکان. لێکچوونی گەڕانە دەروونیەکان لە چوار چێوەی ئەتمۆسفێرێکی ئاکاری و رۆحیدا. گەڕان بە دوای چەند ئامانجێك کە پێشتر لە دەفری هێڵە بنەڕەتییەکانی خۆیاندا هەنگاویان بۆ هەڵهێنراوە و بەڵام لە کۆتاییدا لە بیرچوونەتەوە، واتە لە ئاکامدا لەیەکچوونی ئاووهەوای رۆحیی سەرتاپای قۆناغێك. هەموو ئەم شتانە دەتوانێ بە شێوەیەکی لۆژیك بمانگەیەنێتە بەکارهێنانی چەند فۆرمێك کە لە رابوردوودا خزمەتی هەمان



رەوتیان کردووە. بەم چەشنەیە کە، هیچ نەبێ کەسێك لە خۆشەویستیو تێگەیشتنو ئاشنایی رۆحیی ئێمە بۆ هونەرە سەرەتاییەکان لەدایك بووە. ئەم هونەرمەندە پاکیزانە، وەکو ئێمە، هەوڵیان داوە کە جگە لە شتە بنەڕەتیە دەروونیەکان هیچ شتێك لەبەرهەمەکانیاندا پیشان نەدەن. ئەمەش بە لەناوبردنی هەموو دیاردەیەکی دەرەکی.

ئەم پەیوەندی بەستنە لەگەڵ دەروون، سەرەڕای هەموو گرنگییەکەشی، تەنیا یەك لایەنی مەسەلەکەیە.

رۆحی ئێمە، دوای ئەو قۆناغە درێژەی ماتریالیزم کە جگە لە بێدارکردنەوەمان نەیتوانی هیچ شتێکی دیکە بکات، بناوانەکانی بێئومێدیو بێمتمانەییو بێهودەییو بێسوودی لەناو خۆیدا دەشارێتەوە. کابوسی پەیڕەونامە ماتریالیستەکان، کە ژیانی ئەم دنیایەی کردە یارییەکی گەمژەو بێسوود. هێشتا دوایی نەهاتووە. تەنیا تروسکاییەکی بێهێزی جریوەداری وەك خاڵێکی بچکۆلە لەناو بازنەیەکی زلی رەش. ئەم ترووسکاییە لاوازە تەنیا پیشهەستێکە، رۆحیش جەسارەتی ئەوەی نیە گومانی بۆ ئەوە بچێتو بزانێ کە ئەم قورساییە خەونێکەو ئەم بازنە رەشەش واقیع.

ئەم گومانو زەبوونییەی دەست فەلسەفەی ماترسیالیست کارێکی وا دەکات کە رۆحی ئێمە بە شێوەیەکی قووڵ لە رۆحی ((هونەرمەندە سەرەتاییەکان)) جیاواز بێت. رۆحی ئێمە شەقڵێکی تێکەوتووەو کاتێ پێی دەگەیت دەزرنگێتەوە، وەك گوڵدانێکی دانسقەی درزبردوو

کە لە قووڵایی زەویدا دۆزرابێتەوە. بۆیە ئەم ڕووکردنەمان بەرەو هونەری سەرەتایی کە ئێستا لەگەڵ فۆرمی ڕووکەشانەی ئەمڕۆیدا دەژین. تانیا بۆ ماوەیەکی کەم نەبێ ناتوانێ بەردەوام بێ.

ئەم دوو لێکچوواندنەی (Analogie) هونەری نوێ کە هەندێك فۆرمی قۆناغە بەسەرچووەکانی تێدایە. ئاشکرایە کە بەتەواوەتی دژی یەکترین. یەکەمیان بە تەواوەتی دەرەکییەو هیچ دوارۆژێکی نیە. دوەمیان دەروونییەو هەر بۆیەش تۆوی دوارۆژی لە خۆدا هەڵگرتووە. دوای فریودانی ماتریالیست. کە بە دەستیەوە هەرەسی هێناو لە هەمان کاتدا وەك هەواو هەوەسێك لە خۆی دوور خستەوە، ڕۆح سەری هەڵدا، ئەو ڕۆحەی کە بەرەنجو ئەشکەنجە ناسك ببۆوە.

هەستو نەستی ناقۆڵا، وەکو ترس، خۆشی، غەمگینی، کە بە درێژایی ئەم قۆناغە فریودانە دەیانتوانی ببنە ناوەڕۆکی هونەر، بە هیچ شێوەیەك سەرنجی هونەرمەند ڕاناکێشن. هونەرمەند هەوڵ دەدا هەستو نەستی ناسکتر بێدار بکاتەوە.

هەستو نەستێك کە هیچ ناوێکی دیاریکراویان نیە، هونەرمەند خۆی لەناو بوونێکی ئاڵۆزدا دەژی. بوونێکی تا ڕادەیەك زەرکەفتو نیان. ئەو بەرهەمەی کە لە هونەرمەندەوە بڵاچە دەدات، لەلای ئەو بینەرانەی کە توانایان هەیە، چەند سۆزێکی تابلێی ناسك دەورووژێنن کە وشە ناتوانێ دەریان ببڕێ.

ئەمڕۆ بینەر بە دەگمەن توانای ئەوەی هەیە کە هەست بەم چەشنە هەژانە بکات. بینەر لەناو بەرهەمی هونەریدا، بە دوای لاسایکردنەوەیەکی سروشتدا دەگەڕێ کە بۆ ئامانجێکی پراکتیك بەکار بهێنرێت (وەك پۆرترێت بە هەموو واتای ساویلکانەی وشەکە) یانیش بەدوای لاساییکردنەوەیەکی ئەوتۆی سروشت کە چەند لێکدانەوەیەك هەڵبگرێت ((نیگار کێشانی ئەمپرێسیۆنیست)) یانیش لە کۆتاییدا بەدوای چەند حاڵەتێکی ڕۆحیی دەمامکدراو بە چەند فۆرمێکی سروشتی (ئەوەی ناوی دەنێن کەش _ ambiance).

هەموو ئەم فۆرمانە، بەتایبەت کاتێ قسە لەسەر فۆرمی ڕاستەقینەی هونەری دەکرێ (بەتایبەتی لە حاڵەتی یەکەمیشدا) دەگەنە ئامانجی خۆیانو بژێوێکی ڕۆحی پێك دەهێنن. بەڵام لەسەرووی هەموویانەوە لە حاڵەتی سێیەمدا، کە بینەر تێیدا هاوئاهەنگی ڕۆحیی خۆی دەدۆزێتەوە. بێگومان هاوئاهەنگییەکی وا ((تەنانەت ناسازێتیش)) ناتوانێ خۆی وەك شتێکی پووچ یان ڕووکەش بنوێنێ. بەڵام کەشی بەرهەمە هونەرییەکە، جگە لەوەش، دەتوانێ کەشی ناوەوەی بینەر بە برشتتر بکاتو خاوێنی بکاتەوە.

هەرچۆنێ بێت. ئەم چەشنە بەرهەمانە بەرگری لە ڕۆح دەکەن دژی هەموو قوورساییەك. ئەم بەرهەمانە ڕۆح لە ئاستێکی بەرزدا ڕادەگردن. وەك کلیلی ئامێرێکی مۆسیقایی کە تاڵەکانی خۆی توند ڕادەگرێ. بەڵام لەگەڵ ئەوەش ناسکیو بڵاوبوونەوەی ئەم سەدایە لەناو کاتو شوێندا نیوەچڵ دەمێنێتەوەو هەموو کاریگەرییەکی شیاوی کە لە هونەردا هەیە ناخاتە گەڕ.

باڵەخانەیەکی گەورە، زۆر گەورە، باڵەخانەیەکی بچووك یان مامناوەندی، دابەشکراو بەسەر چەند هۆڵێك، دیواری هۆڵەکان لە ژێر چەند تابلۆیەکی بچووك، گەورە یان مامناوەندیدا بزردەبن. زۆر جاران لە ژێر چەندان هەزار تابلۆدا. لەسەر ئەم تابلۆیانەشدا بە ڕەنگ چەند پارچەیەك لە ((سروشت)) دروست کراون: ئاژەڵ لەبەر خۆرەتاو یان لەبەر سێبەردا، لە نزیك کومێك ئاو دەخۆنەوە، لەناو گیادا وەرکەوتوون لە تەنیشتیانەوە مەسیحی لە خاچ دراو، کە هونەرمەندێك نیگاری کێشاوەو خۆیشی باوەڕی





به مه‌یسح نییه: چه‌ند گوڵێك، فیگه‌ری چه‌ند ئاده‌میزادێك، دانیشتوو، به پێوه، به‌ده‌م رێوه، زۆر جارانیش رووت‌و قووت: کۆمه‌ڵێك ئافره‌تی رووت (زۆر جاران بچووك کراونه‌ته‌وه‌و له دواوه‌ڕا نیگار کێشراون)، سێوو خونچه‌ی زیوین، پۆرتریتی راوێژکارێك... خۆرئاوابوونێك، ئافره‌تێکی په‌مبه‌پۆش، له شه‌قه‌ی باڵدانی مراوییان، پۆرتریتی ژنه به‌گزاده‌یه‌ك... فڕینی قاز، خاتوونێکی سپی پۆش، چه‌ند گایه‌ك له‌به‌ر سێبه‌رداو له‌ملاو له‌ولاش چه‌ند په‌ڵه خۆره‌تاوێکی زه‌ردی ناجۆر، پۆرتریتی جه‌نابی Y....، خاتوونێکی سه‌وز پۆش. هه‌موو ئه‌م شتانه به وردبینییه‌وه له کتێبێکدا چاپکراون: ناوی هونه‌رمه‌نده‌کان. ناوی تابلۆکان. خه‌ڵك ئه‌م کتێبانه به ده‌سته‌وه ده‌گرن‌و له‌و تابلۆوه بۆ ئه‌و تابلۆ ده‌چن، لاپه‌ڕه‌کانیان هه‌ڵده‌ده‌نه‌وه‌و ناوه‌کان ده‌خوێننه‌وه. پاشان، ئه‌م سه‌ردانه‌ی پێشانگاکه نه له هه‌ژاری‌و نه له ده‌وڵه‌مه‌ندییانی که‌م یان زیاد کردبێت، ده‌ڕۆن، ده‌گه‌ڕێنه‌وه بۆ سه‌ر ئه‌و کاروبارانه‌ی خۆیان که هیچ په‌یوه‌ندییه‌کی به هونه‌ره‌وه نیه.

بۆچی هاتن بۆ ئه‌و پێشانگایه؟ هه‌ر تابلۆیه‌ك ژیانێکی ته‌ڵزماوی‌له‌خۆ گرتووه، به‌هه‌موو ئازارو گومان‌و دڵخۆشی‌و رووناکییه‌کانی خۆیه‌وه. ئه‌م ژیانه ئامانجی چییه؟ رۆحی نیگه‌رانی هونه‌رمه‌ند، کاتێ به‌شداری له داهێنان ده‌کات. روو له کێ ده‌کات؟ نیازی وایه چ شتێك بدرکێنێ؟ ((تیشکاییه‌ك بخاته کانگای دڵی مرۆڤایه‌تییه‌وه. ئه‌مه‌یه به‌هره‌ی هونه‌رمه‌ند)) وه‌ك شومان Schumann ده‌ڵێ. هه‌روه‌ها وه‌ك تۆلستۆی Tolstoi ده‌ڵێ: ((نیگارکێش مرۆڤێکه که ده‌توانێ وێنه‌ی هه‌موو شتێك بکات‌و هه‌موو شتێك نیگاربکێشێ)).

له نێوان ئه‌م دوو پێناسه‌یه‌ی چالاکیی هونه‌رمه‌نددا. ئه‌گه‌ر بیر له‌و پێشانگایه بکه‌ینه‌وه که پێشتر باسمان کرد، پێویسته پێناسه‌ی دووه‌م هه‌ڵبژێرن.

به که‌م تا زۆرو به‌هره‌مه‌ندی کارامه‌ییه‌وه. چه‌ند شتێکمان وه‌شانده سه‌ر تابلۆکه‌و ((نیگارێکمان)) دروست کرد. که‌م تا زۆر ناسك یان ناقۆلا. ئه‌مه هاوئاهه‌نگی سه‌رتاپای شته‌کانی سه‌ر تابلۆکه‌ن که کاره هونه‌رییه‌که پێك ده‌هێنن.

بە چاوێکی ساردەوەو بەڕۆحێکی بێباکەوە تەماشای ئەم بەرهەمە دەکەین. هونەرناسەکان زۆر حەز لە ((رەخنە)) دەکەن (وەك چون حەز لە سەماکەری سەر پەت دەکەن) هەروەها حەز لە ((نیگار کێشان)) دەکەن (وەك چۆن حەز لە پارچە گۆشتێك دەکەن).

## ڕۆحە برسییەکان ڕێو ڕێ بە برسێتی دەگەڕێنەوە.

جەماوەر بە درێژیی‌و پانی هۆڵەکە دێت‌و دەچی‌و تابلۆکان بە (جوان) و(بەهێز) لەقەڵەم دەدان. ئەو کەسەی کە دەیتوانی قسە بۆ ئەو خەڵکە بکات هیچی نەوت،ئەو کەسەش کە دەیتوانی گوێ رابگرێت گوێی لە هیچ نەبوو.

ئەمەیە ئەو حاڵەتە هونەرییەی کە ناوی دەنێن ((هونەر بۆ هونەر)).

ئەم هەناسە لێبڕانەی ئەم دەنگدانەوە دەروونییە، کە بریتییە لە ژیانی رەنگەکان، ئەم پرژۆڵە بێسوودەی هێزەکانی هونەرمەند. ئەوەتا ئەمەیە ((هونەر بۆ هونەر)).

هونەرمەند بەدوای پاداشتی تواناکانیدا دەگەڕێ، بە دوای هێزە داهێنەرەکەی‌و ئەو هەست ناسکییەی کە لە شێوەیەکی ماتریالدایە. ئامانجی ئەو دەبێتە رازیکردنی مەرام‌و تاسووقەکانی. لەناو هونەرمەندەکاندا. لەجیاتی هاوکارییەکی قووڵی نێوانیان بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانیان، پێشبڕکێیەك لەدایك دەبێ. خەڵك ئیتر نارەزایی دەردەبڕێ کە ئەم پێشبڕکێیە زێدەڕۆیی تێدا دەکرێت‌و زیاد لە پێویست بەرهەم دەهێنرێت.

رق، لایەنگری، دەستەگەرەکان، هەروەها تاسووق‌و دەغەڵکاری، لە ئاکامدا دەبنە هۆی ئەوەی کە ئەم هونەرە ماتریالیستە لە ئامانجی راستەقینەی خۆی دوور بکەوێتەوە.

بینەر وردە وردە روو لەو هونەرمەندە وەردەگێڕێ کە ئامانجی ژیانی خۆی لە هونەرێکی رچەشکێندا نادۆزێتەوەو روو لە بەرزتر دەکا.

((تێگەیشتن)) پەروەردەکردنی بینەرە بۆ ئەوەی بگەیەنرێتە ئاستی هونەرمەند. ئێمە لەسەرەوەدا وتمان کە هونەر زادەی ئاستی سەردەمی خۆیەتی. هونەرێکی وا لە ئەتمۆسفێرێکی کاتدا ناتوانێ هیچ شتێك بگەیەنێ. جگە لەو شتەی کە بە روونییەوە هاتۆتە بەرهەم. ئەم هونەرە کە هیچ وزەیەکی ئایندەی لە خۆیدا هەڵنەگرتووەو لە هەمان کاتدا تەنیا زادەی قۆناغەکەی خۆیەتی، هەرگیز دواڕۆژی لێ ناکەوێتەوە: هونەرێکی نەزۆکە. تەمەن کورتەو هەرکاتێك گۆڕانێك بەسەر ئەو ئەتمۆسفێرەدا بێت کە دروستی کردووە. ئەوا ئەویش لەباری فەرهەنگییەوە دەمرێ.

هونەرەکەی تر، ئامادە بۆ هەر چەشنە پەرەسەندنێك، ئەویش هەر سەرچاوە لە قۆناغە رۆحییەکەی خۆیەوە هەڵدەگرێ، بەڵام ئەو تەنیا ئاوێتەو دەنگدانەوە نیە، بەڵکو بە پێچەوانەوە، هێزێکی بێدارکەرەوەی پێغەمبەرانەی هەیەو دەشێ کاریگەرییەکی قووڵی هەبێ.

ژیانی رۆحی، کە هونەر بۆ ئەو دەگەڕێتەوەو یەکێکە لە ئەندامە سەرەکییەکانی، جموجوڵێکی بەگری‌و گۆڵە، بەڵام مسۆگەرەو دەکرێ بە ئاسانییەوە سادە بکرێتەوە، بەرەو پێشەوەو بەرەو ژوور. جموجوڵی زانین، هەرچی فۆرمێك وەربگرێت، هەمان واتای قووڵ‌و هەمان ئامانج دەپارێزێت.

هۆیەکانی ئەو پێویستییەی کە ناچارمان دەکات بەرەو ژوورو بەرەو پێشەوە بجووڵێینەوە ((بە ئارەقەی نێوچەوانمان)) لە توێی ئێش‌و ئازارو دەردەسەرییەکانماندا نەناسراو دەمێنینەوە. کاتێ حاڵەتێك دێتە پێشەوەو رێگامان لە تەلاشە بەردە دەغەڵکارەکان پاك دەبێتەوە. دەستێکی نەدیتراوی درِ دێت‌و سەرلەنوێ بە چەندین لەمپەڕ، هەندێك جار رێگاکە وا دادەپۆشێ کە چیتر نەیناسینەوە.

لەم حاڵەتەدا، بێ‌چەندو چون مرۆڤێك دێتە ئارا. یەکێك لە خۆمان، وەکو ئێمە لە هەموو بارێکەوە. بەڵام بەهێزی ((بینینێکی)) تەلزماویی بەهرەمەندەوە.

ئەو دەبینیّو ریّگا پیشان دەدا. هەندیّ جار دەیەویّ خۆی لەدەست ئەو بەهرەیە رزگار بکات کە وەك خاچێك دڵی دەگوشیّ. بەلاّم ناتوانیّ، بەسەر ئەم ریّگا حەشاماتەوە، سەرەرای رقو کینە، عارەبانە قوورسەکەی مرۆڤایەتی بەرەو پێشەوەو بەرەو ژوور، بەدوای خۆیدا رادەکێشیّ.

زۆر جاران، کاتیّ هەولّ دەدریّ بە هەموو شێوەیەك ئەم فۆرمە جەستەییە بە شێوەیەکی مەزنتر لە قەوارەی سروشتیی خۆی (بە مەرمەر، بە ئاسن، بە برۆنز، بە بەرد) بهێندرێتەوە



بەرهەم، لەو کاتەدا (مـن ) ی جەستەیی هونەرمەند زۆر دەمێکە لەناوچووە، وەك ئەوەی ئەم ((جەستەییە)) لەلای ئەم شەهیدانەی پیاوچاکانی خزمەت بە مرۆڤ بایەخێکی زۆری هەبێت. ئەوان، خۆیان رقیان لە جەستەیە، بەلاّم پرن لە رۆحانیەت.

لە سەرووی هەموو شتێکیشەوە، ئەم پەیکەرە مەرمەرییە ئەوە دەسەلمێنیّ کە حەشاماتێکی زۆری خەڵك تازە بەتازە گەیشتونەتە پایەی ئەو کەسەی کە ئەمرۆ ئەوەتا بەشانو باڵی هەڵدەدەن.

## جووڵانەوە

سێگۆشەیەکی گەورەی دابەشکراو بەسەر چەند برگەیەکی نایەکسانەوە. بەشە هەرەبچووكو هەرە تیژەکە رووی کردۆتە سەرەوە. خشتەیەکی جوانی ژیانی رۆحانی. چەند بەرەو خوار ببینەوە. برگەکانی سێگۆشەکە هێندە گەورەتر دەبن، پانتر. هەراوتر. هەروەها بڵندتر.

هەموو سێگۆشەکە هێدی هێدی بەرەو پێشەوە دەچیّو بەرز دەبێتەوە. بە بزاوتێك کە بە ئاستەم هەستی پیّ دەکریّ. ئەو خاڵەش (ئەمرۆ) کە لووتکەی سێگۆشەکە پێی دەگات. لەلایەن برگەکانی دوای خۆیەوە بەجیّ دەهێلرێت (سبەینیّ)*.

ئەمە ئەوە دەگەیەنیّ کە ئەو شتەی ئەمرۆ سەبارەت بە هەبوونی لوتکەیەکی هەرە تیژ لێی تێدەگەینو کە لە چاو بەشەکانی دیکەی سێگۆشەکە کارێکە کە رەنجت لەگەڵیداوەو خەڵك لێی تێناگات. سبەینیّ، بۆ برگەی دووم دەبێتە ناواخنی لەخۆگری سۆزو واتای ژیانی رۆحیی خۆی.

بەسەر تیژترین لووتکەی سێگۆشەکەوە هەندیّ جار تەنیا پیاوێکی تەنیا هەیە. ئەو دڵخۆشییەی کە لە گۆشەنیگای خۆیەوە هەستی پێدەکات یەکسانە بەو غەمگینییەی ناوەوەی: نزیکترین ئاشناکانی خۆیشی لێی تێناگەن. ئەو کەسانە، لە شپرزەیی خۆیان بە دەغڵکاری دادەنێن، بە شێت. بەم شێوەیە بتهۆڤنیّ تاقو تەنیا لەکاتی خۆیدا ببوە تیسەسارەی خەڵكو هەرەشەی لێدەکرا.

چەند ساڵ پێویست بوو بۆ ئەوەی برگەیەکی گرنگی سێگۆشەیەك بگاتە ئەو ئاستەی کە جاران

به تەنیا تێیدا نیشتەجێ ببوو؟ سەرەڕای هەموو پەیکەرێکیش. چەند کەس لە ئەوان بە راستی گەیشتنە ئەو ئاستە. لە هەموو برگەکانی سێگۆشەکەدا دەتوانین چەندین هونەرمەند بدۆزینەوە. لەناو ئەو هونەرمەندانەدا ئەوەی توانای هەیە کە ئەولای سنوورەکانی برگەکەی خۆی ببینێ. ئەوا پێغەمبەرێکە بۆ دەوروبەری خۆی و یارمەتی جووڵانەوەی عارەبانە سەر سەختەکە دەدات، بەڵام ئەو هونەرمەندەی کە ئەم گۆشەنیگا باریکبینەی نەبێت. یانیش بۆ چەند موتیڤێکی ساکار بەکاری بهێنێ. یانیش ئەگەر هەر بەکاری نەهێنێ. ئەوا خەڵك بە باشی لێی تێدەگەن و پرۆزبایی لێدەکەن. برگەکەی هونەرمەند چەند گەورەتربێت (کەواتە هێندە لە خوار ترە) جەماوەری هێندە زیاتر دەبێت و باشتر لە قسەکانی تێدەگەن.

ئەمە ئاشکرایە کە هەر یەکێك لەم برگانە چاوەڕێ دەکا. بەشێوەیەکی هوشیار یان ناهوشیار (کە ئەمە حاڵەتێکی هەرە باوە) هیوای نانێکی رۆحیی ئەوتۆ دەخوازێ کە شایستەی بێت، ئەم نانە رۆحییە لەلایەن هونەرمەندەکانەوە بۆ ئەوهاتۆتە پێش. هەمان ئەم نانەیشە کە سبەینێ برگەکانی دیکە بەدوایدا دەگەڕێن.

**

پێش چاو خستنی ئەم خشتەیە. بێگومان، جگە لە وێنەیەکی ناتەواوی ژیانی رۆحی هیچی دیکەمان پێ نابەخشێ. جگە لەوەش دیوەکەی پشتەوەمان پیشان نادات. دیوی ((پەڵە رەشە گەورە)) مردووەکە. ئەمەش لەبەر ئەوەی زۆر جاران ئەم نانە دەبێتە بژێوی ئەو پیاوانەی کە سەر بە برگەیەکی بەرزترن. ئەم نانە. کەواتە. بۆ ئەوان دەبێتە ژەهر، ئەم ژەهرە ئەگەر بەشێوەیەکی تۆزە تۆزە بێت ئەوا رۆح لەبرگەیەکی بەرزەوە دەخلیسکێنێتە برگەیەکی نزمتر. ئەگەریش بەشێوەیەکی زۆر بێت ئەوا دەبێتە مایەی هەرەسبردنێکی زۆر ئاستەنگ بەرەو برگە هەرە نزمەکان.

سینکیڤیچ (Sienkewicz) لە یەکێ لە رۆمانەکانیدا، ژیانی رۆحی بە مەلەکردن بەراورد دەکات. ئەو کەسەی بێوچان دژ بە داتەپین



کارنەکاتو بێ وەستان خەبات نەکات، ئەوا بەتەواوەتی نقووم دەبێ. بەهرەی سروشتیی مرۆڤیش ((سرووش)) (بەواتا ئینجیلیەکەی) دەبێتە نەفرەت. نەك تەنیا بۆ ئەو هونەرمەندەی کە ئەو نانە ژەهراویەی وەرگرتووە. بەڵکو بۆ هەموو ئەوکەسانەش کە لەو نانە ژەهراوییە دەخۆن.

هونەرمەند هێزی خۆی لەپێناو رازاندنەوەی پێداویستییە لاوەکییەکان بەکاردەهێنێ. فۆرمێکی بە رووکەش هونەری دەبەخشێتە ناوەرۆکێکی ناڕەوا. توخمە لاوازەکان بەرەو خۆی رادەکێشێو تێکەڵاویان دەکات بە شتی خراپ. خەڵك فریودەداتو دەیانخاتە سەر ئەوەی کە خۆشیان خۆیان فریو بدەن. هونەرمەند خۆی دەهێنێتە سەر باوەڕو ئەو خەڵکانەش هەر دێنێتە سەر باوەڕ کە تینوێتی رۆحیان هەیەو ئەو تینوێتییەی خۆیان بە سەرچاوەیەکی سازگار دەشکێنن. لەم بەرهەمانەوە هیچ جموجوڵێك برەو سەرەوە هەڵناکشێ، ریگایان لێدەگرێ، هێزەکانی پێشکەوتنیان لێدەبڕێو دەورووبەریان دەردەدار دەکات.

لەم جۆرە قۆناغانەدا کە هونەر هیچ جۆرە نوێنەرێکی جێی متمانەی نیەو کەس ئەو نانە رۆحییە نابەخشێتە مرۆڤ، ئەم جۆرە قۆناغانە ((قۆناغی شیرازە تێکچوونی)) جیهانی دەروونین. رۆح بێوچان لە برگەکانی سەرەوەی سێگۆشەکەوە بەردەبنە خوارەوەو هەست دەکەی سێگۆشەکەش خۆی هەر وەستاوەو ناجوڵێ. کەچی لە هەمان کاتدا هەست دەکەی بەرەو دواوەش دەچێتو داشدەبەزێ. لەم سەردەمە لاڵو نابینایەدا، مرۆڤ بایەخێکی گرنگو تایبەت دەداتە سەرکەوتنە دەرەکییەکان، تەنیا شتە ماتریالییەکانی لەلاوە گرنگە، پێشوازی لە هەموو پێشکەوتنێکی تەکنیکی وا دەکات کە، وەك سەرکەوتنی مەزن، خزمەتی هیچ ناکات جگە لەجەستە. هێزە پاکە رۆحییەکان گڵ هەر نرخی خۆیان نەدراوەتێ. بەڵکو پشت گوێش خراون.

برسییەکانو ئەوانەی دەبینن. هەروەها دوورخراوەکان، گاڵتەیان پێ دەکرێو بە خەڵکێکی ناسروشتی دادەنرێن. لەگەڵ چەند رۆحێکی دەگمەندا، کە خەو ناچێتە چاویانو هەست بە پێویستییەکی تەڵزماویی ژیانی رۆحیو زانینو پێشکەوتن دەکەن. بێنەوازشو دەم بە گازاندەوە لەناو کۆرسی تاسووقە ناقۆڵاکاندا دەلاوێنەوە. شەوی رۆحی ئەستوورتر دەبێ. بە دەوری ئەم رۆحە زەندەقچووانەدا هەموو شتێك زیاتر رەنگی خۆڵەمێشی لێدەنیشێ، ئەو کەسانەش کە سەر بەم رۆحانەن. لە ترسو بێ ئومێدی خۆیاندا، ئەشکەنجەدارو رەتاو، زۆر جاران داڕووخانی ئاستەنگو لە ناکاوی ناو رەشایی بە باشتر دەزانن لەوەی کە هێدی هێدی بگەنە ناو ئەم ئەنگوستەچاوە.

هونەر، لەو قۆناغانەدا کە ژیانێکی نیوەچڵی هەیە. تەنیا بۆ چەند ئامانجێکی ماتریال بەکاردێت. هونەر، سەبارەت بەوەی کە ناواخنێکی ناسکتر ناناسێ. دەچێ لەناو کەرەستەیەکی ناقۆڵادا بە دوای ناواخندا دەگەڕێ.

ئەو کەرەستانەی، کە بەرهەمهێنانەوەیان تاقە ئامانجێکی هونەرە، بەردەوام وەکوو خۆیان دەمێننەوە. لەم حاڵەتەدا مەسەلەی (چی) لە هونەردا بزر دەبێ. تەنیا یەك مەسەلە وەك ناواخنێك دەمێنێتەوە ((چۆن)) کەرەستەی جەستەیی، کە دەتوانێ لەلایەن هونەرمەندەوە بەدەستەوە بدرێ. ئەم کەرەستەیە دەبێتە باوەڕ ئەم هونەرە رۆحی نیە.

هونەر لەسەر ئەم رێگایەی ((چۆن)) دا بەردەوام دەبێ. تایبەتمەندێتی وەردەگرێتو تەنیا ئەو هونەرمەندانە لێی تێدەگەن کە دەست دەکەنە گازاندە کردن لە بێباکی خەڵك لە هەمبەر بەرهەمەکانیان.

بەشێوەیەکی گشتی. هونەرمەند لەو قۆناغانەدا پێویستی بەوە نیە شتێکی ئەوتۆ بڵێت. هەروەها گرتنەبەرێکی ساکاری ((رێبازێکی دیکە)) وا لە هونەرمەند دەکات کە لەلایەن

هەندێ لە تاقمە بچووکە هەونەردۆستو هونەرناسەکانەوە پەنجەی بۆ رابکێشرێتو نرخی بۆ دابنرێت. واتە لەلایەن ئەوکەسانەی کە بانگەشەی بۆ دەکەن (ئەوانەی کە لە بەخشینی ئیمتیازی ماتریالانەی هەندێ جار زۆر گرنگیش دەست ناگرنەوە).

ئەمەش بەشێوەیەك کە دەبینین حەشاماتێکی زۆری خەڵکی بەتوانا، بە بەهرەیەکی ئاشکراوە دەرژێنە سەر ئەم هونەرەی کە ئەنجامدانی، وەك پێدەچێ زور ئاسان بێت.

هەموو ((مەڵبەندێکی هونەری)) هەزاران لەم جۆرە هونەرمەندانەیان تێدایە، کە زۆربەیان تەنیا بەدوای شێوەیەکی تازەدا دەگەرێنو بەبێ هیچ دڵگەرمییەکەوە، بە دڵساردیو رۆح پڕ لە وەنەوزەوە.ملیۆنان بەرهەمی هونەری دروست دەکەن.

((پێشبڕکێ)) رۆژ بەرۆژ بەهێزتر دەبێ، عەودالبوونی وەدەستهێنانی سەرکەوتن هەمیشە گەرانی هونەری کزتر دەکاتەوە.

گرووپی بچووك، کە پێشتر بە رێککەوت توانیویانە کەخۆیان لە غەوغای هونەرمەندو ئیماژەکان دوور بخەنەوە، پاشەکشێ دەکەنو دەگەرێنەوە سەنگەرەکانی پێشوویان. جەماوەر، لە دوواوە بێئەوەی تێبگات تەماشا دەکات، هەموو بایەخدانێکی بە هونەرێکی وا لەدەست دەداتو پشتی تێدەکات.

سەرەرای ئەم کوێریو ئەم غەوغاو عەودالبوونە کێوییە، سێگۆشەکە بەردەوام پێشدەکەوێت، بەهێواشیو بە مسۆگەرییەوە. بەهێزێکی لەبن نەهاتووەوە خۆی پیشان دەدات.

مووسای تازە، نەدیتراو، لە شاخەکانەوە دادەبەزێتە خوارەوە. چاوی بەسەمای دەوری گا ئاڵتونییەکان دەکەوێ.

سەرەرای ئەمانەش، ژیرییەکی نەوباو بۆ مرۆڤ دەهێنێ. قسەی ئەو، کە جەماوەر ناتوانێ گوێی لێبێت، پێش هەموو کەسێك هونەرمەند گوێی لێدەبێت. لە سەرەتادا ناهۆشیارانە، بێئەوەی خۆی پێبزانێ، بەدوای بانگەوازەکەدا دەروا. مەسەلەی ((چۆن)) بناوانێکی شاراوەی چاکبوونەوەی لەخۆدا گرتووە. تەنانەت ئەگەر ئەم ((چۆن)) ە بەشێوەیەکی گشتی سوواویش بێت، ئەم ((رێبازی دیکە)) یە ((ئەوەی کە ناوی دەنێین کەسایەتی)) رێگای ئەوەمان دەداتێ کە لەناو بابەتەکەدا (Object) تەنیا کەرەستەیەکی ناقۆڵا نەبینن. بەڵکو لە هەمان کاتدا ئەو شتەش ببینین کە لەچاو بابەتی قۆناغی ریالیست کەمتر جەستەییە، سەرلەنوێ شت بەرهەم دەهێنێ ((وەك ئەوەی هەیە)) بێ فەنتازیا.

ویرای ئەوە، کاتێ ئەم ((چۆن)) ە سۆزەکانی رۆحی هونەرمەند دەداتەوەو رێگای پێدەدا کە ئەزموونێکی خۆش ببەخشێتە بینەر، هونەر دەگاتە ئاستانەی ئەو رێگایەی کە یارمەتی دەدات ((چی)) ی ونبوو بدۆزێتەوە، ئەم ((چی)) یە دەبێتە نانی رۆحیی ئەم بێداربوونەوە رۆحییە.ئەم ((چی)) یە چیتر نابێتە ((چی)) ی ماتریالێ کە رووی کردبووە بابەتی قۆناغی پێشوو، بەڵکو دەبێتە رەگەزێکی هونەریی ناوەوە.

رۆحی هونەر. کە بەبێ ئەو، جەستەی ((چۆن)) هەرگیز ناتوانێ ژیانێکی پیرۆزو راستەقینەی هەبێت وەك مرۆڤ خۆی یان وەك نەتەوە.

ئەم ((چی)) یە بریتییە لەو ناوەرۆکەی کە تەنیا هونەر لەناو خۆیدا دەتوانێ وەدەستی بهێنێت، وە لەرێگای چەند ئامرازێکی ئەوتۆوە کە تەنیا سەر بە ئەون دەری ببڕێ.

پەراوێز:

* ناوەرۆکی وشەی (ئەمڕۆ) و (سبەینی) وەك ناوەرۆکی (رۆژانی) داهێنانی زەمین وایە کە لە ئینجیلدا باسیکراوە.

سەرچاوە:

• ئەم وتارە بەشێکە لە وەرگێرانی کتێبەکەی کاندینسکی بە ناونیشانی رۆحانیەت لە هونەرداو بە تایبەت لە نیگارکێشیدا، پاریس ١٩٨٩، ٢٠٤ لاپەرە، دەزگای بلاوکردنەوەی Folio)

لە فەرەنسییەوە کردوومانەتە کوردی ((هیوادارین لەداهاتوودا بەشەکانی دیکەشی بلاویکەینەوە.

* لە ژمارە _ ١ _ ی گوڤاری ((دەروازە)) کە لە کوبنهاگن دەردەچوو ساڵی (١٩٩٣_١٩٩٤) بلاو بۆتەوە.

# بیزەنتینیەکان لە باکوور، بوار بۆ ئیمپراتۆریەتی ئیسلام دەلوێنن لە باشوور

• ئا: دارا حەمە سەعی

لە سەرەتای سەدەی چوارەمی زاییندا، کۆلۆنیای داگیرکراوی گرێکی کۆن لەلایەن بیزەنتینەکانەوە، کە لەسەر کەناری بۆسفۆر بوو. کۆستانتین شاری (کۆستەنتینۆفۆلی) هەڵدەبژێرێت بۆ پایتەختی نوێ بۆ ئیمپراتۆریەتی رۆمانی لە خۆرهەڵات. ئەم شارە سەرلەنوێ چاکرایەوەو دامەزرایەوەو بووبە مەڵبەندێکی فراوانی پۆلیتیکۆ هونەرو کولتور تا ئیمپراتۆرییەتەکە لە خۆرهەڵاتدا بۆ ماوەی هەزار ساڵ بیبیندەگرێ هەتا کەوتنی ئیمپارتۆرییەتەکە.

هونەری بیزەنتینی هەموو هونەری مەسیحیی دەگرێتەوە لە خۆرئاواوە هەر لە دامەزراندنی شاری کۆستانتینۆفۆڵیەوە، هەتا کەوتنو داگیرکردنی لەلایەن عوسمانییە موسوڵمانەکانەوە ساڵی (١٤٥٣). ئەو هونەرە چەرخێکی گەورەی شارستانیی بەسەر ئەوروپاو ئاسیاو ژووروی ئەفریقادا بەگەڕ دەخاتەوەو لەرووی تەلارسازیی‌و فیگورو لەلایەکی ترەوە کەلەپوری هێلێن لە هەموو خۆرئاوادا بڵاو بوو بەتایبەتی لە ئەسکەندەریەو ئەنتاکیاو ئیفێزۆ. جگە لەوەی کە لە تورکیا کەلەپووری خۆماڵیی گران بەهاش کاری لەهونەرەکە کردبوو.

کەواتە هونەری بیزەنتینی لەنێوان سەدەی چوارەم‌و شەشەمدا دەگەشێتەوە بە تواندنەوەی هونەری کلاسیزمی (گرێك - رۆمان) (کە بەرەو ئابوتی دەچێ) لەگەڵ هونەری خۆرهەڵاتیی کە زیندووە. ئەمەش بەو شۆرش‌و گۆڕانکاریانەی کە کەمەسیحیی‌یەکان بەرپایان کرد لە ئاستی شارستانیتی هێلێن - رۆمانی بەڵام لەلایەکی ترەوە خۆیان بە ئاسانی هونەرە میتۆلۆجیەکەی ئێران‌و میزۆپۆتامیا دەزانن. وەکو هونەرێکی توێکلاویی **allegorico** بەتایبەتی گوومەزو



ئەستانبوڵ. مزگەوتی سوڵتان سلێمان. لەلایەن ئەندازیاری عەرەبی (سینان) دوای گەوتنی شاری کوستنتینپۆڵی (ئەستانبوڵ) لەسەر نەخشەی کەنیسەی سان سونیای بیزەنتینی دروست کراوە بەگومەزێکی گەورەوە لەناوەڕاستدا.



مزگەوتی سەلیمی دووەم. سەلیمیە ١٥٧٠ز. گومەزێکی گەورە لەناوەڕاستدا لەسەر هەشت پایەی گەورە ڕاوەستاوە. لەسەر بناغەی هەشت گۆشە





کەنیسەی سان ئیرێنێ لەئەستەنبوڵ ساڵی ١٥٣٢ز دیوی دەرەوەو ناوەوە کۆنترین کەنیسەیە لە ئەستەنبوڵ کە گومەزدارە.

پەرستگاکانیان. کە ئەمان بە ئاشکرا دەیانویست تێکەڵاوی هونەرەکەیانی بکەن. لە هەمووی گرنگتر ئەو ڕەوشتە کەسایەتیانەی کە لە گیانی مەسیحایەتییەوە هەڵدەقوڵا، بۆ گەیاندن و فێرکردنی ئۆرتۆدۆگسی و پێگەیاندنی ئیمپراتۆریەتیی مەسیحی.

پێویست ناکات بڕوامان وابێت کە هونەری بیزەنتینی یەك شێوە دەربڕینی هەبێت بۆ لێکدانەوەیژیان. کە تا هەتایە هەر لەجێی خۆی بخولێتەوە. بەڵکو ئەولەکاتی تەنگانەدا ئامادەیە خۆی بگونجێنێ لەگەڵ کولتورەکانی دیکەیشدا وەکو هەموو چەرخە گەورەکانی تری ژیان. تا لە کاروان جێنەمێنێ. بۆیە کەڵك لە هەموو ئەو کولتورانەی ناوچەکان وەردەگرێ لە خزمەتی خۆیدا، ئەگەرچی ئەو کولتورانە لە ڕیشەدا لەگەڵ ئەمیشدا ناگونجێن وەکو (کوردی و ئەرمەنیی و کیپتیی و جۆرجی و گرێکی و).

هونەری بیزەنتینی زۆربەی وڵاتەکانی ڤینیسیا و سیچیلیا و نیمچەدورگەی بەلقان (ئەلبانیا و بولگاریا و یوگوسلافیا و ڕۆمانیا و ئاسیای

# وێستگەکانی سەردەم













- کامۆ لای رووناکبیرە جەزائیرییەکان
- خواو یاسای دڵ
- گرۆتۆڤسکی مرد
- فڕین بەشێوازێکی دی
- ئیشکالیەتی چەمکی کۆمەڵگای مەدەنی
- دنیای شتە بچووکەکان
- مارا — ساد
- خوان
- شۆڕش یا ریفۆرم
- سارتەرو سیناریۆی فیلمێکی سینەمایی لەسەر فرۆید
- ئیلیا کازان و دووەمین خەڵاتی ئۆسکار



# کامۆ

# لای روناکبیره جەزائیرییەکان

و. لەفەرەنسی‌یەوە

ئارام سەعید

رەشید میمونی نوسەرو ئەدیب کەرەخنەگرێکە لەگروپە ئیسلامیەکانی جەزائیر رۆماننوسێکی بەناوبانگی ئەو ولآتەیەو نزیکیی خۆی لەگەڵ کامۆ ئەگێڕێتەوە.

گۆڤاری لۆپوا (LE POINT): بۆ یەکەم جار کەی ئەلبێر کامۆت خوێندەوە؟

رەشید میمونی: ٢٥ ساڵ لەمەوبەر رۆمانی (نامۆ)م خوێندەوەو هێندەی چاپکردنی یەکەم رۆمانی خۆم کەلەفەرنسا چاپ کرا بەلامەوە گرنگ بوو، رۆمانەکەم کەناوی (روبارەکە ئاراستەی خۆی گۆڕی)ە بەبەرهەمێکی کامۆیی‌یانە وەسف دەکرێت... لای من ئەلبیرکامۆ نوسەرێکی زۆر رەسەنە.

(گ.ل): بۆچی؟

ر. میمونی: لەبەر ئەوەی پێم وایە لەهەستی بێهودەیی‌دا بەرامبەر بارودۆخی مرۆیی‌و جیاوازی‌و ناکۆکیەکانی مرۆڤەکان لەگەڵیدا هاوبەشم، پێم وایە ئەیزانی بەباشترین شێوەو جیا لەهەموان گوزارشت لەشتەکان بکات‌و شیعر ئامێزی ئەو مەسەلآنە ئاشکرا بکات.

(گ.ل): ئایا ئەلبێر کامۆ لەخوێندنگاکانی جەزایر دەخوێندرێت؟

(ر.م): کامۆ نەك تەنها لەزانکۆکانی جەزایردا بەڵکو ئەو نوسەرەیە کەهەموو ولآت‌و زمانەکانی سەرسام کرد، ئەمە جگە لەوەی زۆربەی بەرهەمەکانی لەجەزایربوون.

(گ.ل): لەوێ چۆنی لێدەڕوانن؟

(ر.م): بەگەورەیی... هەندێك هەر لەسەرتاوە ئاستی نوسەریی وەردەگرن‌و پێیان وایە یەکێکە لەشەخسیەتە گەورەکانی ئەدەب لەجیهاندا. هەندێکی دی سەرنجی هەڵوێستە سیاسیەکانی دەدەن بەتایبەتی لەسەردەمی شەڕی جەزایردا کەپێیان وایە هەڵوێستی زۆر روون‌و ئاشکرا نەبوە. جەزایریەکان یان (عەرەب) زۆر نیگەرانن لەوەی لەرۆمانە سەرەکیەکانیدا حوزوری زۆریان نەبووە، کەخۆی تیایدا ژیاوە... زۆرینە بەو شێوەیە سەیر دەکات کەرۆمانێك باس لەئەفریقای باشور بکات بەبێ‌ئەوەی ئاماژە بەرەش پێستەکان بکات..

(گ.ل): ئایا کامۆ سەرچاوەیەکە بۆ روناکبیرانی جەزایر؟

(ر.م): هەرچەندە بەراستەوخۆیی باسی لەکێشەی جەزایر نەکردوە بەڵام راستیشە بڵێین ئەو گفتوگۆیانەی لەبەرهەمە سەرەکیەکانیدا وروژاندوییەتی تائێستاش پەیوەندیان بەئێمەوە هەیە، لە (مرۆڤی یاخیبوو)دا پرسیاری ئەوەی وروژاندوە کەپاساو بۆ کوشتن ئەهێنێتەوە، ئەمڕۆ لەجەزایردا چەندین بێتاوان ئەکوژرێن، لە(تاعون)دا دەمانگەیەنێتە ئەوەی توشی گومانمان کات لەوەی شەڕ بەهێزترە یان خێر.

(گ.ل): لەساڵی ١٩٥٦ دا کامۆ پێشنیاری پرۆژەی ئاگربەستی مەدەنیکرد، هەموو ئەو عەرەبو فەرەنسیانەی بانگهێشت کرد کەتا ئەو کاتەش ئەیانتوانی دیالۆگ بکەن... ئایا ئەوە هیچ دەنگدانەوەیەکی هەبوو...؟

(ر.م): ئێستا ئەوانەی لەخانەی روناکبیراندان دابەش بوون بەسەر یوتوپییەکان و ئەوانەی ئەیانەوێت بڕوا بەو ئەگەرانە بکەن کەناوبژیوانی نێوان خاوەنی دوو بیری جیاواز ئەکرێت، بەڵام کێشەکە لەوەدایە کاتێك دەیانەوێت دیالۆگ لەگەڵ ئەوانیدی بکەن، ئەوان تەقەیان لێئەکەن ئەمە ئەوەیە کەئێستا لەجەزایردا روودەدات، ژمارەیەکی زۆر لەروناکبیرە فەرەنسییەکان کەلەسەردەمی خەباتی ئازادیدا بانگهێشت کران بۆ دیالۆگ لەگەڵ روناکبیرانیتردا رووبەرووی کوشتن دەبونەوە.

(گ.ل): هەمووان ئەو ووتە بەناوبانگەی کامۆمان بیستووە لەوەڵامی خوێنکارێکی جەزایریدا کەدەڵێ (من بڕوام بەدادپەروەری هەیە بەڵام بەرگری لەدایکم دەکەم لەبەردەم دادگادا) ئایا ئەو رستەیە هیچ کاریگەری لەسەر ئێوە هەبووە؟

(ر.م): ئەو رستەیە کەکامۆ پاش ووتارەکەی لەکاتی وەرگرتنی خەڵاتی نۆبڵ دا لەستۆکهۆڵم رایگەیاند جەزایرییەکانی زۆر بێئومێد کرد... پێم وایە ئەوەش راست نییە بکرێتە بنێشتە خۆشەی سەر زمان کەئێمە چەندین ووتەی ترمان لەبەردەست دایە؟ بۆ نموونە کامۆ ئەیوت (گەر پارتێك هەبێتو ئەندامەکانی دڵنیا نەبن لەوەی خۆیان خاوەنی راستین ئەوا من دەچمە ئەو پارتەوە.) کامۆ لەلای ئێمە بەبنەرەتی ماوەتەوەو نوسەرێکە ناتوانین دەستی لێهەڵگرین، چونکە جورئەتی هەبوو گومان بکات هەموان لەسەر بۆچونەکانی ناکۆکن.

### کامۆو سیاسەت:

( کامۆ حەزی بەسیاسەت نەئەکرد) ئەم ووتەیە ژینێڤ گێران لەنوسینێکدا لەسەر کامۆ دەربارەی کتێبی (پۆرترێتی کامۆ لەهونەرمەندەوە بۆ هاوڵاتی، فرانسوا بوران) نوسیویەتی. بەڵام سیاسیەکان خۆیان کامۆیان خۆش ئەویستو ووتەکانیان دەخواست.

میشێل رۆکار، فیلیپ سێگوین، تەنانەت شارلس باسکا ئەیانخوێندەوە ووتەکانیان دەخواست،لێرەوە ئایا ئەتوانین بڵێین لەناو سیاستتمەداراندا نەوەیەکی کامۆیی هەبووە؟

بێگومان کامۆ سەرچاوەیەکی گەورەی هێزو کارکردن بووە؟ بەشێوەیەك سیاستمەدارانی سەرسام کردبوو؟ لەدژی فاشیزمو کۆمۆنیزمی سەرکەوتوو، ئازارەکانی جەزایر بووە. لەزریانەکانی ئەم سەدەیەدا دووربو لەهەڵە گەورەکانی دێوەرە ترسنۆکەکان. پاش موغازەلەیەکی کورتو لەگەڵ یەکەم هەنگاوی کتوپڕی دۆگمایانەیاندا، دەستی لەپارتی کۆمۆنیست هەڵگرت، لەبەرامبەردا ئەفریقای باکوری بەجێهێشتو بەرەو فەرەنسا بەرێکەوت. لەساڵی (١٩٤٠)دا پەیوەندیکرد بەهێزەکانی بەرگری فەرەنساوە بەبێئەوەی بکەوێتە پەرستنی ستالینیزم.

ئەو گەڕانەوەیە بۆ کامۆ وەك ژان دانیاڵ لەسەر (سەردەمی دابڕانەکان) گراسێی نوسیویەتی تاوانبارکردنی مێژووە... رەتکردنەوەکانی، بێدەنگییەکانی، گومانەکانی، لەسەردەمی خۆیدا بەترسنۆکی و ئاڵۆزی لەقەڵەم ئەدرا، ئەمڕۆش باس لەبلیمەتیو سەرکەوتوویی ئەو لەپاش مردنی ئەکەن.

لەستۆکهۆڵم ووتی دایکی پێباشترە لەدادپەروەری، ئەمەش لەساڵی ١٩٥٧دا بەخیانەتی کۆمەڵایەتی ناوبراو لە ١٩٩٣دا بەهیومانیزم.

سەرچاوە:

LE POINT NUMERO 1091
14 AOUT 1993

# خواو یاسای دڵ

و: موەفەق دەرگەڵەیی



ئـــەمڕۆ کـــە ڕۆژی (١٤)ی فێبریوەریـــەو (ڕۆژی دڵان)[1] ە، (١٠) ساڵ لەمەوبەر دڵی منیـان لەخـەم ئـاڵاند، منیـان خسـتە بەردەم دووڕیانێك، ئایا بێدەنگ بم بەرامبـەر بەسیاسـەت (کـە بـە دڵخۆشیەوە ئەمـەیانم دەوێـت) بەڵام بێدەنگیەکی ناچاریشە، یان قسـە بکـەم و دەیشترسـم جیـهان چیتر گوێم لـێ نـەگرێت کە مـن بـەزمانی ڕاسـتەقینەی ئـەدەب دەمـەوێت چی بڵێم. بـەم جـۆرە ڕەنگە یارمـەتی خۆمم دابێت کە (سـەلمان)ی ڕاستەقینە لەپـەنای ئـەو تەنگژەیـەدا بشارمەوە کـە بەهەرای (ڕوشد)یان ناوزەدکرد.

من دوو ژیانم هەیە، یـەکێکیان تێکشکاوی و قـین و مێژوویـەکی شێواوە کە پێم وایە بەداخـەوە هـەرگیز کۆتـایی نایـەت، ژیـانێکی تریش کـە خۆشەویسـتی تیـا دەکەم، خۆشیان دەوێم، ژیانێکە کە تیایدا لەبەڕێوەبردنی کـارمدا ئـازادم، ناتوانم یـان ڕێگا بـەخۆم نادەم کە کۆتایی بەهیچ یـەك لـەم دوو ژیانە بهێنم، چونکە ئـەوەی زیانی تیا دەکات هـەر منـم کـە هەردووکیانم لەدەست دەچێت.

دەمـەوێت بنـاخفم، چونکـە لەساڵڕۆژدا هەموو کەسێك حەز بە قسـەکردن دەکـات. ئەگـەرچی سـوپای کۆنـە پـەرسـتانیش لەشوێنێکی تـر دەپـەیڤن، لـێیان گـەڕێن بادەهۆڵی خۆیان بکوتـن، من باس لەگرنگی بابـەتی ئـەدەب دەکەم.

بۆ ئەو پرسیارەتان کە لەم دە ساڵەی ڕاوەدونـراوم چ کـارێکی کردۆتـە سـەر نووسـینم مـن وەڵامێکی سادەم هەیە. ئـەوەیش ئەوەیە کە چاوەڕێی کۆتاییـەکی بەختیارانـەم. ئـەو هێرشـە ئاشکرایانەی کرانـە سـەر مـن هەست و میزاجمی چاکـتر کـرد، بـەڕای خـەڵکانێکی زۆرەوە دوا کتێبم خۆشـترین کتێبم دەبێت، بەڵام تەنانەت ئەم وەڵامەیش زۆر ورد نیـەو بـەرەو قوڵایـی چـەند پرسیارێکی ترمان دەبەن. چۆن بۆ یەکێکی تر باس لەهەستی خۆم بکەم لەوکاتـەدا کـە هەڕەشـەی توندوتیـژم لـێ دەکرێـت؟ وەك ئـەوە وایـە دەوری ماڵەکـەت بگـیرێت و هـەموو شـتێکیش بەردەستت تێکوپێك شکێنرابێت. ئەوان کـاتێك دێنـە سـەرت کـە لـەئارەزوو شـکاندنداتیت. یـان ڕوتیت و خۆت دەشۆیت یان لـەخۆ بەتاڵ کردنەوەدایت. یان نوقمی تێڕوانینی ئەو ڕستانەیت کە هـەر ئێستا نوسیوتن. تۆ لەم حاڵەتـەدا ناتوانیت خۆت بشۆیت. یان ماچێ بکـەیت. یـان خـۆت بـەتاڵ بکەیتەوە. یان بنووسیت. تۆ لە خەیاڵی ئەوەدایت کە ئێستا یان کـەمێکی دی دێنـە سـەرت و

پەلامارت دەدەن.. هەرگیز! بەڵام هەر دەیش بێت ئەو کارانە بکەیت.

نازانم چۆن باسی ئازارەکانم بکەم. چۆنیان وەسف بکەم! وەك تەزوویەکە بەلەشتا. تەزوویەك نات کوژێت بەڵام سەرو دڵت تێك دەداو ئازارت پێ دەگەیەنێت، لەمرۆڤێکی لەش قورسی لەپەلو پۆ کەوتو دەچیت. بۆ نموونە ساتێکی ژیانی (ئینتەرنات)[2]ی قوتابخانە کە لەخەو هەڵدەستم هەست دەکەم ناتوانم لەسەر تەختی نوستنەکەم جوڵە بکەم. دەستم. قاچم. سەرم ئەوەندە گرانبوون هەر مەپرسە. بێگومان کەس بڕوام پێ ناکاتو هەموو قوتابییەکان دەست بەقاقای بەپێکەنین دەکەن، برسێتی نووسەرێك هەویەکەیەتی. هەر لەوێوە شیرینیو خەونە راچڵەکیوەکانی سەرهەڵ دەدەن. لەسەر کارەکەی سوکایەتی پێ بکرێتو بەردەوامیش دەنگی خۆی بۆ ئەدەب بەرزیکاتەوە. بۆ ئازادیی تەواوی سەر زەمین بەرزترین هونەر ئەو گەشتە روتەیە کە بەناو سروشتی بێ سنووری مرۆڤدا دەیکەیت. ئەمە خەباتێکە دژی دوگم. بۆ ئەو هەستە نەترساوەی دەیانەوێت قەدەغەی بکەن.

لەماوەی ئەم ساڵانەدا چەندین کەسی ئازام بینیوە کە خەبات بۆ ئەدەبێکی ئازاد دەکەن. ئەوانە زۆریان دڵ داومەتەوە. هەر لەماوەیەکی کورتی لەمەوبەردا بوو بەشداریم لەبڕینی شریتی کردنەوەی بارەگایەکی ئەدیبانی تاراوگە لە (مەکسیك) کرد کە زیاتر لە (٢٠) شار بەشداری پرۆژەکەیان کردبوو. شانازی بەوەوە دەکەم کە دەتوانم یارمەتی ئەوانە بدەم کە لەبەردەم فشارو پەلاماردان. هەروەها بێ سێو دوو بەردەوام دەبم لەو خەباتەدا کە لەبەرم گرتووە. بڕیارێکە بەخۆمم داوە ئەوە بسەلمێنم کە ئەدەب لەو هێزانە بەهێزترە کە هەڕەشەی لێ دەکەن. باشترین پارێزگاری کردنو بەرگری لە ئەدەب بەردەوام بوونە لەنووسینی سەربەرزانەدا. ئەزانم نووسینەکانم گۆڕاون. زیاتر بەرەو رەگ دەگەڕێنەوە. خەون بەدەرچوونەوە دەبینن. لەهەمان کاتدا لەدوولاوە لەنێوان مۆرکی خۆمو دەرەوەی مندا شەڕ دەکەن.

ئێستا من یەکم خستونەتەوە. لەنێوان ئەوانەی لەویستی ئازادا لەدایك دەبنو ئەوانەی نابنە سیمای بیری من، نیشتمانی هونەری من وەك شێوەیەکی بێ ئاڕاستە کراوو رۆژهەڵاتێکی دوور وایە.

ئەوە کتێبەکانی منن لەسەر مێزە خۆشەویستەکان دانراون. لەتەنیشت تەختی خۆشتندا. لەمەلەوانگەدا. یان لەبەر چرای تەختی نوستندا کە تاقە ماڵی منە. رەنگە ژیان بێ بەزەییانەو پڕ گیروگرفت بێت. بەڵام رۆژی دڵان بەبیری هێنامەوە کە چەند سەختە بیرەوەری ئەو ساڵانەی دڵمیان رەوانەی تاریکی کرد، ساڵی (١٩٨٩) تەکانێکی دایە من، تەکانێکی خۆشەویستیو دژوەستان، ئەو خۆشەویستیە زیاترو زیاتر وام لێ دەکات کە بەهای نووسینم لابەزختر بێتو دەربارەی شتی بەنرخ بنووسم. لەژیانی خۆمدا جگە لە کتێبە تازەکانم. نەخشەکانی ئایندەم هیچی تر شك نابەم. ئەو وێنانەم خۆش دەوێت کە هەموو دڵە ئەویندارەکان پەی بەساتە ئاڵۆزەکانی ژیان دەبەن لەو جیهانە واقیعیەدا. لەکاتێکدا کە جیهان بەبینینی گەشانەوەی خۆشەویستی لەشەقامەکانیدا زیاترو زیاتر خۆی دەوڵەمەند دەکات.

پەراوێز:

(١) رۆژی (١٤) فیبریوەر لەهەموو ئەورووپاو ئەمەریکاو ئوستralیاو کەنەدادا بەڕۆژی دڵان ناسراوە. لەو رۆژەدا خەڵکانی ئەویندار کەسانی دی دیاری سیمبولێکی دڵ بۆ خۆشەویستەکەیان یان کەسە دڵسۆزەکانیان پێش کەش دەکەن -و-

(٢) قوتابخانەی ئینتەرنات ئەو قوتابخانانەن کە بەشی تایبەتیان بۆ ژیانی قوتابیان هەیە. هەروەها قوتابیانی بێکەس و بێ دایكو باوکیش لەو قوتابخانانەدا دەژین -و-.

● ئەمە دەقی نامەیەکە کە (سەلمان روشدی) بۆ ئەو ساڵڕۆژەی نووسیوە.

لەرۆژنامەی Afton bladet (ئەفتۆن بلادێت)ی سویدیەوە کراوە بەکوردی.

# گرۆتۆڤسکی مرد!

دانا رۆوف – سوید

گرۆتۆفسکی مردو، یەکێك لە دەنگە هەرە گرنگەکانی شانۆ کپ بوو. بوارێکی مەزنی لێکۆڵینەوەو، دیدو هونەرێکی باڵاو بلیمەتی ریژی لەم سەردەمەدا لە کارکەوت.

گرۆتۆفسکی لە ١٤ی مانگی یەکی ساڵی ١٩٩٩ دا، دوای ٦٥ ساڵ تەمەن، لە ماڵە ساکارەکەی لە پۆنتیادێرەی ئیتالی بە نەخۆشی دڵو شێرپەنجەی خوێن کۆچی دوایی کرد.

لە پەنجاو شەستەکانی ئەم سەدەیەدا، گۆڕانکارییەکی گرنگی تێکرای ستركتوری شانۆی هاوچەرخی جیهانی دەگرێتەوە. تەوژمێکی نوێ راستەوخۆ کاردەکاتە سەر رەووتو بزوتنەوەی شانۆی ئەورووپی. گەنجێکی بلیمەت لە پۆڵۆنیاوە زۆر بەخێرایی هەنگاو دەنێت.

شانۆ شانۆی ئەکتەرەو، تەنها ئەکتەر لە چەقو سەنتەری دیدی شانۆدا گەوهەری هەموو شتەکانە.

لەو روانگەیەوە گرۆتۆفسکی لێکۆڵینەوە قوڵەکانی دەستپێدەکاتو، بۆ ئەو مەبەستەش گروپێکی ئەزموونگەری لە پۆڵۆنیا دادەمەزرێنێت.

مرۆڤ لەو تاقیکردنەوە قوڵە فەلسەفیە گرنگانەدا سەرچاوەیەکی فرە مەزنە. هاوکێشەیەکی پێکداچووی نێوان ئەکتەرو بینەرە. بینەران دەبنە بەشێکی گرنگی ئەو سرووتو مەشقە پڕ لە ژانەی گەمەیەکی فەلسەفەیو ئەبەدی.

هەوا، ئاو، زەوی، ئاگر. پێداویستیە گرنگەکانی مرۆڤو خولقاندنی گێتیو، سەرچاوە فەلسەفیەکانی کتێبە زۆر کۆنەکانی مرۆڤایەتیو، بوونیادی جیهان. خاڵە زۆر گرنگەکانی بیروهۆشی ئەو فەیلەسوفە گەورە شانۆییەیە.

ساڵی ١٩٦٨ بە کتێبەکەی ((شانۆی هەژار)) کیشوەرێکی تر بۆ دنیای شانۆ دەدۆزێتەوە.

پیتەربروك ریژیسۆری بەناوبانگی ئینگلیزی هەر لە سەرەتاوە ئاماژە بە مەزنی ئەم تەقەلایە دەکات. بروك لە پێشەکیەکی زۆر کورتی ((شانۆی هەژار)) دا دووپاتی ئەوە دەکاتەوە کە گرۆتۆفسکی دیاردەیەکی زۆر تایبەتە لە شانۆدا.

هونەری نواندن لە دیدێکی زۆر نوێوە دەبێتە بنەما هەرە گرنگەکانی بواری لێکۆڵینەوەو، مەشقو پراکتیکی گرۆتۆفسکی. جەستەی ئەکتەر دەبێتە تاکە ئامرازو دیدی شانۆیەکی زۆر تایبەتمەند.

گرۆتۆفسکی بە پێچەوانەی ئەنتۆنین ئارتۆوە ریژیسۆرێك بووە دیدو تێڕوانینەکانی تەنها تیئۆری نەبوون. بەڵکو بەردەوام هەوڵو تەقەلای ئەوەی داوە کە دیدو تێڕوانینەکانی لەبواری پراکتیکدا بەرجەستە بکات. ئەمە جگە لەوەی مامۆستاو راهێنەرێکی گەورەو بە سەلیقەو بلیمەتیش بووە.

بەلام هەردووکیان گەرەکیان بووە کە شانۆ بگەڕێتەوە بۆ سەرچاوەکانی هونەرێکی سرووت ئامێزی پیرۆز.

گرۆتۆفسکی بۆ بڵاوکردنەوەی بیرو بۆچوونە شانۆییەکەی، لە شەستەکانی ئەم سەدەیەدا بە شاکارە ئەزموونگەرییەکانی چەندین گەشتی بە سەراپای ولاتانی ئەورووپاو ئەمەریکادا دەکاتو، هەر زوو تەوژمەکەی دەبێتە دیاردەیەکی هەرە گرنگی شانۆی هاوچەرخی جیهانیو خۆشی وەك ریژیسۆرێکی بلیمەتی جیهانی ناسرا. گرۆتۆفسکی لە ساڵی (١٩٦٦) دا هاتۆتە سویدو شانۆگەری (Den Standaktige Prinsen ی Colderons) لە ستۆکهۆلم نمایش کردووە.

لە ساڵی ١٩٨٧ بەدواوە گرۆتۆفسکی لە کالیفۆرنیاوە دەگوێزرێتەوە بۆ شارۆچکەی (پۆنتیادێرە) لە ئیتالیا.

گرۆتۆفسکی لە پۆنتیادێرە سەرگەرمی لێکۆڵینەوەو، مەشقو هەلکۆڵینی بەردەوامی شانۆیی دەبێتو، لە دیدو بۆچوونێکی جیاوازترەوە بەردەوامی دەبەخشێت بە ئەزموونەکەی.

شانۆی هەژاری شەستەکان (کە دواتر لە هەشتاکاندا بە ئێمە گەیشت) لەم پانزە ساڵەی کۆتایی تەمەنی گرۆتۆفسکیدا وەرچەرخانێکی گەورە بەخۆوە دەبینێت. چەمکی ئەو شانۆ هەژارەی کە ئەمڕۆ ئێمە لە دنیای شانۆی خۆماندا دەیناسین،

پێناسەی ڕێبازو پرۆژەو دیدی گرۆتۆفسکی ناکات.

تۆماس ریتشارد کە سێ ساڵ تەمەنی لە گرۆتۆفسکی بچووکترەو، خەڵکی نیۆیۆرکە، نزیکترین هاوکارەکانی گرۆتۆفسکی بووەو، پێکەوە لەو لابورە شانۆییەدا کاریان کردووە کە بە (Art as vehicle) ئاماژەیان بۆ دەکرد. لەو لابورەدا هەردووکیان (گرۆتۆفسکیو تۆماس ریتشارد) پێکەوەو بە جیا لەگەڵ ئەکتەری زۆر گەنج کاریان کردووە.

Centroper la Sperimentazione ela Ricerca Teatrale ناوەندێکی شانۆیی ئەزموونگەری گرنگە لە ئیتالیاو، ئەوان لە ساڵی١٩٨٧ وە میوانداری گرۆتۆفسکی یان کردووە بۆ هەڵکۆڵینو کاری لابورە شانۆییەکەی. هەروەها ئەو ناوەندە بەر لە بیست ساڵ لە پۆنتیادێرە دامەزراوە، لە شەستەکاندا لە ژێر کاری ڕەووتی (شانۆی هەژار) دا کاریان کردووە. هەڵبەتە گرۆتۆفسکی سەرچاوەیەکی ڕاستەوخۆی پرۆژە ئەزمونکاریەکانیان بووە. ئەمە جگە لەوەی ئەو ناوەندە لە ساڵی (١٩٨٦) بەدواوە تاقیگەیەکی تایبەت بە پشکنینو پرۆژەو ئەزموونەکانی گرۆتۆفسکی دەکەنەوە بە ناوی Workcenter of Jerzy Grotowski .

گرۆتۆفسکی لە پۆنتیادێرەو، لەو لابورە نوییەیدا لەنێوان پێنج تا هەشت قوتابی وەرگرتووە کە تەمەنیان تەنها بیستو دوو تا بیستو سێ ساڵ بوون. ئەو قوتابیانەش شەشە ڕۆژ لە هەفتەیەکدا، بە شێوازێکی زۆر چڕو، بەلایەنی کەمەوە بۆ ماوەی یەک ساڵ کاریان کردووە. ئەو پرۆگرامەی کەکاریان لەسەر کردووە، وزەو توانایەکی زۆری گەرەك بووە.

هەچ قوتابییەکیش لە ماوەی ساڵی یەکمدا بە شێوەیەکی دڵخۆشکەر بەرەو پێشەوە چووبێت، ئەوا توانیویەتی دوو، سێ ساڵی تر، یاخود لە هەندێ حاڵەتی تایبەتیدا تا چوار ساڵ بمێنێتەوە. ئەزموونو وانەو مەشقی ئەو نێوەندە لە ڕوانگەی فۆرمێکی سەربەستەوەو بەڕێوەچووە.

گۆرانی، تێکست (چالاکیو وانەکانی ستانسلافسکی)و مەشقی جەستەیی/ فیزیکی/و، هەروەها مەشقی پلاستیکی گرنگترین چالاکیەکانی بەشی یەکەمی ئەو لابورە شانۆییە بوون. لایەنێکی تری کارەکانی ئەو لابورە لە دەرەوەی گۆرانیو ئەو چالاکیانەوەیە کە لەلای سەرەوە ئاماژەمان بۆ کرد.

بۆ نموونە هەڵکۆڵینو کارکردن بە شێوەیەکی زۆر قوڵ لە دابو نەریتی کۆنی ئەفرۆ ـ کاریبینی، کە گەلێکی هیندین لە باکوری ئەمەریکا. لەلایەکی دیکەوە بەکارهێنانی تێکستی زۆر کۆن کە لە تێکستە ئەنتیکەکانی میسر، سوریا، ئیسرائیلو گریکەوە وەریان گرتووە.

گرۆتۆفسکی نەیویستوە لەو لابورە شانۆیەدا هیچ جۆرە یاسایەکی تایبەت دەستەبەریکات. شانۆ جیهانێکی بێسنورە، ناکرێت لە چوارچێوەی ڕێبازو قوتابخانەی دەستنیشانکراودا بەند بکرێت. لەبەرئەوە گرۆتۆفسکی بواری ئەوەی نەداوە، ئەو کارەی ئەو دەیکات ببێتە دیاردەیەکی تایبەتی تاکە کەسانی تر دوای مردنی، ئەو فۆرمە بکەنە ڕێبازێکی دیاریکراوو پەیرەوی بکەن. گرۆتۆفسکی هەمیشی دووپاتی ئەوەی کردۆتەوە کە هەڵکۆڵینو ئەزموونگاریەت لە Art as vehicle پێویستە دوای مردنی گرۆتۆفسکی هەر بەردەوام بێت.

گرۆتۆفسکی لە ڕازێسرۆف لە پۆڵۆنیا لەدایك بووە. لە شاری کراکۆفو دواجاریش لە مۆسکۆ هونەری شانۆی خوێندووە. یەکەم جار وەکو ڕیژیسۆر لە ساڵی (١٩٥٩) دا بە شانۆیی (کورسیەکان) ی یۆژین یۆنسکۆ لە کراکۆف دەردەکەوێت. شانۆیی کورسیەکان دەبێتە بنەمای دەرکەوتنو پێناساندنی گرۆتۆفسکیەکی لاو.

دوای ئەوە هەموو پرۆژەیەکی ئەو لاوە کەم دووە دەبێتە جێگای سەرسوڕمانی بینەرو، ڕەخنەگرانو شانۆکاران. بەرئەنجامیش شانۆی هەژار لەدایك دەبێت.

گرۆتۆفسکیش وەك تاکە بلیمەتی ڕیزی ناوبانگی هەموو جیهان دەگرێت.


سەرچاوەکان:

١. ڕۆژنامەی (داگێنس نیهێتەر) بەشی کلتوری ڕۆژی ١٨/١/١٩٩٩.

٢. گۆڤاری ئێنترێ. ساڵی ٢٣، ١٩٩٦. گۆڤارێکی وەرزی شانۆییە.

تەنیایی، یەکێ لەسیفەتە هەرە دیارەکانی جۆناتانە، لەکاتێکدا قارەمانەکانی خەیاڵو واقیعی ئێمە ﴿بەئایینیو سیاسیو کۆمەڵایەتیو ئەدەبیشیانەوە﴾ بەقەڵەباڵغییەکی چڕ، دەستو پێوەندێکی زۆر و غولامو نۆکەری بێئەندازە چواردەوریان گیراوە. بەلام تەنیایی جۆناتان بەمانای دابڕانی ئەو لەگەڵە تێنەگەین، چونکە جگە لەوەی ئەو چاوێریکەرێکی وردی هەموو ئەو دیاردەو شتانەیە کەلەناو دەستەی نەورەساندا بەدیار دەکەون؛ بەهەمان شێوەش خۆدوێنەرێکی چوستە. کەهەموو دیاردەو بزاوتو یاسای هۆزی نەورەسان لەمۆنۆلۆگێکی چڕدا هەڵدەسەنگێنێ. کەواتە خۆدواندن سیفەتێکی ترە کەقارەمانێتی جۆناتان لەقارەمانانیتر جوێدەکاتەوە. ئەو لەتەنیاییەکانیا پتر لەهەر کاتێ شۆڕشگێڕترو سەرنجراکێشترو کەمدوو ترە.

کەمدوویی و مۆنۆلۆگ ئەو خەسڵەتانەن کەلەجیهانی عارفو موتەسەووفو لای پاڵەوانی نووسەرە گەورەکانی جیهان دووبارەدەبنەوە: ﴿دویستۆفسکی، پروست، ئۆنامونۆ...﴾ دووحاڵەتن لەسەفەری دەروونیا بۆ پەیوەندیکردنی نەفس یان ((خود)) بەخۆیەوە و، بۆ چڕکردنەوەی نیگای دەروون لەسەر هەستیی خۆی. بەلام مۆنۆلۆگ توانای ڕەوانبێژییو خوتبەدانی درێژخایەن کەمدەکاتەوە. ڕستەکان کورتنو بەماناو دەلالەتی هەمەچەشن بارگاوی بوون، بەجۆرێ کەبەتەنیا جارێ خوێندنەوەو گوێ بۆگرتن خۆیان بەدەستەوەنادەن. ئەمەش دەقاودەق بەپێچەوانەی ڕەوانبێژیو بەدەم و دوویی و قسە حازریی دنیای قارەمانی قەڵەباڵغەوەیە. کێشەی ئەم قارەمانەش ئەوەیە بەردەوام فڕێدەداتو لەبەرهەم هێناندا دەستەوەستانە. ئەو زۆر سەرسوورهێنەرانە لەساتی ((ئێستا))دا ڕاماندەگرێو بەحەپەساوی دەمانهێڵێتەوە، بەلام توێشەبەرەیەکمان بۆ هەواری داهاتوو ناداتێ. هێندەی دەیەوێ یەکمانخاتو لەقاڵبمان بدا، بوارمان بۆ نارەخسێنێ ئازادانە خەیاڵمان چالاك بێت.

کەواتە ئازادی دان بەخەیاڵ خەسڵەتێکی تری کاراکتەری قارەمانبوونە بەشێوە جۆناتانییەکەی. خەیاڵ بەرهەمهێنانی جیهانێکی ئازادە لەپێناوی خۆ دەربازکردن لەکۆنترۆڵی گەلەو دەستەی نەورەسان، تاریکستانێ نییە بۆ پەلەقاژێو سەرلێتێکچوون، بەڵکو نیشتمانێکە بۆ داڵدەدانی خودێتی لەبەردەم شاڵاوی دەستەدا، بکەرێ نەتوانێ خەیاڵکاتەوە نایشتوانێ بوونێکی سەربەخۆی هەبێ، وەکێشەی زۆربەی قارەمانە دینیو کۆمەڵایەتیو سیاسییەکان ئەوەیە کەناتوانن بایەخ بەخەیاڵ بدەن؛ هەر بۆیەشە بوونی ئەوان بوونێکە لەدوای بوونێکی ترەوە: (کتێبە پیرۆزەکان پەیمانو سەنەدەکانو بەرنامە سیاسییەکان).

جۆناتان نایەوێ لەودیو هیچ بوونێکی ترەوەبێت. ئەو دەیەوێ بوونی یەکەم بەدەست بهێنێ.

بەواتایەکیدی؛ ئەو شەیدای ئەزموونکردنو تاقیکردنەوەو فێربوونی هەموو ئەو هونەرانەیە کەدەشبێت هەر بوویەك لەماوەی عومری خۆیدا پێیان بگاو فێرببێ. هەر لەبەر ئەمەشە جۆناتان قارەمانێکە (دیسانەوە بەپێچەوانەی قارەمانە زەمینییەکانی ئێمەوە) بەتوندی دژ بە((نەمری))یە چونکە نەمری سیفەتێکە بەپێویست قارەمان راپێچدەکات لەژێر رکێفی شوێنو زەمان دا بمێنێتەوە. (ئەمەش ئەو حیکمەتەیە کە جۆناتان لەچیانگ-ی پیرە نەورەسەوە فێری دەبێت). (نەمربوون).

خۆزگەیەکی مەرگخوازانەیەو تەمەننای دەروونە بۆ لەناوبردنی

جەستەو کوشتنی مەبدەئی چێژ. دەروونی مەرگخواز ئامادەیی جەستە لەواقیع دا رەتدەکاتەوەو دەیکاتە پەیکەرێکی ووشك. بەڵام شەیدایی جۆناتان بۆ تاقیکردنەوەی بەردەوامو شکاندنی سنوورە دیارەکان، لەهەمان زاتیشدا ئامادەکردنەوەی جەستەیە لەواقیعدا، ئەو ژیان بەپانتاییەکی نەبڕاوەی ئەزموونو تاقیکردنەوەی تواناکانیو حەزەکانی دەزانێتو ناشیەوێت لەپاش مردنی لەبارەیەوە ((واتەوات بڵاویکەنەوەوبیکەن بەخواوەند)) چونکە ئەو تەنیا ((نەورەسێکە حەز بەفڕین دەکا))و هیچیتر...

تێکەڵبوونی جۆناتان لەگەڵ نەورەسە یاخییەکانیترو کۆکردنەوەیان، لەنیەتی بوون بەسەردارو رابەرو فەرمانداریکردنیانەوە نەهاتووە. چونکە وەکو پێشتر هێمای بۆکرا. جۆناتان سیفاتی ئەو کاراکتەرانەی زۆر بەکزی تێدانو چاوەڕێی ئەوەی لێناکری تەختێ داگیربکا!.. ئەوەی ئەو لەم هاودەمیی و نزیکبوونەوەیە چاوەڕێی دەکات، گۆڕینەوەی ئەزموونەکانە لەناو دەستەی نەورەسەکانداو کەڵەکەکردنی سەرمایەیەکی زۆرترە لەپێناوی فڕیندا بەشێوازێکیتر؛ نەك بەرهەمهێنانەوەی کەسێتی خۆی لەکەسێتی ئەوانیتردا. یاخود موتوربەکردنی خەسڵەتەکانی خۆی لەسەر پانتایی بوونی ئەوانیتر (کەدیسانەوە ئەمە سیفەتێکی دیاری قارەمانەکانی دنیای ئێمەیە). چونکە گەر ئەمەی بکردایە، ئەوا دەبووە دیکتاتۆرێ بەسەر خەیاڵو جیاوازییەوە. دەبووە سەردارێکی تری قەبیلەی نەورەسانو ئەرکی سەرەکیشی دوای تێربوونی چیکەڵدانەی، دەبووە پارێزگاریکردنی ئەو یاسایانەی پێشتر لێیان هەڵگەڕابوەوە!. بۆیە بەبارێکی تردا دەتوانین بڵێین: شۆڕشو یاخیبوونی جۆناتان شۆڕشێکەو لەپێناوی هێشتنەوەی جیاوازیداو رۆچوونێکە بەناخی ((خود))دا بۆ بەرگریکردن لەسەربەخۆیی خۆی. جائەگەر هەر حەزیش بکەین ناوێ بۆ جۆری قارەمانی جۆناتانی بدۆزینەوە، ئەوە من پێشنیاری ئەوە دەکەم ئەو ناوە ((قارەمانی ئاگایی)) بێت؛ چونکە تەنیا دۆزینەوەو گەیشتنە بەئاگاییەکی جۆناتانی کەرزگارماندەکا لەدنیای پڕ فریوی قارەمانانی ئەمڕۆ.

پێموایە هەر ئەمەشە بۆتە ئەنگیزەی هاوڕێی پڕکارو بەڕێزم ﴿ئازاد بەرزنجی﴾ تا بوارمان بۆ برەخسێنێ لەڕێگەی زمانی کوردییەوە بەدنیای جۆناتان ئاشناببینو بەخۆماندا رۆچین؛...

بۆچینا؟ رەنگە فێربین بیر لەشێوازێکی تری فڕین بکەینەوە.

إشكالية مفهوم المجتمع المدني

«النشأة - التطور - التجليات»

د. كريم ابو حلاوة





# ئیشکالیەتی چەمکی کۆمەڵگای مەدەنی

ئا/ ئاسۆ جەبار

چەمکی کۆمەڵگەی مەدەنی هەر لەمێژەوە تا ئێستا جێی چەندین مشتومڕی گەورە بووە، هەر لەدوای دروستبوونی دەوڵەتی نەتەوەوە کۆمەڵگاکان خوازیاری شێوەیەک لەشێوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی بوون. هەر لە یۆنانەوە ئەم چەمکە بەشێوەیەک لەشێوەکان جێی وتووێژێکی بەرفراوان بووە لەنێو فەیلەسووفەکاندا.. بیرمەندو فەیلەسووفەکانی جیهان، مەعریفییەکان، کۆمەڵناسەکان ئەنترۆپۆلۆژیستەکان هەمەیشە لە لێکۆڵینەوەو راڤەکردنی بەردەوامی ئەم بیرۆکەیەدا بوون.

کتێبی (ئیشکالیەتی چەمکی کۆمەڵگەی مەدەنی) لەنوسینی نووسەرو بیرمەندی عەرەب (دکتۆر کریم ئەبو علاوە)یە.. ئەم توێژینەوە مەعریفیەیەی بەدیووە شاراوەکانی چەمکی کۆمەڵگای مەدەنی دەبات، لەم کتێبەدا باس لەسەرەتاکان و جێبەجێ کردنەکان و گەشەسەندن و پەرەسەندنی ئەم چەمکە دەکات.

بیرمەندی فەرەنسی بەرەچەڵەک جەزائیری (جیۆڤانا تەنزەرێلا) لەمەڕ کۆمەڵگەی عەرەبی پرسیارێك دێنێتە کایەوە ئەویش ئەوەیە: (ئایا کۆمەڵگەی عەرەبی خوازیاری شێوەیەك لەشێوەکانی کۆمەڵگایەکی مۆدێرن هەیە یان نا؟).

هەر لەم گومانەی (تەنزەرێلاوە) وەك هەموو بیرمەندە عەرەبەکان بەچەند گرفتێکی گەورەی مەعریفییەوە دەناڵێنن: وەك جیهانگیری و کۆمەڵگە پەراوێزەکان. لەبەریەك هەڵوەشانەوەی سیستەمی ئایدیۆلۆژی جیهان، گرفتەکانی

تازەگەریو نوێخوازی، پێکهاتەی کۆمەڵگەی عەرەبی، پرسیارو گومانە جیدییەکانی بەر لەتازەگەریو دوای تازەگەری، پەرەسەندنی بزووتنەوە توندڕەو مەزهەبییەکان، فاشیزمی عەرەبیو خێڵەکایەتیو سەنتەرگەری دەوڵەتو گرفتەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی...

نووسەر سەرەتا بەمیتۆدێکی مێژوویی مەعریفی دەستپێدەکات لەپێناو پشکنینی مەودا زەمەنییەکانی مێژوو وەك گەشەسەندنی سیاسیو ئابووریو دەسەلات.. وەك لەبەشی یەکەمی ئەم کتێبەدا.. باس لەسەرەتاکانی دروستبوونی کۆمەڵگەی مەدەنی دەکاتو دەڵێت: (سیستەمی سیاسی کۆن بەتەواوەتی جەختی خستبووە سەر حەقی خوایەتی میرنشینەکانو دەسەلاتی رەهاو پیرۆزیی (دینیو سیاسی)،و زۆرینەی کات دەسەلاتی دینیو سیاسی هاوئاهەنگ بوونو بەیەکگرتوویی لەنێو قۆناغە مێژووییەکانی ئەورووپادا دەسەلاتیان هەبووە، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا بەریەککەوتنو ململانێیەکی بەرفراوان لەکۆنەوە تائێستا لەنێوان دینو سیساسەتدا هەبووە).

لەبەشی دووەمی ئەم کتێبەدا کۆمەڵگەی مەدەنی لەنێو دەقەکانی هیگلو مارکسو گرمشیدا بەشی هەرە گرنگی ئەم لێکۆڵینەوە مەعریفیە ئەو پێشهاتە فەلسەفیە راڤە دەکات کە مەجرایەکی گەورەیی وتووێژو ململانێی مەعریفی بووە لەفەلسەفەی میتافیزیکەوە هەتا پرسیارە جوداخوازەکانی (مارکس)و مارکسیەتو دواجاریش بەرێگەچارە رۆشنبیرییەکانی (گرامشی) دەروازەیەکی تر واڵا دەکات لەچەمکی کۆمەڵگەی مەدەنی.

لەدوا نووسینی نوسینەکانی (هیگل)دا ئاوا باس لەپێکهاتی سیستەمی کۆمەڵگەی مەدەنی دەکات:

کۆمەڵگەی مەدەنی پێکهاتووە لە:

١. سیستەمی پێداویستیەکان.
٢. رێکخستنی دادگاو دادوەری.
٣. دامو دەزگا پیشەییەکان.

بەلام چەمکی دەسەلاتی رەهای دەوڵەت لەلای (هێگل) مەجرای کۆمەڵگەی مەدەنی دەبات بۆ نێو پانتاییەکی چەق بەستوو.. بەلام وتوێژێکی بەرفراوان بەرهەم دێنێت، هەر بۆیە (مارکس) لەدەروازەیەکی ترەوە چەمکی کۆمەڵگەی مەدەنی دادەرێژێو لەگۆشەنیگای مارکسەوە ئایدیۆلۆژیا باڵادەست دەبێتو لەنێو ململانێی ئابووریو سیاسی وەك لەکتێبی (ئایدیۆلۆژیای ئەڵمانی)دا زیاتر روون دەبێتەوە.

(گرامشی) مانایەکی تازەی بەخشیە چەمکی کۆمەڵگەی مەدەنی. بەبۆچوونی (گرامشی) کۆمەڵگەی مەدەنی پێکهاتووە لەکەشو هەوای پێشبڕکێی ئایدیۆلۆژییەکان.

بەبۆچوونی (گرامشی) ئەگەر کۆمەڵگەی سیاسی فەزایی کۆنترۆڵ کردنی سیاسی بێت بەهۆی هێزو دەسەلاتەوە، ئەوا کۆمەڵگەی مەدەنی فەزای مەژیوونی رۆشنبیی ئایدیۆلۆژییە، لەم کتێبەدا قۆناغە مێژووییەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی مشتومڕێکی گەورەی مەعریفی بەرهەم دێنێت.




# دنیای شتە بچووکەکان

ڕێبین هەردی

دنیای شتە بچووکەکان دوا کتێبی برای ڕۆشنبیر (ڕێبوار سیوەیلی)یە کە دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم لەزنجیرەی بڵاوکراوەی کتێبەکانیدا بڵاوی کردۆتەوە. ئەم کتێبە گەرچی لەچەند وتارێکی جیاواز پێکهاتووە کە نووسەر لەبۆنەو بواری جیاوازدا نوسیونی، بەڵام دەتوانین هێڵێکی ستراتیژی ببینین کە هەر هەموویان کۆدەکاتەوە: بیرکردنەوەو نوسین لەسەر ئەو وردە شتانەی لەمێژووی نوسراودا، ناویان نایەت. ناوی کتێبەکە (دنیای شتە بچووکەکان) هەر لەسەرەتاوە ستراتیژی کتێبەکە ئاشکرا دەکات؛ نوسین لەسەر ئەو دیاردەو روداوو شتە بچووکانەی کە سەرەتا وادێنە پێشچاو کە گرنگ نین بەڵام ڕێبوار لەگرنگیان دەدوێت.. راوەستان لەسەر ئەو خاڵانەی کە بەئاسانی بەلایاندا دەڕۆین.. بەڵام ڕێبوار لەسەریان دەوەستێت و لێیان ورد دەبێتەوە.. گەڕانەوە بۆ ئەو شوێنە فەرامۆشکراوو روداوە بیرچوانەی لەئاسۆی مێژووی نوسراودا بەهایەکیان بۆ دانانرێت. بەڵام ڕێبوار لەبەهاو نرخیان دەدوێت. ڕێبوار بەم شێوازەی نیشکردن دەیەوێت پێمان بڵێ ژیانی کۆمەڵگاکان و ئەوەی پێی دەڵێین مێژوو بەتەنها ئەو روداوو

بەسەرهاتانە دروستی ناکات کە لەئاستی سیاسی یان تەنانەت روداوی کۆمەڵایەتی گەورەدا، دەردەکەون. بەڵکو زیاد لەپێنت و زیاد لە سەرچاوەیەکی کاریگەریمان لەسەر ژیانی کۆمەڵگاکان و مێژوو هەیە. مێژوو چەند بەسەرهاتی شۆرشەکان و سەرەولێژ بوونەکانی دەسەڵات و جەنگە خوێناویەکانی دروستی دەکات، هێندەش لەبەسەرهاتی کاریگەری ئەو ئامێرە تەکنیکە بچوکانەوە دروست دەبێ کە لە رۆژگاری تازەدا هێرشیان بۆ ناو واقعی ئێمە هێنا. رێبوار بۆ خوێندنەوەی کۆمەڵگاکان یان مێژووی کۆمەڵگاکان بەسەرهاتە ئابوری و سیاسی و تەنانەت فکریە مەزنەکانی واز لێ دێنێ و لەو جوڵەو بزاوتانەدا دەیدۆزێتەوە کە لەسەر جەستەی مرۆڤ ئاشکرا دەبێت. چونکە دواجار مێژوو یادەوەریەك نیە لەهوشیاریدا هەڵمانگرتبێ.. روداوێك نیە بیرمان نەچوبێتەوە.. سیفەت و خەسڵەتێکی روحیش نیە کاری لەدەرونمان کردبێت بەڵکو لەهەموو ئەمانەش زیاتر ئەو وشەو رەفتارانەیە کە لەسەر جەستەمان دەنوسرێنەوە.. مێژوو چەند لە روداوە سیاسیەکانەوە دەخوێنرێتەوە هێندەش لەدیسپلینی جەستەو نیگاو رەفتارە بچوکەکانی مرۆڤیشدا، رەنگدەداتەوە.. واتە مێژوویەکمان نیە لەهەمان کاتداو بەشێوەیەك لەشێوەکان دیسپلینی جەستەی نەکردبێ و جوڵەو رەفتارێکی دیاریکراوی پێ نەبەخشی بێ.

لێرەوە هەموو خوێندنەوەیەکی مێژوو بەبێ خوێندنەوەو ئاشکرا کردنی ئەم لایەنە گرنگانەی کارتێکردنەکانی مێژوو، خوێندنەوەیەکی فەقیرە.. چونکە دواجار هەموو هەوڵێك بۆ گۆرانی مێژوو بەبێ ئازادکردنی جەستە لەو دیسپلینکردنانە، کارێکی ئەستەمە. گۆران ئەو ساتەوەختە نیە کە دەمەکان بەشێوەیەکی دی قسە دەکەن و دروشمێکی دی بەرز دەکەنەوەو مژدەو بەڵێنێکی دی دەدەن.. بەڵکو گۆران ئەو ساتەوەختە دەست پێدەکات کە شێوازێکی تازە لەجوڵەی جەستەو لەسەیرکردنمانداو لەبەکارهێنانی ئەندامەکانی جەستەماندا، دێتە ئاراوە.. ئەو گۆرانانەی شێوازێکی تازەی جوڵەی دەست و نیگاکردن و مامەڵە کردن لەگەڵ خۆیاندا ناهێنن، گۆران نین بەڵکو دووبارە بوونەوەیەکی رابردوون لەسیماو جلو بەرگێکی تازەدا.

رێبوار لەم کتێبەدا بانگمان دەکات بۆ ئەوەی سەیرکردنمان بۆ مێژوو فراوانترو گەورەتر بکەین و تەنها لەو بەسەرهاتە خوێناوی و گەورانەدا تەماشای نەکەین کە مێژووی نوسراو کردونی بەتاکە حیکایەتێکی شایەنی گێرانەوە. ئەم کتێبە ناچار بەبیرکردنەوەو گومانکردنمان دەکا لەهەموو ئەو مانایەی تائێستا بۆ مێژوو دەستەبەرمان کردووەو فێرمان دەکات مێژوو بەزیاد لەزمانێك قسە دەکات و بەزیاد لەئاراستەیەکدا خۆی نمایش دەکات و لەزیاد لەبوارێکدا دەردەکەوێت.. پرۆسەی دۆزینەوەی شوێنە شاراوەکانی کارتێکردنەکانی مێژووش لەهەمان کاتدا هەنگاوێکە بەرەو مێژوو داماڵین.. کە مێژوو داماڵینیش جەوهەری ستراتیژی هەموو شۆرشێکی ئازادیخوازە کە دەیەوێت ئەمرۆ چیدی بەردەوامی دوێنێ نەبێت، بەڵکو رۆژێکی تازە بێت بەخۆرێکی تازەوە.

# مارا - ساد




لەزنجیرەی بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپو پەخشی سەردەم کتێبی ((مارا – ساد)) کە بریتی‌یە لە شانۆگەری‌یەکی شیعری وەرگێڕدراو، بڵاوکرایەوە. ئەم دەقە شانۆگەری‌یە کە بە ژمارە دووی بڵاوکراوەکانی سەردەم بڵاوکراوەتەوە لەنووسینی (پیتەر ڤایس)ی نووسەرو هونەرمەندی شێوەکارو دەرهێنەری سینەمایەو مامۆستا شێرزاد حەسەن لە ئینگلیزی‌یەوە کردوویەتی بەکوردی.

ئەم شانۆگەری‌یە شیعری‌یەی پیتەر ڤایس کە لە دووتوێی (١٧٠) لاپەڕەی قەبارە مامناوەندی‌دا چاپکراوە. شانۆگەری‌یەکی پشت ئەستوورە بەحەقیقەتێکی مێژوویی‌و کەلکی لەکۆمەڵێ بەڵگەنامەو کارەساتی باوەڕپێکراو وەرگرتووە.. بەڵام هەرچۆنێك بێت ئەم شانۆگەری‌یە شیعری‌یە دەقێکی دوکیومێنتی نی‌یە، بەڵکو دەقێکە حەقیقەتی ژیان‌و مەرگی ((ژان پۆڵ مارا)) لە شێوەی شانۆ لەنێو شانۆدا نمایش دەکات. ڤایس لەم شانۆیی‌یەدا زۆر وەستایانە مامەڵە لەگەڵ کەرەستە مێژوویی‌یەکان دەکات بۆئەوەی جیاوازیی فیکری نێوان ((مارا و مارکیز دی ساد)) مان پێشکەش بکات: مارا بڕوای بەتینی بەشۆڕشی کۆمەڵایەتی هەیە، شۆڕشێك کەسەرجەم کۆمەڵ بگۆڕێت بەڵام لەبەرامبەردا دی ساد گاڵتەی بەو بۆچوونە دێت‌و بڕوای بەشۆڕشی فەردانی هەیە.. لێرەوە دووتێزو دوو بۆچوون رووبەڕووی یەکتری دەبنەوە کە جگە لەحەقیقەتی ژیان‌و مەرگی ژان پۆل مارا زۆر بیرۆکەی دیکە گوزارە دەکات.. دەکرێ بەتاڵ بوونەوەی لە دروشمە باق‌و بریقەکانی یەکێك بێت لەو بیرۆکانەی بەتایبەتی کە زۆر راشکاوانە دەمانخاتە بەردەم ئەو راستی‌یە کە بەناوی شۆڕش‌و ئازادی‌یەوە زۆر کاری دزێو ئەنجام دەدرێ‌و چەندین قەسابخانە دەخولقێنرێن‌و سەرەنجام مرۆڤ تووشی نائومێدی دەکات. نائومێدی‌یەك کەوا لە مرۆڤەکان دەکات متمانەیان بەشۆڕش‌و پاکیەتی نەمێنێ.

ئەم شانۆگەری‌یە شیعری‌یە نموونەیەکی جوان‌و بەرچاوە لەپانتایی شانۆگەری سیاسی‌داو ئیدی دەمێنێتەوە دەست خۆشی لەمامۆستا شێرزاد حەسەن بکەین‌و ئومێدی سەرکەوتنی بۆبخوازین.


زنجیرەی کتێبی سەردەم (٣)

# خوان

ئەفلاتون

وەرگێڕانی :
ئاوات ئەحمەد

# خوان

لە زنجیرەی بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپو پەخشی سەردەم دا بەم دواییانە کتێبی ((خوان)) چاپ کرا کەلەنێو زنجیرەی کتێبی سەردەم دا ژمارە ((٣)) ی پێدراوەو بریتییە لەدەقی مشتومڕێکی ئەفلاتوونی سەبارەت بەخۆشەویستی.

خوان وەك ئاماژەمان پێدا لەنووسینی ئەفلاتوونەو کاك ئاوات ئەحمەد لەعەرەبییەوە کردوویەتی بەکوردیو لەدووتوێی (٩٤) لاپەڕەی قەبارە مام ناوەندیدا چاپکراوە.

ئاشکرایە کە ئەفلاتوونی فەیلەسووفی ناودارو دێرینی یۆنان پێدەچێت. تاکە فەیلەسووفی دێرینی یۆنان بێ کە سەرجەمی نووسینو بەرهەمەکانی بەپارێزراوی گەیشتۆتە دەستی ئێمە.. ئەفلاتوون سەرجەمی تێزو بیروڕاکانی خۆی لەچوارچێوەی گفتوگۆو مشتومڕدا ((وەك ئاوات ئەحمەد نووسیویەتی)) بڵاوکردۆتەوەو کۆی بیستوهەشت مشتومڕی جیاوازی بەبابەتی هەمەچەشن نووسیوە.

خوان یەکێکە لەو مشتومڕانەی کە نووسیونیو تیایدا سوکرات لەپاڵ ئەکاسۆنو ئەلقیبیادیس دا رۆڵی سەرەکی تیادا دەگێڕێو باسی خۆشەویستی دەکات.

ئاوات ئەحمەد جگە لەوەرگێڕانی دەقی وتووێژو مشتومڕی سەرخوانەکە بۆخۆشی پێشەکییەکی تێروتەسەلی بۆکتێبەکەی نووسیوەو زانیاری بەنرخی سەبارەت بە سوکراتو ئەفلاتوون تۆمارکردووە.

هەرچۆنێك بێت ئەم کتێبە یەکێکە لەو کتێبانەی کە ئەمڕۆ کتێبخانەی کوردی زیاد لەهەربابەتێکی دیکە پێویستی پێیەتی.. هیوای سەرکەوتن بۆ وەرگێڕو بۆ دەزگاری سەردەمیش دەخوازین.

# شۆڕش یا ریفۆرم

لەبڵاوکراوەکانی گۆڤاری (مرۆڤایەتی) - ٢ -

شۆڕش یا ڕیفۆرم

- گفتوگۆ لەگەڵ هێربرت مارکۆزو کارل پۆپەردا -

وەرگێڕانی:
ئازاد بەرزنجی



**- گفتوگۆ لەگەڵ هێربرت مارکۆزو کارل پۆپەردا -**

بەم دواییانە لە زنجیرە بڵاوکراوەکانی گۆڤاری ((مرۆڤایەتی)) دا کتێبی ((شۆڕش یا ریفۆرم - گفتوگۆ لەگەڵ هێربرت مارکۆزو کارل پۆپەردا)) بەچاپ گەیەنرا. ئەم کتێبە کە بەڕێز (ئازاد بەرزنجی) لەزمانی فارسییەوە کردوویەتی بەکوردی لەدوو توێی حەفتاوچوار لاپەڕەی قەبارە مام ناوەندی دا دەقی گفتوگۆیەکی لەگەڵ هەردوو بیرمەندی گەورەی سەدەی بیست دا لەخۆگرتووە کە ساڵی ١٩٧٠ لەگەڵیان دا ساز کراوە.

بێجگە لەدەقی وتووێژەکە برای وەرگێڕ دەروازەیەکی بۆکتێبەکەی نووسیوەو تیایدا تیشکی خستۆتە سەر ئاراستەی فیکریی هەردوو بیرمەندی ناوبراو و بەکورتی ناساندوونی لەپاڵ پێناسەیەکی کورتی تێزەکانیان دا. دواتر ژیاننامەی سیاسیی هەریەک لەمارکۆزو پۆپەریش بەپوختی تێهەڵکێشراوە.

جێی خۆیەتی ئاماژە بۆئەوەبکرێ کە کۆمەڵگەی نوێو هەڵسەنگاندن و رەخنە لێگرتنی دیارترین تەوەری وتووێژەکانەو لێوەیان هەنگاو دەنرێ بۆ بابەتو باسی دیکە. دەردەکەوێت لای مارکۆز کۆمەڵگەی تەکنەلۆژی کۆمەڵگەیەکی تاک ڕەهەندەو هیچ بوارێک بۆ ئازادیو بەختەوەریی راستەقینەی مرۆڤ ناهێڵێتەوە. هەربۆیە ئەوژیارەی تەکنەلۆژیا بەرهەمی هێناوە ژیاری ئەرکو ماندووبوونەو ژیاری ئیرۆس نییە. ئیرۆسیش لای مارکۆز بۆخۆی چەمکێکی فراوانتری هەیە لەچەمکە باوەکەی بەڵام چۆنیەتی بەدیهێنانی کۆمەڵگەی ئیرۆس لای مارکۆز لەدووتوویی تێزەکانی ئەم گفتوگۆیەدا بەدی دەکرێتو وەڵامی ئەو پرسیارەشمان دەداتەوە ئایا ئەم کۆمەڵگەی ئیرۆسە لەڕێی شۆڕش یان ریفۆرمەوە بەدی دەهێنرێت؟

لە بەرامبەردا کارل پۆپەر کە فەلسەفەکەی ناونابوو ((ئەقڵانیەتی رەخنەگرانە)) و بەردەوام پرسیاری جددی لەزانست دا دەوروژاند لەو گفتوگۆیەدا بەشدارەو بەگوێرەی ئاراستەی فیکریی خۆیو لەچوارچێوەی ئاخاوتن لەسەر کۆمەڵگەی نوێ تێزی ((کۆمەڵگەی کراوە)) دەخاتە روو. ئیدی ئەویش بەهەمان شێوە لەڕێی گفتوگۆکەوە وەڵامی پرسیارە گرنگەکەمان دەداتەوە، ئایا ئەم کۆمەڵگەیە بەریفۆم یان بە شۆڕش بەدی دەهێنرێت؟

جێی خۆشیەتی ئەوە تۆماربکەین کە وەرگێڕی کتێبەکە بۆخۆی درکی بەوە کردووە کە ئەو پرسیارەی دەکرێ گوایە وەرگێڕانی گفتوگۆیەک کە ساڵی ١٩٧٠ ئەنجام دراوە چ بایەخێکی هەیە؟ و لەو رووەوە بۆخۆی لەدەروازەکەیدا ئاماژەی بۆئەوە کردووە کە هەرچەندە ئەم گفتوگۆیە ساڵی ١٩٧٠ کراوە بەڵام لە رووی ئەو گرفتانەی وروژاندوونی زیندوویێتی خۆیان پاراستووەو هەردوو فەیلەسووفیش سەرەڕای گۆڕانکاریەکان لەسەر هەمان هێڵی فیکریی خۆیان ماونەوە.

# سارتەرو سیناریۆی فیلمێك لەسەر ژیانی فرۆید

و: تارا شێخ عوسمان



لەسالّی (١٩٥٨)دا (جۆن هیوسن)ی دەرهێنەری ئەمریکایی داوای لەژان پول سارتەر کرد کەفیلمنامەیەکی لەسەر ژیانی (فرۆید) بۆ بنوسێ.

سارتەریش دوای سالێك ئەو سیناریۆیەی نووسی. بەلاّم لەبەر ئەوەی سیناریۆیەکی زۆر دوورو درێژبوو، هیوسن داوای لەژان پول سارتەر کرد کەجارێکیتر بینووسێتەوە.

دوای دووەم جاریش سیناریۆکەی هەریەو دوورو درێژیە بۆ هێنایەوە.

سەرەئەنجام لەسالّی (١٩٦١) فلیمەکە بەناونیشانی (فرۆید، چەند میلێکی شاردراوە) و لەنواندنی (مۆنتگمری کلیفت) کەرۆلّی (فرۆید)ی دەبینی نمایش کرا.

سارتەر لەم فلیمنامەیەداو بەپشت بەستن و تاو توێ کردنی سەرچاوە جۆراو جۆرەکانی وەك بیوگرافی جۆنزو (لێکۆلّینەوە دەربارەی هیستریاو راڤەکردنی خەو) کەسێتی (فرۆید)ی بەجۆرێکیتر نیشان دا، ئیدی کەسێتی (فرۆید) کەسێتییەکی سلبی‌نیە، بەلّکو کەسێکی رەق و خۆپەرست و کەللەرەق و مەغشوشەر کەهەمیشە لەگەلّ خۆی و لەگەلّ دەوروبەریدا لەچەندو چون و قسەدایە، لەوانەشە هەر لەبەرئەوەبێت کەسارتەر دوای لێکۆلّینەوە لەژیانی فرۆید کەوتە نووسینی ژیاننامەی خۆی، ئەو یاداشتانەمەیەی کەسارتەر نەیتوانی تەواوی‌کات، تەنها ئەوەندە نەبێت دەزانین بەناونیشانی (ژان)ی بێ‌نیشتمان، (ژان)ی هەتیوەوە نووسراوەو کتێبێکی تریشی بەناونیشانی (ووشەکان) لەهەمان سالّ دا نووسیوویەتی و هەلّێنجاوی ئەو یاداشتنامە ناتەواوەیە.

سارتەر لەکۆتاییدا، دەگاتە ئەوەی کەدەروون شیکاری پێش ئەوەی بناغەیەکی زانستی هەبێت، ئەنجامی هەولّو تێکۆشانێکی گەورەیە دەربارەی (خود)و(دژەخود) بەرای سارتەر ئەم فلیمنامەیە فلیمنامەیەکی (فرۆید)ی‌بوو کەرۆلّی خۆی لەوێدا

دۆزی بۆوە. سارتەر هیچ کاتێ لەپلەو پایەی فرۆیدی نەهێناوەتەخوارێ، بەڵکو چمکە سەرەتاییەکانی خۆی زۆر راستگۆیانە روون دەکاتەوە.

(هیوستن)یش لەگفتوگۆیەکیدا بەم شێوەیە باسی یادەوەرییەکانی دەکات لەکاتی کارکردن لەگەڵ سارتەرداو دەڵێ:

((هیچ کات لەگەڵ کەسێکدا کارم نەکردووە وەك سارتەر فیرسیچمە بێت، ووت ووێژ لەگەڵیدا مەحاڵ بوو، هەرگیز نەمدەتوانی قسەی پێببڕم.

هەمیشە بێوەستان منی دەخستەژێر رێژنەی قسەکانییەوە.زۆرجار، بێتاقەت دەبووم و لەژوورەکە دەچوومەدەرێ بەڵام تاماوەیەکی زۆر دەنگی لەمێشکمدا دەزرنگایەوە، دوایی کەئەگەڕامەوە، کەمترین گرنگی بەچوونە دەرەوەم نەدەدا تاکو لێم بپرسێ لەکوێ بووی؟)).

خاڵێکیتریش ئەوەیە. لەوانەیە بڵاوبوونەوەی فلیمنامەکەی (ژان پول سارتەر) لە زنجیرەی (دەروون شیکاریو مێژوویەکەی) شتێکی سەیر بێتە بەرچاو. ئامانجی سەرەکی ئەو گەڕانە بەدوای راستیدا. بەهەرحاڵ کتێبەکەی ئێستا تەنها بەڵگەیەکە. لەم بارەیەوەو مێژووی تێروتەسەلو ئاڵۆزی ئەم شتانە بێشك لەمێژووی سارتەرو مێژووی دەروونشیکارەوەیە هەڵێنجراوە.

سەرئەنجامی ئەمەش؛ دەروون شیکاری پەیوەندی بەمێژووی بیرکردنەوەو مێژووی ئێمەوە هەیە.

ئەمەش بەشێکە لەفلیمنامەکەی فرۆید. ((دەنگی فرۆید ـ لەدەرەوەی کادرەکە. هەموو شتێ لەگەڵ مردنی باوکما دەستیپێکرد.)).

ئەو دیمەنەی پێشوو نامێنێت.

دەنگەکان لەسەر وێنەپەخش کراوەکان دەبیسترێ.

دیمەن، پاییزی ساڵی (١٨٩٦)ە لەڤیەننا پیاوێکی (٤٠) ساڵە (فرۆید) بەجلوبەرگی تازێبارییەوە، خۆی دەکات بەسەرتاشخانەیەك دا بێتۆقرەو تووڕە، بەناقابلییەوە سەیرێکی موشتەرییەکانی دەکات، کەپێش ئەو هاتوون و چاوەڕێی سەرەی خۆیانن..

سەرچاوە/
رۆژنامەی ایران ژمارە (١٠٩٧)

فلیمنامەی (فرۆید) کەلەنووسینی ژان پول سارتەرە، نووسەرو وەرگێڕی فارسی (قاسم روبین) لەکتێبێکی (٥٢٠) لاپەڕەییدا کردوویەتی بەفارسیو لەسەر ئەرکی دەزگای چاپو پەخشی (نیلوفەر) لەتاران (٢٢٠٠) تیراژی لێبەچاپ گەیاندووە.

# ئیلیا كازان‌و دووه‌مین ئۆسكار



ئـه‌كادیمیای زانسـتـه‌كان‌و هونـه‌ره‌كانی سینه‌مایی ئـه‌مریكا (واته ئۆسكار) به‌نیازه خـه‌ڵاتی ئۆسكاری فـه‌خریی ساڵی ۱۹۹۹ی خـۆی بـه (ئیلیـا كـازان) كـه ده‌رهێنـه‌رێكی خاوه‌ن شـێوازێكی تایبه‌تی‌و كاریگه‌ره، ببه‌خشێت.

كازان له‌ساڵی ۱۹۳۵دا ژیانی خۆی به‌شانۆ ده‌ست پـێ كـردو چه‌ند كـارێكی (تینسی ولیـامز)ی بۆ شانۆ ده‌رهێنا. پاشـتر رووی كـرده سـینه‌ماو لـه‌و بواره‌شـدا بـه‌هره‌وه‌ریی خـۆی پیشـاندا. له‌كاره سینه‌ماییه به‌ناوبانگـه‌كانی (بـژی زاپاتـا) ۱۹۵۲ شـكۆی كێڵگه‌كه (۱۹٦۱) له‌سـاڵی ۱۹٤۱دا به‌رامبـه‌ر ده‌رهێنـانی فیلمـی (رێكه‌وتنامـه‌ی ئاپرووومه‌ندانـه) ئۆسكاری وه‌رگرت.

ئیلیا كازان كه ئێستا ته‌مـه‌نی (۹۰) سـاڵه، لـه سـاڵی ۱۹۱۳دا له‌گـه‌ڵ خێزانه‌كـه‌یدا –كـه لـه ویۆنالیانـه بـوون كـه لـه توركیـادا ئه‌ژیان– بۆ ئه‌مریكا كۆچی كرد.

## ئاگادارییەك بۆ نووسەرانی گۆڤاری سەردەم

- لەگەڵ دەقە وەرگێڕراوەکەدا دەقە ئەسڵییەکەش بنێرن.
- رەچاوی رێزمانو خاڵبەندی بکەن.
- دەبێ بابەتەکە بەخەتێکی جوانو لەسەر دیوێکی کاغەزەکە بنووسرێ، دەنا فەرامۆش دەکرێ.
- بەپێی پێویست وێنە لەگەڵ بابەتەکەدا هەبێ.
- هەر بابەتێك بڵاوبکرێتەوەو نەکرێتەوە نادرێتەوە بەخاوەنەکەی.
- ئەو بابەتانەی بڵاودەکرێنەوە مەرج نییە دەربڕی راوبۆچوونی گۆڤارەکە بن.
- (سەردەم) پاش بەراوردو پیاچوونەوە بەبابەتەکاندا، لەدەسکاریو داڕشتنەوەیاندا ئازادە.

## ئاگادارییەك بۆ وەرگێڕەکان

دەزگای چاپو پەخشی سەردەم بەنیازە لەزنجیرە کتێبە چاپکراوەکانیدا گرنگییەکی تایبەت بەوەرگێڕانی کتێبی هەڵبژاردە بدات لەزمانە زیندووەکانی جیهانەوە، هەر بۆ ئەم مەبەستە:

یەکەم: بایەخی تایبەت بەلێکۆڵینەوە دەدرێ لەبوارەکانی: فیکر، فەلسەفە، تۆژینەوەی ئەدەبی، دەقی جیهانی وەرگێڕراو، رەخنە، زانستە مرۆییەکان، مێژوو، لێکۆڵینەوە خۆرهەڵاتناسییەکان، تۆژینەوەی هونەری، ئەدەبی منداڵ، فەرهەنگسازی ... دا.

دووەم: دەبێ دانەیەك لەکتێبە ئەسڵیەکە لەگەڵ وەرگێڕانەکەدا هەبێ.

سێیەم: دوای ئەوەی بڕیاری چاپکردنی دەدرێ؛ نۆرەی خۆی بۆ چاپ دەگرێتو پاش چاپکردن، بەپێی قەوارەو لاپەڕەکانی کتێبەکە (جگە لەرێژەیەك لەکتێبەکە) خەڵات بۆ وەرگێڕەکەی تەرخان دەکرێ.

